# تەفسیری کوردی

## لە کەلامی خوداوەندی


مەلای گەورە

( مەلا محمدی کۆیی )


بەرگی یەکەم



# تەفسیری کوردی

## لە کەلامی خوداوەندی

مەلای گەورە

( مەلا محەمەدی کۆیی )

بەرگی یەکەم

جوزئی ( ١-٣ )

لەسەر ئەرکی بەڕێز مام جەلال سەرۆک کۆماری عێراقی فیدراڵ لەچاپدراوە

نـــــاوی کتێـــــب: تەفسیری کوردی لە کەلامی خوداوەندی
نوســـــــــەر: مەلای گەورە (مەلا محمدی کۆیی)
بلاوکردنــــــەوەی: نوسینگەی حەمدی/ بۆ بلاوکردنەوەو ڕاگەیاندن- سلێمانی
پیتچـــــــــنین: علی صلاح الدین
نەخشەســــــازی: جومعە صدیق کاکە
خـــــــــە ت: نەوزاد کۆیی
بـــــــــەرگ: چاپخانەی حەمدی
مونتـــــــــاج: عەبدولا مەهدی رسول
سەرپەشتیاری چاپ کرمانج محەمەد موراد
بەراوردی دەستنوس لیژنەی سەرپەرشتی
لەســـەر کۆمپیوتـــەر: اسماعیل طە- شنۆ حمدأمین- ارسلان رحمان محمد
ســـالی چـــاپ: ١٤٣٠ک - ٢٠٠٩ز
تـــــــــیراژ: ٢٠٠٠

لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی ( ١٣٥ ) ی سالی ٢٠٠٧ دراوەتێ



مەلای گەورە ١٨٧٦ز- ١٩٤٣ز

# وتەی لیژنەی سەرپەرشتی کردنی چاپی تەفسیری مەلای گەورە

*بە ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان*

شاری کۆیە، ددیەها هزرڤان و شاعیر و رۆناکبیری و بلیمەت و داهێنەری وەك حاجی قادر و دلدار و زانایانی خێزانی جەلی زادەی پێشکەش بە میللەتی کورد کردوە، ئەگەر جمال الدین ئەفغانی و محمد عبدە رابەری ئەو گەشە کردن و نوێخوازیانەی جیهانی ئیسلامی بن، ئەوا هەموو میللەتی کورد قەرزاری شاری کۆیەن، بە تایبەتی مەلای گەورە بۆ هۆشیاری و رۆناکبیریی لە سەردەمی خۆی ، چونکە عەقلیەتی مەلای گەورە عەقلیەتێکە، زۆر پێش زەمانی خۆی کەوتوود، بە هەموو شێوەیەك ویستوویەتی میللەتەکەی لە خەو رابێ و، چی دی دوای کۆنە پەرستی و خەیال و ئەندێشە نەکەوێ و، چەکی زانست تەنها چەکیان بێت بۆ چوونە پێش لە ژیاندا

هزرڤانی گەورەی کورد مەلای گەورە ویستویەتی جارێکی تر ژیانی بیر و نیشتمان پەروەری و کۆمەلایەتی میللەتی کورد سەر لە نوێ دابرێژێ، تا بگونجێ لە گەڵ سەردەمدا ، هەر بۆیەش کۆنەپەرستان و بیر تەسکان و ئەو

کەسانەی دینیان بە سوودی خۆیان بە کار دەهێنا ، دژی مەلای گەورە وەستان و بەر هەڵستیان کرد .

یەکێك لە چەکەکانی مەلای گەورە تەفسیرەکەی بوو ، هەر جارێ رەوشەنبیرێ یا ئەندامێ لە خانەوادەی جەلی زادە، بەڕێز مام جەلالیان دیبێ، یەکەم پرسیاری بەڕێزیان دەربارەی ئەو تەفسیرە بووە، کە ئایا بە چاپ گەیەنراوە یان نا ؟

دوا جار بیرۆکەی چاپکردنی لە لایەن ئێمەی لیژنەی سەرپەرشتیاری بە چاپ گەیاندنی چرۆی کرد و ویستمان بەڕێز مام جەلال لەو بیرۆکەیە ئاگادار بکەینەوە، ئەوەبوو نامەیەکمان بۆ بەڕێزیان نووسی و ئەویش لە وەڵامدا بە بەڕێز (مامۆستا سید احمد بەرزنجی) راوێژکاری ئایینی بەڕێزیان وتبوو من رازی نابم ئەو تەفسیرە چاپ بکرێ و لە سەر ئەرکی من نەبێ، لە ڕاستیدا ئەم وتەیەی بەڕێزیان گەورەترین هاندەر بوو بۆ ئێمە ، چونکە گەورەترین کۆسپ لە ڕێگای چاپکردنی ، کۆسپی دارایی بوو.

ئەم پڕۆژە زانستیە ماوەیەکی زۆر و ماندوبوونێکی زۆری ویست ، ئەوەی زیاتر ئێمەی سوور کرد لە سەر بەردەوام بوون لەم پڕۆژەیە بەردەوامی لێپرسینەوە و هاندانی بەڕێز سەرۆك کۆمار بوو .

تەفسیری جەنابی مەلای گەورە دیارترین بەرهەمی زانستی ئەو زاتەیە ، بەڵکو دەتوانین بڵێین ئەم تەفسیرە، یەکەم تەفسیری زانستی قورئانی پیرۆزە بە زمانی کوردی لە رووی چەندایەتی و چۆنایەتی ، مەلای گەورە لە سەر داوای کۆمەڵێ لاوی شاری کۆیە لە ساڵی **١٣٥٢** کۆچی **١٩٣٣** زاینی دەستی پێ

کرد و، دوای ( ١٠ ) دە ساڵ لـە (٢٧) ی ذی الحجـة سـاڵی ١٣٦١ی کۆچـی بەرامبەر بە ١٩٤٣/١/٥ زایینی ئەم شاکارە زانستیە بە بەرهەم هات ، جەنابی مـەلا هەنـدێکی بـە دەسـتی خـۆی نووسـیوەتەوە و هەنـدێکی تـریش بـەڕێز (مامۆستا مەلا مەعسوم هەورامی ) نووسیویەتیەوە .

جەنابی مەلای گـەورە تەفسـیرەکەی ناونـاوە ( تەفسـیری کـوردی لـە سـەر کەلامی خوداوەنـدی ) ، نەجیبـە خـانی کچـی ، بـەرگی یەکـەمی لـە سـاڵی ١٩٦٨زاینی وبـەرگی دووەم و سـێ یـەمی لـە سـاڵی ١٩٧٠زاینـی بـە چـاپ گەیاندووە و بەرگـەکانی تـری ئـەم تەفسـیرە لـە چـاوەڕوانی چـاپکردندا بـوو، رۆشەنبیران و دڵسۆزانی میللەتەکەمان خەونیان بە چاپکردنیەوە دەبینی، تا ئەم بوارە بـۆ چـاپکردنی رەخسـا ، ئـەوەی شـایانی باسـە ئـەم تەفسـیرە لەلایـەن لیژنەیەکی تایبەت پاك نووسکراوەتەوە، کە ماوەی ( ١٠ ) دە سـاڵی خایانـدووە وە بەڕێزان :

١- مامۆستا عبدالمجید نورالدین جلی زادە .

٢- مامۆستا طاهر احمد حویزی .

٣- مامۆستا مەلا قادر کانی دەربەندی، بەم کارە پیرۆزە هەڵساون.

نابێ رۆڵی نەجیبەخان لە بیر بکرێ بۆ پاراستنی ئەم دەسکەوتە زانستیە .

وا مژدەی تەواو بوونی ئەم پرۆژەیە دەدەینە خوێندەوارانی کورد ، کـە ئێمـە دڵنیاین ئەم تەفسیرە کەلێنێکی زۆر گەورەی کتێبخانەی کوردی پڕ دەکاتـەوە و دیدەی زۆر کەسی پێ روون دەبێتەوە ، بەو هیوایەی شاکارەکانی تـری زانایـانی کورد بـەم شـێوەیە ئـاوڕی زانسـتیانە لێ بدرێتـەوەو، خـەمخۆرانی گەلەکـەمان

بایەخی تەواو بەم بەرهەمە زانستیانە بدەن، کە لە روانگەیەوە بلیمەتی و شارەزایی و دڵسۆزی و زانستپەروەری و نیشتمان پەروەری راستەقینەی گەلەکەمانی تیا بەدی دەکرێ ، هەروەها لێکۆڵەر و رۆشنبیر و هزرڤانانی گەلەکەمان هان دەدەین، کە بەشێك لە ئەرك و ماندو بوونی خۆیان بۆ ئەم بوارە تەرخان بکەن، کە ئەرکێکی تری زانستی و نیشتمان پەروەری و ڕاستیە .


پ.ی.د. جواد فقی علی     پ. د.محمد صابر

م . دانا عبدالمجید جلی زادە     م . مخلص یونس مصطفی

نەوا محمد سعید

# تەفسیری مەلای گەورە

به پێنووسی : د. جواد ملا محمدامین چۆم حەیدەری

**پێناسەی تەفسیرەکە :.**

تەفسیری مەلای گەورە بە پیێزترین بەرهەمی زانستی ئەم زاتەیە، دەکرێ بڵێین تەفسیری مەلای گەورە بە زمانی کوردی نۆبەرەی تەفسیری زانستیە بۆ قورئانی پیرۆز بە زمانی کوردی

هەروەکو زانراوە مەلای گەورە بیرۆکەی نووسینی ئەم تەفسیرەی بۆهاتووە دوای داواکاری کۆمەڵێ لە گەنجانی شاری کۆیە، ئەوەبوو لە ساڵی ( ١٣٥٢ ك – ١٩٣٣ز) دەستی پێکردو لە ( ٢٧ ذی حجەی ساڵی ١٣٦١ ك – ( ١٩٤٣/١/٥ ز ) تەواوی کرد واتە دوای دەساڵ وەبەرهەم هات

هەندێ لە بەرگەکانی بەڕێز مامۆستا ( مەلا معسوم ) هەورامی (یەکێکە لە ناودارترین دەرچوانی قوتابخانەی مەلای گەورە ) نوسیویەتیەوە، بەڵام بۆ پاك نوسکردنی ئەم تەفسیرە لە ساڵی ١٩٦٩ ز لە شاری کۆیە لیژنەیەك لە بەڕێزان

١. مامۆستا مەجید شێخ نوری

٢. مامۆستا مەلا عەبدولقادری کانی دەربەندی

٣. مامۆستا طاهر احمد حەوێزی .

پێك هات  بە مەبەستی پاك نوسكردنی هەموو بەرگەكانی، ئەم كـارەش لـە ماوەی ١٠ ساڵ ئەنجام درا، مـەلای گـەورە تەفسـیرەكەی ناونـاوە ( تەفسـیری كوردی لەسەر كەلامی خوداوەندی )، دەستنوسی ئـەم تەفسـیرە لـە ٣٠ بـەرگ پێك هاتوە، هەربەرگەی لە ١٥٠ تا ٣٠٠ لاپەرەی گەورە پێك دێت.

- نەجیبەخانی كچی مەلای گـەورە هەڵسـا بـە بەچـاپ گەیانـدنی بـەرگی یەكەمی ئەم تەفسیرە لە ساڵی ١٩٦٨ ز، بەرگی دووەم و سێ یەمیشی لە ساڵی ١٩٧٠ ز. بەچاپ گەیاند، بەڵام بەرگەكانی تری ئەم تەفسیرە هەر لە چاوەڕوانی بە چاپ گەیاندندا بوون، تا بەڕێز مام جـەلال فـەرمانی كـرد لـە سـەر ئـەركی بەڕێزیان چاپ بكرێن.

- لە سەرچاوەكان زۆر بەكەمی باسی ئەم تەفسیرە كـراوە، ئـەوەی وتـرابێش بریتی بوە لە هەندێ پەراوێز لەسەر بەرگی ئەم كتێبە، یا ئەو كتێبـەی زانایـەك لە زانایەكان نوسیویەتی، كە بە زۆری لەگەڵ ئـەو هـەموو شـتە بـە نرخانـەی میلەتی كورد لەو ڕۆژگارە دا فەوتا .

یەكێك لەو كەسانەی ئیجازەی عیلمیان لە جەنابی مەلای گـەورە وەرگرتـوە، مامۆستا مەلا عەبدولقادر كانی دەربەندیە، كە لـە سـاڵی ( ٢٠٠٦ ز كۆچـی دوایی كرد ) .

دەربارەی تەفسیری مەلای گەورە دەڵێ : ئەو كەسەی تەفسیری جەنابی مـەلا بخوێنێتەوە، گەر خۆی هەر بیروباوەڕ و ڕۆشنبیریەكی هەبێ، كاتێ ئـەم تەفسـیرە دەخوێنێتەوە دەگاتە قەناعەتێ، كە جەنابی مەلا بەم تەفسیرە مـرۆڤ پـەروەردە

دەکات، چونکە ئەم تەفسیرە هەوڵێکە بۆ دروست کردنی مرۆڤی زانا و سەربەست و ئازاد ، سەربەست و ئازاد لە هەموو بە دواکەوتنی ئەندێشەو خەیاڵی پڕوپوچ، ئەوەی ئەم تەفسیرە لە تەفسیرە کوردیەکانی سەردەمی خۆی جیادەکاتەوە ئەوەیە، کە مەلای گەورە بەڕای هەموو کەسێ ڕازی نیە لە تەفسیرە کۆنەکان، بەڵکو گفتوگۆ و هەڵسەنگاندن دەکات لەسەر تەفسیرەکانی قورئان بە زمانی عەرەبی، جگە لەمەش زۆر جار هۆی دابەزینی ئایەت باس دەکات, دوای هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە لە مانای ئایەتەکان ڕای خۆی دەنوسێ، ئەوەی دەینوسێ ڕای خودی خۆیەتی, زۆر جاریش زۆر بواری زانستی تێکەڵ بە تەفسیرەکەی دەکات .

وەك مامۆستا مەسعود محمد دەڵێ : مەلای گەورە لە تەفسیرەکەیدا زۆر شتی باس کردوە، کە محمد عبدە لە تەفسیرەکەی خۆی لێ کەنار گرتوە .

مەلای گەورە لە کۆتایی تەفسیرەکەی داوای لێبوردن لە خوێنەران دەکات، دەڵێ ئەم تەفسیرە بێ کەم و کورتی نیە, هۆی کەم و کورتیەکەش لە پێشدا پەیوەندی بە زمانەوە هەیە، زمانی قورئانی پیرۆز زمانێکی تایبەتە, گەر یەکێ بە زمانی عەرەبی بیەوێ تەفسیری قورئان بکا توشی گرفت دێ، جا چۆن گەر بەزمانێکی تر تەفسیری قورئان بکا !

لە ڕاستیدا ئەم تەفسیرەی مەلای گەورە چاکترین تەفسیری قورئانە بە زمانی کوردی، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە ئەم تەفسیرە بێ کەم و کوڕی بێ.

یەکێ لەو خاڵانەی مرۆڤ بەدی دەکا لەسەر ئەم تەفسیرە ئەوەیە: مەلای گەورە جاری واهەیە بە پێچەوانەی زۆر لە زاناکان بۆ تەفسیری ئایەتەکان دەچێ

.ئەوەی جێگای سەرنجە تەفسیرە کەی مەلای گەورە بۆ زانایـان نوسـراوە، بۆیـە زۆر لەو کەسانەی ئاستی رۆشـنبیریان بەرزنیـە لـە زۆر مەسـەلەکانی نـاو ئـەم تەفسیرە تیّ ناگەن.

## سەرچاوەکانی تەفسیرەکە :.

مەلای گەورە لە دانانی ئەم تەفسیرە، سودی لە زۆر کتێبی تەفسیری عـەقلّی و نەقلّی وەرگرتوە ، وەك خۆی لە کۆتایی تەفسیرەکە ئاماژەی پیّ کردوە .

هەندیّ لەو سەرچاوانەی مەلای گەورە لە تەفسیرەکەیدا ئاماژە بەوە دەکات، کە سودی لیّ وەرگرتون ئەمانەن :

١. جامع البیان فی تفسیر القرآن – دانانی ئەبو جەعفەر محمدی کـوڕی جـەریری تەبەری (لە سالّی ٣١٠ ك ) کۆچی دوایی کردوە .

٢. مفاتیح الغیب ( التفسیر الکبیر ) دانراوی فخرالدین محمد بن عمر البكري.

٣. الکشاف عن حقائق التنزیل و عیون الاقاویل فی وجوب التأویل – دانـراوی ئەبو قاسم محمودی کوڕی عمری زەمەخشری .

٤. انوار التنزیل واسرار التأویل – دنـراوی ناصـرالدین عبداللـه کـوڕی عمـری بەیزاوی.

٥. غرائب القرآن ورغائب الفرقـان – دانـراوی نظـام الـدین – حەسـەنی کـوڕی محمدی قومی، خراسانی، نیسابوری.

٦. ارشاد العقل السلیم الی مزایـا الکتـاب الکـریم - دانـراوی ئـەبو سـعودی محمدی کوری محمد مستەفای ئامێدی .

٧. روح المعانی فی تفسیر القرآن العظیم والسبع المثـاني — دانـراوی ئـەبو ثـە نـا شهاب الدین مەحمود ئالوسی .

٨. تفسیر القران الحکیم ( تفسیر المنار ) دانراوی محمد رشید رەزا .

٩. الجواهر فی تفسیر القرآن الحکیم — دانراوی سەید تەنتاوی .

١٠. تەفسیر جزء عمّ — دانراوی ئیمام محمدعبده .

هەروەها مەلای گەورە لە تەفسـیرەکەیدا ڕای زۆر لـە زانایـانی تەفسـیر لـە یـاوەرانی ( پێغەمبـەر ) و ئەوانـەی دوای ئـەو هـاتوون باسـکردووە، وەك :. عەبدوڵڵای کـوڕی عبـاس، ئـیبن ئـەبی لـەیلا، ئیمـام حەسـەن بەسـری، ئـەبو عەبدولرحمن ئەسودی کـوڕی یەزیـد، ئـیبن قەیسـی نەخـەعی، ئـەبو حەنیفـە ( نەعمانی کوڕی ثابت ) جەلالەدینی سیوتی.

# كورتەی ژیان و بەسەر هاتی مەلای گەورە

**ناو و نازناوی :.**

ناوی مەلای گەورە (محمدی كوڕی مەلا عبداللەی كاك ئەســــعەدی جەلی, كۆییە)

لە سەردتایی ژیانی بە كاك حمد ناویان بردوە، دوای كۆچی باوكی بۆتە سەرۆكی زانایانی ئاینی دەڤەری كۆیە، بە مەلای گەورە ناوبانگی دەركرد، بە شێوەیەك كە ئەم ناوە بۆتە ناوبانگی ئەم زاتە و لە كتێبەكانی مێژوو و ئەدەبی كوردی هەر بەم ناوە ناو دەبردرێت .

**لە دایك بوون و ژیانی :**

ئەم زاتە لە شاری كۆیە لە سەرەتای مانگی ڕەجەبی ساڵی ( ١٢٩٣ ك) بەرامبەر بە ( ١٨٧٦ ز ) لە ژێر سایەی خێزانێكی زانستی (كە ڕۆڵێكی گەورەیان لە خزمەتی زانست و شكۆمەندی بۆ گەلی كورد تۆمار كردوە) لە دایك بوو .

جێگای بایەخی خێزانەکەی ( بە تایبەتی باوکی مەلا عەبدوڵڵای جەلی ) بوە، هەر لە سەرەتای ژیانیەوە لیّ هاتویی و زیرەکی تیابەدی دەکرا .

لە تەمەنی پێنج ساڵی، دایکی کۆچی دوایی کردوە، ئەمەش وای کرد باوکی زیاتر بایەخی پیّ بدا، هەر بۆیەش هەندیّ جار پیّ یان وتوە یوسفی جەنابی مەلا عەبدوڵڵا .

زۆر جاریش باوکی بە بەیتیّ شیعر هانی داوە، تا خۆی لەگەڵ خوێندن و وەرگرتنی زانست و پابەندبوون بە ڕەوشتی بەرزی ئیسلام خەریك بکا .

## خوێندنی مەلای گەورە :.

مەلای گەورە لە ساڵی (١٣٠٤ ك) بەرامبەر بە(١٨٩٣ ز) دەستی بەخوێندن کردوە،سەرەتا بە خوێندنی قورئانی پیرۆز و چەند نامیلکەیەکی فارسی _ کە ئەو سەردەمە لە خوێندنگە ئاینیەکانی کوردستان دەخوێندرا _ دەستی بەخوێندن کرد، دوای تەواوکردنی ئەو کتێبە سەرەتاییانە، دەستی بە خوێندنی زانستەکانی (نەحو، صەرف، فیقە ) کرد لە سەردەستی هەندیّ لە فەقیّ گەورەکانی باوکی .

یەکیّ لەو مامۆستایانەی، کە ڕەنگدانەوەیەکی دیاری هەبووە لە دارشتنی کەسایەتی زانستی مەلای گەورە (مەلا حەمید تالیشی یە) بە پلەی دووەم، دوای مەلا حەمید بەڕێز (مەلا حەمەدەمینی کونەفلوسەیی) دیّ، کە ڕۆڵێکی گەورە و دیاری هەبووە لە پیّ گەیاندنی

ئەم زاتە, هەروەها ئەم زانایانەش ڕۆڵیان هەبود لە فێرکـردن و دەرس و وتنەوە بە مەلای گەورە :.

مەلا حسن ڕەش .

مەلا عەبدورەحمانی گەناوی .

باوکی ( مەلا عەبدوڵلاّی جەلی ) .

ئەوەی جێگای سەرنجە لـە ژیـانی زانسـتی مـەلای گـەورە، متمانـە بەخۆبونە, بەمەش کەسایەتیەکی تایبەتی بۆ خۆی دروست کردوە .

وا دەردەکەوێ مەلای گەورە زۆر مەبەستی خوێندن و فێربـوون بـوە، وەك خۆی دەڵـێ وازی لـە هـەموو کـەیف و سـەفایەك هێنـاوە و ڕوی کردۆتە فێربوون و بە دوا دا چـوونی زانسـت، بـە تایبـەتی کـاتێ، کـە گەیشتۆتە تەمەنی ( ١٧ )ساڵ .

کە وەك خۆی دەڵێ :

دەرگەی لە زەتم لەسەر خۆ بەست

چی علوم هەبوو بە دەستم خست

مامۆستا ( مەسعود محمد ) لە زاری باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ : لەم ساڵەدا قوتابخانەکەم (کـە مزگەوتەکـەی بـوو) قـەت جـێ نەهێشـتوە، تاساتەکانی درەنگی شەو خەریکی خوێندن بووم، لە مزگەوت دەمامەوە و هەر لەبیر و زیکرابووم، زۆر جار لە شەوەزەنگی تاریکیـا هەسـتم بـە دڵنیایی دەکردو و ئارامیەکی دەرونیم بەدی دەکرد، کە دوای ئەوە قەت ڕێك نەکەوتەوە بۆم .

مەلای گەورە لەسەر دەستی کۆمەڵێ زانای بە ناوبانگی زانستە ئاینیەکانی ئیسلامی، کە کورد بوون خۆی چەکدار کرد بە عیلم و مەعریفەت، تا بوە ئەستێرەیەکی درەوشاوە لە ئاسمانی زانست و بیری ئیسلامی، ئەوەبوو لە تەمەنی (٢٠) ساڵی ئیجازەی عیلمی لە باوکی (مەلا عەبدوڵڵای جەلی) لە ئاهەنگێکی گەورەدا وەرگرت, کە بەم بۆنەیەوە سازدرا و کۆمەڵێ زانا و شاعیر و ناودارانی شاری کۆیە تیایدا ئامادەبوون .

## دەرس وتنەوەو پێش نوێژیی :

دوای ئەوەی مەلای گەورە خوێندنی ئاینی تەواو کرد و ئیجازەی عیلمی وەرگرت، لەسەر شێوازی ژیانی باوکی، لە جیاتی ئەو دەستی کرد بە دەرس وتنەوە و پێش نوێژی و گوتار خوێندنی ڕۆژانی هەینی، باوکی زۆر کاروباری کۆمەڵایەتی و ئەرکی ئامۆژگاری خەڵکیشی بەو سپارد .

مەلای گەورە دوای ماوەیەکی کەم وەك یەکێك لە زانا ناودارەکانی کورد ناوبانگی دەرکرد, دەیەها فەقێ و خوێندکاری خوێندنی ئاینی لە شارەکانی کوردستان ڕویان لە کۆیە دەکرد، بۆ ئەوەی شەرەفی دەرس خوێندنیان لە لای مەلای گەورە بەر بکەوێ .

لە دوای وەفاتی باوکی ( پایزی ١٣٢٦ ك ١٩٠٨ ز ) ئەرکەکانی سەرشانی مەلای گەورە زیاتر بوو ، هەر لەم ڕۆژانەوە کێشەکانی ژیان ڕویان تێ کرد, هەروەك خۆی دەڵێ باری ژیانی قورس بوو، ناچار ژیانی

دابەش بوو بەسەر دەرس وتنەوەو كاركردن لە كێڵگە بۆ بەدەست هێـانی بژێوی ژیان .

تاریكخوازان هێرشیان بۆ سەر مەلای گەورە زیاد كرد, دەیان ویست هەراسـانی بكـەن لەبـەر ئـەوەی لـەم سـەردەمەی ژیـان، گـەورەترین هاوپشتیوانی لەدەست دا، كە باوكی بوو، دەبێ ئـەوەش بلـێین هـەوڵ و كۆششی شەڕخوازان نەیتوانی مەلای گـەورە لەسـەر ڕێبازەكـەی سـارد بكاتەوە .

لەساڵی (١٩١٢ ز) لەسەر داوای حكومەتی عوسمـانی بـوە مـوفتی شـاری كۆیـە، زۆر بـەرێك و پێكـی بـەم كـارە هەڵسـا، كێشـە كۆمەڵایەتیـەكانی خـەڵك لای ئـەو چـارەی بـۆ دەدۆزرایـەوە, لـەم سـەردەمەدا پەیوەندیـەكی پتـەوی لەگـەڵ (والی موصـل — سـلێمان نەزیفی دیاربەكر) گرێ دا، دواییش لە شاری موصل سەردانی كرد, هەر لەوێ لە كاتی كردنەوەی جادەیەكی نـوێ، داوا لـە مـەلای گـەورە كـرا وتەیەك بە زمانی عەرەبی بخوێنێتەوە، مەلای گـەورەش داواكاریەكـەی جێ بەجێ كردو، بە وتەكەی سەرنجی ئامادەبوانی بۆلای خۆی ڕاكێشـا، هەر لەو كاتەدا داوای لە والی موصل كرد قوتابخانەیەكی ڕوشـدیە لـە شاری كۆیە بكاتەوە . والیش ڕەزامەندی دەربڕی، قوتابخانەكـە لەسـەر زەویەك كە بەشێك بوو لە مزگەوتی گەورە دروسـت كـرا، (تـا سـاڵی ( ١٩٥٧ ز ) ئەم قوتابخانەیە هەر بەردەوام بوو ).

لە ساڵی ( ١٩١٥ ز ) بەرامبەر ١٣٢٤ ك ) بوە ئەندامی ئەنجومەنی ویلایەتی موصل، هەر لەم سەردەمەدا لە لایەن (سوڵتانی عوسمانی — محمد ڕەشاد) نیشانەی مەجیدی — پلەی سێ یەمی پێ بە خشرا .

لە ساڵی (١٩١٩ ز — ١٣٣٧ ك) بوە دادوەری شاری کۆیە، بۆ ماوەی دەساڵ لەم کارەدا بەردەوام بوو, ئەوەی شایانی باسە بڕیارەکانی دادگایی بە زمانەکانی ( فارسی —تورکی —عەرەبی — کوردی ) نوسیوە .

لە ساڵی (١٩٢٤ ز) لە سەر داواکاری خەڵکی شاری کۆیە بە ئەندامی ئەنجومەنی دامەزرێنەری عێراقی (المجلس التأسيسي العراقي) هەڵبژێردرا, بۆ ئەم مەبەستەش لە کۆتایی مانگی ئاداری ( ١٩٢٤ ) چوە بەغدا, تا مانگی ئابی ئەم ساڵە لەوێ مایەوە،و دوایی گەڕایەوە شاری کۆیە .

دوای گەڕانەوەی بۆ شاری کۆیە, گەڕایەوە سەر کارەکەی پێشوی بە دەرس وتنەوەو دادوەری و ئامۆژگاری موسڵمانان، تا ساڵی (١٩٢٨ ز) لەم کارەدا بەردەوام بوو، دوایی وازی لە وەزیفە هێناو هەموو کاتەکانی بۆ دەرس وتنەوەو نوسینی کتێب تەرخان کرد .

ساڵی (١٩٣٠ ز) بە ساڵی گەیشتنی مەلای گەورە بە لوتکەی تێگەیشتنی بیرو فەلسەفەی مەلای گەورە دەژمێردرێ، چاکترین بەڵگەش ئەوەیە مەلای گەورە لەم سەردەمەدا دەستی کرد بە دانانی ئەم تەفسیرەی قورئانی پیرۆز، ئەوەی شایانی باسە مەلای گەورە بەوە ناسراوە هەیبەت و ڕێزی تایبەتی هەبووە لەلای هەموو خەڵکی شاری

کۆیه و کوردستان، جێگای خۆی له دڵی خەڵك کردۆتەوە, بەقسە خۆشەکانی و هەڵس و کەوتی ڕێك و پێکی لەگەڵ خەڵك - کە سەرنج ڕاکێش بوە- ناوبانگی دەرکردودو خەڵك لە هەموو لایەکی کوردستانەوە تامەزرۆ بوون بە دیداری شادبن، ناسراوە بەوەی ئەو شتانەی کە بڕوای پێ بووە لە ژیانی خۆی جێ بە جێ ی کردوە، قەت بارودۆخی ژیان و ترس لە خەڵك وای لێ نەکردوە واز لە بیروبڕوای خۆی بێنێ، بە پێچەوانەیانەوە هەڵس و کەوت بکات، زۆر سەر بەرزانە ژیانی بەسەر بردودو قەت ئامادەنەبوە بە گوێڕایەڵی و ویستی بەر پرسان قسە بکا, هەموو کاتێ لە ژیان پشتی بە خۆی بەستودو چاوی لە دەستی کەس نەبووە .

## دوا ڕۆژەکانی ژیانی :.

مەلای گەورە لە سەرەتای ژیانیەوە توشی نەخۆشی سوتانەوەی گەدە ( قرحة المعدة ) بووە، بەلاّم ئەم نەخۆشیە لە دواین ڕۆژەکانی ژیانی زیاتر هەراسانی کرد, تا لە کۆتایی مانگی ئەیلولی ( ساڵی ١٩٤٣ ز) کاتێ لە چنارۆك بو ئەم نەخۆشیە بۆ جارێکی تر تینی بۆ هێنا, ناچار گەڕایەوە کۆیە و لە ژێر چاودێری پزیشك دانرا.

لە ڕۆژی (١٠ و ١١ ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٣ز – ١٣٦٢ ك) خوێنی گەدەی بەردەبێ, لەپێشدا دەوەستێنرێ, دوایی جارێکی تر بەگوڕتر لەجاران ئەو خوێنە بەردەبێ, هەر ئەم نەخۆشیە دەبێتە هۆی

گیان لەدەستدانی، لەڕۆژی (١٣ تشرینی دوەمی ساڵی ١٩٤٣) لە گۆڕستانی دەروێش خدر بە خاك سپێردرا.

بە بیستنی کۆچی دوایی مەلای گەورە، شاری کۆیە و کوردستان شلەژا, خەڵکی کوردستان هەستیان بە لەدەست دانی گەورە پیاو و زانای بەناوبانگیان – مەلای گەورە – کرد .

لە کۆیە و زۆربەی شارەکانی کوردستان – وەك شاری مهاباد – پرسەی بۆ دانرا, زانایان و هزرڤانانی میللەتی کورد پرسەیان لێك دەکرد, چەندەها هۆزان و پەخشان لە لایەن شاعیران و نوسەرانی کوردەوە بۆ لاواندنەوەی ئەم زاتە نوسرانەوە، مەلای گەورە لە ژیانی دوجار ژنی هێناوە، جاری یەکەم کاتێ لە تەمەنی ( ٢٥ ) ساڵیدا بوو( نەعیمەی کچی مەلا حەبیبی کوڕی کاك ئەسعەدی جەلی) هێناوە، کە ساڵی ١٩١١ ز کۆچی دوایی کردوە، بۆ جاری دووەم لە ساڵی ١٩١٣ ز ( حەبیبەی کچی شێخ ڕەزای کوڕی شێخ قادری سندۆلانی ) هێناوە، لە ژنی دووەم (٢) کوڕ و چەند کچێکی هەبوە، کوڕی یەکەمی ناسراوە بە مسعود محمد، کە لەساڵی ١٩١٩ ز لە چنارۆك لە دایك بووە،کە یەکێکە لە نوسەرە ناودارەکانی میللەتی کورد، دەیەها کتێب و دانراوی زۆر بە نرخی نوسیوەو پێشکەشی کتێبخانەی کوردی کردوە، یەکێکە بووە لە و کەسانەی بە زمانی کوردی و عەرەبی دەیاننوسی و بە بەرزترین هزرڤانی سەردەمی خۆی دەژمێردرێت، ئەویش لە ( ٢٠٠٢/٤/١ ) کۆچی دوایی کرد, دووەمیان مامۆستا فاروقە لە ساڵی

( ١٩٣٣ ز ) له كۆیه لەدایك بووە مامۆستایەكی سەركەوتوی بواری پیسپۆری خۆی بوە .

له كچەكانی مەلای گەورە :.( نەجیبەخانی ) كچیەتی، له ساڵی ( ١٩١٧ ز ) له كۆیه له دایك بووە، زۆر نوسینی جوانی هەیە، هەر ئەویش بوو كه توانیویەتی زۆربەی بەرهەمە زانستی و ئەدەبیەكانی مەلای گەورە بپارێزی، ئەویش له ساڵی (١٩٩٩ ز ) كۆچی دوایی كردوە، هەروەها له ژنی دووەمی سێ كچی تری هەبوە (ثوریا خان), (ئەدیبه خان), كه له ساڵی (١٩٧٢ ز) كۆچی كردوە (ئیقلیمەخان), له ( ساڵی ١٩٩٩ز كۆچی دوایی كردوە) .

# پێشـــــەكی

دوای سوپاس و ستایشی ئیـزەدی دانـا، زنـدووی توانـا، كـه ئینسـانی لـه زەررەیـێ دروسـت كـردووه؛ وه لـه ڕووی لطـف وكـەرەم بـۆ ڕێ نیشـانـدانی بەشەر، پێغەمبەرانی گەورە گەورەی هەناردووه...

وه پاش عەرضی درود و سەلام بـۆ دەرگـاهی خـاتمی نبـووەت زینـەت- دەهەنـــدەی منقەبـــەی رســـالەت، خاوەنـــد وەحـــی و ئیلهـــام، ســـەرداری هونەرمەندان و قسەزانانی (انام) — محمد المصطفى ـ علیه الصلاة والسـلام، ئەو نووره درەخشانه، كه ئێمەی له تاریكیی نەزانی بۆ ڕوناكی بردووه...

وه پـاش دیـاریی اخـلاص لـه دڵـی خـاوێن و ڕونـاك و، پێهـەڵگوتن و ناوبردنی چاكی به زوبانی ڕاست و پاك، بـۆ خزمـەت یـاران گزینـی احمـدی، كه ضیای ئیمانیان له ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا هەڵایساندووه...

ئەڵێین، له ڕووی (تاسف) و حەسرەتەومەندی، زۆر حەیف و زۆر مخـابن، كه تا ئیمرۆ تەفسیرێ به زوبانی كوردی بـۆ كـەلامـی خوداوەنـدی نـەكراوه؛ باوجودی (لسانی) عەرەبی ئەوەنده كتێبی تەفسیر تالیف كراوه، كه ژماردنی زەحمەتـە! ئێسـتاش مـەلایانی عـەرەب خـەریكن لەرسـائلی ئـەوروپاییان، له (مجلات) و جرائدی (یومیەی) مصریان قسان كۆئەكەنەوه... دوور و درێژ ئەیكـەن بـه تەفسیر لـه چـاپ ئـەدرێ، بـڵاو ئەبێتـەوه بـه اطراف و اكنـافی عالەم. وه به زوبانی توركی و فارسی گـەلێ تەفسـیر كـراوه، حـەتتا (حتـی) تـورك بـه تەفسـیر رازی نـەبوون بـه زوبـانی خۆیـان تەرجەمـەی قورئانیـان كرد (مع انه) تەرجەمەی قورئان به هیچ زوبان نابێ، محال اندر محاله.

گەلێ جار، بە دڵم دادەهات، کە تەفسیرێ بە زوبانی کوردی دانێم، تا خویندەوارانی کورد لە کەلامی خوای خۆیان تێبگەن و بە ڕێنیشاندانی قورئانی، ڕێ بۆ مەنزلی نەجات ببەن.. ئەمما بێ هێزی خۆم و بێ مەیلی قەومی کورد، منیان لەوکارە خێرە راگییر کرد. تا لەو ڕۆژانە دەستەیێ لە جوانان و لاوانی کورد، کە هەریەک بۆ دەستیار و یاوەریی ئەنگوستی بۆ (اشتیاق) و ئارەزووی خۆیان نواند، کە تەفسیرێ بە کوردی لە سەر یەک دانێم... زۆر پێ کەیف خۆش بووم...

لەسەر ئەو فکرە پێگەیشتووە، هەزار ئافەرینم لێ کردن، کە هەم دۆستی دین، هەم یار و وەفاداری کورد وکوردین.

منیش کە (جەلیزادە) کاک حەمەدم پێئەڵێن، دەستم پێکرد بە تەفسیری قورئانی حەکیم و ناوم لێنا: - «تەفسیری کوردی لە کەلامی خوداوەندی» -

**دانەر**

**کوی سنجق ١٣٥٢ هـ.**

# سورەتی فاتحە

ئەڵێم بە زوبانی پاک ودڵی سەلیم:

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١﴾

بزانن، کە قورئان لـە اوائلـی رسـالەت، قابـل نـەبـوو هـەمـووی بـە جـارێ بێتەخوارێ، بەڵکوو ئایەت ئایـەت، سـورەت سـورەت، بـە گـوێرەی زەمـین و زەمان ئەناردرا، تاکو لە اواخری حەیاتی (نبوی) بەئەمرو ئیشارەتی صاحبـی وەحی، بەو نظم و ترتیب و هۆندنەوەی حاضرە رێکوپێک خرا و، لە زەمانی خلافەتی (ابوبکری صدیق) بە (اصرار) و پێداگرتنی (امامی عمـر) لـە کاغـەز نووسرایەوە.

زێرا لە شەڕی (یمامە) لـەگـەڵ ـ مـسیلمەی درۆزن، گـەلـێ لـە (حفـاظ)ی قورئـان، یـەعنـی ئـەوانـەی قورئانیـان بـە تـەمـامی لـەبـەر بـوو شـەهیـد کران. (فاروقی اعظم) فەرموی ئەگەر قورئان نەنووسرێتەوە، بـێشـک ضـایـع ئەبێ.

حفاظی قورئان ئەگەر نەشکوژرێن، خۆ هەر ئەمرن، امێدیشی نەبـوو بـەو حالە ئەوانی، کە دوایی پێئەگەن قورئان بە زەریفی بە تەواوی لەبەر کەن.

حاصلی (صدیق) و سائر یارانی اقناع کرد، کە ضرورەتی حفظی قورئـان

قضا ئەخوازێ بنوسرێتەوە. نسخەکیان نووسی لەسەر ئەو هۆندنەوەی حاضری و، لەزەمانی (امامی عثمان) سەبەب بە اختلافی بعضێ (قرآیان) چەند نسخەیان گرتەوە، بۆ أقطاری اسلامیان ناردن.

وە بە اتفاق (بسم الله الرحمن الرحیم)یان لەسەری هەموو سورەتان دانا، الاّ سورەی (برائەت) نەبێ.. بۆیێ (امامی شافعی) لایوایە، کە ئەو کلمە مبارەکە لە قورئانە.

لە ڕەوشتی مشرکان وا دەرئەکەوت، کە (کتب) و رسائل و معاهدات وسائر اموری هاممەیان، بە ناوی ئالهەی خۆیان ئەکردەوە. حتی (دیان) ـ مع انه ـ اقرار بە الوهیت و نبووەت ئەکەن، لە سەر لوحەی کتبیان ناوی (اب و ابن و روح القدس) ئەنووسن.

قورئانی کریم، کە کتێبی ئەهلی توحیدە، بە ناوی خوداوەندی عالەم، کە خودایيکە واحد و ڕەحمان و ڕەحیم افتتاح کرا، تا ئەوی (موحد) بێ، سەری هەموو ئیش و کاران بە ناوی ئەو خودایە بکاتەوە، هەم لەم عەسری (مدنیت)، سفرا و عظمای هەر دەوڵەتێک لە مراسم و محافلی (دولی)، بە ناوی سەرداری خۆیان پیالە هەڵئەگرن ئەیخۆنەوە.

تاکو ئەوی ئەهلی ئیمانە لە هەر نادی و جمعیتی اساسی و سیاسی منسووبی هەر دەولەتێ، هەر فرقەیێ بێ لە ڕووی یەکی بەناوی خوداوەندی ڕەحمان و ڕەحیم، بادەی وەحدەتی بێ تفرقەی جنس و مذهب نۆش کەن.

سەرلەوحەی قورئان بەو کلمە طیبە ئارایش درا، ڕەحمان و ڕەحیم لە ڕەحمەت وەرگیراون. ڕەحمەت چی‌یە؟ (رقت)ی قەلب و دڵ تەنگی، تەنگی دڵە، ئەوی دڵنەرمبێ، دڵی بەدەردەمەند و بێچارەگان ئەسووتێ، بەزەییان پێدێن، ئەوجا بە فریادیان ئەگەن، چارەسازی و غەمخواریان ئەکەن. ئەوی دڵڕەق بێ، کەیفی بە لنگەفرتێی کوژراوان دێ؛ معلوومە ئەو (رقت) و تاثر و ئێشە بۆ خوای نی‌یە، لەبەر ئەوە لە ڕەحمەت ارادەی احسان، یا احسان مقصوودە و اثری ڕەحمەتی ئیلاهی لە عالەمدا ظاهر و نمایانە، بۆیێ پاش

بسم‌الله ئەفەرموێ:

﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾﴾ ستایش و ثنا خاصة مملوکه بۆ خـودایێ، کە پەروەردگار و تەربیەدەری هەمـوو، ئـەو عالـەمـە ئـەنواعی نایێتـە حدّ و حساب، هەر نەوعـە بـەو نـەوعـە، کـە لایقـی‌یـەتـی اصـول و قـەواعیـدی بـۆ پەروەرش و تەربیەی داناوە (سـبحان مـن أعطـی کـل شـیء خلقـه ثـم هـدی) بالخاصة لە میانەی ئەو هـەمـوو عالـەمـە، اعتنـای زۆری بـە بـەخێـو کردنـی ئینسان کردووە، هەم لـە جیهـەت خـەلـق و ایجـاد، هـەم لـە طـرف تعلـیم و تفهیم، حتی بعضـێ لە گەوران ئەفەرمـوون: خـودای تعـالی لـە (٧) حـەفـت صیفەتی خۆی، کە (حیاتە، علمە، قدرەتە، ارادەیە، سمعە، بـصرە و کلامـە) وێنەیەکی داوەتە ئینسان، فەرقی پێغەمبەرێک و شوانێکی نەکردووە.

لەو ئایەتە کریمە ئەزاندرێ، غەیری خوا هەرچی بە خەیالاّ بـێ و لـە هـەر مەقامێ تصور بکرێ، ئەویـش وەک مـن و تـۆ محتـاجی خودایـەکـین، کـەس حەقی (الوهیت و ربوبیت)ی لـە سـەر کـەس نـی‌یـە؛ بـەو نظـرە (پێـشوولە و جبریل) متساوین... وە ئەزانـێ نعمـەتـی تربیـە و تعلـیم لـە فـوقی هـەمـوو نعمـەتانـە و، احسانی عمـومی لـەسـەر احـسانی خـصوصی تـرجیح ئـەکـا. ستایشی کبریائی اولاً لەسەر چاکەی عمومی بەجێ ئەێنێ.

ذاتاً ئاشکار و نمایان بووە، ئەفرادی هـەر قـەومـێ سـعادەتـی خۆیـان لـە سعادتی عمومی دا ببینن، متحد ئەبن، حسد و بغض و کبریان لە حەق یەک نامێنێ، سەرئەکەون، سەرئەکەون بە کەمالی شکۆە و گەورەیی ئەژیـن. حقـاً ئەوە لایق مسلمانان بوو، کـە جـەنـابی نبـوی ئـەفـەرمـوێ: (المـؤمن للمـؤمن کالبنیان یشد بعضه بعضاً) و ئەفەرموێ (لا یؤمن احدکم حتی یحب لأخیه ما یحب لنفسه) بەڵکوو ئەهلی ئیمان ئەبێ (غل و غشی) لـەگـەڵ کـەس نـەبـێ، حتی بەزەیی بەکافر و بە جاهلاندا بێ، سعی بکا بۆ قوتار کردنیان.

سعدی ئەڵێ:

بنی آدم اعضای یکدیگرند
که در آفرینش زیک جوهرند
چو عضوی به درد آورد روزگار
دیگر عضو هاراً نماند قرار[١]

بۆخاتری ئەوە، کە بزانن حەزرەتی کبریا لە خوداوەندی خاوەندی صاحب مەرەحەمەتە دوبارە ئەفەرموێ:

﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ٣﴾ یەعنی خەلق و ئیجادی تربیە و ارشادی هەموو لە رووی لطف و رەحمەتە ضرورەت ومجبوری و ناعیلاجی لە بۆ وی نیەیە، چونکە لە هەموو کرداری خۆی مختارە،بە خواهشت خۆی ئەیکات و خواهشی خۆی (كَتَبَ علی نفسه الرّحمة)وە لە پێش خەلقی عالەم بە قەلەمی کەرەم نووسیویەتي (سَبَقَتْ رَحمَتي غَضَبي) حتی عەذاب دانیشی لە رەحمەت خالی نیە (وَلَكُم في القِصَاصِ حَيَاةٌ يا أُولي الألباب) اعضایێ، کە خۆرکی لێ کەوتبێ، تداوی نەکرێ، بڕینی عەینی چاکەیە.

کەسێ تەماشای ئەو ئایەتە بکا و لە (ربوبێتی) خوا تێبگا و بە چاوی اعتبار بنوڕێ، ئەو دنیایەی بە مدرسەیێ زۆر گەورەی دێتە بەر نظر و، ئەهلی دنیا وەکی قوتابیان ئەبینێ، حوادث و وقایعی زەمانە هەر ڕۆژ نەوعە دەرسێکیان پێ ئەڵێ.. ئەوجا ئەوی هۆش و گۆشی هەبێ، زۆر چاک دەرس وەرئەگرێ و بە تەواوي (تفریقاتی) ئەکا، بە بێشک لازمە ئەو (طلبە)انە امتحان بکرێن، تاکوو ناجح و اکمال و ڕاسب، لێک جودا بکرێ.. مدیر و (مرّبی) ئەو مدرسە کێیە؟ دیارە خوایە، کە ڕب العالمینە، (ممتحن) و (ممیز) خۆیەتی. کێ نمرە بەحەق ئەدا بێ مەیل و محابا، هەر خودا.

(١) — ئادەمیزادان ئەندامی یەکترن و لە دروست کردنەوە لە یەک جەوهەرن، کە ئەندامێ بەدەردێک ببێ دوچار، ئەندامەکاني تریش ئارام ناگرن. (ع.بیمار)

(فعلی هذا حتماً) ئەبێ ڕۆژێ بێ، هەرکەس دەرەجەی تعلیم و تەربیەی خۆی بزانێ، دەرەجەی دەرچوون و ڕووچوون و لەمیانە مانەوە.. هەموو بە تەواوی ئاشکار، بەبێ عالی و اعلی وعلی الأعلی (بالكلية) نەزان و ئەمانە هەموو بە تەواوەتی جدول بکرێ، خوداوەند و خاوەند ئەو ڕۆژە ﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾ ، هەر رب العالمینە تقدیری مجازات و مکافات بێ ڕوو و ڕیا و مدارات هەر ئەو ئەتوانێ، بیکات. ئەمڕۆش لە حەقیقەتدا مالک و ملک هەر ئەوە؛ ئەمما ڕۆژی جەزا زۆر چاک ئاشکار ئەبێ، کە هەر ئەوحسابە بۆ ئەوحەق و حسابە.

ئەبینن منداڵێ، کە صفر وەرگرێ، یا نمرەی کەم بێ، لەناو قوتابیان چۆن شەرمەزار ئەبێ، ئەگریێ، خۆڵ بە سەرا ئەکا، لە حەسرەت و ئەندۆە و پەشیمانی وەقتە دڵی بتەقێ.

آمان! سەد آمان! خۆتان لە ئابڕوو چوونی ئەو ڕۆژە بپارێزن، اعتماد مەکەنە سەر کەس.. سەعی بکەن.. غیرەت بنوێنن.. تا تووشی ئەو حەسرەتە بێ منفعەتە نەبن. (بالغرض) عەفویش بکرێن شەرمەزاری گونەهکاری چەند عەذابێکی گەورەیە، چەند ناخۆشە وەکو خیام ئەڵێ:

با نفس همیشه در نبردم چه کنم
وز کرده خویشتن به دردم چه کنم
گیرم کەمرا فرو گذری بە کرم
زانشرم کەدیدی کەچە کردم چەکنم

ئەی وای!! ئەوی لە مکاتبی دنیا شەهادەتنامەی بێ، استحقاق وەرگرێ ئەگەر ذەرەیێ حسی هەبێ، کە تەماشای لوحەی دڵی خۆی بکا، کلۆر و بەتاڵی ببینێ، ڕەنگە لە شەرمان بتاوێتەوە، هەر سەعی و کۆششە بەکارت بێ، میوەی سەعی دوایی ئەبینرێ.

کەسێ لەو ئایاتی (مذكورة) بە زەریفی تێبگا، ئەزانێ (موجد و مرشد و

مربی) مجازات و مکافات دەهندە خودایە، ئەوجا التفات بە کەس ناکا لە (غیب) بۆ شهود ئەچێ،بە دڵی حاضر ڕوو ئەکاتە دەرگاهي (ربّاني) و ئەڵێ:

﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ٥﴾ هەر تۆ ئەپەرستین، هەر لەتۆ یاریکاری ئەخوازین. غەیری ئەو کێ بپەرستین؟ غەیری ئەو لە کێ امداد طلب کەین؟ (لیس فی الدار غیره دیار) هەموو کەس وەک ئێمە فەقیرو محتاجە دەربارەی خودا، بە غەیري (عبودیت) هیچ وەسیلەیەکیتر نییە:

دوریـش و غنـی بنـده ایـن خـاک درنـد
بلـکو آنانـکه غنـیترنـد محتـاج ترنـد[1]

بۆیێ ڕسولی کبریا ئەفەرموێ: (انا اعرفکم باللـه واخشاکم منـه)، ئەوی زەوقیکی وجدانی هەبێ ئەزانێ ئازادی، حریتی دڵ و فکر و وجدان لە هەموو چشت خۆشتر و بەلەززەت ترە، کەسەک بە دڵ ئەبێتە ئەسیری جوانێک، ئەبینێ کوو ئەکەوێت، تووشی چ ڕەزالەت و سەفالەتێک ئەبێ و ئەو حریەتی ضمیر و وجدانە، کە لە ئیمان بە (وحدانێتی) خوا هەیە، لەززەتی ئەداتە مؤمن، کە هەر بە وجدان بزاندرێ، بەڵام ئێمە لەو لەززەتە محرومین.

ئەوی لە (صدر اسلام) ئیمانی ئەهێنا، دوێنێ خۆی بەرابەر بەردێ،بتێ، گاجوتێ، شەخصێکی وەک خۆی، بە عەبدێکی زەلیل و بێ دەسەڵات ئەزانی. ئیمڕۆ لە سایەی ئیمان بە (وحدانێتی) خودای بێ هەمتا بە نەوعێ سەرفراز بووە، گەردەنی فخر و مباهاتی بڵند کردووە، غەیری ئەو خودایە عظیم الشانە، کەس لە ژوور خۆی نابینێ؛ حقاً لەززەتێ ئەچێژێ، کە بە قەلەم و زوبان، نایێتە تحریر و تقدیر. تا (معبودت) گەورەتر بێ؛ خۆشت گەورەتر ئەبی!. تا مبعودت (سفیل)تر بێ؛ تۆش ڕەزیلتر ئەبی. ئاخ بۆ

[1] هەژار و دەوڵەمەند بەندەی ئەم خاکی دەرگایەن، بەڵکوو ئەوی دەوڵەمەندترین پێویست و هەژارترە.

میللەتێ، کە ئیدراکی حریتی نەبێ، گەردن کەچی لای سەرفرازی بێ. لەو مەقامە ئینسانی موحد و متوجەی دەرگاهی (رب الأنام) لە خودا چ ئەخوازێ؟ بە غەیری هدایەت و (رشاد)، چیتر بە نعمەت نازانێ، کە لە خودای بخوازێ؟ بۆیێ تێکڕا عەرض ئەکەن:

﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦ ﴾ (الهنا وربنا) ڕێگای ڕاستمان پێنیشان بدەی، تاکوو پێیدا بڕۆین.

﴿ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ ﴾ ڕێگای ئەوانە، کە انعام و احسانت لەگەڵ کردوون. ڕێگایەکی (وسط) و هەموار، بێ کەند و کۆسپە، بێخوارەکە و پێچەکەت، بۆدانان پێیدا ڕۆیشتن و پێگەیشتن. نامانەوێ ئەوانە بە خوا بزانین و دەست بە دامانیانەوە گرین،دەمانەوێ ئێمەیش وەکو ئەوان بە ڕێگای واندا بڕۆین چۆن پێگەیشتن، ئێمەش پێبگەین. وەکوو احسانت لەگەڵ .ئەوان کردووە لەگەڵ ئێمەشا بیکەی. الله . الله .لەو فکرە پاکە، لەم هیمەتە بڵندە! هەر بژی ئینسانی بەغیرەت. هەر بژی ئینسانی عالی و (ثابت قدم)، کە اصلاً کەماتی قبووڵ ناکا، دائماً بۆ سەرکەوتن و بڵندی تێئەکۆشێ.

بۆیێ لە خزمەت شێخ علی افندی بووم لە کرکوک، عەرضم کرد شعرێک هەیە ئەڵێن ئی حەضرەتی گەیلانییە:

(افلت شموس الأولین و شمسنا

ابداً علی افق العلی لا تغرب)

« ئاوا بوو ڕۆژی ئەوانی پێشی،بەڵام ڕۆژی ئێمە قەت لەسەر افقی بڵندی ئاوا نابێ ».

امام فاروقی سهرندی لە مەعنایدا ئەفەرموێ: «هەر قوتبێ پێش گەیلانی هاتبێ، سەربەخۆ بووە، ئەمما ئەوی لەدوای ئەو حەضرەتە هاتبێ، وەکیلی قوتبی گەیلانییە، استقلالیت بۆ وان نییە».

شێخ علی فەرمووی: من ئەوە نازانم، غەیری (نبوەت) هیچ دەرگاییێک نەبەستراوە، من و تۆ الچاغین، ئەگەر هیمەتی عالیمان هەبا سەعیمان کردبا، تۆ ئەبوویە (امامێک) وەک شافعی.. من ئەبوومە قوتبێک وەک گەیلانی.

ئافەرین. خودا لە شێخ علی ڕاضی بێ. خوداوەندا، یا ڕبی ڕێی ڕاستمان ئەوێ، ڕێی ڕاستمان ئەوێ.

﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾ ڕێگای ئەوانەی غضب لێگیراو و گومڕاە بوون، نامانەوێ ڕێگای بە کەند و کۆسپە، هەوراز و لێژ، پل و تاتەلووس، پێدا ڕۆیشتنی زەحمەتە، ئەوی پێیدا بڕوا لە ڕێگا بە ڕێگا خەریک ئەبێ، بەڵکوو هەڵ ئەدێرێ.. پارچە پارچە ئەبێ، کۆرە ڕێ لە چۆڵ و بیابان و کێو و کەژ پێدا ڕۆیشتنی بزر بوونە.

ئەم دوو ڕێگایە لە سورەتی (بقرة) و سورەتی (آل عمران) بۆتان دەرئەکەوێ و معلوم ئەبێ، ئەو ڕقلێگیراو و بزربوانە جولەکە و دیانن، بەڵام مستلزمی حصر نییە، چونکە سالکی ماڵ وێران و گومبوو لە هەموو دینێدا هەیە، حتی لە (فیرەقی) اسلامیان گەلێ، ڕێیان لێگۆڕاوە، بزربوون، غضبیان لێگیراوە، بۆیێ بعضە مەلای گەورە تەفسیری فرقەی اولیان بە ئەوانەی، کە غەرقی مادیاتن و فرقەی (ثانیان) بە ئەوانەی، کە صرف متوجهی معنویاتن کردووە، وە فرقەی هادی تەفسیری بە ئەوانەی لە مادیات و معنویات استفادە ئەکەن کردووە. لە (حدیث) ئەفەرموێ پیاو هەر ئەو پیاوە نییە، کە پیاوی دنیا بێ و پیاو هەر ئەو پیاوە نییە، کە پیاوی قیامەت بێ. بەڵکوو پیاو ئەو پیاوەیە، پیاوی دونیا و قیامت بێ، حقا تا موسڵمانان لە قوەتی مادی و معنوی بەهرەمەند بوون، بەتینی ئیمان و هێزی بازوو، تاج و تەختی هرقل و کسرایان بە تاڵان ئەهێنا.

کە ڕوویان کردە معنویات، بە (شواذ) و (خوارق) هەڵخەڵەتان، وا ژێر کەوتن، کە ئینسان ئومێدی ڕاست بوونەوەیان ناکات و، لەهەموو أطرافی

دنیا سەرو ماڵیان بە تالان چوو!..

ئەوجا کە ئەو ئایاتی ئەم سورەتەتان بەو نەوعەیە زانی و زانیتان چیە، چیتیایە.. ئەزانن کە شایانە، کە ناوی نراوە بە (ام الکتاب)، خلاصەی هەموو قورئانی تیایە. ئەتوانین بڵێین، کە هەموو قورئان، بەڵکوو ئایەتی (اکوان) تەفسیرن بۆ ئەو سورەتە و، بۆیش بوویتە (فاتحة الکتاب) خۆڕایی نییە زێدە لە سورەتان ئەمر کراوە هەموو موسڵمان لە هەموو ڕکعاتی هەموو نوێژان بیخوێنن.

خوداوەندی عالـەم، بە حورمەتی ئەو سورەتە، عالەمی ئیسلام بهێنێتەوە سەر ڕێی ڕاست.. ڕووی مەرحەمەتیان تێبکا، لەم گومراهییەی، کە تێدان نەجاتیان بدات. ﴿آمین﴾.

(آمین) ئەو کلیمە لە قورئان نییە، ئەمما خوێندنی پاش فاتحە، بەڵکوو پاش هەموو دوعا سوننەتە. مەعناشی ئەوەیە یارب دوعامان قبووڵ بکەی وقتاً، کە نیازی ئەو نیازمەندانە پەروازی کرد، بۆ دەرگاهی بێنیاز رب العالمین دوعای قبووڵ کردن،لە سورەتی (آتی) ڕێگای ڕاست و خواری نیشان دان.

❊ ❊ ❊ ❊

## سورەتی (بقرة)

پاش ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بۆ خاتری چاک گوێ ڕاگرن، فەرمووی:
﴿الٓمٓ ﴿١﴾﴾ وەک (هەلەو) لەسەر تەلەفون ئەوی بیستی، بە احضاراتێکی تەواو گوێ ڕاگرێ. هەم ڕەمزێکی تیایە، کە ئەو گفت و گۆیە (بعینە)، کەلامیکە کە لە حروفاتی فطری ئێوە مرکب ئەکرێ «الف لام میم ڕ ی ص کاف هێ یێ عین ط س ح ق ن» ئەو حروفانە لە (اکثر) زوبانی ئێوە هەیە.
مەڵێ ئەوە کەلامی خوایە چۆن کەس لەخودا ناگا، کەس لە کەلامیشی ناگا و علمای تەفسیر، گەلێ ئەسراری عجایب و غراییبیان لە تەفسیری ئەو حروفاتە فەرمووە. بەڵام ئەو تەفسیرە کورتە کوردیيە، ئەو طول و تفصیلە هەڵناگرێ.
حاصلی، ئەوانە بێمعنا و زائد نین، هەر کەس لە ئەربابی فهم و دانش، بە گوێرەی زەوقی خۆی ئەسراری لێ فهم ئەکا.
دوای ئەم اخطار و احضارە ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ الْكِتَابُ﴾ ئەو قورئانە عظیم الشانە ﴿لَا رَيْبَ ۛ فِيهِ ۛ﴾ شکی تێدا نیيە ﴿هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٢﴾﴾ نەفسی هیدایەتە بۆ ئەو کەسانەی خۆیان بپارێزن.
ئێوە.. ئەی طالبانی شاهڕاهی هیدایەت، ئەگەر ڕاست ئەکەن ڕێی ڕاستتان ئەوێ، اقتدا بەم کتێبە بکەن، ئەوی ئەمرتان پێ دەکا بیکەن، ئەوی نەهیتان لێدەکا مەیکەن. بێشک و مریە ئەگەن بە منزلی وصول،

نائلی سعادەتی دنیا و آخرەت ئەبن.

ئاگاداربن، لە بەشەر(٣) سێ فرقە هەیە: فرقەیێ بە غەیری محسوسات، ئیمان بە هیچ چشت نـاهینێ، ئەوی بە بەر چاو، یا بە بەر گوێ یـا (ذەوق) یا (شم) یا (لمس) نەکەوێ، ئیدراکی هیچیتر ناکا، ئەوانە نە ئـەلوهیتیـان لا هەیە، نە (نبوّت).

فرقەی دووەم، اعتمادیان لەسەر عەقڵە، ئەڵێن عەقڵ هادییێ وایە بەشەر استغنا ئەکا لە نبووەت، ئەوانە الوهەتیان لا هەیە، انکاری نبوّەت ئەکەن.

فرقەی سێیەم، اعتبار ئەکا بە عەقڵیش و بە نبووەتیش، ئەفەرموون: نە نبوەت استغنا لە عەقڵ ئەکا، نە عەقڵ استغنا ئەکا لە نبووەت. لە امتزاجی عەقڵ و نبووەت بە ڕێگایی ڕاست دا ئەڕوا.

ئەو کتابە عەزیزە بۆ ئەو فرقـە هـادییـە، ئـەوانـە زۆر بـاش اسـتفادە لـە قورئان ئەکەن؛ ئەوفرقەش دوو طائفەن.. یەکێکیان:

﴿ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ﴾ ئەو(متقـی)یانـەن، کـە ئیمانیـان بـە شـتی بـزر هـەیـە، ئەزانن لە فوقی مدرکاتی حسی؛ مدرکاتی عقڵیە هەیە.

﴿وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ نوێژ بەجێ ئەهینن. خۆیان مقابل خودا، کە غیبی حقیقییە ـ اصلاً بە حواس دەرک ناکرێ ـ بە خاضع و خاشع ئەنوێنن.

لە جهەت ڕحم و دڵنەرمی بە ئەبنای جنـسی خۆیـان، قـەدەرێ لـە مـاڵی خۆیان تەعین ئەکەن، ئەیدەنە محتاج و بێ دەسەڵاتان.

﴿وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ٣﴾ زێتـریش لـە مقـداری معـین لـەو ڕزقـەی، کـە خـودا ئـەفـەرمـوێ پێمـان داون، صـرفـی مـستحقینان ئـەکـەن، وە نـایگـەیێننـە دەرەجەی ئیسراف و تبذیر.

طائفەی دووەم ئەو(متقی)یانەن کە بالفعل ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ﴾ بڕوایی ئەکەن بەو کتیبەی، کە لە تەرف خوداوە انزال کراوە بۆ لای تۆ، حقیقةً هەر کەسێ ئیمان بە قورئان بینێ، ئیمان بە هەموو کتبی سماوی، وەک تـەورات

و انجیل و زبور ئەهێنێ، (لکن) لە بۆ خۆپارازتن لە کتبی (محرّفە) یەعنی تغییر دراو، راساً ئیمان ئەهێنن ﴿وَمَآ﴾ بە ئەو کتبەی، کە ﴿أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ﴾ هەناردراوە لەپێش ئەتۆ. وە هەم ئیشارەییکیشی تێدا هەیە، کە مقصود ئیمان بە (ما انزله)یە، تاکو ڕێی تعصب ببڕێ لە حەق ئەو کەسەی، کە کتێبی بۆهاتووە.

﴿وَبِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ٤﴾ و بە ڕۆژی واپسێن، ئەوان باوەڕڕێکی مەحکەمیان هەیە، شک و شوبهەیان لە ڕۆژی جەزا نییە، معلوومە ئیمان بە قیامەت لە (ثمرە)ی ئیمان بە نبووتە، لە پێغەمبەرانەوە نەبێ بە ڕاستی نازاندرێ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ﴾ طائفەی اوّل ﴿عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ﴾ ئەوا لەسەر هیدایەتن، حازر و ئامادەن.. ئەوەندە.. مرشدێکیان ئەوێ بە خەبەریان بینێ، دەرحاڵ ئیمان ئەینن بە (مکمّلی و مفصّلی) ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ﴾ وە طائفەی دووەم ﴿هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٥﴾ بالفعل نائلی (فوز و فلاح و نجات) بوون.

حاصڵی قورئانی کریم هیدایەتە بۆ ئەو فرقەی، کە ئیمانیان بە عەقڵ و نبووەت هەبێ بە کبر وحبی جاهو ماڵ ، پابەند نەبن و نبووەت نەکەنە قەومییەت.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ کە هەر دوو فرقەی پێشوو لە انکاری ئەصڵی نبووەت موافقن ﴿سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ﴾ یەکسانە لەسەر ئەوان ﴿ءَأَنذَرۡتَهُمۡ﴾ ئایا بیانترسێنی ﴿أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ﴾ یا نەیان ترسێنی ﴿لَا يُؤۡمِنُونَ ٦﴾ ئیمان ناهێنن، نایێنە سەر هیدایەت، استفادە لە قورئان ناکەن.

﴿خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ﴾ خودامۆری لەسەر دڵی ئەوان داناوە، ئیمان ناچێتە ناو دڵیان، نفوذی تێ ناکا ﴿وَعَلَىٰ سَمۡعِهِمۡۖ﴾ لە سەر گوێی ئەوان ﴿وَعَلَىٰٓ أَبۡصَٰرِهِمۡ﴾ و لە سەرچاوی ئەوان ﴿غِشَٰوَةٞۖ﴾ پەردەیێ هەیە، ئەمما چ پەردە؟

پەردەیێ وا ئەستوور، کە مەنعی بیستن و دیتنی لێکردووە.

ئەوانی اعتمادیان لەسەر حسە ئەیانزانی، کە ئینسان لە حیوانات امتیازی بە قووەی عەقڵە، ئینسان بە چی حقائق و ماهیّاتی ئەو محسوساتانە ئەزانێ؟ بە چی اصول و قواعد و قوانین دادەنێ؟ ضبطی احکامی جزئیات ئەکا، حرکاتی علویات و سفلیات دەهێنێتە ژێر حساب. هەر حسێ لە ئینساندا هەبێ؛ لە (کەر)یشدا هەیە، بەڵکوو بعضە حواس لە بعضی حیوانات قووەتی زیاترە لە حسی ئینسان، وە ئەوەی اعتماد ئەداتە سەر عەقڵ، ئەگەر عەقڵی تەواوی هەبا، ئەیزانی دەرەجاتی عەقڵی بشری زۆر متفاوتە.

سەران، سەروەران، گوردان و گەردەن کەشان، شاهان و سوپاهسالاران بۆ عەقڵی کێ گەردەن دادەیی اطاعەت و متابعت ئەبن؟ ئەوی مغروری قووەتی بازوو بێ، بە عەگالی عەقڵ چۆن ئەبەسترێ؟ دیارە ئەو فرقەیە ئاگایان لە احوالآتی نفسیّەی اقوامی مختلفەی بەشەر نییە..

دەخیل، وا تێ نەگەن کە دڵی (ادنی) قابلیتی هەبێ، پەروەردگاری عالەم ئەو دڵە مۆرئەکا، نایێڵی ئیمانی بچێتێ. ئەو هەموو (قوا) و مدارکی داوەتە ئینسان.. ئەو هەموو ئاياتی ظاهرەی لە (کون و مکان) بۆ داناوە.. ئەو هەموو، پێغەمبەرانی عظامی بۆ ارشاد و دلالەت و هیدایەتی هەناردووە، لە رووی بێ مبالاتی، دڵی رەق بکا نەهێڵێ ئیمان بچێتە ناوی، چۆن ئەبێ هەیهات.. هەیهات.. ئەوە دوورە لە خوداوەندی رەحمان و رەحیم، هادیی صراط المستقیم. نە جەبر لە کەس ئەکا بۆ ئیمان، نە تۆبزی لە کەس ئەکا بۆ کفر؛ بەڵکوو بە تەواوی رێگای هیدایەت و ضلالەت بۆ بەشەر بەیان ئەفەرمووێ و، ئینسان (مخیّر) ئەکا وەک لەمەولا بۆتان معلوم ئەبێ.

﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٧﴾﴾ بۆ ئەو گرۆهە بێعەقڵە و حواسە، عەذابی گەورە هەیە (سواء) حسێ بکەن، یا نەکەن.

ئەبینن کە (اطبا) ناساغێ بەنج ئەکەن؛ بێهۆش ئەبن، ئەعضایان پارچە

پارچە ئەکەن، ئاگایان لەو عەذابە گەورەیە نىیە. حالّی ئەو گرۆهە لە دانشمەندان بە چاوو گوێ بزر نابێ، بەسەهلی ئەتوانن خۆیانی لێ بپارێزن، بۆیێ ئەوەندە لە بەیانی حالّیان اکتفا کرا.. فرقەیەکیتر هەیە لە (بشر) منافق، سیاسی، حیّال، مکار، غدّار، بێوەفا و عەهد شکەن؛ خۆپارازتن لەو گرۆهە خەیلی مشکلە، بۆیێ جنابی باری بە تفصیلاتی تەواو بەیانی حالّی ئەو فرقە ئەفەرمووێ، تا موسلّمانان لە حیلەی ئەوان ئاگادار بن، پێیان هەڵنەخەڵەتێن.

﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ﴾ خۆیان لە (ملیـّــون) حساب ئەکەن، ئەڵێن، ئیمانمان هەیە بە خوداو ڕۆژی واپسێن.

﴿وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ ۝٨﴾ درۆ ئەکەن دڵ و زوبانیان یەک نىیە. ﴿يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ﴾ فێڵ لە خودا ئەکەن، وەک لە ئاخر(جزوء) بە دەر دەکەوێ.

﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ فێڵ لە وانەی ئیمانداری بەڕاستینە ئەکەن. ئەمما ئەوە حماقەتە، فێڵ لە خودا ناکرێ. ئیمانداریش بە عەونی باری ئاگاداری خۆی ئەکا، فێڵی لێناکرێ. کەوابێ ﴿وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ﴾ فێڵ ناکەن الاّ لەگەڵ خۆیان نەبێ ﴿وَمَا يَشْعُرُونَ ۝٩﴾ ئاگادار نین، کە فێڵ لە خۆیان ئەکەن.

﴿فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ لە دڵی ئەواندا هەیە دەردێ، ئەمما چ دەردێ. کە ڕۆحیان لەبەر دەردێ. شفای ئەو مرضە ئیمانە، ئەمما ئیمان ناهێنن. بۆیێ. ﴿فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا﴾ دەرد لەسەر دەردی لێ زیادکردن، ئابڕووی بردن، بە داوی تزویری خۆیانی گرفتار کردن. گەلێ ئەبێ ئینسانێ ئەوەند خەریکی دوژمنی خۆی ئەبێ، لە خۆی غافڵ ئەبێ، کە ئاگاداری خۆی پێناکرێ، لەلایی ترەوە تێئەکەوێ ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌۢ﴾ بۆ ئەوان هەیە عەذابی بە ئێش.

دەرکی ئەکەن اربابی سیاسەت (لاشک)، کە داوی تزویری لێ‌پسا؛ فێڵیان ئاشکار بوو.. زۆر (متالم) ئەبن، حتی گەلێکیان لە تاثرا انتحار ئەکەن، ئەو ئەلەم و عەذابە ﴿بِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴿١٠﴾﴾ بە سبب (تحیّر) و ترددیان، یا بە سبب درۆیان، درۆیان کە سپی دەبێتەوە و بۆیان ناچێتە سەر. لاشک ئەو فرقە سیاسی‌یە درۆزنانە ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ بەسی‌یە! ڕەحمێ بە عبادی خودا بکەن.. چی‌دی ئاگری فیتنە هەڵ مەگیرسێنن، طمع لە مولک و ماڵی خەلقی مەکەن.

حتاکەی ئەو حقد و حسد و بغض و عداوەتە؟ ئەگەر وایان پێ بگوترێ ﴿قَالُوٓا۟﴾ لە جوابدا ﴿إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ﴿١١﴾﴾ ئێمەنین الاّ مصلحین.. فکری فەسادمان نی‌یە. بێ دەسەڵاتان لە دەستی (ظالم)ی بەدەسەڵات قوتار ئەکەین.

وەکو (ائمە)ی فساد لە حەربی عمومی ئەیانگوت و، گەلێ موسڵمانیش بە ناشوکری نەبێ پێیان هەڵخەڵەتان و، ڕۆسای دینیش ئەڵێن ئێمە ارشادی گومڕاهان ئەکەین، لە خودایان نزیک ئەکەینەوە، لە قیامەت ئەبین بە تکاکاریان و گەلێ خەلقیش پێیان بڕوا ئەکەن؛ عاقبەت گومراە ئەبن.

﴿ أَلَآ ﴾ ئاگادارین ئەی عبادی خودای ﴿إِنَّهُمْ﴾ بە حەقفەت ئەوان ﴿هُمُ ٱلْمُفْسِدُونَ﴾ هەر ئەوان مفسدن، تێک دەری دین و دنیان. ئەو نەوعە مفسدانە لە هەموو زەمانێدا هەن. خاصةً لەم زەمانە، کە اکثری ناس بوینە سیاسی، دۆستی خێر خواهی ڕاستی نەماوە. ﴿وَلَـٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ ﴿١٢﴾﴾ نازانن سیاسەتەکەیان ئاشکارە، هەموو کەس ئەیزانێ، ئەوی ادنی شعورێکی هەبێ لە فیریلداقیان ئەگا.

کەسێ پێیان هەڵخەڵەتێ، یا لە بێ شعوری‌یە، یا ئەویش هەواو هەوەسێکی هەیە بۆ (نیلی) دوایان ئەکەوێ، بەڵام پێشی ناگا.

﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ﴾ ئـەگـەر بـەوان ببێـژرێ ﴿ءَامِنُواْ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ﴾ ئيمـان بێنن وەكو ئـەو خـەلقـە ئيمانيـان هێنـاوە، دڵ و زوبانتـان يـەك بـێ، وەكـو ئەوان.

﴿قَالُوٓاْ أَنُؤْمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ﴾ ئايا ئێمە ئيمـان ئـەهێنـين، وەكـو ئـەو كـەم خيرەدانە، مصلەحەت نەزانانـە ئيمانيـان هێنـاوە، ئـەمـە قـەت نـابێ، ذاتـەن ئەمڕۆش سەرآمەدانـی سياسـەت و كياسـەت لايـان وەيـە، ئـەوی ئيمـانی بـە خوداو پێغەمبەر و قيامەت هەبێ گێژە،گەوجە، (كانە) عەقڵ و دين دوژمنـی يەكدين.

چەندێ لەمەو پێش، يەكێ لە ائمەی سياسەتی فەرەنگ لە سـەرەمـەرگدا وتی: «مـن بـاوەڕريـم بـە خـودای بـێ هێـزان نـیـيـە!» وەختـە بلـێم ئـەوان معذورن، ئەو دينی ئەوان زاناندوويانە سەراپا خەرافاتە.. لە عەقڵ و شعور و ادراک دوورە، ئەوی تۆزێكی عەقڵ هەبێ قبوولی ناكـا! ئـەممـا ئـەوەنـدەيـان قصورە بێ تەحقيق و تدقيق دينی ئيسلاميـشيان لـەو نـەوعـە دينـە حـساب كردووە، (مع انهُ) دينی فطریيە لە گەڵ عەقڵ و علم جوملانەيە.

(معاذ الله)، ئەگەر كەسێ بە ائمەی ارشادی ئەم عەصرە بڵێ، بەسـیـيـە ئەو فەسادە حيلەكاریيە.. ئێوەش وەكو عبادی خودا ئيمـانی ڕاسـت ببيـنن قيامەتی لێهەڵەستێ.

﴿أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ﴾ ئاگاداربن بە حەقيقـەت هـەر ئـەوان گێـژ و وێـژن، دينی ڕاست، ڕاستی ئەوێ لەگەڵ عەقڵ يەكە، ڕوحە بۆ هەيئـەتـی اجتمـاعی فتنە ئەنگێزی ڕاحەتی حەياتی اجتماعی تێک ئـەدا، سياسـەت و حيلـەكـاری شەرەف و فضائلی بشری مەحو ئەكاتەوە..

(دجاجلەی)[1] دين خۆيان لە مصالحی دين بـێخـەبـەرن، چـۆن ارشـادی

---

(١) كۆمە لی (دجال).

خەلق ئەکەن بۆ چاکە. « خفته را خفته کی کند بیدار »(٢)

﴿وَلَٰكِن لَّا يَعۡلَمُونَ ١٣﴾ سبب بە کبرو انانیت و طمع نازانن، کە ئەوی ئەوان ئەیکەن کاری خیرەد و ئیمان نییە، وجدانی بشری (ابا) لەو نەوعە خست و دەنائەتە ئەکا. ئەمما ئەوی بێوجدان بێ، ئینسان چی لە حەق بڵێ زیادە فائیدەی نادا، باوجوودی موسڵمانەکانیان بە (سفیه) و گەوج ئەزانێ کەچی:

﴿وَإِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ وەختێ، کە تووشی ئیمانداران ئەبوون ﴿قَالُوٓاْ﴾ بە زوبان ئەیانگوت ﴿ءَامَنَّا﴾ ئیمانمان هێناوە وەک ئێوە ﴿وَإِذَا خَلَوۡاْ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمۡ﴾ وەقتێ، کە طلبی خلوەتیان کردبایە لە گەورە گەورەی خۆیان، (ائمەی) شقاق و فساد، پاش ئیذن لە خەلوەت ﴿قَالُوٓاْ﴾ ئەڵێن لە جوابیان، بۆچ ملاقات لەگەڵ موسڵمانان ئەکەن ﴿إِنَّا مَعَكُمۡ﴾ ئێمە لەگەڵ ئێوەین. جوداییمان نییە ﴿إِنَّمَا نَحۡنُ مُسۡتَهۡزِءُونَ ١٤﴾ ئێمە گەمە ئەکەین بە موسڵمانان. یاخود ئەوە اظهار ناکەن، کە نەزاندرێ گەمە بەکێ ئەکەن، بە (ائمەي) خۆیان ئەکەن، یا بە موسڵمانەکان؟ (حقیقةً) ئەمە لە منافقیی ئەوان ئەوەشێتەوە، حقیقة ئەوانی سیاسین لەگەڵ یەکیش ڕاست نین، ئەوانەن کە لە حەقیان ببیژێ «با ما کج و با خود کج و با خلق خدا کج»[١] بالخاصة ئەو سیاسیانە، کە منسوبی دوەلی مختلفە بن، با یەک دینیش بن لە مەیدانی سیاسەت، لە پەنای دۆستی افلاک وا دەدەنە سەر یەک، کە تەوقی سەریان بە ئەرزی ئەکەوێ، ئەوجا پێ ئەزانن.

﴿ٱللَّهُ يَسۡتَهۡزِئُ بِهِمۡ وَيَمُدُّهُمۡ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ﴾ مهلەتیان ئەدا لە طغیان و تەجاوز لە

---

(٢) واتا خەوتووکەی، خەوتوو لە خەو هۆشیار ئەکاتەوە. (ع . بیمار)

١- لەگەڵ ئێمە و لەگەڵ خۆی و لەگەڵ خەلقی خوا خوار و ناڕاستە. (ع . بیمار)

حدّی خۆیان، ئەوانیش سبب بە اهمال و امهالی خودا ﴿يَعۡمَهُونَ ١٥﴾ دڵ کوێر ئەبن.

﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ﴾ ئەوانە ئەوانەن، کە ﴿ٱشۡتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلۡهُدَىٰ﴾ گومڕاهیان بە هدایەت، بەصیرەت بەدڵکوێری کڕی. ﴿فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمۡ﴾ تجارەتەکەیان بێ قازانج بوو، بەڵکوو مایەشیان نەما ﴿وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ١٦﴾ ڕێیان بۆ حەق نەبرد، خائب و خاسر بوون.

دوای ئەو ایضاحات و تەفصیلاتی حاڵی منافقان، تا، تزویری ئەو منافقانە لە پێش چاو موسڵمانان تمثل بکا.. جەنابی حەق تمثیلیان ئەکا بە دوو(وجه) و، لە گوێرەی قووەی حیلە و دەسائسیان دەرئەکەوێ، ئەو منافقانە دوو مەرتەبەن، فرقەی اولیـّـان ﴿مَثَلُهُمۡ﴾ لە ئاتەشبازی فتنە ﴿كَمَثَلِ ٱلَّذِي ٱسۡتَوۡقَدَ نَارٗا﴾ وێنەی حاڵی ئەو کەسەیە، کە ئاگرێ هەڵ بئایسێنێ ﴿فَلَمَّآ أَضَآءَتۡ مَا حَوۡلَهُۥ﴾ کە ئاگرەکە ئەطرافی ئەوێی ڕوناک کرد، ئەمەلیان بوو، کە ئاگرەکە دەوام بکا، نفعی لێ ببینن. ﴿ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمۡ﴾ خووا نووری ئەوانی برد بە نەوعێک، کە جاری تر نەبێتەوە (عودی) نەبێتەوە، هەڵنەکرێتەوە.

﴿وَتَرَكَهُمۡ﴾ خدا ئەوانی فڕێدا، بە جێی هێشتن ﴿فِي ظُلُمَٰتٖ﴾ لە تاریکی یان ﴿لَّا يُبۡصِرُونَ ١٧﴾ هیچ نابینن، یا بینایی‌یان نەماوە، ئەوانە ﴿صُمُّۢ﴾ کەڕن ﴿بُكۡمٌ﴾ لاڵن ﴿عُمۡيٞ﴾ کوێرن ﴿فَهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ١٨﴾ ناگەڕێنەوە.

دیارە ئەو قەومە، کەوا تمثیل کراون لە فتنەوفساد، لە نفاق و حیلەکاری زۆر بە قووەت نین.

تاریکی ئەگەر زۆر نەبێ، مەنعی دیتن ناکا، بۆیێ ئەفەرمووێ ـ ظلمات ـــ تاریکی دەورا دەوری گرتوونە بە نەوعێک، نە لە دوور، نە لە نزیک ڕوناکی نابینن. نەوەک هەر لێرە، لە هەموو قورئان بە مناسەبەی مقام، تاریکی بە (جمع) و نور بە (مفرد) ذکر ئەفەرمووێ، تاکوو ئەوی تۆزێک نووری هەبێ بزانێ، کە ئەهلی ئیمان ئەبێ یەک نوور بن و، ئەهلی فسادە بە انواعی تاریکی بە متفرقی ئەمێنن. بۆ ئەوانەی، کە لە نفاق و سیاسەت (عریق) و عمیقن، مەثەلی گەلێ گەورەتر ذکر ئەکا و ئەفەرموێ: ﴿ أَوْ كَصَيِّبٍ ﴾ وێنەی ئەوان حاڵ و حکایەتی جەماعەتێکە، ڕێژنەی بارانیان بە سەردا بێ ﴿مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ﴾ لە سەرەوە ﴿فِيهِ﴾ تێیدابێ ﴿ظُلُمَٰتٌ وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ ﴾ تاریکی بە شددەت و زۆر گرمەگرمی هەور، بروسکە و تریشقەیشی تێدابێ. بە (قرینەی آتی) ئەوان لەو هەنگامە بەدەهشەتە ﴿يَجْعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمْ فِىٓ ءَاذَانِهِم ﴾ ئەنگوستی خۆیان دەخەنە ناو گوێی خۆیان ﴿مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ﴾ لە ترسی تریشقە تریشقەی بە قووەت، کە پیستی مێشک بدڕێنێ، ئەوی گوێی لێ بێ بمرێ.

﴿ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ ﴾ لەبەر خۆپاراستن لە مردن، بەو نەوعە گوێی خۆیان ئەگرن، ئەمما ئەو (حذرە) کەلکیان ناگرێ.

﴿وَٱللَّهُ مُحِيطٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩﴾ ﴾ خودای تعالی دەوری ئەو کافرانەی داوە، بە چ لایەکا قورتار نابن. ئەسبابی مردن زۆرە ﴿ يَكَادُ ٱلْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَٰرَهُمْ ﴾ نزیکە بروسکە بینایان برفێنێ. ﴿كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم ﴾ هەر وەختێ بروسکە ڕوناکی‌یان بۆ بدا ﴿مَّشَوْا۟ فِيهِ ﴾ لە ڕوناکی‌یەکەدا ئەڕۆن.

﴿وَإِذَآ أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ ﴾ و کە تاریکی بە سەرداهێنان، حقیقةً ئینسان لە تاریکی، کە چاوی بە بروسکە بکەوێ، پاش کوژانەوەی بروسکە، دنیای لەبەر چاو گەلێ تاریک تر ئەبێ. ﴿قَامُوا۟ ﴾ ڕائەوەستن، پەلەکوتە ناکەن،

ئەتوانن محافظەی خۆیان بكەن، هەم لە تریشقە، هەم لە بروسكە، هەم لە تاریكی، بە هەموو نەوعێ ئەتوانن محافظەی خۆیان بكەن.

﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ﴾ ئەگەر خودا حفظی كردبا، ﴿لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَٰرِهِمْ﴾ بە تاكید بە جارێ گوێ و چاوی ئەبردن.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٠﴾﴾ بە تەحقیق خودا لەسەر هەموو چشتێ توانایە، ئەمما چشتێ، كە دروست بێ نسبەتی بە (الە) بدرێ، خودا ئەیتوانی ئەوانەیش وەک قەومی پێشوو كەرر و كوێر بكا ئەمما ئەو قەومە لە سیاسەتی خۆیان ئەوەندە (كتوم)ن، ئەڵێی هەر لە ئەصلدا زوبانیان نی‌یە. ئەمما ئەوانی پێشوو ئەوەندە بە (متانت) نین، وائەبێ بە زوبانی خۆیان پەردەی سیاسەتی خۆیان بدرن. بۆیێ لە ئەوێ (بكم)یشی علاوە فەرموو. لە هەموو زەمانێک ئەو نەوعە دوژمنی دینی ئیسلامە زۆرن. ئەمرۆش بعضێ بە سیاسەتێكی ضعیف خەریكن.. لە (اول)ەوە استفادە ئەكەن، دوایی غرور سیاسەتیان لێتێک ئەدا، ئاگریان ئەكوژێتەوە، وایان بە سەردێ ناتوانن بگەڕێنەوە بۆ مەقامی پێشووی خۆیان و، بعضێكیش هەنە خوێنسارد و (متانی)، بە كاوەخۆ، دووربین، هەرچەندەكوو جوی سیاسەتی لەسەر تاریک بە بێڕێژنە و ڕەعد و بروسكە و تریشقەی فتنەی بە سەردابێ، صبر و ثبات ئەكا اضطرار و پەلەپەلێ ناكا، هەر وەقتێ ڕوناكی‌یەكی شک برد بۆلای مقصدی خۆی شەقاو ئەهاوێ، كە تاریكی تراكمی بە سەردا كردرا ئەوەستێ، خۆی بەم لاوو بەو لادا نادا.. اخری لەم هەموو فتنە و مصائبە، كە نزیكە مێشكیان بپرژێنێ بێ فكر و هۆشیان بكا، چاویان بە با چشت لێک بكەنەوە، بەڵام بە كەمالی صبر و تانی ئاگاداری خۆیان ئەكەن، نە لە خۆیان غافل ئەبن، نە لە دوژمن. ئەگەر بە مقصدیش نەگەن، ئەتوانن بگەڕێنەوە مەقامی بڵندی خۆیان، مكانەتیان ئەمینێ، ئەوی تۆزێک تێگەیشتنی هەبێ، ئەزانێ ئەو دوو فرقە لەو عەصرەدا كێن؟ وە

موسڵمانانیش زۆر احتیاجیان هەیە بە ڕجالی سیاسەت لکن مع الاسف لە هەموو عصردا (سیاسیون)یان کەمن.

لە تفصیلاتی ڕابردوو دوو سؤال دێتە خاطر، اولیان:ـ مادامەکو هیدایەت و ضلال لە طرف خوایە و، خواش لەسەر هەموو چشت اقتداری هەیە، بەس ئەو خەلقە چ دەسەڵاتی هەیە؟ بۆچی مذمومە، معاتبە؟ (کانە) لە جوابدا ئەفەرمووێ بە خطابی عام بێ امتیاز و تفریق ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ﴾ ئەی ئینسانینە، عەبدایەتی، یا عبادەتی خوای خۆتان بکەن، ئەو خوایەی کە ئێوەی خەلق کردووە، بە خەلقی مساوی لە هەموو اعضا و قووەتی مدرکە و عاملە شەریکن. حتی ئینسانی شێتیش بێ، ئەوەندە هۆشەی هەیە، کە بزانێ ئینسان لە گاجوت و بت زیاترە.

﴿وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ﴾ هەم ئەوانی پێشی ئێوەی خەلق کردووە، وەک ئێوە عیسی و موسی، افلاطون و ارسطو (عیناً) لەخەلقی ئێوەدان.. بە غەیری (سبقی) زمانی هیچ سبقێکی ذاتییان نییە.

﴿لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ٢١﴾ ئەو ئەمرە فائدەی بۆ ئێمە نییە بۆ خۆتانە، بۆ خاتری ئەوە ئێوە خۆتان بپارێزن لە (خسەت) و ڕەزالەتی عبودیەت، عبادەت بۆ امثالی خۆتان ئەمرمان کردونێ، کە خوداوەندی انام بپەرستن، کە لە هەموو جهەت (فوق الکل)ە ﴿ ٱلَّذِي﴾ خوایێ ئەوتۆ ﴿ جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فِرَٰشٗا﴾ ئەرزی گێرراوە بۆ ئێوە بە ڕایەخ ﴿وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءٗ﴾ ئاسمانی گێرراوە بە بان خانوو، چادر و قوببە و بارەگاهی (مزین و منقش) بڵندی ئاسمان لە سەر ئێوە، وەک بڵندی چادر و بان خانووە هیچ بڵندییتری نییە.

﴿ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ﴾ ئاوی لە ئاسمان هەناردووەتە سەر ئەرزی ﴿فَأَخۡرَجَ بِهِۦ﴾ بەو بارانە هێناویەتییە دەرێ لە ئەرزی ﴿مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزۡقٗا لَّكُمۡۖ﴾ لە

بەری گیا و دار، ڕزقی بۆ ئێوە، قووتی بۆ ئێوە هێناوەتە دەرێ کەوابێ:
﴿فَلَا تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادٗا﴾ بۆ خوا لە ئەرز و ئاسمان هیچ شریک ــ موافق یا مخالف ــ پەیدا مەکەن، هەرچی بیکەن بە شریک مخالفە لەگەڵ حەقیقەتی الوهیت مناسەبەی نییە حاڵیش وایە.

﴿وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٢٢﴾ ئێوە صاحب علم و ادراک و هۆشن، ئەوی صاحبی هۆش بێ، چۆن ممکنێکی وەک خۆی ئەکاتە شتی وەک خوا؟

یا خود ئێوە ئەزانن بێ شوبهە و شک، کە خوا شریکی نییە، غایەتی خۆتان بێ هۆش و ادراک ئەکەن! دیارە ئەگەر هەموو بەشەر سجدە بۆ گاجووت ببا، بڵێ ئەوە خوایە، نابێ بە خوا. بەخوا هەر گاجووتە. الوهییەت بە (جعل) نابێ. کەوابێ ئێمە لە هیچ خصوصەوە، نە لە خەلق و ئیجاد، نە لە ارشاد و تعلیم، نە لە اظهاری آیات فەرقی کەسمان نەکردووە.

سؤالی دووەم، کە لە پێشدا فەرمووی (ذلك الكتاب لا ريب فيه) ئەگەر کەسێ خەیاڵ بکا ئەو قسە بێئەصڵە، لاف و گەزافە، مبالغەی شاعرانەیە.. ئەم کتێبە لەو دەرجەدا نییە کە کافلی هیدایەت بێ، لە جوابدا ئەفەرمووێ ﴿وَإِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّمَّا نَزَّلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا﴾ ئەگەر ئێوە لە شکو گومان دان لەو کتێبەی، کە ناردوومانەتە سەر عەبدی خۆمان، کە هەمووتان ئەزانن کێیە، چییە، چونە؟

﴿فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّن مِّثۡلِهِۦ﴾ بینن سورەتێکی لە وێنەی قورئان، یا لە مثلی محمد (صلى الله عليه وسلم) ﴿وَٱدۡعُواْ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ بانگی (ائمە) و ناصر و اصحابی حل و عقدی خۆتان بکەن، غەیری خودا.

خوا (حقیقةً) مطلعە لە سەر هەموو چشت، ئەمما ئێوە لەو تەجاوزتان کردووە، بە صاحبی خۆتانی نازانن. ئەوجا بە هەمووتان تێفکرن قووەت بدەنە یەک، بزانن عجبا پێتان دێ.

﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٣﴾﴾ ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن بە چاوی علم شک و گومانی تێدا ئەبینن. ﴿فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا﴾ ئەگەر نەتان کرد، عاجز بوون لەو (اتیانه) ﴿وَلَن تَفْعَلُوا﴾ نایکەن، پێتان ناکرێ، محالە نابێ ابداً ﴿فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾ کەوابێ ئیمان بێنن عناد مەکەن، خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی، کە سووتەنی ئەوی ئینسانە، بەردە، ئەمما چ ئینسان؟! ئەو ئینسانانەی، کە لەمەودووا دەرئەکەوێ دڵیان ڕەقە وەک بەرد، لە بەردیش ڕەق ترن و ئەو دڵ ڕەقانە گەلێکیان لە بەرد کەمترن، کە عبادەتی بەرد ئەکەن ئەو ئاگرەیەش ﴿أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ ﴿٢٤﴾﴾ اساساً بۆ کافران داندراوە. ئەو کافرانەی، کە خۆیان ڕووت کردووە لە مزایای ئینسانیی، خۆیان ڕەزیل ئەکەن بەکەمترین موجودات خۆیان کەمتر ئەکەن. حقاً ئەو نەوعە ئینسانە بۆ سوتاندن نەبێ، کە لُکی چی تر ناگرن.

ئێوە کە ئیمان نەهێنن، تمسک بە قورئان نەکەن، دیارە لە عنادە، لە حسدە، لە عداوەتە.

لەو ئایاتە بەدەر ئەکەوێ و لە ڕەوش و تێفکرین ئەزاندرێ: خوا یەکە، بێ مثلە. قورئانیش لە ناو کتێبی هیدایەتدا بێ نظیرە. ئەو عبدەیەش لە گروهی مصلحاندا بێ هەمتایە. چونکی ئەو ئایەتە تخویف و انذاری تیا هەیە بۆ کافران، (کانە) جەنابی حەق ئەفەرموێ انذاری کافران بکە ﴿وَبَشِّرِ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ موژدە بدە ئەوانەی، کە ئیمانیان هێناوە بەکێ؟دیارە بە خوا، بە کتێبی هادی، بە ئەو کەسەی، کە کتێبەکەی بۆ هاتووە و اعمالی چاکەیان کردووە.. ئەوی بخونجێ بە گوێرەی حال ڕێککەوێ کردوویانە و ئەیکەن.. بە ئیمان لێ ناگەڕێن. ذاتەن عملی چاکە ثمرەی ئیمانە. موژدەیان بدەیێ بە:

﴿أَنَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾ باغاتی بەهەشتێ، کە لە ژێر دار و

باری جۆ و جۆباری ئەڕوا، وەکی ڕوباران. بەهەشتێ وابێ بێشک سەبز و خوررەمە میوەجاتی زۆرە.

﴿كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقًا﴾ هەر وەقتێ لە ئەمەرەی ئەو باغاتە ئەوعە ڕزقێکیان پێبدرێ ﴿قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِي رُزِقْنَا مِن قَبْلُ﴾ ئەوە ئەو ڕزقەیە، ئەو ئەمەرە و میوەیە، کە لە دنیا پێمان درابوو.

﴿وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا﴾ یەعنی ئەو ڕزقەی، کە پێیان کەرەم کرابوو، خۆ بە خۆیی بە یەکتر ئەچوون. یا خود لەگەڵ ڕزقی دنیایی پێکتر ئەچوون، ئەو ئینسانە، کە لە بەهەشت دایە هەر ئەو ئینسانەیە، کە لە دنیا بووە. ئەو میوە، ئەو ڕزقە، ئەو باغات و جۆ و جۆبارە، ئەبێ لەگەڵ باغات و میوە و جۆ و جۆباری دنیا پێک بچن.

لذائذی بدنی لە بەهەشت دا ئەمێنێ.. خۆمان جسمانین، ڕوحمان جسمە، کە لەناو هەیکەلی بەدەنمان دووبارە ئەو بەدەنە تشکل ئەکاتەوە، ئەو ڕوحەی دێتەوە بەر.

(بالکلیة) لە طبیعەتی ئینسانی دەرناچێ — غایة ما فی الباب — لذائذی ڕوحانی غلبە ئەکا لەسەرلذائذی جسمانی.. چونکە ڕوح لە ئەوی بە قووەت ترە.. دوژمنێکی، کە هەوا و هەوەسە لە ئەویدا نییە.. الم و عذابی (روحانی و جسمانی)ش وەکو ڕوحانی و جسمانییە.

﴿وَلَهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ﴾ هەم موژدەیان بدەیێ، کە لە بۆ وان هەیە ژنی پاک و خاوێن هەم لە پیسی ڕوحی، هەم لە خبائثی جسمی.. لەو ئایەتی کەریمە سێ فائدە هەیە:

اولاً: بەهەشت هەروەکوو بۆ پیاوان هەیە، بۆ ژنانیش هەیە.

ثانیاً: پیاو، بوونی ژن لە بەهەشت، بە نعمەت بزانێ.

سێیەم: آن مهمی ئەوەیە ژن لە دنیا و لە قیامەت ڕەفیقی حەیاتن. نە لذەتی دنیا، نە لذەتی بەهەشت لە سەر ئەو هەموو خۆشییە بێ ژنی

پاک و خاوین تەواو نیڕیە، بەڵکوو ناخۆشە وەک لە کوردیدا دەڵێ «دۆست لە کوێ بێ ئەوێ خۆشە» کەوابێ هەر لە ئەمڕۆوە، پیاو و ژن لە حاڵی خۆیان بفکرن، اصلاحی نەفسی خۆیان بکەن. لەم حەیاتی دنیایە بە خۆشی ڕاببوێرن، چونکی ڕەفیقی ابدین لێک دانابڕێن، با خۆیان لێک دانەبڕن. حقا ئەگەر موسڵمانان تاملیان لەو نەوعە ئایەتە کردبایە، ئەیان زانی، کە ژن لە حەیاتی دنیەوی و اخروی چ مەوقعێکی هەیە، ئەو وەختە ژنیان لەلا بە حرمەت ئەبوو، بەغایەتی خۆشی پێکەوە ئەژیان.

ژنانی ئەورووپایی، کە ئیمڕۆ لەبەر خشونەتی طبعی موسڵمانان، نەفرەت لە ئیسلامەتی ئەکەن، خۆیان ئەهاویشتە باوەشی ئەو پیاوە لطیف و بە مەرحەمەتانە، کە حقووقی زوجەیان لە دنیا و قیامەت لا مقدسە.

﴿وَهُمْ﴾ هەموویان ژن و پیاو ﴿فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٢٥﴾﴾ لە بەهەشتدا ابدینە، ناچنە دەرەوە.

وەقتاً کە جەنابی باری تمثیلی حیلەکارەکانی کرد بە آگر هەلایسێن و ڕێژنە باران بەسەردا هاتوو، ئەو دڵڕەقانە بۆ خاتری چاوبەستێ لە عبادی خودا القای شک و شوبهەیان ئەکرد، ئەیان گوت خودا لە ئەوە گەورەترە، کە تمثال و ممثال بکا. بۆ خاتری وەسوەسەی ئەوانە، تاثیر لەو چاو و زمان نەکا ئەفەرموێ:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْيِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا﴾ حەیا ناکا لەخۆی ئەمما لەغەیر هەر بە وەهم دانابێ، یەعنی ممنوع نیڕیە بۆخوا، کە لێ بدا مثلٌ مایيکی با ئەو شتە لە غایەتی حقارەت دابێ.

﴿بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا﴾ پێشکەیێ بێ، یاشتێ بێ لە فەوقی پێشکە لە گچکەیی، یا لە گەورەیی خودای تعالی حقیقةً (غني عن العالمین)ە هەموو عالەم بە نظر مەقامی الوهییەت لە ذەررەیێ کەمترە، ئەمما ئەو مەقامە، مەقامی لطف و مەرحەمەتە، مەقامی (ربوبیت)ە، مەقامی تعلیم و تفهیمە. بە

هەر نەوعێ، کە عبادی خۆی تێبگەیینێ حق و حقیقەتیان بۆ جلوە ئەدا. بناءً علیە، دارژاندنی مثال لە خوا مەنع نی‌یە، وەک لەمەو دوا بە دەرئەکەوێ لە چ مەقامێکی مناسب. سکەی (مَثَلْ) بە ناوی مێش و جاڵجاڵوکە لێئەدا، سبحان الله ئەو گرۆهە ئەحمەقانە عەینی جەنابی کبریائی لە بەرد، لە گاجوت، لە سائری محقراتی دی تمثیل ئەکەن؛ کەچی ئەڵێن ضرب المثل بۆ خودا ممنوعە. طبعاً القاءاتی ئەو نەوعە ئەحمەقانە تاثیر لە ئیماندار ناکا.

﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەوانی کە ئیمانیان هەیە بە خودا و نبووەت، بە ڕاستی تنزیهی خدا ئەکەن، زەریف لە تمثیلەکە ئەگەن.

﴿فَيَعۡلَمُونَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡۖ﴾ چونکە (نظراً)کە نە پەروەردگار و (مربيّ) خۆیان ئەزانن لە ڕووی عنایەت و مەرحەمەتەوە ضرب امثال ئەکا. ذاتاً تمثیل حەقی صانعە، نابینن ئەو هەموو حقائقی اشیایە، ئەو هەموو ماهیاتی کلیەیە بە خەلق و ایجاد لە هەیکەلی افراد دا تمثیلی ئەکا. ئەمما خۆی مقدس و منزهە لە (تمثل).

﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەوانی کەوا زۆر ڕوو چوونە خوارێ لە کفر و ضلال و عناد ﴿فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلٗاۘ﴾ چی مقصودە خودا بەو مەثەلە؟ چی پێ تمثیل ئەکا؟ (کانە) لە جوابدا ئەفەرمووێ:

﴿يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرٗا وَيَهۡدِي بِهِۦ كَثِيرٗاۚ﴾ گەلێکی پێ ضال ئەکا و، گەلێکیشی پێ هیدایەت ئەدا. ئەمما لە کافران، ئەو کافرانەی، کە پەردەیێکی تەنکیان لەسەر چاوە، خۆیان ناتوانن تمثیلی حقائق بکەن. بەونەوعە ضرب المثلە پەردەکەیان لە سەر چاو لادەدرێ، حەق ئەبینن، تێئەگەن، قبووڵی ئەکەن. ئەمما ئەو کافرانەی، کە (غلیظن)، قاسی القلبن، بە پەردەی عناد و عەداوەت و حسادەت چاویان گیراوە، لە دائرەی اطاعە

دەرچوون، ئەوانەی پێ‌گومراه ئەکا زیاتر کافر ئەبن، کە اصلاً قبولی هیدایەت نەکەن.

﴿وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَـٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾﴾ ئەوانەی کە لە اطاعه دەرچوون لەو ئایەته و لە گەلێ ئایاتی‌تر دەرئەکەوێ، کەسێکی قابلی هیدایەت بێ جەنابی باری پەردەی شکوک و شبهاتی لەسەر لائەدا. تقریر و تمثلی حەققی بۆ ئەکا. نەوەک معاذ الله چاوی کوێرکا و دڵی مۆر کا. کامە فاسق ﴿ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَـٰقِهِۦ﴾ عەهدی خوا ئەشکێنن لەپاش ئەوەی، کە مەحکەم کرابێ.

﴿وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ﴾ معاکسە لەگەڵ خودا ئەکەن ئەوی، کە خودا ئەمری کردبێ پێکەوە بنووسێندرێ ئەی بڕن.

(حکماء) ئەفەرموون: وەضیفەی عەقڵ (توحید) و پێکەوە نووساندنی ئەو شتانەیە، کە جیهەتێکی وەحدەتی تیابێ. وەضیفەی خەیاڵ تفریق و لێک بڕینی ئەو اشیایانەیە، کە پێکەوە بنووسێن.

(بناءً علیه) خیالیون دائماً خەریکی تفریق و تفرقەن.. جیهەتی وحدەت لە بەینی اشیا نازانن؛ خصوص، کە بغض و عنادیشیان هەبێ، ئەوجا لە هیچ ناپرسن دائماً تێ‌ئەکۆشن، کە فساد و تفرقە باوێنە ناو خەلقي.

﴿وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ﴾ حتی خەریک ئەبن، کە ئەوانەی بە ڕابطەی ئیمان بوون بە یەک دڵ و یەک جان و یەک زوبان لە بار یەکیان بهیننە دەرێ.

﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ﴿٢٧﴾﴾ ئەوانە بە حەققەت خائب و خاسرن لە دنیا و قیامەت قازانجیان نی‌یە، پاش ئەو ئایاتی بیّناتە، ئەو ایضاحاتە بە کمالی تعجب ئەفەرموێ:

﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ﴾ چۆن ئێوە کافر ئەبن بەخوا؟ ئیمانی بە

ڕاستی پێناهێنن؟ ﴿وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا﴾ ئێ مردوو بوون. کە وەقتێ (نطفە و علقە و مضغە) بوون. ئەو موادی مختلفە، ئەو عەناصری متباینە کێ پێکەوەی نووساند؟ ﴿فَأَحْيَٰكُمْ﴾ ئێوەی کردە زندوو. امتزاج و وەحدەتێکیدا بەو موادی مختلفە. ڕوح بەو دووریە، کە هیچ مناسەبەی لەگەڵ مادیات نییە، ئەویش امتزاجی کرد لە گەڵیان. ئەو احیایە بە غەیری خودا، کێ ئەتوانێ بیکا؟.. ئەوی بە خەیال دابێ (طبیعەتە)؛ طبیعەتیش بێ ادراک و هۆشە، دائماً لە طغیانە. ئەو توحیدە بەو حکمەتە بەو علمە باهرە بەطبیعەتی بێ شعور ناکرێ، ئەگەر لە خەلقی خۆشتان غافلن خۆ اولادی خۆتان ئەبینن بە چ تطوراتێ دێتە عالەمی حەیات.

﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمْ﴾ پاشان ئەتان مرێنێ، (کانە) لەبەر غایەتی غەفڵەتیان نازانن، کە ئەمرن. ﴿ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾ لە پاش مراندن زندووتان ئەکاتەوە ﴿ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٨﴾﴾ هەر وەکو خەلق و ایجادی ئێوەی کردووە.

﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا﴾ بۆ اکمالی نعمت، ئەوی لە ارضایە بۆ ئێوەی خەلق کردووە، حتی زەهریش بە طریقی عیلم ئەتوانن استفادەی لێ بکەن. حاشا ثم حاشا! خەیاڵ نەکەن، کە ئەو پێغەمبەرە فیکری (استلا)یە و سلبی نعمەتی دنیایە لە ئێوە، بەڵکوو مقصودی ئەوە ڕوویکەنە خوا لە خەلقی خوا (مادةً و معنیً) استفادە بکەن.

﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ﴾ لە پاش ئەوەی کە ئەرز و (ما في الارض) مهیّا کرد بۆ ئێوە، مەیلی کرد بۆ لای ئاسمان ﴿فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ ۚ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٩﴾﴾ تسویە و تەرتیبی دا بە حەوت ئاسمان، ئەویش هەر بۆ نفعی ئێوەیە، کە لە بەینی امتزاجی سفلی و علوی نەتیجەی منافع بۆ ئێوە بدات وا ئەنوێنێ، کە اولاً خەلقی ارض و ما في الارضی کردووە. پاشان بۆ

جیهەتی ئاسمان عەطفی عنایەتی کردووە، تاکوو احتقاری نەکەن، کە لە ژێر پێتانە و علویات نەپەرستن.
کەوابوو لازم بوو ئێوە بە مقابلی ئەم هەموو عنایەت و نیعمەتە، هەر خودا بپەرستن، عەهد نەشکێنن لە اتحاد خەریک بن.. فساد نەکەن وەک (سعدی) ئەڵێ:

ابر و باد و مه و خورشید و فلک در کارند
تا تو نانی به کف آری و به غفلت نه خوری
همه از بهر تو سر گشته و فرمان بردار
شرط انصاف نباشد که توفرمان نبري.(۱)

وەقتاً کە فەرمووی ئێوە (اموات) بوون و ئێوەمان زندوو کرد بۆ ئەوە، کە بزانین مەبدەئی حەیاتی ئێمە لە چییەوەیە؟ هەروا بە طریقی توالدە، یاخود مەبدەئێکی هەیە؟ ئەوجا بۆ بەیانی مەبدەئی بشری ئێمە و، ئابائی ئێمە بە وجهی منتظم لەگەڵ (ماقبل و مابعدی) فەرمووی ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ﴾ خطاب لەگەڵ ڕەسولی خۆی تا بزاندرێ ئەو ماجەرایە بە وەحیی ئیلاهی زانیویەتی لە کتبی سالفەی وەرنەگرتووە.
ئەهلی عەقڵ لە ((ملیّون و طبیعیون) متفقن، کە ئەم ئەرزە لە ئەوەڵەوە خاڵی بووە لە حەیات. ئەم حەیاتە چۆن هاتووە؟ طبیعی بە طریقی طبیعی نازاندرێ. ئەوی گوتراوە لە تخمین و خیاڵە، بۆیێ ئێمە اعتماد ئەکەینە سەر وەحیی خودا، کە بۆ پێغەمبەرانی عظام هاتووە.
﴿لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ بە فریشتەکانی فەرموو، بە تاکید من خەلیفەیێ، جێنشینێ لە ئەرز خەلق ئەکەم، دایئەنێم. استشارەی

---

۱- هەور و با و مانگ و ڕۆژ و ئاسمان لە کاردان، تا تۆ نانێک بە چەنگ بخەیت و بە بێئاگا نەخۆیت. هەموویان لە پێناو تۆ مەدهۆش و فەرمانبەرن. جا مەرجی ئینصاف نییە، کە تۆیش کارێک بەجێ نەهێنی.. ع. بیمار.

جەنابی کبریائی لەگەڵ مەلائکەتان بۆ (جعل) و دانانی خەلیفە زۆر معقوڵـە. (غاية الغاية) بەیانی دەرەجەی لیاقەتی ئـادەم و مـەلـەکە. استـشارەی کـرد. ئایا ئێوە لە خەلقی خەلیفە لە مەسلەحەت و مفسدة چ ئەبینن. ئەوانیش بـە غەیری (مفسدة) هیچ جهەتێکی تریان نیشان نەدا.

﴿قَالُوٓاْ أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ﴾ چـۆن دائـەنـێی لـە ئەرزی کەسێکی، کە فساد لە ئەرزی بکا. بێهوودە خوێن برێـژێ، ئـەسڵەن رووی چاکەیان نیشان نـەدا. زێـرا ئـەوەنـدەیـان بـە کـافی دیـت. بـۆ خـەلـق نەکردنی خەلیفە لە قەواعیدی مقـررەیـە، کـە مـانع و مقتـضی گـرد بوونـەوە مانع مقدمە ئەوەیان لە چ زانی؟ واتێ گەیشتن خەلیفە، یا خەلیفەی حوکمە؛ ئەوی حاکم بێ ئەبێ، حوکمی نفوذ بکا. کەسێک مخالفەی کـرد (مخالفـە)کـە نەهێڵێ. ئەوەش بالطبع سەر ئەکێشێتە شەرر و شۆڕ(هرج و مـرج). یـاخود خەلیفەی خودا، ئەبێ دائمـاً خـەریکـی عبـادەت بـێ بـە تـسبیح و تقـدیس و تمجیدی ئیلاهی مشغوڵ بێ. ئەگەر ملحظ ئەم فائدە بێ لە قبیلەی تحصیلی حاصڵە.

﴿وَنَحۡنُ نُسَبِّحُ بِحَمۡدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ﴾ کەوابێ خەلقی خەلیفە بێهوودەیەو، شتی بێهوودەش لە تنزە و تقدسی کبریائی دوورە.

تسبیح چیـیە؟ تقدیس چیـیە؟.. هەردوو لە اصلی مەعنا شریکن، بەمعنی پاک کردنەوەیە، فەرقیان بە اعتباری متعلقە. تسبیح تطهیرە لە (نقص). بـە اعتباری اموری خارجی، تقدیس تنزیهە لە نقص بە اعتباری ذات.

لاشک کەسێکی خەریکی تسبیح و تقدیسی کبریائی بێ، ئەبێ بێباک بـێ لە فەساد و خوێن ڕژاندن، بۆیێ ئـەفـەرمـون (بحمـدك و لـك)، تـا بـزانن خـوا خۆی منزهە، متصفە بە کمالی ذاتی و فعلی، نەوەک ئێمە پاکی ئەکەینەوە. تسبیح ئەگەر لە گەڵ تعظیم نەبێ، تقـدیس ئـەگـەر بـۆ کـەسـێ نـەبـێ، کـە خۆی (قدوس) بێ گەمەیە. نـابینی عبّـادی أصـنام ئـەم هـەمـوو تـسبیح و

تقدیسەی جمادات و حیوانات ئەکەن، عجباً ئەوانە ئەبن بە مقدس؟ حاشا کەر هەر کەرە:

(خری عیسی اگر بە مکە بری
چون بیاید هنوز خر باشد)[١]

ئەمما ئەصڵی خلافەت، خەلافەتی خەلق و ئیجادە، خەلافەتی صنع و اختراعە، خەلافەتی کەشفی ئەسراری قودرەتی ئیلاهی‌یە، کە لەسەر ئەرز و ناو ئەرزی داناوە. خلافەتی نظامە.

لەبەر ئەوە جەنابی کبریائی، لە جوابیاندا ئەفەرمووێ: ﴿قَالَ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٠﴾ بە ڕاستی من ئەزانم ئەوی ئێوە نایزانن. لە اوەلەوە جنابی کبریائی تەنبیهی ئێمە ئەکا، کە ملائکەت بە هەرچۆنێ خەیاڵیان بکەن، خاڵی نین لە جهل. ئەوجا جەنابی کبریائی خەلقی ئادەمی کرد لەسەر ئەو صورەتەی، کە ئێستا بنی‌ئادەمی لە سەرە. نەوەک (داروین و اتباعی داروین) ئەڵێن ئینسان لە اوەلەوە شتێ بووە وەک مەیموون، دوایی بە توالد و تناسل بە طریقی انتخابی طبیعی ئەو جنسە ترقی کرد، هاتە سەر ئەو شکل و شمائلی بشری.

ئەوەش مەعنای فەرمایشتی پێغەمبەرە (خلق الله آدم علی صورته)، کە ئەمڕۆکە مەعنای ئەو حدیثە زەریف ئاشکرا بووە و، گەلێ کەس بە نەزانینی خۆیان، لەم حدیثە تووشی کفر و ضلال بوون.

﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا ﴾ جەنابی کبریائی حەزرەتی ئادەمی خەلق کرد، پڕ لە مدارک و مشاعر و عەقڵ و قووەتی عاملە، کە بتوانێ محسوسات و معقولات درک بکا. خەواص و علائمی اشیاء بزانێ. جمع وتفریق لە بەینی متخالفات و متماثلات دا بکا، وە بە قووەی حس و سرعەتی انتقال و انتباه اسراری طبیعەت تێبگا و، دەری بینێ ئەو تعلیمی فطری‌یە ئیلاهی‌یە،

(١) کەری عیسی ئەگەر بچێتە مەککە، کە گەڕرایەوە هەر کەرەکەی جارانە (ع. ب).

نەوەک تەنها بۆ ئینسان بۆ حیواناتیش ئەو تعلیم و تربیەی هەیە.

ئەمما تعلیمی ناو و اسمی بێمەعنا، چ مەعنای نییە، باوجودی لغاتی بەشەر ئەوەندە مختلف و زۆرە، قابل نییە لە شەخصێکدا گردببێتەوە، (مع انه) لە پاش ئادەم تا ئەمڕۆ صەد هەزار هەزار چشتی وا پەیدابووە، کە ناوو نیشانی لە عالەمی وجود دانەبووە، لە بەر ئەو (سعەتی) صنع و اختراعە، بشر هاواریەتی لە چەنگ قصوری لغەت. ئەوجا پاش ئەو خەلق و تعلیمی فطرییە زەمانیکی پێچوو، کە ئادەم علومی مکتسبە بە واسطەی قوای فکری بێنێتە دەست خۆی. ئەوجا بێ بۆ مجلسی امتحان. بۆیێ ئەفەرمووێ ﴿ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ﴾ معلوماتی مکتسبەی خۆی بە حقائقی کائنات لەسەر ملائکەتان نواند.

﴿فَقَالَ﴾ ئادەم فەرمووی.. ﴿أَنۢبِـُٔونِى بِأَسْمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣١﴾﴾ خەبرم بدەنێ بە علاماتی ظاهرەی ئەو موجوداتە، فەضل لە اسراری حقائق و دقائقی، ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن لە ڕاستانن. لاشک تا قوای مدرکە زیاتر بێ، مدرکات زیاتر ئەبێ. تەماشای کرم و ئینسان بکەن. ئینسان جسمێکە وەکو سائری اجسام..

(نامی)یە کە وەکو سائری گیا و دار حساس و متحرکێکە، وەکوو سائر حیوانات زیادی بەچییە؟بە قووەی عەقڵە، بە قووەی انتباهە. بناءً علیە ئینسان لە علم و قدرەت و صنع و اختراعدا ئەوەندە گەورەیە، ناتوانین بڵێین ممثلی خودایە. ئەمما ئەڵێین لەسەر ئەرز خلیفەی خودایە، خاصةً سرری ئەم خلافەتە لەم قەرنەدا زۆر چاک ئاشکرا بووە.

ئەوجا ملائکەتەکان لە خەجاڵەتان، نەیان توانی ڕووبکەنە ئادەم. ڕووی ذیللەتو انکساریان کردە جەنابی کبریائی فەرموویان: ﴿قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ﴾ عیلمی ذاتی هەر بۆتووە. لەهەمووکەمی ذاتی و صفاتی و افعالی منزهی، هیچ عیلم بۆئێمە نییە الاّ ئەوەی، کە تۆ فێرمان بکەی.

﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ۝٣٢﴾ دانا بە حکیمەت و اسراری موجودات؛ هەر ئەتۆی. واضعی کلی چشت، کە لایق بە مقامی فطرتی خوێ بێ؛ هەرتۆی. حەزرەتی ئادەم باوجودی ئەو معروضاتەی ئەزانی، لاکن خودسەرانە اظهاری نەفەرموو، تاکو ئەمری پێکرا لە طرف جەنابی باری، کە فەرمووی:

﴿ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡۖ ﴾ ئەویش درعقب ئەمری بەجێهێنا.

﴿فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ ﴾ کە حەزرەتی ئادەم خەبەریدا بە ملائکەتان بە حقائقی ئەو موجوداتە، ئەوجا بە ڕاستی قەدر و قیمەتی ئادەمیان لێمعلووم بوو. جەنابی کبریائی﴿قَالَ﴾ بە ملائکەتەکانی فەرموو: ﴿أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾ اسراری کائناتی علوی و سفلی، من بەڕاستی ئەزانم چی ئەبێ، چۆن ئەبێ، چێلێ (ترتب) ئەکا. ئەرز ئەگەرچی لە نظر ئێوە محقرە، ئەمما اسراری وای تێدا هەیە، کە شایانە تفضیل بدرێ لەسەر علویات.

﴿وَأَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ ۝٣٣﴾ و بە ڕاستی ئەزانم ئەوی ئاشکرا ئەیکەن، ئەوی بە دزی ئەیکەن و، مقتضای فطرەتی ئێوەش لە من بزر نییە. ئەوجا پاش دەرکەوتنی قەدر و قیمەتی ئادەم و نقصانی علمی ملائکەت چیبوو، چ کرا؟ بۆ ئەوەی، کە بزانین بە زەریفی تذکارمان ئەکا ئەفەرمووێ:

﴿ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ﴾ بە ملائکەتەکانمان گوت ﴿ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ ﴾ سجدە ببەن بۆ حەزرەتی ئادەم. ئەوانیش بلا اهمال﴿فَسَجَدُوٓاْ ﴾ وا دیارە مەقامی ئادەمیان ئەوەندە بڵند دیت، خۆیان ئەوەندە (منکسر) چاو پێکەوت، مەیلێکی وایان تێدا پەیدا بوو بو، کە جبراً سەوقیان بکا بۆ سجدە بردنە بەر ئادەم. بەس منتظری ئەمر بوون. ذاتەن ئەوی ئەهلی انصاف بێ کە لە معنویاتدا انکسار و ذیللەتی بەسەردا هات؛ (مادةً)یش اظهاری (تذلل) و

شکستیی خۆی ئەکا.

﴿إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ﴾ لە سجدە بردن بۆ ئادەم ابای کرد. ﴿وَٱسۡتَكۡبَرَ﴾ طلبی تعالیی کرد. خۆی لەئەو زیاتر زانانـد. لـە کمالی بێخەجالەتی اصداری لەسەر کبری خۆی کرد.

﴿وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٤﴾ اساساً طینەتی پاک نەبوو. خـۆی بـە گـەورە و بڵندتر ئەزانی، نهایەت تائەو وەقتە تووشی امتحانی نەبووبو، کە ئەو کفر و عناد و جه هلەی لێ بەدەربکەوێ:

خوش بود گـر محک تجربه آید به میـان
تا سیه رِوی شود هر که دروغش باشد.[1]

ئـەو سـجدە لای مـن سـجدەیـی حقیقـییـە. زێـرا، تـەسلیم و انقیـادی ملائکـەتـەکـان، کبـر و عنـاد و عـصیانـی ابلـیس بـەو ئـەمـرە نـەبـا، بـە دەرنەدەکەوت. ذاتەن ئادەم و ابلیس بۆ سجدە بـردن بـەر خـودا حـاضـر و ئامادە بوون. سبحان الله لە حیکمەتی خودا، کە بە کفر ئیمان بەدەردەخـا. کەوابێ حاجەت بە تاویلاتی مەلایان نییە، پاش ئەم سەرگوزەشتە جـەنـابی کبریائی ئەمری کردە ئادەم:

﴿وَقُلۡنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ﴾ خـۆت و ڕەفیقـەی حـەیاتـت لـەو بەهەشتە دانیشن.

هەتا ئێستا بەحسی (زوجه) نەبوو، لاکن بە گوێرەی اسراری ئەو ئایەتەی، کە بەیانمان کرد (ولهم فیها ازواج مطهرة) اشارە بۆ اتمـامی نعمـەت و اکمـالی لەذذەت، اظهاری ئەمر بە دانیشتنی بەهەشت بـە ڕفیقـەی حیـاتی ئـادەمـی فەرموو.

لێرەدا تەرکی (اذ) ئەفـەرمـوێ، چونکی لـە میانـەدا انکسارێکی ئـادەمـی تێداهەیە، حەز ناکا بەوەجهی تـذکار بـەیـانی بفـەرمووێ. چـون لـە آخـردا

---

(١) خوش ئەبوو، کە سەنگی محەکێ هەبوایە، تا ئەوەی درۆی بکردایە ڕووی ڕەش بوایە.

مسامحەی کرد، لێرەشدا مسامحە ئەفەرموێ. لە زوبانی فارسی مەشهورە:

(بزرگان برداشتهء خویش را نینداختەاند)[٢]

دیسان بۆ امتحان، کە ئادەم بە فضل و علمی خۆی مغرور نەبێ و لە (شرری)دوژمن ئاگاداربێ فەرمووی.

﴿وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ﴾ بخۆن هەردووکتان لە میوەجاتی بەهەشت خواردنی زۆر، واسع، فراوان، خۆشگوار؛ نزیکی ئەم دارە مەکەون. ئەودارە چیە؟ زۆر قسەی لێ کراوە، بەلاّم محققە هەرچی بێ، میوەی ئەو دارە زیاد لە دارەکانیتر، زۆر زوو تهیج و تەحریکی شهوەت ئەکا. ئێوە ئەگەر بخۆن لەو دارة ﴿فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٥﴾﴾ لە خۆتان و لە انسالتان.

﴿فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ﴾ ابلیسی پر تلبیس تەلەزگەی پێدان. ﴿عَنْهَا﴾ لەوبەهەشتە خۆشە، واسعە، ڕزقزۆرە. ﴿فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ﴾ دەری هێنان لەو عەیشە خۆشەی، کە تێیدابوون، حتی نەیاندەزانی معاشرە چیە. ئالات و ادواتی زواج هەیە یان نا.. بە محبەتێکی ساف و ڕوحانی لەو بەهەشتە خۆشەدا، امراری حیاتیان ئەکرد. ئادەم و زوجەیشی، شیطانیش لە مەقامی علویتی خۆیان تنزلیان کرد. بۆیێ ئەفەرموێ.

﴿وَقُلْنَا ٱهْبِطُوا۟﴾ کە نشستی ظاهری (ترتب) ئەکا لە نشستی باطنی کەسێ (معنیً) لە مەقامی دوور کەوێتەوە. طبعاً لەو مەقامە دەرئەکرێ. حتی بە ظاهری تێیشی دابێ لە حقیقەدا تێیدا نیە.

﴿بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ﴾ بعضێک بۆ بعضێک دوژمنن ﴿وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ﴾ وە لەبۆ ئێوە هەیە لەئەرزی جێی قەرار و تمتع، یا نەفسی قرار و تمتع. آدەم أصلاً لە ئەرز خەلق کرابوو (منها والیها)، شەیتانیش

(٢) — گەورەکان ئەوەی خۆیان هەڵیان گرتۆتەوە؛ فڕێی نادەن .. (ع . ب)

لەبەر ثقلی کبر و انانیتی بوو بە ئەرز. ذاتەن اثقال مائلی مرکزی ئەرزە.

﴿إِلَىٰ حِينٍ ۝٣٦﴾ تازەمانێکی محدود، کورت یا درێژ، شەیتانی خبیث، باز لەسەر تمرد و عنادی خۆی مایەوە. لاکن حەزرەتی ئادەم پەشیمان بوو، تۆبە و انابەی کرد، لە ڕووی لطف و کەرەم تۆبەی قەبوول کرد.

﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ﴾ هەرچەند حەزرەتی ئادەم بە علم و فضل تفوقی لە ملائکەتی پاک طینەت کرد، ئەمما لەبەر صەفوەتی قلب گیرۆدەی داو و تزویری ابلیس بوو، ئەمما کردی بە دەرسی عبرەت، کە جارێکیتر بە حیلە و مەکری حیالان هەڵنەخەلەتێ، (کانە) عیلمی سیاسەتیش فێر بوو.
﴿فَتَابَ عَلَيْهِ﴾ ئەو ثقل و گرانایی‌یەی لەسەر لادا.

﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ۝٣٧﴾ بەراستی خودای تعالی (توابە)، حەز ناکا باری گران لەسەر شانی عبادی خۆی دانێ و، تا لە دائرەی امکان دابێ. بۆیێ بە شرائطی خفیفە، تۆبەی لە ئادەم قبووڵ کرد. ئەگەر جەنابی حەق ئەو کلماتە سیاسی‌یەی بەیان فەرموو بایە، ئەهلی علم ئەیان کرد بە دەستووری لا یتغیّر، ئاگایان لە قەواعدی تزویر و تلبیسی شیاطینی ایام خۆیان نەدەما، زوو بە بندەکەوتن، نەوەک حەزرەتی ئادەم توهم بکا بچێتەوە مەقامی پێشی. بۆ قطعی املی لە حەیاتێکی بسیط فەرمووی:

﴿قُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ مِنْهَا جَمِيعًا﴾ قابل نی‌یە تا قیامەت حیاتی بسیطی بێ‌خدعەو مەکر و فێڵ چەنگتان ناکەوێ، بەڵکوو ئەمەندەیە ﴿فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى﴾ کە هیدایەتێکیان لەطرف منەوە بۆهات﴿فَمَن تَبِعَ هُدَاىَ﴾ ولو ڕئیسی اهلی تلبیسیش بێ.

﴿فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ۝٣٨﴾ خۆف و حزنیان لەسەر نی‌یە، بە گوناهی ڕابردوو نایان گرێ، ئەمما﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ بەذاتی کبریائی ئیمانیان

بەزەریفی بەخوا نەبێ ﴿وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِنَآ﴾ چ ئایاتی عقلّی، چ ئایاتی وەحــی ی.
﴿أُوْلَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ﴾ ئــەوانــە ڕەفیــق و خــاوەنــدی ئــاگرن ﴿هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ۝٣٩﴾ لێک جودا نابنەوە.

ئەو ماجەرایە چەند فائدەیەکی تێدایە، گەرچی اشارەمان بۆیان کردووە، ئەمما حەز ئەکەم بە تفصیل عەرضتان بکەم: -

یەکەم: استشارەی خودا لەگەڵ ملائکەتـان دوور نـی‌یـە خـصوص، کـە مقصد اظهار کردنی حکمەت و سررێکی عظیم بێ، کـە لـەو کـارەدا هـەیـە و بالخاصة ئەتوانین بڵێین، ئەوە دەرسێکە بۆ ملوک و سلاطین و امـراو علمـاو عظمای، کە مستبد بالراین، سەربەخۆ ئیشان ئـەکـەن.. خـودایێ بـەو علـم و عظمت و کبریائی‌یە، استشارە لەگەڵ بەندەکانی خۆی بکا.

ئێوە استشارە لەگەڵ امثالی خۆتان و، بەڵکوو لـە ئێـوە زیـاتر لـە علـم و فضل و هۆش و معرفەت نەکەن. جێی تعجّب و استغرابە، بۆیێ حـەزرەتـی ڕسالەت استشارەی ئەکرد، وە گـەلـێ جـار ڕەئـی پیـاوێکی (ادنـی)ی تـرجیح ئەدا بەسەر ڕەئی سەرآمەدانی یارانی گزین و عملی پێئەکرد.

دووەم: ئینسان خاصةً، کە استشارەی لەگـەڵ بکرێ، حـەقـی اعتـراضـی هەیە بەو شەرطە اعتراضەکـــەی (موجە) بـێ. بـە عنـادی لجـوجی نـەبـێ.. ئەوی اعتراضیـشی لـێ دەگیـرێ بـا (علامـە)ی دەوران و قطبـی زەمـان بـێ، استکراهی معترض نەکا. بەعنف و شددەت و جنێو مقابەلەی نەکا.. نەوەکو صوفی‌یەکان، پاپی‌یەکان، علی العمیا تسلیم بن ـ کالمیت بـین یـدی الغاسـل ـ. هەرچی پێیان گوترا بڵـێن قوربـان وایـە. نـەوەک پـاپ و شـێخ و بعـضە مەلایەکان، ئەگەر اعتراضێکیان لێگیـرا ئـاگر ئـەستێنن.. نـائرەی غـضبیان دێتەجۆش، قصد ئەکەن معترضەکە پارچە پارچە بکەن. بە تکفیر و تحقیـر و جنێودان ئابڕوویان ئەبەن.

سێیەم: ئەوی اعتراضـی لـێئـەگیـرێ، بـە کـەمـالی ڕفـق و مـەرحـەمـەت

ایضاحی مەسئەلە بکا. سائلە کە تێبگەیێنێ.. دلائل و براهینی بۆ تقریر بکا.

چهارەم: بەکەمالی انصاف جوابی حەق قبووڵ کەی، لەسەر عنادی خۆت نەمێنێ، تابعی حەقبی.. حەق نەکەیە تابعی خۆت.

پێنجەم: بزانی غەیری خوا هەرچی لە دائرەی امکان دابێ جهەتی نەقصی هەیە.. خصوص لە خۆت بفکری تازیاتر بی، خۆت بە ناقص تر بزانی.. بەزانینی خۆت مغرور نەبی. وەک ئیمامی شافعی ئەفەرمووێ (کلما ادبني الدهر اراني نقص عقلي، واذا ما ازددت علماً زادني علماً بجهلي). هەر وەقتێ دەهر ئەمن تادیب بکا، نقصی عقڵم پێنشان ئەدا و، کە علمم زیادبوو، علمم زیادئەکا بە جهلی خۆم.

شەشەم: کەسێ نەقصی خۆت پێنشان بدا، تقدیر و ئافەرینی بکەی، ڕقی لێنەکێشی.

هەفتەم: ئەهلی انصاف، ناتوانێ بە قطعی و بە اطلاق تفضیلی ئینسان لەسەر مەلەک، یا مەلەک لەسەر ئینسان بدا، چونکی هەردوو لا جهەتی نەقص و کمالیان هەیە. ئەمما کمالی مکتسبی ئینسان لەگەڵ ئەو هەموو علایق و عوایقە هونەرترە و، بە طریقی شاعرانە بۆ تشویقی بەشەر لەسەر تحصیلی علم و معارف تفضیلی بشر لەسەر مەلەک بدرێ چاترە، بالخاصة بۆ ڕێبەستنی عبادەتی ڕوحانیات و بڵندکردنی مەلەک بۆ دەرەجەی الوهیەت، تفضیلی بشر لەسەر مەلەک زۆر مصلەحەت بروانن.

ئەو ملائکەتانەی ئێوە ئەڵێن (بنات اللـه)ن، لە مەیدانی امتحان لەگەڵ ئادەم چۆن مغلوب بوون و بە کمالی انکسار سەری افتخاریان بۆ ئادەم لەسەر خاکی (مذلەت) دانا، ئێوەش کوڕی ئەو بابەن، چۆن ئەو ملائکەتانە ئەپەرستن؟ حقاً ئەوە فائدەیێ زۆر گەورەیە.

هەشتەم: قورئان لە مەدح و (ذم) مسلکێکی زۆر جوانی هەیە. لەمەقامی ایجاب بکا گەورە ئەشکێنێ، کامل بە ناقص ئەنوێنێ و، ایجاب بکا ناقص

بە کمالی تعظیم یاد ئەکا. (حقیقةً) ئەو ڕێگایە، ڕێگایێ ڕاستە، واجب بوو علمای ئیسلام پێیدا بڕۆن.

نۆیەم: ئەگەر دوو جهەتی گەورەییت دیت، بزانە کامیان قابلی اکتسابە، ئەوە اختیار بکە بۆ خۆت، ئەو شەڕەفە پەیدا بکە. شەڕەفێکی بۆ تۆ ممکن نەبێ خۆپێهەڵدانەوەی بێعەقڵییە.

دەهەم: کلامێکی مەعنادارت بیست، بە مناقشاتی بێهوودە ڕوحەکەی لە کیس خۆت مەدە. چۆن ئەبێ خودا استشارە ئەکا، چۆن خودا قسە ئەکا؟ خودا چۆن ئەم هەمووگفت و گۆیە لەگەڵ ابلیس ئەکا؟

بەو خەیاڵاتی بێهوودە، خۆت مەمرێنە، ئەوجا پاش ادراکی ئەو حکمیاتە، ڕوو بکەنە ئەهلی فساد و شقاق وعناد بنی اسرائیلی، بڵێن ئێوە ئەگەر کوڕری ئادەمن، ئینسان بن، تێکۆشن، ارشادی بنی نەوعی خۆتان بدەن، فساد و تفرقەیان باوێنە بەینێ، والاّ دیارە ئێوە ابلیسن چوونەتە کسوەی بشري، تا تلبیسی حق بە باطل، باطل بکەن بە حەق و، خۆتان دوچاری غضبی ئیلاهی بکەن. وقتاً کە لە ئایاتی سابقە، علاماتی ئەو منافقانەی، کە فێڵیان لە خودا ئەکرد و گەمەیان بە ئەهلی ئیمان ئەکرد. ظاهر و هویدا بوو پەردە لە ڕووی هیاکلی ئەو نفاقە هەڵ گیرا. بەدەر کەوت کە ئەوانە ڕۆسای جوولەکانن بۆیێ بە خطابی عام ڕوولە بنی اسرائیلی ئەکا، ئەفەرموێ:

﴿يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ بە عنوانێکیان بانگ ئەکا، کە شەرم لە کردەوەی خۆیان بکەن، ڕوو لە فساد وەربگێرن، پەیڕەوی ئابائی خۆیان بکەن.

ئەزانن اسرائیل کێیە؟ (الکریم ابن الکریم ابن الکریم یعقوب ابن اسحق ابن ابراهیم)ە.

﴿ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ﴾ ئەوي (نعم)ی عمومی ئەگەر لاتان موجبی شکران نییە، یادی نعمەتی خصوصی بکەن، کە لە حەق ئێوەم کردووە.

ئەو نعمەتانەش خۆتان ئەیزانن. یاخود نعمەتی ئەوەندە گەورە نە نایێتە بەیان.

﴿وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِيٓ﴾ پەیمانی من بە جێبینن ﴿أُوفِ بِعَهۡدِكُمۡ﴾ منیش پەیمانی ئێوە بەجێ ئەهێنم. خودای تعالی بۆ کەس وەعدی نەداوە (تۆ دانیشە و من بۆت ئەکەم)، بە شرطێ ئینسان عەهدی خوا بەجێبهێنێ، خوداش عەهدی ئەو بەجێئەهێنێ.

آن زیادە فائدەی وەعدی خودا بۆ قووەتی قلبە، کە (مطمئن) ببێ. ئەوی خودا وەعدی دابێ، ئەبێ هەر ببێ.. بە صدمات و موانع سستی نەهێنێ. لەهەموو مقصودتر لەو عهد و پەیمانە ئەوەیە ﴿وَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ ٤٠﴾ هەر لە من بترسن. قەومێ کە لە غەیری خودا بترسێ، ترس غلبەی لێئەکا، ئەو قەومە قەت غالب نابێ، دائماً ئەبێتە ژێر چەپەلۆک. ئەمما تا لە خودا زیاتر بترسن، ئازاتر ئەبن.

سبحان الله لەو خودایە، کە بەندەگی بۆ ئەو ئازادییە! ترس لەئەو ئازاییییە!..

﴿وَءَامِنُواْ بِمَآ أَنزَلۡتُ مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَكُمۡ﴾ هەر ئیمان بینن بە ئەو کتبەی، کە ناردوومانە بە مؤید و مقوی بۆ ئەو کتێبەی لەگەڵ ئێوەیە. حتی ئەو کتێبە ئەگەر ئەو کتێبە نەبێ.. ئەو ڕسولە صادقە نەبێ، کێ ئەتوانێ بڵێ ئەو منداڵەی، کە لەناو صندوق بە ئاو دادرا و هەڵگیرایەوە لە بنیاسرائیلییە؟ الآنیش بعضێ کەس بە علنی ئەڵێن: (موسی) کوڕی فرعونە، کە ئێوە تکذیبی قورئان بکەن، ئەبێ تکذیبی نەسەبی پێغەمبەری خۆشتان بکەن. بەو ئیمانە صحیحە ئێوە لە (موسی) و لە تەورات دانابڕێن.. ذاتەن موسڵمان (امتی) هەموو پێغەمبەرانن، کە خاتم الرسل بە دینی اقوم و اکمل و اتم، لە غایەتی نەزاهەت و خاوێنیی تەمثیلیان ئەکا.

﴿وَلَا تَكُونُوٓاْ أَوَّلَ كَافِرِۭ بِهِۦ﴾ مبادرەمەکەن بە انکار، مەبن بە اول قەومێ

باورر نەكەن بە قورئان؛ دەنا ئێوەش فەرقتان نابێ لەگەڵ ئەو گرۆهانەی، كە گورج انكاری موسی و ابراهیم و پێغەمبەرەكانی تریان ئەكرد.. ئەگەر ئێوە معذورین، ئەبێ ئەوانیش معذورین.. ئەوانیش عادات و عنعنات و ئادابێكی قەومی خۆیان بووە.

﴿وَلَا تَشْتَرُوا بِآيَاتِي ثَمَنًا قَلِيلًا﴾ ئایاتی خودا، ئەحكامی سماوی، كە زۆر قیمەت دارە، بە چشتێ كەمی مەفرۆشن و، هەرشتێ لە مقابلی ئایاتی ئیلاهی وەرگرن. ئەگەر دنیا و مافیها بێ، لە حەقیقەتدا كەمە، ئەو(خسەت) و دەنائەتە، لە خواص و مزایای مەلایەكانیان بووە.

﴿وَإِيَّايَ فَاتَّقُونِ ﴿٤١﴾﴾ هەر خۆ لەمن بپارێزن.. قەدر و قیمەتی من و ئایاتی منتان لەلابێ. خودا خۆی ئەزانێ هەر دینێ، هەر ئایینێ، كە تێك چوو بێ، بە واسطەی ئەو خۆفرۆشانەن دەنێ هیممەت، بێخوێن و دەمار.. شەرری ئەو گرۆهە بۆ دین گەلێ زۆرە و، اعظمی مصیبتان ئەو گرۆهە بەدطینەت و بەدرەوشت و بەدكردارانەن، كە لیباسی تزویر لەبەر حەق ئەكەن. حەق بە باطل بە صورەتی حەق ئارایش ئەدەن. حقاً ئەوانە عەینی ابلیسن.

﴿وَلَا تَلْبِسُوا الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ﴾ بە طبعی شاعرانەتان، لباسی باطل لەبەر حەق مەكەن. ئەمرۆش ئەو نەوعە ابلیسە زۆرن، بەڵكوو لە هەموو اعصار و ازمنەی سابقە زیاترن. حتی ئەوانەی، كە بە ناوی اصلاحی دین هاتنە پێش، دڵی موسڵمانانیان جلب ئەكرد.. ئەوەندی پێنەچوو پەردەی تزویریان درا، ئاشكرابوو لە پەنای دەعوای اصلاح، دەعوای پێغەمبەرییان كرد و، گەلێ (سخيف العقل)یان پێ هەڵ خەلەتا!.

ئەوانەی كە تمثیلی حەق بە باطل، باطل بە حەق ئەكەن.. نەفرەت ئەكەن لە تمثیلی حەق بە حەق، تلبیسی ئەویش ئەكەن، ئەڵێن: (ماذا اراد الله بهذا مثلا).

﴿وَتَكۡتُمُواْ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٤٢﴾﴾ سیاسەتی ئەوگرۆهە (اولاً) کتمی حەق، پاشان اظهاری باطل بە صورەتی حەق. وە ئەشزانن، کە ئەوانە ئەو کارە بەدبەختی‌یەیان ئەکرد، لاکن لەبەر هەوا و هەوەس، طمعی ریاسەت و، بەڵکوو بە (خەیاڵی) تەشکیلی سلطەنەت مبالاتیان بەو بەدکاری‌یە نەدەکرد.

﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرۡكَعُواْ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾﴾ رؤسای دین بە عمومی، تووشی حاڵێ ئەبن، خۆیان لە مەقامی زۆر بڵند ئەزانن، ئەڵێن: ئێمە (خواصین) و خواص الخواصین، لەوەی گەورەترین، کە عباداتی عوامی بکەین، ئەمەش دیارە لە کبر و انانیت و غرورە.. بۆیێ خطابیان لەگەڵ ئەکا، ئەفەرمووێ نوێژ بکەن وەکو خەلقي، وەک شەیتان خۆی لە زومرەی ملائکەتان دەرکرد، ئێوە خۆتان لە گرۆهی ئەو عوامی‌یە صافدڵانە، کە مداری معیشەت و گەورەییتانن دەرمەکەن.. وە زەکات بدەن!! خۆتان ئەزانن چەند بخیل ئەبن، حتی لەسەرەمەرگیش کەس استفادەتان لێناکا.. لەگەڵ راکع و مطیعان مطیع بن.. پشتی خۆتان نوی کەن، بە کبر و سەرافرازی مەکەن.. تەماشای ئەو پێغەمبەرانی عظام بکەن، کە خۆشیان خادمێک بوون وەکوو سائری افرادی (امّت)، هیچ وەقت لە خزمەت خدا، لە ملاحظەی حاڵی ئوممەت غافڵ نەبوون.. چ تەکلیفێکیان لە ئوممەت کرد، بۆ خۆشیان کردوویانە وەکو ئەوان؛ لاکن ئەو رۆحە، ئەو زەوقە، کە ئەوان لەو عباداتی عامەیان چێشتووە.. بە خەیاڵی عوامدا نەهاتووە. ئێوەش ئەگەر راست ئەکەن، وەکو ئەوان بێ روحی عبادات بە چەنگی خۆتان بخەن.

نابینن کەسێکی صاحبی شەوق و ذەوق، تەماشای بەهار و باغ و راغ ئەکا، گولوکی رەنگاورەنگی دێتە بەرچاو، جمالێکی دێتە بەر نظر، کە عەقڵی تێدا حەیران ئەبێ.

کەسێکی بێ ذەوقیش تەماشای عەینی مناظر ئەکا، (مع انه) لە حیوانات زیاتر چی‌لێ دەرک ناکات.

﴿أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ﴾ ئەمر دەکەنە خەلقی بە چاکەو، خۆتان لە فکر ئەکەن، بە درۆ و دەلەسە دنیا لە پێش چاوی خەلقی ئەخەن. ماڵ و دەوڵەتیان بە (نذروهبه) و وەقف و وەصییەت و زەکات لێ سلب ئەکەن، خۆشتان زەکات نادەن!! ئەمریان ئەکەنێ بە اطاعە و تسلیم بن (کالمیت بین یدی الغاسل)، خۆتان دەربارەی خودا، بە کبر و انانیت و گەردەن افرازی لە ئەمری ئەو ئەچنە دەرەوە. ئەی واە بە حاڵی ئێوە... ﴿وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ﴾ ئێوە کتێبی ئیلاهی ئەخوێننەوە.. ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٤٤﴾﴾ عجبا هیچی لێ تێناگەن؟ عجبا ئێوە تێناگەن، کە صاحبی کتاب ئەمری بە چاکە کردووە و، خۆشی دائماً خەریکی چاکە کردن بووە. خۆیان لە زمرەی ئوممەتی خۆیان نەهاویشتوەتە دەرەوە، بەڵکوو علاوەی تکالیفی عامەن تکالیفی بە (مشقەت)تریان هاویشتووەتە سەرخۆیان چارەی ئێوە بۆ دەفعی ڕەزیلەیی کبر و بخل ئەوەیە..

﴿وَٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ﴾ صبر و ثبات بکەن لەسەر کسری نەفسی خۆتان، مصارعە و مخاصمەی لەگەڵ بکەن.. تاکوو ڕامی ئەکەن و ئەیهێننەوە مەقامی خۆی.. بیکەن بە متواضع، کە خۆی لە آحادی ئوممەت حساب بکا، چ جۆرە طاعات و عبادەتی خودایان کردووە، ئەویش بیکا بەلام:

﴿وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ﴾ ئەم استعانە بە صبر و صلاة گرانە، ئەمما گران ﴿إِلَّا عَلَى ٱلْخَٰشِعِينَ ﴿٤٥﴾﴾ الا لەسەر ئەوان کەسانە نەبێ، کە خاشع و متواضع و خۆشکێن بن.

﴿ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُوا۟ رَبِّهِمْ وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿٤٦﴾﴾ ئەوانەی کە گومان ئەبەن ملاقاتی خوای خۆیان ئەکەن و، گەڕرانەوەیان بۆ لای ئەوە. یەعنی ئەو کەسی گومانێکی هەبێ، کە حشر و حساب هەیە، مرجع خودایە.. ئەو

خراپانە ناکا، استعانە بە صبر و صلاة، لەسەر ئەوانە ئاسانە، کەوابێ مقصد لەو ئایەتە اشارەیە، کە ئەو گرۆهە بەدطینەتە گومانیشیان نییە، فضل لە علم اشارەییکیشی هەیە، کەسێکی متقی بێ خۆی لە مظنوناتیش ئەپارێزێ، چشتێکی گومانی خراپەی لێهەڵستێ، نایکا.

خطابی بنی اسرائیل، تا ئێرە لەگەڵ ئەو گرۆهە بوو، کە حاضری زەمانی نبوی بوون، لەمەولا توجیهی خطاب بۆ بنیاسرائیلی پێشییە، ئەمما مقصد زەجر و توبیخ و عتابی (حاضرون)ە، بۆیێ تکرار بە عنوانی سابق و سەرلەوحەیی تذکار بە ئەمری مشترک لەبەینی فریقین ئەفەرمووێ:

﴿ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَنِّي فَضَّلۡتُكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾ من ئێوەم ترجیحدا لەسەر عالەم، ئەوی بۆ ئێوەم کرد، بۆ هیچ شعبێکم نەکردووە، خاصة بۆ تعلیم و تربیەتتان، (لایعد) انبیام لە خۆتان ناردوەتە سەر خۆتان، تاکوو لە دین و دنیا مستقل بن.. تا کەس فخرتان لەسەر نەکا.. هەرچەند جەنابی حەق لە هیچ خصوصیێکەوە نعمەتی خۆی لە ئێوە دریغ نەکرد.. اسبابی استقلالیتی دنیا و قیامەتی پێکەرەم کردن، لاکن مع الاسف بێفائدە دەرچوو، ترجیح کران فقط، ترجحتان نەبوو. وەکو کوردی ئەڵێ:

« هەر چەند ئەتکەم بە سەرپاڵوو،
ئەمما خۆت ئەکەیە بنپاڵوو ».

لە اعظمی نعمی ئیلاهی، انتسابتانە لە جهەتی حسب و نسب بۆ پێغەمبەرانی عظام، بەڵام ئەویشتان کردە مایەی شقاوەت و گومراهی بۆ نجاتی اخروی اعتمادتان دایە سەر (نسب)، بەڵام ئەوە زۆر خراپە.

﴿ وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا لَّا تَجۡزِي نَفۡسٌ عَن نَّفۡسٖ شَيۡـٔٗا ﴾ خۆتان بپارێزن لەو ڕۆژەی، کە کەس لە جیاتی کەس هیچ حەق قضا ناکا، هەر کەس حقی کەسیکی لەسەر بێ، ئەبێ خۆی ادای بکا. ﴿ وَلَا يُقۡبَلُ مِنۡهَا شَفَٰعَةٞ ﴾ لەو ڕۆژەدا هیچ تکا

قبوولْ ناکرێ لە کەس. ﴿وَلَا يُؤۡخَذُ مِنۡهَا عَدۡلٌ﴾ لە هیچ کەس (فدیە) وەرناگیرێ. فدیە معلوومە لە ڕۆژی قیامەت نییە.. ئەوە ئەو فدیەیە، کە ئەمڕۆ خۆتان پێ هەڵخەڵەتاندووە و عالەمی پێ هەڵئەخەڵەتێنن، کە مصلحی گەورە لە ئێمە خۆی کردووەتە فدیەی عالەم.. ئیمان بەو فدیە بێنن، ئیتر هەرچی ئەیکەن بیکەن زەرەرتان نادا.. دەرئەکەوێ، کە ئەم فدیەیە، نییە، قبوولْ نەکراوە، خەیاڵێکی مؤمنانە نییە، لە کافرەکانی (بوذەوی) و ئەمانە وەرگیراوە.. چۆن ئەوان محروم ئەبن؛ ئێوەش محروم ئەبن.

﴿وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ۝٤٨﴾ هیچ کەس لە طرەف هیچ کەسەوە نصرەت نادرێ. ئەم ئایەتە صریحە، کە لە ڕۆژی قیامەت شفاعەت لەکەس بۆکەس نییەو، فی‌الحقیقە قطعی امل لە غەیری خودا سوقی ئینسان ئەکا بۆ ئیمان و (عمل)، شفیع و یار و یاوەرێکە لە ئینسان جودا نەبێتەوە؛ هەر ئیمان و عملە.

بەڵام مەلایانی ئێمە، کە (ئەهلی سنە و جماعەتین) لامان وایە، کە شفاعەت هەیە. بعضێ توجیهات و تاویلاتیان بۆ ئەم ئایەتە کردووە، کە ڕوح و ڕەونەقەکەی بردووە، زۆر چاک بە دڵەوە ناچەسپێ. منیش عەرضتان ئەکەم، ئەوانی امێدی شفاعەتیان هەیە دووقسمن:

اولیان: بە امنیة و خەیاڵ اعتماد ئەدەنە سەر شفاعەت. نەفسی خۆیان بەرەڵدا ئەکەن، لە اطاعەی خودا دەرئەچن.. حتی تکاکارەکان بە شریکی خودا ئەزانن. بەڵکوو (نوعاً ما) حاکمی‌یەتێکیان ئەدەنێ لەسەر خودا.

لاشک شفاعەت بۆ ئەوانە لە هەر ئوممەتێ بن، لە هەر خانەدانێ بن نی‌یە.. نە ئەمڕۆ نە ڕۆژی جزا (الی ابد الآباد) ئەو تکایە، تکاکارە هەر نی‌یە!

دووەمیان: ئەوانەی کە گوناهێکیان لێ صادر بوو؛ خەجاڵەت ئەبن.. لە

كمالي شەرمەزاری سەربەخۆ، ناتوانن ڕوو بكەنە دەرگاهی ئیلاهی عالەم، ئەوجا ڕووی ڕجا ئەكەنە يەكێ لە (مقربانی) بارەگاهی كبريائی، ئەيكەن بە وەسيلە، كە خوداوەندی غيور قەلەمی عفو بە گوناهانيان‌دا بينێ، وەك سعدی ئەڵێ:

« من نگويم كه طاعتم به پذير »

چونكە خۆم بە صاحبی طاعەت نازانم، بەڵكوو لە ڕووی انكسارو (مذلەت)ەوە عەرض ئەكەم « قلمی عفو بر گناهم كش ». بێ شوبهە ئەوانە لە شفاعەت استفادە ئەكەن، شفيعی خۆيان ناكەنە حائل لە بەينی خوا و خۆيان.

ئەوجا هات يەک يەک لە نعمی ئیلاهی، كە لە حەق بنی‌اسرائيلی‌يەكانی پێشووی كردووە و اثری ئەو نعمەتە لە (حاضرون)دا ماوە. ازجملە نجاتی بنی‌اسرائيلی‌يە لە فرعون. ئەمريان ئەكاتێ بەتذكاری ئەو نعمەتە.

﴿وَإِذۡ نَجَّيۡنَٰكُم مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ﴾ مەلايانی نابەڵەد لە تەئريخی مصر گەلێ قسەی پڕوپووچيان لە فرعون كردوە.. حتی مەلايان اشتقاقی ئەو كلمەيان لە (فرّ) و (عون) وەرگرتووە، لاكن ئەمڕۆ تەئريخيان ئاشكرايە. ئەوی مجلاتی مصری‌يە بخوێنێتەوە، حاڵ و ئەحواڵيان ئەزانێ. حتی لەو بەينە هەيكەلی فرعەونی (موسی)، كە (توت عنخ آمون)ی پێ‌ئەڵێن، لە اهرام هێنايانە دەرەوە و مامورينی گومرک، ڕەسمی مروری هەيكەلی فرعونی بە قانوونی (رسم السمک) ئەستاند (سبحان من لا يتغير).

﴿يَسُومُونَكُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ﴾ عملی شاقەيان ئەهاويتنە سەر، (كانە) وەكو حيواناتی لە چراگاهی بە درک و چقڵ و چرگان ئەيان لەوەڕاندن. لەوەڕتان عەذابی پيس و ناخۆش بوو. ﴿يُذَبِّحُونَ أَبۡنَآءَكُمۡ﴾ سەری كوڕەكانتانيان ئەبرری.

﴿وَيَسۡتَحۡيُونَ نِسَآءَكُمۡ﴾ مانەوەی ژنەكانتانيان ئارەزوو ئەكرد. البتە ئەمە

خۆڕایی نەبوو، کارێکی (وایان) پێ بوو. قورئان لەبەر غایەتی حیا، شەرم ئەکا اظهاری بکا. مەپرسە لە بێناموسی بنیاسرائیلی، شەرم و حیاو عاری نییە! ئەو وەقتە کە بغداد استیلا کرا چییان کرد؟ هەمووماں ئەزانین لەو سایەوە، نائلی ماموریەت بوون و، ئەمڕۆش ئەو حورمەتەیان هەرماوە.

﴿وَفِي ذَٰلِكُم﴾ لەو عەذابە، یا لەو نجاتە بۆ ئێوە هەیە. ﴿بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿٤٩﴾﴾ امتحانی گەورە لە طرف خوا، عجبا ڕوحی حیاتتان هەیە،یان مردوون؟!

ذاتەن بە تەئریخ ثابتە ، گەلێ ئوممەت لە طرف دوەلی غالبە تضییق کراون،تحقیراتیان دیتووە؛ لە نتیجەی تضییقات ئاگری غیرەت لە دڵی ئەواندا هەڵ بووە، فورانی کردووە.. تاکوو لە ژێر نیری ئەسارەت نەجاتیان بووە.. بە کمالی شکۆە تۆڵەی خۆیان کردوەتەوە. بەڵام شرطە ئەو ئوممەتە صفوەتیکی ڕوحی هەبێ.

وەکو ئاو، تا زیادە تضییق بکرێ، بە قووت تر دەرئەچێ. یاخود بەو نەجاتە امتحانمان کردن، تاکوو بزانن پاش ڕەفعی ئەم بەڵایە چی ئەکەن؟ بە چ احتراس و احتیاطات محافظەی خۆتان ئەکەن، کە دووبارە تووشی (مذلت) نەبنەوە و ممکنیشە، (ذلکم) اشارە بێ بۆ هەردووکیان یەعنی لە (کل)ێک لە نەجات و عەذاب، کە بۆ امتحانی ئێوە بوو. انعامی گەورەی تێداهەیە. بەڵام لەو نعمەتە محروم بوون، لە امتحان دەرنەچوون. ئەگەر کەسێ بە خەیاڵیدا بێ، کە بنیاسرائیلی بە مەردی و مەردانەگی، خۆیان لە چنگ فرعون نەجاتیان بوو وەک بعضێ (امم)، کە عەرض کرا بۆ دەفعی ئەو توهمە، ئەو خەیاڵە خاوە بەوەجهی تذکار ئەفەرموێ:

﴿وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمُ الْبَحْرَ﴾ یاد بکەن ئەو وەقتەی، کە بەحرمان بۆ ئێوە شەق کرد، لێک جودا کردەوە، با وجودی ئەو فرقە محض بە قودرەتی ئیلاهی بوو. ئەمما ئەوەندە بە ترس و لەرز بە ناویدا ئەڕۆشتن (کانە)

خۆیان بەحرەکەیان شەق ئەکرد، بۆیێ ئەفەرموێ (بکم).

﴿فَأَنجَيْنَـٰكُمْ﴾ ئێوەمان ڕزگار کرد لە دەستی فیرعـەون. ﴿وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ﴾ فرعۆن و آلی فرعونمان خنکاند ﴿وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ۝٥٠﴾ ئەو نظـر و تەماشایە بۆ بنیاسرائیلی زەمان حەزرەتی موسی، ڕای العین بو، بۆ ئەوانـی زەمانی سعادەت نەجاتی بنیاسرائیلیان لـە بـەحـر و غـەرقـی فرعـون و آلـی فرعون لە بەحر، بێ واسطەی طبیعی ئەمرێک بـوو، مـشهوری انـام ـــ جـیلا بعد جیل ـــ بە تواتر قطعی گەیشتبوو، حتی (طبیعیون)ەکانیش ئەیـانزانـی. غایەتی خەریک بوون بعـضـــێ اسـبابی طبیعـی بـۆ بدۆزنـەوە، لـەبـەر ئـەوە (کانە) بنیاسرائیلی زەمانی سعادەتیش ڕای العینیان بۆ مشهودیان بوو، کە تەماشای خۆیان بکردایە، کانە تەماشای حادثەکەیان ئەکرد.

ئەگەر بەو نەوعە آبائی ئەوان نەجاتیان نەبوایە، ئەمـان هـەر نـەدەبـوون. حقیقة ئەو نظرە بۆ ئەهلی نظـر، گـەلـێ بـە قـووەت تـرە لـە تـەماشـاکردنی چاوی.. ئەوجا بزانین ئـەوانـە مقـابلی ئـەو نعمـەتـە عظمـایـە، ئـەو خارقـە کبرایە، ئەو عنایەت و کەرەم و لطفە، چییان کرد.؟

﴿وَإِذْ وَٰعَدْنَا مُوسَىٰٓ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً﴾ ئەمـەش یـاد بکـەن، کـە وەعـدەمـان دایـە حەزرەتی (موسی) بـۆ ڕێنیشـاندان، پـاش چـل شـەو کتێبێکـی پـێکـەڕەم بکەین، کە تفصیلی ئەم مواعدە لە بعضـــێ ئایاتی آتییە ئەزاندرێ.

تەئریخ عالم شاهدە و ئەمڕۆش، کـە ئـەڵـێن عـەصـری مدنیـەت و علمـە، عەینی حاڵ ثابتە. قەومی، میللەتی مغلوب لە نعمەتی علـم محـروم ئـەکـەن، تابتوانن لە گێژاوی جهلدا ئەیان خنکێنن. بنی اسـرائیلی، ئـەگـەر چ محـروم بوون لەو نعمەتە، ئەمما ئەوەندە غرقی جهالەت بووبوون.. حسیان نەدەکرد، لاکن حەزرەتی (موسی) زۆر متاسف بوو، دڵی بە قەومی خۆی ئەسووتا، لە پاش نەجات اهم مهمات لە نظر (کلیم) ئەوە بوو، کە خودای تعالی کتێبێکـی پێکەڕەم بکا بە طریقی تعلیم و تعلم، قەومی خۆی بکا بـە ئینـسان. گـەلـێ

جار ئارەزووی خۆی عەرزی (کبریائی) ئەکرد.

جەنابی باریش ڕووی قبولّی نیشان ئەدا، بۆیێ ئەفەرموێ (واعدنا) به (صیغەی مشارکە) پاش ئەوەی، کە خودای تعالی کتێبی احسان کرد بە موسی.. بە ئومێدی ئەوە بگەڕێتەوە، قەومی بەو نووری هیدایەتە لە بەحری ظلماتی جهل بهێنێتە دەرەوە.

حەقیقەت فەرقی بەحری جهالەت، فەرقی زۆرە لەگەڵ فەرقی بەحری ئاو. نەجات لە بەحری ئاو جسمانییە، نەجات لە بەحری جهالەت ڕوحانییە، حیوانیش ئەتوانێ بە مەلە لە ئاو بپەڕێتەوە، ئەمما لە حیوانیی خۆی ناتوانێ دەربچێ.

﴿ثُمَّ ٱتَّخَذۡتُمُ ٱلۡعِجۡلَ﴾ لە پاش ئەم هەموو حاڵ و حیکایەتە، گۆلکتان اتخاذ و قبوول کرد بە خودا. ﴿مِنۢ بَعۡدِهِۦ وَأَنتُمۡ ظَٰلِمُونَ ٥١﴾ دوایی چوونی حەضرەتی (موسی) بۆ میعاد. حقاً ظلمێکە لە ئەندازە بەدەر، عەقڵ تێیدا متحیّرە، لاکن جهل هەموو چشت بە ئینسان ئەکات.. ئەو ظلمە ظلمێکی ئەوەندە فاحش بوو، کە نابێتە خەیاڵ. هەروە کوو اتخاذی عجل لە غایەتی دووریدا بوو. غفویش لەو ظلمە لە منتهای دوورییە. بۆیێ بە عنوانی (ثم) ئەفەرمووێ:

﴿ثُمَّ عَفَوۡنَا عَنكُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ﴾ لە پاش ئەم ظلمە بێئەندازە، اصلاً حەقی عفوویان نەبوو. ئەمما جەنابی کبریائی لە غایەتی بەندە نوازی، ئەو ظلمە گرانەی بە شتی کەم هێنایە بەر نظر، مسامحەی فەرموو.

﴿لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٥٢﴾ بەڵکوو ئەوجا تێفکرن، شوکرانەی ئەو نعمەتی فوق النعمتە، فوقالقصور، فوقالخیال، فوق الأمل بکەن و، تاهەموو کەس بزانێ هەر کەسێکی ادنی ادنی ئەمەلێکی هیدایەتی لێبکرێ، خودای تبارک و تعالی دەرگەی ڕەحمەتی لێ نابەستێ، دڵی مۆرناکا، چاوی کوێر ناکا.

ئێوەش وەکو بنیاسرائیلی سطحیانە تەماشای ئایەتی خودا مەکەن،

ئەوجا تەماشا کەن قەومێ معاملەیان دەربارەی خوایێ، وا بە لطف و کەرەم، پێغەمبەری وا غەمخوار و ساعی بۆ نەجاتیان لەو مصیبەتە گەورە گەورانە، باوجودی نزیکی تاریخیان لە پێغەمبەرانی ئابائی کرامی خۆیان پاش ئەو معاملەی ملپانانە، کە دەربارەی پێغەمبەرانی دووای حەضرەتی (موسی) یان کرد؛ ئەبێ ڕەفتار و معامەلەیان دەربارەی ڕسولی عربی ﷺ بی؟!..

کەسێ ادنی معلوماتێکی بە احوالی ئەوان هەبێ، چۆن بڕوایان پێ ئەکا؟ پێیان هەڵ ئەخەڵەتێ (ارجوفەی) ئەوان چۆن ئەکاتە دەلیلی طعن لە قورئان؟ لە نبووەتی ڕەسولی ئاخر زەمان؟

پاش ئەو عەفوە، ئەو ئەمەلی شوکرانە بە ئومێدی ئەوە کە لە کتێبی ئیلاهی، ئەوجا استفادە بکەن، (کانە) سەربەخۆ بێ نظر بۆ مؤاخذەی سابقو اتخاذی عجل، تذکاریان ئەکا بە کتێبی هادی ئەفەرموێ:

﴿وَإِذْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْفُرْقَانَ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿٥٣﴾﴾ کتێبێکی فارقی بەحری جهالەت، هادی - ڕێی ڕشاد بە موسیمان کەرەم کرد لە ئەمەلی ئەوە، کە ئێوە نەجاتتان ببێ، چیتر دوای احساساتی خۆتان نەکەون. گەرچی جەنابی کبریائی، گوناهی بنی اسرائیلییانی نظر بە مەرحەمەتی خۆی کەم نواند. لاکن ئەو عفوە (سلمە السلام) بە جارێ هەموو بنیاسرائیلی لە ڕێدەرئەچوون. بۆیێ نسبەت بە حەضرەتی موسی تذکاری عفویان ئەکا ئەفەرموێ:

﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ﴾ کانە ئەو فکرو ڕەئییە، ڕاساً لە طرف حەضرەتی (موسی) وە بوو بۆ قەومی خۆی، بۆیێ نافەرموێ (واذ قلنا لقومه) و نوعاً ما انقطاعێکیش ئەنوێنێ، لە بەینی خودا و قەومی (موسی). حتی بە عنوانی بنی اسرائیلیش یادیان ناکا. حەزرەتی (موسی)، کە لە میعاد گەڕرایەوە مطلع بوو، لە سەر ماجەرا تاملی فەرموو، بە فکری صائبی

خۆی زانیندی، کە نەجاتی قەومی لە ظلماتی جهل نابێ، الا بە فەوتانی ئەو گرۆهە، کە گۆلکیان پەرست. بە ئومێدی نەجاتی بقیة لە کفر و ضلال قورتار بوونی گۆلک پەرستەکان لە عەذابی ابدی، چارەییێکی نەدیت الا انتحار. ئەوجا ڕووی کردە قەومی خۆی فەرمووی:

﴿يَٰقَوۡمِ إِنَّكُمۡ ظَلَمۡتُمۡ أَنفُسَكُم بِٱتِّخَاذِكُمُ ٱلۡعِجۡلَ﴾ دەنائەت و خەباثەتی نەفستان گەیشتوەتە دەرەجەیەک، نە تەنها لە زومرەی ڕسل، بەڵکوو خۆتان لە سلکی بشری دەرکردووە. اصلاً بە فکر و نظر، بە ئایاتی بینات اصلاحتان نابێ. لاکن هەر وەکوو لە دنیا انقطاعتان کرد لە خودا، با لە حیاتی عقبی لە ڕەحمتی خودا محروم نەبن.

﴿فَتُوبُوٓاْ إِلَىٰ بَارِئِكُمۡ﴾ رجوع بکەنەوە لای خودا، ئەمما بە تزکیە و تطهری نفس ئەو تۆبەیە غەیرە قابلە. ﴿فَٱقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ﴾ چارەتان نیـیە، الاّ انتحار نەبێ، خۆتان خۆتان بکوژن، نەوەک فرقەییێک فرقەییێک بکوژێ. مەبادا ببێتە سەبەبی عداوەتێکی زیاد لە بەینتان دا. چۆن تۆبە و انابەی ملائکەتان، ظهوری خەباثەتی شەیتان، چ چارەییێکیتری نەبوو، الا بە سجدە بردن بۆ حەضرەتی ئادەم، ئەمانیش چ چارەیان نیـیە الاّ انتحار. کەوابێ حاجەت بە تاویلاتی مەلایان نیـیە، کە خۆیان پێوە ماندوو کردووە.

﴿ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ﴾ بۆقیامەت ئەوەیە بە کە ڵکتان بێ ﴿عِندَ بَارِئِكُمۡ﴾ لەلای خودای خۆیان، ئەگەر بە هیچ نەوعێک چارەیان بکرایە، محقق قرار لەسەر انتحاریان نەئەدرا.

وادیارە ئەوانیش قبووڵیان کرد لە وەقتی شروع لە انتحار، حضرەتی (کلیم) خەبەری دانێ بە قبووڵی تۆبە، فەرمووی ﴿فَتَابَ عَلَيۡكُمۡۚ﴾ چونکە بە ڕاستی شەرطی تۆبەیان هێنایەجێ.

﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ٥٤﴾ لاشک قبووڵی تۆبە لەو نەوعە کەسە،

(ولو) بەو صورەتەش بێ عەینی مەرحەمەتە، زێرا ئەگەر خۆشیان انتحار نەکردبوایە، هەر ئەمردن و ذاتەن لە حیاتی مادی خۆشیان مایوس بوون. عجبا بزانین ئەو بقیەی باقیە، کە گۆیا لە پاش نزولی کتاب فارقی بین الحق والباطل مانەوە، بزانین لەو کتێبە استفادەیان چ بوو؟ بەو نوری نجاتە بۆ چ جهەتێ ڕۆیشتن؟ بۆ تذکاری حاڵی ئەوان ئەفەرموێ:

﴿ وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهْرَةً ﴾ کانە لە نتیجەی فضائلیان، وا تێگەیشتن لەو ئایاتی، کە حەضرەتی موسی بۆیان شرح و ایضاح ئەکا ئیمانەکەیان تقلیدی محضە، ئەیان ویست ئیمانەکەیان ببێ بە شهودی، وەک صوفییەی ئێمە، کە ئەڵێن نظر اعتباری پێنییە، هەر(شهود) حسابە، کە لە تصفیەوە پەیدابێ، بە ئایاتی پێغەمبەران ڕازی نین، ئەڵێن(حدثنی قلبی عن ربی) نازانن شهود هەر شهودی عقڵییە، ئەوەندە ئەحمەق بوون نەیان ئەزانی، کە دیتنی چشت لە مقولەی ئیمان نییە، ئەوجا گوتیان ابداً ئێمە ئیمان ناهێنین بۆتۆ.

وایان ئەزانی، کە شهودی ئیلاهی ئەوەیە، کە بە چاو ببینرێ و لە پێشەوەش قورئان، فەرمووی هیدایەتی کتێبی ئیلاهی ئەوەیە، کە قابلی ئیمان بالغیب بن. ئەوانی ئیمان بە غەیر محسوسات نەهێنن اصلاً لە کتێبی ئیلاهی استفادە ناکەن و، دیارە علیالعلوم ئەو بنیاسرائیلییانە حس پەرست بوون. لە عەصری (موسی) چۆن بوون، طبیعی لە عەصری (محمد) دەها خراپتر بوون، دیارە ئەم گرۆهە لە گۆلک پەرستەکان خراپتر بوون. ئەوان نوعاً ما انکسارێکی نفسی یان هەبوو، خۆیان لایق نەدەدیت، کە خودا ببینن، بۆیێ بە تمثال اکتفایان کرد، ئەمما ئەوانە بە غەیری دیتنی ذاتی کبریائی، بە چیتر اکتفایان نەدەکرد.

چارەی ئەوانە چییە؟ وەک مەلایانی ئێمە ئەفەرموون، لە حەق(عنادیون) نان سووتانە، هاویشتنە ناو ئاگرە. یا بسووتێن لە کوڵببنەوە، یا اعتراف بکەن.. دەست لە عناد هەڵ بگرن، بۆیێ ئەفەرموێ:

﴿فَأَخَذَتْكُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٥﴾﴾ بروسکەیێ ئێوەی گرت، خۆتان دیتان چ بروسکەیێ بوو، لە دانشمەندێکیان پرسی، بۆ ئینسان چ چاکە؟ فەرمووی علمێ کە عالەم نفعی لێ‌ببینێ. گوتیان ئەگەر ئەوە نەبوو؟ فەرموی: عەقڵێ کە مداراتی پێ‌بکا بە حسنی سلوک لەگەڵ عالەم بژیی. عەرضیان کرد، ئەگەر ئەوەش نەبوو؟ فەرمووی بروسکەیێک بێ لە ئاسمان لێ‌یداو بیسووتێنێ.

دیارە ئەم صاعقەیە، صاعقەیەک نەبوو، کە بە تەواوەتی بیانگرێ و بیانمرێنێ، بەڵام حرکە و هۆش و گۆشی لێ‌بررین.. هەر ئەوەبوو هەناسەیێکیان ئەهاتوو ئەچۆ، وەک مردوو بوون.

لەو ساڵانە لەلای (بێلاوە) بروسکە لە دوو کەسانی دا، یەکێکی دەرحال کوشت، ئەوی‌تریان چاکی نەگرتبوو، بەڵام وەک مردوو وابو بردیانەوە چەند رۆژ لە جێ‌کەوت، بێ‌هۆش و گۆش، بێ‌خواردن و خواردنەوە. دوایی وردە وردە چاک بووەوە، لاکن پاش چەندێ لە شەخصێکی بێلاوەیی ئەحواڵم پرسی، گوتی (حقیقةً) چا بۆتەوە، ئەمما ئێستاش هەر گێژ و وێژە، چ ئاگای لە خۆی نی‌یە. ئەو قەومە پاش بروسکەکە زۆر دوور بوون لە حیات، ئەمما جەنابی کبریائی بە قووەتی فاطری، چاکی کردنەوە، پاش ئەو مردنە زندووی کردنەوە.

﴿ثُمَّ بَعَثْنَٰكُم مِّنۢ بَعْدِ مَوْتِكُمْ﴾ لە پاش ئەو مردنەتان ﴿لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٦﴾﴾ بە رچای ئەوە ئێوە شوکرانەی خودا بکەن. لە مقابلەی ئەو حەیاتە حسی‌یە، حەیاتێکی معنوی، شعور و ادراکێک بە مقامی کبریائی پەیدا بکەن.

ئەو نەخۆشە بروسکە لێ‌دراوانە، گیان و بەدەن سووتاوانە، لاشک احتیاجیان بە دوو چشت هەیە؛ یەک: سێبەر بۆ فێنکایەتی، یەک خواردنێکی لطیف، هەم دەروون پاک بکاتەوە، هەم قووەت بدات.

لەو چۆل و صحرا و بیابانە، ئەو سێبەر و خۆرشە چۆن بە دەست ئەکەوێ؟ محضا بە قودرەت نەبێ دەستگیر نابێ، بۆیێ ئەفەرموێ:

﴿ وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْغَمَامَ ﴾ ئەو هەورە، کە مەنشەئی بروسکەیە بۆ ئێوەمان کردە چەتر و سایەبان، لە سەر ئێوەمان هەڵدا.

﴿وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ﴾ ناردمانە سەر ئێوە بۆ تنقیە و تقویە، گەزۆ و شێلاقە.

اکثری مفسرین ئەفەرموون (ترنجبین)ە. «آلوسی» ئەفەرموێ: (ترنجبین) شتێکە بە زەوی ئەچێ، مزرۆکەیە. گەلێک مفسریش تەفسیریان بە گەزۆ کردووە.

لە وڵاتی ئێمە لە شاخ وداخی کوردستانمان زۆر ئەکەوێ، وەک خوناوک ئەنیشێتە سەر دار و بەرد لەو جێی تەواو فێنک بێ ئەمەیی، ڕەق ئەبێ. لەو جێی گەرم بێ، یا وشک نابێ، کە کۆبکرێتەوە ئەوەی ئەکەوێتە سەر گیا و بەرد خەسار ئەبێ، ئەوێ ئەکەوێتە سەردار و باری بێبەر، لقەکانی دارەکە ئەبرن لە ئاوی گەرمی هەڵئەکێشن، ئاوەکە ئەکوڵێنن، تا نەختێ پەیت ئەبێ، ئەبێ بە دۆشاوی شۆک.

لە کوێستانان ئەوی سەر بەردان خرر ئەکەنەوە، سپی و خاوێن، اکثری ئەینێرن بۆ سلێمانی، حەلوایەکی زۆر خۆشی لێ دروست ئەکەن. ئەوی ئەکەوێتە سەر(گوین)ی لە وەقتی تەکاندندا وردە پەلک و تۆزی گوینی لەگەڵ تیکەڵ ئەبێ، بۆر ئەنوێنێ. ئەوی لە سەرداران بێ طبیعی لە وەقتی تەکاندندا، وردە پەلکی تێکەڵ ئەبێ سەبز ئەنۆینێ. وە هەمووی زۆر شیرین و خۆش و بە لەزەتە و ملیّنە و، بە گەلێ دەرمان ئەشێ.

(سلوی) تەفسیر ئەکەن بە نەوعە تەیرێک و(سمانی)، یا نەفسی سمانی، ڕەنگە لە ئاسمانی وەرگیرابێ. یا لە بەر ڕەنگی سماوی، کە ئەو تەیرە مەیلە و شینە، یا زۆر لە بڵندی یەوە دێ و ئەنیشێ.

گەلێ جار لە باوکم ئەبیست،کە تعبیری بە شێلاقە ئەفەرموو. (حقیقةً)

شێلاقەش تەیرێکی مەیلەوشینە زۆر نافرێ، باڵی سستە، گرتنی سەهلە. حتا کەسێکی شلەپەتە بێ، بە کاوەخۆ بڕروا بە کوردی ئەڵێن: (ئەڵێی شێلاقەی باڵ شکاوە).

ئەوجا لە جهەت لطف و عنایەتەوە ئەفەرموێ:

﴿كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡۚ﴾ لەو ڕزقە پاکەی، کە بۆمان ناردن لەو نباتات و بەری دارانە، کە لە ئەرز بۆمان خەلق کردوون، بخۆن.

ذاتەن کێوی (طور) وەکی (کۆسرەت) و چیای (سەفین)ی ئێمە، چیایەکی بە گیاو دار و بارە. ئەنواعی خۆرشی تێدا هەیە.. گەلێ کەس بەو موادی طبیعی‌یە ئەژیی.

حتی لە ساڵی گرانی (١٣٣٦) اکثری اهالی، بە کەنگر و امثالی وی زۆر چاک ژیان، لە مردن دەرچوون. ئینسان کە تەماشای عنایەتی جەنابی کبریائی ئەکا لەگەڵ بنی‌اسرائیلی‌یان و، معاملەی حقوق ـ شکەنانەی ئەوان دەهێنێتە بەر نظر؛ نزیکە بڵێ ظلمیان لە خودا کردووە (کانە) جەنابی کبریائیش ئەفەرموێ: وایە ظلمیان هەیە، ئەمما ظلم لەکێ ئەکەن؟

﴿وَمَا ظَلَمُونَا﴾ ئەو ظلمەیان لە ئێمە نەکرد، خودا لە زەرەر و زیان منزهە، وەک لە (حدیثی قدسی) فەهم ئەکرێ، ئەگەر هەموو عالەم لە ئینسان و (اجنە) اولین و آخرین لە غایەتی چاکی‌ی بن، چ لە موڵکی خودا زیاد ناکا، ئەگەر ئینسان و (اجنە)ی اولین و آخرین لە غایەتی خراپی دا بن نەقص بە مولکی خودا ناگا.

﴿وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ٥٧﴾ بە حەقیقەت ظلمیان لە نەفسی خۆیان کرد. عجبا پاش ئەو ئایاتی بیناتە، پاش ئەو تصریحاتی ئیلاهی‌یە، مەلایێ ئەتوانێ بڵێ «خودای تعالی لەگەڵ ئەم هەموو ئایات و معجزاتەی بۆی ئەنواندن، محضا بە خلقی خۆی دڵی ڕەق ئەکردن و، کفری تێدا خەلق ئەکرد» حقا ئەو فکرە دەرحەق بە خودا لە فکری بنی اسرائیلی یان

خراپترە و، بۆ ئوممەت زەهرێکی قاتلە.

وەقتێ کە فەرمووی لەو ڕزقە پاکە بخۆن، ئەمرێکی تریشی پێکردن؛ اولاً بە حسنی جوار لەگەڵ ئەو ئاوەدانیانەی، کە لە اطراف سینا بوون، تاکو بە تجارەت و معاملە و ئەم نەوعە چشتانەش ماڵ بۆ خۆیان پەیدا بکەن، بۆیێ دیسان بە طریقی تذکار ئەفەرموێ:

﴿وَإِذْ قُلْنَا ٱدْخُلُوا۟ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ﴾ بڕۆنە ناو ئەو دێیە، کە لە نیزیکتانە ئەیبینن. ﴿فَكُلُوا۟ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَدًا﴾ بخۆن لە محصولاتی ئەو دێیە لە هەرجێیەکی لە هەر نەوعێکی، کە محصولاتی هەیە.. جێیێ بە محصولات وخۆرش و واسعی هەیە، ئەمما چۆن بچن؟

﴿وَٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا﴾ بە دەرگەدا بچنە ژوورەوە بە خضوع و خشوع و، وقار و تمکین، استعطافی ئەهلەکەی بکەن.

﴿وَقُولُوا۟ حِطَّةٌ﴾ ئێمە هاتوینە جەواری ئێوە، ڕحالی خۆمان لە جەواری ئێوە خستووە.. ئەگەر وابکەن. ﴿نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَٰيَٰكُمْ﴾ ستری عیوبتان ئەکەین، بالطبع بە معاملەی دۆستانە لە وسائلی گوناهان دوور ئەکەونەوە.

﴿وَسَنَزِيدُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾﴾ بۆ ئەوانی، کە محسن بن ڕعایەتی حقووقی (جوار) بکەن، بە حسنی سلوک ڕەفتار بکەن، ئێمە علاوەی لێخۆش بوون احسانتان لەگەڵ ئەکەین، لاکن ئەمەیان نەکرد..

﴿ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ﴾ هەموو، یا بعضێ، کە ظالم بن، لە هەموو چشت تجاوز لە حد ئەکەن.. بەڕێی ڕاست دا ناڕۆن قسەکەیان گۆرری بە ﴿قَوْلًا﴾ بە قسەیەکی کە﴿غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ لَهُمْ﴾ غەیری ئەو قسەیە بوو، کە پێیان گوترا، چۆن ئێمە بەو نەوعە بچینە ئەو شارە، ئەو تذلل و نەرمییە بنۆینین، دیسان ئەکەوینە بەر دەستی ئەو قەومە، وەکو فرعونی عەذابمان ئەدەن.. تووشی ئەسارەت ئەبینەوە. جزای ئەو ظالمانە چییە؟.

﴿فَأَنزَلْنَا عَلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ لەسەر ئەو ظالمانە عەذابێکمان نارد لە طرف ئاسمانەوە، کە تعیین ناکرێ، ئەمەندە گەورەیە، بەڵام لام وایە پاش چەند ئایەتێ ئەو عەذابە دەرئەکەوێ.

ومن العجائب بعضێ لە (مفسرین) ئەڵێن: ئەو رجز من السمائە بەفر بوو بە سەریاندا باری، هەفتا هەزار کەسی لێکوشتن.. گەرچی ئەمە دوور نییە لە قودرەتی ئیلاهی. بەڵام لە گەڵ ئێرە هیچ مناسبەی نییە.. احتمالی هەیە ئەو مفسرە لە اهالی بلادی باردە بێ، زۆر دەرد و بەڵای لە بەفر چاو پێکەوتبێ!. سەبەبی ناردنی ئەم عەذابەش.

﴿بِمَا كَانُواْ يَفْسُقُونَ ﴿٥٩﴾﴾ بە سبب خروج لە اطاعە بوو. خروج لە اطاعە بوبوە خووی ئەوان وازیان لێ نەدەهێنا.

کەسێک ئەڵێ: ئەوە جهەتی خۆرشیان بە هەر حاڵێک بوو، تامین کرا.. ئەدی ئاو؟ خۆ حەیات بێ ئاو دەوام ناکا.. ئەو بەرو بیابانی، کە ئەو قەومە تێیدا بوو، گەلێ جیهەتی دوورە لە ئاو. ئەو قەومە چۆن ئیدارەیان ئەکرد بۆ بەیانێ کیفیەتی تامینیان لە جوابدا باز بە طریقی تذکار ئەفەرموێ:

﴿وَإِذِ ٱسْتَسْقَىٰ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ﴾ حەضرەتی موسی طلبی ئاوی کرد لە بۆ قەومی خۆی. حاجەت ناکا ئەمانە بڵێی بە وجهی عناد طلبیان کردووە.

وا دیارە کە حەضرتی (موسی)، ڕاسا جست و جۆی ئاوی کردووە و، ئەیزانی بە غەیری خوا، چ چارەسازێ نییە، کە لەو بیابانی وشکە ئاویان بۆ پەیدا بکا. لە جوابی دوعا و نیازی حەضرەتی (موسی)، جەنابی کبریائی ئەفەرموێ:

﴿فَقُلْنَا ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ﴾ ئاو پەیدا کردن لەو جێگایە، کەمتر نییە لە شقی بحر بەغەیری (خرقی عادەت)، بە چیتر چارەی ناکرێ، حەضرەتی (موسی) لەسەر ئەمری خودا عصای خۆی لە بەردیدا.. هەر بەردێ بێ، امتیازی بەردێ لە بەردێ نییە بۆ ئەم جهەتە. بعضێ مەلا

زۆر بەردی دووریان هاویشتووە، بەڵام نەکەوتوەتە بەر عصای (موسی).. حاصڵی قسەکانیان وشک و بێئاوە.

﴿فَٱنفَجَرَتۡ مِنۡهُ ٱثۡنَتَا عَشۡرَةَ عَيۡنٗاۖ﴾ در عقب هەل کولی لە بەرد، یا لە ضربی عصا. لێرە بۆ (مرجعی ضمیر) کامیان دوورترە، ئەو نزیک ترە، زێرا علتی حقیقی قدرەت و عنایەتی ئیلاهی‌یە. ئەوجا ئەو ئاوە لە ژێر نظارەتی حەضرەتی (موسی)لە بەینی اسباط تقسیم کرا بە نەوعێ:

﴿قَدۡ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٖ مَّشۡرَبَهُمۡۖ﴾ هەر کەس جێگای شرب و حەقی شربی خۆی لێ معلووم بوو بە نەوعێ، کە کەس تجاوزی لە حەقی کەس نەکا. وەک شاری کۆیە، بعضێ لە ئاو، ئەخنکێن بێزارن لە ئاو، بعضێک بۆ ئاو ئەمرن.

مەگەر جەنابی کبریائی، کەسێک بنێرێ لە جیاتی (عصا)، بە بۆڕی ئاسن ئاو لە.ناو شار بگێڕێ، هەر کەس مشربی خۆی بزانێ.

ئەوجا لە پاش اکمالی نعمەتی ئیدارە لە خواردن و خواردنەوە ئەفەرموێ:

﴿كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ مِن رِّزۡقِ ٱللَّهِ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ٦٠﴾ عادەتە قەبیلەیی زۆر، کە لە موقعێکیان هەڵدا، پاوانی، سوتەنی و مەرعای حیوانات بۆ هەر شعبەیێک تعیین ئەکرێ. ئەگەر وانەبێ ئەکەونە (مشقت) تووشی شەرر و هەڵلا ئەبن؛ حەضرەتی (موسی)ش هەر وەکو ئاوی بەسەردا تقسیم کردن.. پووش و پاوانیشی بۆ تعیین کردن، چونکی لە (تحتی نظارتی) خۆی نەبوو وەک ئاو، ئەمری پێکردن.. تنبیهاتی دان، کە لەو حدود و مواقعی ئەرضی بۆیان داندراوە، تجاوز نەکەن.

لە ڕووی فساد و انتظام تێک دان، با وجودی بە گوێرەی احوال (فوق مایتصور) تامینی ئیدارەیان کرا و، لە پێشەوە حەضرەتی (موسی) نشانی‌دان ئەگەر خواهش معیشەتی حەضرەتیان هەیە.. ئەها لەم دێیە ئەتوانن خۆرشی مدنی بە چنگ خۆتان بخەن، نەشیان کرد لە ڕووی بێعاری

و بێشەرەفی، عەرضی حەضرەتی (موسی)یان کرد: ئێمە لە سەر ئەو معیشەتە صبر ناکەین، باز جەنابی باری بە نەهجی سابق ئەفەرموێ:

﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَـٰمُوسَىٰ لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ وَٰحِدٍ﴾ خۆرش ئەگەرچی دوو سێ ڕەنگ بێ ئەمما، کە بە دائمی بێ، هەموو ڕۆژ لەوی زیاتر نەگۆڕرێ بەیەک ڕەنگ حسابە و، هەم ماکولاتی (بەری) خصوص بنجی گیایان بە اکثریت تامیان یکەو دیارە ئارەزووشیان ئەوە بوو خواردنی مدنی بە طریقی معجزة بۆیان پەیدا ببێ، بۆیێ عەرضیان کرد:

﴿فَٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ﴾ دوعابکە بۆ ئێمە، کە خودای تۆ دەر بکا بۆ ئێمە لەو شتانەی، کە ئەرز پێی ئەگەیێنێ، فەرقی چیە بریەو بستانی وایان ئەنواند، کە ئەوی ئەوان طلبی ئەکەن، شتێکە حاضر و مهیا، هەر هێنانە دەری پێ ئەوێ.. وەکو پیفۆک، گێزبەلە، کەنگر و دومبەلان. ئەو چشتەکەش...

﴿مِنۢ بَقْلِهَا﴾ لە گیای بستانی وەک بامیە و باینجان و تەماتە، بەڵکوو وەک گێزەر و شێلم و توور و پەتاتە، کە ئەوانیش وەک بری لەناو ارضدا کۆ ئەبنەوە، ئەیهێننە دەرێ و ئەیخۆن.

﴿وَقِثَّآئِهَا﴾ تەرووزی، خصوص ئەو دێمیش ئەبێ..

﴿وَفُومِهَا﴾ گەنمی، ئەویش زۆر حاجەتی بە سقی نیە.

﴿وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا﴾ (لە نیسک و پیازی ئەرزی و سائری ماکولاتی بستانی، کە وەک ماکولاتی بری ئەرز پێی ئەگەیێنێ. ئەو قەومە تەماشایان کرد خودای تعالی بحری بۆ شەق کردن، بە ضربی عصای (موسی)لە بەردی ڕەق دوازدە کانی بۆ دەرکولاندن، لاشک ئەوانە زۆر دوورن لە قاعدەی طبیعەت). هێنانە دەری گیا و گول و ئەم دانەوێڵەیە بە نظر ئەو خوارقە عظیمە، بە نظر قودرەتی ئیلاهی، هیچ ئەهمیەتی نیە.. مادام ئەمانەی بۆ

کردین، ئەمانەشمان بۆ بکا، کە زۆر سەهل تریشە!! بەڵام ئەمە جهلە:

(اولاً : بالکلیە خروجە لە نظامی طبیعەت، لەو قاعدە، کە خودا داینانوە.)

(ثانیاً: خوراقی ئیلاهی بە گوێرەی موقعە بۆ ئەصلی وجود، بۆ ادامەی حەیات.. گەلێ چشت محضاً بە قودرەتی خۆی ئەیکا؛ حتی ئەمڕۆش هەر وایە..)

(ئینسان و سائری حیوانات لە ناو ڕەحمی داکی دا، لە بدئی تکون چی ئەخوا؟ چۆن ئەخوا؟ بە چی ئەخوا؟ کە هاتە دونیا بێهێز و بێددان بە غەیری شیر، کە خوا بۆی مهیا کردووە و دایکی بۆ تسخیر کردووە، چی دی بخوا؟ پاش ئەوەش، کە گەورە بوو، ئەبێ هەر وای بژیێنێ، کار و کەسبێک بکا؟

فەرخەی پەڕەسێلکە بێلاق و بێباڵ، لە ناو هیلانە چۆن بەخێو ئەکا؟ پاش ئەوەی، کە باڵی بوو و هاتە فررین و فرری.. طبیعی تەرزی معیشەتی ئەگۆررێ.

ئەگەر ئینسان بە تامل تەماشا بکا، ئەزانێ عالەمی ئینسان وحیوان لە طورێک بۆ طورێک ئەچێ، کە احوالاتی طوری سابقەی لەگەڵ طوری لاحقەی هیچ مناسبەی نییە.

ئەو بنی اسرائیلییانە لە هەموو چشت تجاوز لە حد ئەکەن، بۆ لای (الاە) ئەڵێن : « ارنا اللە جهرةً». بۆ لای (طبیعەت) ئەڵێن، هەموو قواعدی طبیعەتمان بۆ تێک بچێ. بۆ (معجزة) ئەڵێن، ئەبێ لە هەموو حاڵێ بۆمان بێ، نازانن کە معجزە کە بۆ ئەصلی ادامەیان بوو؛ ئەمما ترفیهی معیشەت، گۆناگۆنی اطعمە، خۆرشی حضری ئەبێ خۆیان پەیدای بکەن.

خودا گەنم شین ئەکا، تا دێتە زەمانی درەو.. ئەوی لازم بێ خۆی ئەیکا (بعدە) ئەبێ ئینسان بیدرۆیتەوە، بیکا بە خەرمان، گێرەی بکا، شەنەبای بکا، لە دەستار یا لە ئاشی بکا، بیکا بەهەویر، ئەنگوتک ئەنگوتک.. بیکا بە نان، ئەوجا بیخوا... جەنابی حەضرەتی (موسی) بە

کمالی (تحیر) ئەفەرمووێ:

﴿قَالَ أَتَسْتَبْدِلُونَ ٱلَّذِى هُوَ أَدْنَىٰ بِٱلَّذِى هُوَ خَيْرٌ﴾ (موسی) گوتی: ئەوی چاک بێ بۆ ئێوە ئەیگۆڕنەوە بە چشتی خراپ؟ عجبا نازانن ئەگەر جەنابی کبریائی لەو بیابانە خۆرشی مدنیتتان بۆ خلق بکا، بێ ڕەنج و(تعب) بێتە بەر دەستتان، بە جارێ بێ کەلک ئەبن.

پیاوی مەرد و بەسعی و جەنگ ئاوەرتان لێ پەیدا نابێ.. ئەمما بەو خشونەتی عەیشە زۆر مامولە، کە ئینسانی (بدوی)تان لێ پاشەکەوت ببێ، گورج و گۆڵ و بە نیشاط و بە قووەت.. ئەمڕۆش ئەوا ئەیبینن تەن و مەندی، صاغلەمی قووەت و چوست و چالاکی یەک، کە لە عربان و لادێییەکاندا هەیە، لە شارستانییەکاندا نییە.

بناءً علیە، بە تەمای معجزە و خارق العادە مەبن.. خۆتان جست و جۆ بکەن، پەیدای بکەن.

﴿ٱهْبِطُوا۟ مِصْرًا﴾ هەڵڕژێنە شارێک لە شاران، چ لەلای سوریە، چ لەلای مصر بۆ هەر شارێک بچن.

﴿فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلْتُمْ﴾ وە الاّ ئەم ئارەزووەتان نایێتە جێ.. ئەو قەومە بێعارە، بێنظر و اعتبارە، کە تەماشای خۆتان کرد، اصلاً قابلیەتێکیان لە خۆیان دا نەدیت، کە ڕوو بکەنە شارێ بە قووەی بازووی خۆیان، معیشەتێکی حضری بۆ خۆیان پەیدا بکەن.. خۆیان لە نهایەتی ڕەزالەت، دەمارحیزی، خیسەت و دنائەت، بێمەکنەت و مکانەت چاو پێکەوت..

دەرگەی (خوارق)یشیان لێگیرا.. ئەوجا بە جارێ ﴿

وَٱلْمَسْكَنَةُ﴾ ڕەزیلی و دەنائەت بوو بە قوبە و خەیمەیەک لە سەریان هەڵدرا.. ئەم (رجز)ەیە، کە لە ئاسمان بۆیان هاتەخوارەوە، کە لە هەموو علویت ڕووتکران، دوێنێ لە عنایەتی ئیلاهی هەوریان لە سەر هەڵدرا.. ئەمڕۆ لە دەنائەت و خیسەتی خۆیان ڕەزالەتیان لە سەر هەڵدەدرێ!.

ئەوەش هەموو ئەمەرەی اعتماد علی الغیره، دووای خوارق کەوتنە، بۆیێ (سعدی) ئەڵێ:

(بکوشید تا جامەی زنان نپوشید)

﴿ ﴾ گەڕانەوە لەگەڵ غەضەبی خودا، یاخود مستوی بوون لەگەڵ غەضەبی خودا.. ئەوەش سەبەبی چیبوو؟

﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ﴾ ئەوان بە واسطەی ئایاتی خودای، کە لە حەقیقەتدا بۆ ارشاد و هیدایەتە، کافر ئەبوون. لە کفردا استمراریان ئەکرد. لە مراتبیدا قادرمە بە قادرمە هەوراز ئەچوون.

﴿وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ﴾ ئەو انبیایانەی، کە خەریکی اصلاحیان بوون، گۆیا تربیه و تعلیمیان بکەن، ئەیان کوشتن، بە هیلاکیان ئەدان. لە بەر عنادی ئەوان ڕوحیان ئەکەوتە عەذاب، لە حەیات مایوس ئەبوون.. ئارەزووی مەرگیان ئەکرد.

(حقیقةً) مامۆستای چاک، بە چەنگ فەقێی تێنەگەیشتوو و لاسار، ڕوح و نشاطی تفهیم و تعلیمی ئەمرێ، نامێنێ. کەوابێ ئەم قتلە قەتڵێکی معنوییە، چونکی هێشتا بنی اسرائیلی نەگەیشتبوونە ئەو زەمانەی، کە پێغەمبەرەکانی خۆیان ئەکوشت، بە کوشتنی مادی باسی ئەوان لەمەودوا دێ. بەڵام لەبەرئەوەی عبارەتەکە یەکە، بەبێ نظر بە مەقام، گەلێ مفسر ئێرەشیان هەر بەقتلی حسی تەفسیر کردووە، ئەمما ئەوە غەفڵەتێکی زۆر گەورەیە. ئەمەیە کە عەرضیان بکرێ (تقتلون النبیین بغیر حق).

﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەم ئەحواڵاتانەشیان، کە دەکرد ﴿بِمَا عَصَوا۟﴾ بە سبب ئەوە، کە ابایان ئەکرد لە اطاعە ﴿وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ۝٦١﴾ لە هەموو جهەت تجاوزیان لە حد ئەکرد، هەم لە جهەتی الوهییەت، هەم لە جیهەتی نبووەت، هەم لە جیهەتی معجزە، هەم لە جیهەتی طبیعەت. لە ئایاتی مذکورە لە ضمنی ئەو دوو بانگە، دەر ئەکەوێ مایەی خەلاص، ئیمان و اخلاصە،

اعمالی چاکەیە؛ ئەوی بصولّحێ بۆ دنیا بۆ دنیا. ئەوی بصولحێ بۆ قیامەت بۆ قیامەت..

اعتماد لەسەر شفاعەت، پشت بەستن بە کرامات و خارق العادة، خۆ هەڵدانەوە بە باب و باپیر؛ سببی هیلاکە.. تا هەموو کەس بزانێ ئەو حوکمە ثابت و مقرّر و لا یتغیره، تەنها بۆ بنی اسرائیلی‌یان نی‌یە، بەڵکو بۆ هەمە ئومەمە. ئەفەرموێ:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلنَّصَـٰرَىٰ وَٱلصَّـٰبِـِٔينَ﴾ هەر قەومێ بێ خصوص لە (ملیّـون) کە اسبابی خۆپێ هەڵخەڵەتاندنیان لاهەیە ﴿مَنْ﴾ هەر کام لە ئەوانە ﴿ءَامَنَ بِٱللَّهِ﴾ ئیمانی بە ڕاستی بە خودا بێنێ، بێ شائبەی بتپەرستی ﴿وَٱلْيَوْمِ ٱلْأَخِرِ﴾ ئیمان بە ڕۆژێ، کە کەس بەفریاد کەس نایێ بە غەیری ئیمان و عملی چاکە و ئیمان بە ڕۆژی قیامەت بەو نەوعە و اعمالی چاکە، کە ببێتە مایەی سعادەتمەندی دنیا و قیامەت، هەر لە پێغەمبەران وەر ئەگیرێ، کەوابێ ئیمان بە ڕۆژی قیامەت؛ بێ ئیمان بە پێغەمبەران تەواو نابێ.

﴿وَعَمِلَ صَـٰلِحًا﴾ خۆی سعی و کۆشش بکا، اعتماد نەداتە سەر شفاعەت و کەرامەتی آباء و اجدادی ﴿فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ بۆ ئەوانە اجری خۆیان لەلای خوای خۆیان.

﴿وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ﴾ ترس غەلەبەیان بە سەرا ناکا، بۆ کەس زەلیل و منقاد نابن خەیمەی زیللەت و مسکنتیان بە سەردا هەڵ نادرێ.

﴿وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ۝٦٢﴾ عاجز نابن، ئەگەر خەسارەتیشیان لێبکەوێ. تاثیریکی وایان تێناکا، کە مایوس ببن لە کار و عمل بکەون..

ئەی موسڵمانینە! لەم ئایاتی قورئانی تامل بکەن، تێبفکرن لە احواڵی خۆتان. ئەوی بە سەر ئوممەتەکانی‌تردا هاتووە، عەینی حاڵیش بە سەر

ئێوە داهات. سوادی اعظیم لە خودا دوورن، بە نسب و انتساب مغرورن، لە چاکە و خراپە ناپرسن، لە ڕۆژی جەزا ناترسن، بە اغلبی عقیدە سستن، بە اکثری گۆلک و کەر پەرستن!.

بالخاصة لەم زەمانەدا، خەیمەی بێغیرەتی و ناموسیتان لە سەر خۆهەڵدا، ناموس و غیرەت و ئاهەنگی کوردی، بە ناوی طریقی (خالدی) مجددی نقشبندیتان بەر هەوا کرد.

(سابقاً) لە میانەی باس و خواسی گۆسالە پەرستەکان فەرمووی: کتێبێکی فارقی بین الحق و الباطلمان بە ڕچای هیدایەتی بنیاسرائیلی کەرەم کرد بە حەضرەتی (موسی)، (کانە) کەسێک ئەڵێ: ئەوا جهەتی تنظیم ئیدارە و معیشەتی

بنی سرائیلیمان زاناند و، عاقیبەتی کاریشیانمان لا معلووم بوو.. ئەو کتێبە چی لێهات؟

بنیاسرائیلی چۆنیان وەرگرت بە ئارەزوو و خواهشتی خۆیان، یا بە جبر و شددەت، باز بە وجهی تذکار ئەفەرموێ:

﴿وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَكُمۡ﴾ عەهد و پەیمانی ئێوەمان وەرگرت. ئەمما چۆنمان وەرگرت؟ بە صورەتێکمان وەرگرت، کە (محیر العقولە) بە نەوعێ، کە نەبووە و نەدەبێ.

﴿وَرَفَعۡنَا فَوۡقَكُمُ ٱلطُّورَ﴾ کێوی طورمان بە سەردا بڵند کردن.. ئەگەر قبووڵی نەکەن؛ بە سەرتانا بەری ئەدەینەوە، پانتان ئەکەینەوە.

﴿خُذُواْ مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم بِقُوَّةٖ﴾ وەربگرن ئەو کتێبەی، کە بە ئێوەمان کەرەم کردووە، بە جبر و شددەت. بە تۆبزیەکی ئەوتۆ، کە ڕێگای ئەم لاو ئەولاتان نەبێ. یا بە جبر و شددەتی خۆتان لە سەر نەفسی خۆتان. تۆبزی لە خۆتان بکەن.. کتێبەکە وەرگرن، هەر وا بە سەرسەری تەماشای مەکەن.

﴿وَٱذۡكُرُواْ مَا فِيهِ﴾ ئەوی تێیدایە لە حکم و مواعظ و ارشاد، چاکی

وەربگرن، عملی پێبکەن.

﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾﴾ بەشکم خۆتان ئەپارێزن بە فکر و نظر، چاکە و خراپە لێک ئەکەنەوە: لە اعتقادیات و عملیات، ئەوی چاکە قبووڵی ئەکەن و ئەیکەن، ئەوی خراپە لێی دوور ئەکەونەوە.

ئەمما تەفسیری (قوة) بە جد و نشاط زۆر دوورە لەو هەنگامەدا. جد و نشاط لە کوێ پەیدا ئەبێ؟

جد و نشاط بۆ کەسێکە، بە مەیلێکی وجدانی ڕوویکاتە تعلم، کەوابێ دیارە ئەم تعلیمە، تعلیمێکی اجبارییە، جبرێکی وا بە شددەتیش بەو نەوعە نەبوایە، اصلا بنیاسرائیلی ڕوویان لە کتێبەکە نەدەکرد.

حتی ئەمڕۆ بعضێ لە موسڵمانان، ئەوەندەیان ڕق لە علم و معارف ئەبێتەوە ئەگەر چیای پیرەمەگرونیان بە سەردا دەی، انجا بە کمالی پێناخۆشی، ڕوویکەنە علم و علما.

وە اکثری بشر طبعا (تنفر) ئەکا لە علم، بۆیێ حکومەت لەم عصری علم و معارفدا، قانوونی اجبارییان داناوە بۆ تعلیم و تربیەی اولادی ئوممەت.

بناء علیە، حاجەت بە (چۆن و چرا)ی مەلایان نییە. جێگە جێگەی ضرورەتە. بە ضرورەت نەبێ نابێ. ذاتەن ئەوی ئاگاداریی بەسەر ئەحواڵی ڕوحیەی اقوامی بشر نەبێ.. ڕەنگنییە تەفسیری قورئان بکا!. مەعانە بەو هەموو جبر و شددەتە، ئەگەرچی زەمانێکی کەم تمسکتان بە کتێبەکە کرد، بەلام.

﴿ثُمَّ تَوَلَّيْتُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ﴾ حقاً ئەوە زۆر دوور بوو، پاش ئەو جبر و شددەتە، پاش ئەو قبوول و امتثالە، ڕوو وەرگێڕانتان لەو کتێبە هادییە، قەت نەدەبوایە ببێ.

لەبەرئەوە مستحقی عذابی زۆر عظیم بوون، کە قیاس لە انتحارو بروسکەلێدان نەکرێ. لاکن فەضلی خودای مانع بوو.

﴿فَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ لَكُنتُم مِّنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٦٤﴾ لاشک ئەوی استماعی ئەو ئایەتانە بکا، دێتە خاطری: (ربنا)، ئەگەر لطف و مەرحەمەتی تۆ نەبووایە، ئەبووایە چ عەذابێکیان بە سەر بێ؟ بە چی گرفتار ببن، کە خەسارەت مەندی دنیا و قیامەت ببن!؟

بۆ خاتری ئەوانی (حاضرون) تێبگەن، کە لایقی چ نەوعە عەذابێکن، جەنابی کبریائی بە خطاب لەگەڵ ئەوانەی، کە حاضری زەمانی سعادەتن و مستمعی ئەو ئایەتانەن، ئەفەرموێ:

﴿وَلَقَدۡ عَلِمۡتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعۡتَدَوۡاْ مِنكُمۡ فِي ٱلسَّبۡتِ﴾ کە ئەحواڵی ئەوانیش پاشدان معلووم ئەبێ، لە سەر ئەم تجاوزە با وجودی بە نظر تجاوزی ئێوە زۆر کەم بوو.

﴿فَقُلۡنَا لَهُمۡ كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ٦٥﴾ یەعنی حەقیان ئەوەبوو، کە بیانکەین بە مەیموون.. وەکو ئەوانەمان کردن بە مەیموون، نەوەک مەیموونی لە طبقاتی ڕاقیە وەک (شەمپانزی) و اشباهی ئەوان، بەڵکوو مەیموونەکانی (خسیس) بێ ادراک.

محقق مسخی ئەو قوڕپەسەرانە بە مەیموون، لە نتیجەی مسخی معنوی ئەو گرۆهە عنودە بێشعورە، کە ئابائی کرامیان بوون، وە لەو ئایەتی کەریمە استفادە ئەکرێ: ئەوی افتخار بە آباء و اجدادی خۆی بکا؛ عاقبەت ئەبێ بە سەگسار، بە جارێ لە طبیعەتی ئینسانی دەرئەچێ.

بۆیێ باوکم لە زەمانی منداڵیمدا، بعضێ اشعاری کوردی مشفقانە و ناصحانەی بۆ دائەنام. ازجملە ئێستاش ئەم دوو بەیتەم لە خاطرە: —

مەلازادەی نەخوندی مثلی سەگسار
دەبێ هەر هەڵپەڕێ یا وەک سەگی هار
قول و قاچی موسڵمانان دەرێنێ،
لە سفرەی ظالمان نانێ ڕفێنێ..

ئەمما مع‌الأسف، ئوممەت وها مسخ بووەتەوە، علاّمەی دەورانیان لا، لە مەیموون کەمترە!.

﴿ فَجَعَلْنَٰهَا نَكَٰلًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا ﴾ ئەم عقوبەتەمان گێررا بەعبرەت بۆ ئەوانەی، کە لەو عەصری بوون و بۆ ئەوانەی، کە لە دوا هاتن.. یەعنی ئەوانەی دیتیان و، ئەوانەی بیستیان، منع ببن لە (شەمو) شکاندن.

حتی ایستاش، گەلێ جولەکە ناوێرن شەمو بشکێنن، بەلاّم لە شارە گەورەکانی وەک، بغدا و استانبول و پارس و لۆندەرە.. تازە جەوانەکانیان ئەوا وردە وردە شەموو ئەشکێنن.

﴿وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٦٦﴾﴾ موعظە بە چشتێ ئەڵێن، کە ذکر بکرێ بۆ گوێ دێران، تشویقی تێدا بێ بۆ کردنی چاکە.. تخویفی تێدابێ بۆ نەکردنی خراپە، ئەوی متقی بێ.. وەعظ لە گوێ ئەگرێ، چاکە ئەکا لە خراپە ئەگەڕێتەوە. نەوەک تەنها شەموو عینی حادثە، بەڵکوو هەرچی بێ، ئەمری خودای تێدا بێ، خۆی لێ ئەپارێزێ.

وەکو اشارەمان بۆ کردن، ئەوانی بوون بە مەیموون، گەلێ لە دوای (موسی) بوون، بەلاّم پێش زەمانی سعادەت بوون، لاکن بۆ ئەو فائدەی، کە عەرضمان کردن، ئەو ماجرایەی هێنا میانە، بدیهی‌یە ئەوە خطاب نی‌یە لەگەڵ بنی‌اسرائیلی‌یەکانی زەمانی (موسی). کەوابێ نەدەبوو ئەوانی ناظرن لێرانەدا مشوش ببن. ئەوجا وەکو ئەو قصەیە کەوتە میانە، ایجاب ئەکا اسلوبی خطاب لەگەڵ بنی‌اسرائیلی زەمانی موسی بگۆررێ، بۆیێ بەم عبارەتی آتی‌یە، بەیانی حادثەیەکی مهم ئەکا. ئەفەرموێ:

﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُوا۟ بَقَرَةً ﴾ نەیفەرموو (واذ قلنا لکم اذبحوا بقرة) لە بەر ئەم سررە مخفیە، جەنابی کبریائی نظمی واقعی تێکدا، مؤخری مقدم کرد، دووبارە بە تەرزێکی تر باسی قەومەکەی

هێنایەوە ناو.

سبحان الله لەو هۆندنەوە عجایبە ئەوەیە، کە ئەڵێن: نەظمی قورئان معجزەیە. کەسێکی تەفیسری قورئان لە سەر نەظمی حاضر نەکا، بە ڕاستی تەفسیری قورئانی بۆنایێ.

ئەوجا حەضرەتی (موسی) بەقەومی خۆی فەرموو، خودا ئەمرتان ئەکاتێ (بقرە)یێ بکوژنەوە، نێر بوو.. مێبوو.. ئەگەرچی لازم نیە، ئەمما لە بعضێ أوصافی آتی دەرئەکەوێ، کە مێ بووە بۆیێ ئێمە تەفسیری ئەکەینەوە بە (چێڵ).

﴿قَالُوٓاْ﴾ لە جوابدا ﴿أَتَتَّخِذُنَا هُزُوٗاۖ﴾ ئەتۆ ئێمە ئەگێرری بە قەشمەرجاڕێ خۆت، گەپمان پێئەکەی. حاڵی ئێمە لە کوێ، چێڵ کوشتنەوە لە کوێ؟ « کەر لە کوێ کەوتووە و کوندە لە کوێ درراوە ». لێرانەدا سررێک هەیە، کە ئەو ئەمرەیان بە دوور ئەزانی، پاشدان لە نهایەتی قسە عەرض ئەکرێ.

﴿قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ٦٧﴾ فەرمووی، خۆم ئەپارێزم بە خودا، کە لە زومرەی جاهلان بم، قەشمەری بە خەڵک بکەم. خصوص درۆ بە خودا هەڵ ببەستم. دیارە ئەوەندە قەدر و قیمەتی حەضرەتی (موسی)یان لانەبوو، کە ئیمان و اخلاصی ئەو دەربارەی خودا، ناهێڵێ ئەو نەوعە درۆیە هەڵ ببەستێ.

وە (فيالحقيقە) قەومێ هەن ئەڵێن: « ئەو پێغەمبەرانە بۆ اصلاحی بشر، ئەو نەوعە قسانە ئەکەن و ئەڵێن: خودا وای فەرمووە، ئێمەیان ناردۆتە سەر ئێوە بە پێغەمبەری نەهیتان لە ئەوە ئەکا بۆ خاتری بشر اعتماد بداتە سەر قسەیان، لە خراپە واز بێنن، بێنە سەر چاکە، والاّ طریقی ڕسالەت و نبووەت نەوعێکیترە. »

ئەم گرۆهە، با وجودی خۆیان بە حکما حساب ئەکەن، ئەمما حەقیقەت زۆر جاهلن. کەسێکی ئەوەندە درۆزن بێ، شەرم لە خودا نەکا، درۆ و

دەلەسە بە زوبانی هەڵ ببەستێ، چۆن اصلاحی خەڵقی ئەکا؟ حاشا مەقامی ڕسالەت لەو نەوعە تسویلاتە، لەو طبعی شاعرانە منزهة، منیش ئەڵێم: (اعوذ بالله ان اکون من الجاهلین).

﴿ قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ ﴾ مادام قسەکەت بە جدیيە لە خودای خۆت بەیان بکا بۆ ئێمە، ئەو چێڵە چیيە ؟ لە چ عمر دایە؟ سبحان‌الله لەو انقطاعە، نە (موسی) دەڵێ (ربکم)، نە عەرضی (موسی)شیان کرد (ربنا).

﴿قَالَ ﴾ فەرمووی ﴿إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ ﴾ ئەو چێڵە چێڵێکە ﴿لَّا فَارِضٌ وَلَا بِكْرٌ ﴾نە پیرە نە جاحێڵە..﴿عَوَانٌۢ بَيْنَ ذَٰلِكَ ﴾ناونجیيە لەبەینی جاحێڵی و پیری. وانیيە لە یەکیان نزیک تر بێ لە یەکیان. ﴿فَٱفْعَلُوا۟ مَا تُؤْمَرُونَ ﴿٦٨﴾﴾ ئەوجا ئەوی ئەمرتان پێئەکرێ، بیکەن. ظاهر بە بقرەیێ (هکذایی) اکتفا ئەکرا. ئەمما ئەوان زیادە (تعیین)یان خواست، لە بەر سررێکە لەمەو دوا عەرض ئەکرێ.

﴿قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا ﴾ ڕەنگی چیيە؟ ﴿قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَآءُ ﴾ چێڵیکی زەردە ﴿فَاقِعٌ لَّوْنُهَا ﴾ ڕەنگەکەی زەردێکی خالصە، نە مائل بە سووریيە، نە مائل بە سپیيەتیيە، ئەوەندە ڕەنگی لطیفە.. ﴿تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ ﴿٦٩﴾﴾ ئەوی تەماشای کا کەیفی پێدێ. ئەوجا لە ظاهردا نافەرموێ: (فافعلوا ما تؤمرون).

یا، لای وابو ئەوەندە کافیيە، چیتر مراجعە ناکەن، یا ترسا ئەمریان بکاتێ، باز (تعنت) ئەکەن و علی الحالین نەیان کرد. ﴿قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ ﴾ بە تەواوی بەیانی بفەرموێ، ئەو بەیانی، کە فەرمووی واضح نیيە، هەزار چێڵی وا هەیە نازانین کامە هەوە.

﴿إِنَّ ٱلْبَقَرَ تَشَٰبَهَ عَلَيْنَا وَإِنَّآ إِن شَآءَ ٱللَّهُ لَمُهْتَدُونَ ﴿٧٠﴾﴾ مەقصودمان لەو

مراجعاتە عناد نی‌یە، مقصودمان ئەوەتە غەرضی ئیلاهی بە دەربکەوێ، کە چ چێڵێکی مەقصودە.

ئەگەر (نادر الوجود)یش بێ، ئێمە انشاءالله ئەی دۆزینەوە، پەیدای ئەکەین، (ولو) بە قیمەتی زۆریش بێ، ئەی‌کڕین.

﴿قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا ذَلُولٌ﴾ ئەو چێڵە چێڵێکە، نەرم نەکراوە بۆ جووت کردن. نیری نەچووەتە سەر شان، کە ﴿تُثِيرُ ٱلْأَرْضَ﴾ ئەرز بکێڵێ ﴿وَلَا تَسْقِى ٱلْحَرْثَ﴾ وە نەرمیش نەکراوە، کە لە ناعور و چشتی وا بخرێ، ئاوی پێ‌بکێشن بۆ زراعەت.

﴿مُسَلَّمَةٌ لَّا شِيَةَ فِيهَا﴾ سەلامەتە لە عەیب، یا وەکو کوردی ئەڵێ: (مسلم کراوە) لە ئیش پێ‌کردن. وەکو کەسێکی، کە خەرج و پیتاکی لێ‌نەستێنن و، ئەڵێن ئەو (مسلمە)، یەعنی نە بەبار، نەبەگێرە، بە هیچ نەوعێ نەرم نەکراوە و هیچ عەلامەتی فارقەی نی‌یە بە اعتباری ڕەنگی. نە لە ناو چاوان، نە لەسەر کلکي، نە لە سم و لاق.

ئەوجا ﴿قَالُوا۟ ٱلْـَٔـٰنَ جِئْتَ بِٱلْحَقِّ﴾ الآن (بقرە)کەمان بۆ معلوم بوو، اشتباهی تێ‌دا نەما. ئەو اوصافە منحصری (فی الفرد)ە. ئەوانیش چێڵەکەیان دۆزی‌یەوە، بە هەر نەوعێک بوو، بە دەستیان خست. (حکایەتی پێ‌ناوێ چۆنیان بەدەست خست).

﴿فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٧١﴾﴾ چێڵەکەیان کوشتەوە، بەڵام نێزیک بوو نەیکەن.

بعضێ مەلای اصولی، عیناً لەو مەشرەبەدان، مثلاً ئەڵێن: ئەگەر ئایەتێک وارد بوو، ئەبێ استفسار بکەی، خاصە یا عامە؟ مطلقە یا مقید؟ منسوخە یا ثابتە؟ ئەگەر تخصیص کرابێ، هەر عملی پێ‌ناکرێ.. احتمالە گەلێ چشتی دیشی لێ استخراج کرابێ و ئێمە نەزانین.

لاکن اصحابی گزینی محمد (صلی الله علیه وسلم) لەم فاک و فیکە دوور بوون. ئەمرێ کە لە طرف ڕسالەت پێیان بگەیشتایە، دەرحاڵ مبادەرەیان پێئەکرد، ئەو احتمالی خیاڵی یەیان بە دڵی مبارکدا نەدەهات.

ئەوجا پاش محاورەی (کلیم) لە گەڵ قەومی خۆی، زۆر جوان هەڵ ئەستێ، کە جنابی باری بە نەهجی سابق لەگەڵ قەومی (موسی) بکا، بفەرموێ:

﴿ وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا ﴾ شەخصێکتان کوشت، (کانە) هەموو شەریکی ئەم قتلە بوون. ﴿فَادَّارَءْتُمْ فِيهَا﴾ نزاعتان تێدا ئەکرد. هەر شعبە لە ملی خۆی دائەڕنی، بە ملی ئەوی تری دائەدا، کردتانە پشێوی. مقصودیشیان ئەوە بوو، ئەو خوێنە (هدر) بێ. ذاتەن لە هەموو عەصردا اکثری جرائم، کە بزر ئەبێ، فاعلی دەردەست ناکرێ، بە جزای خۆی ناگا، قباحەتی ئوممەتە!

حتی ئەمڕۆ ئەوی شەهادەتی قتلیشی لەلابێ خۆی، ئاگای لێبێ کەسێ کەسێکی کوشتبێ، ولوحکومەت جبری لێبکا، شاهدی نادا. ئەو خصلتە پیسە باعثی تێکچوونی نظامی عامە، (مع انە) ئەو جدال و خصامی ئێوە، بۆ اخفای قاتل، بێهوودە دەرچوو.

﴿وَاللَّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ٧٢ ﴾ ئەوی ئێوە بزرتان ئەکرد، خودا اظهاری ئەکا.

﴿ فَقُلْنَا اضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا ﴾ خودا ئەفەرموێ: گوتمان بە بعضێ گۆشتی چێڵەکە لە (مقتول)ەکە هەڵسوون - هەر بعضێ ببێ، هیچی لە هیچی زیاتر نسبەتی بۆ زندوو بوونەوە نیيە، کەوابێ بە تعیینی بعضێک، لە هەر دووکیان خۆ ماندوو کردن بێهوودەیە. ئەوانیش امتثالیان کرد، شخصەکە زندوو بووەوە، قاتلی ئاشکرا کرد.

﴿كَذَٰلِكَ يُحْيِي اللَّهُ الْمَوْتَىٰ ﴾ بەو نەوعە جەنابی کبریا، مردووان زیندوو

ئەکاتەوە. نە عیسی بە وەکاز، نە ملائکەت بە بانگ کردنی اموات. خلاصە هەرچی بە خەیالا بێ، بە غەیری قودرەت و حکمەتی ئیلاهی، چی تر تاثیر لە زندوو بوونەوەی مردوو ناکا. نافەرموێ (کذلکم)، بەڵکوو خطاب ئەکا لەگەڵ هەر کەسێکی، کە قابلی خطاببێ.. تێبفکرێ، کە بزانێ احیا و اماتە، خاصەی جەنابی کبریائیە.

ئەمما توجە ئەکاتەوە اسرائیلی، بە جمع ئەفەرموێ: ﴿وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ﴾ گەلێ ئایاتی خۆی بە نیشان ئێوە ئەدا، بۆتان ئەنوێنێ.

﴿لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ٧٣﴾ بە ئومێدی ئەوە، کە عەقڵێ پەیدا بکەن، چونکی تێگەیشتن و پێگەیشتن، هەر بە عەقڵە.

ئایەتی کریمە دەلالەت لەوە دەکا، کە چشتێ واقع بووە لە زەمانی حەضرەتی موسی، بۆیێ جوولەکەکانی زەمانی (نبوي)، نەیان توانی انکاری بکەن بەوە، کە ئەو ماجەرایە لە تەوراتی ئیستایاندا نییە، نابێ ئێمە صەرفی عبارەت بکەین لە صریحی خۆی، چونکە تحریف و تبدیل و تغییر و حذف و زیادە و نقصان کردن، لە بنیاسرائیلی دوورنییە! (الی الیوم ومن الیوم الی الابد). وە تطبیقی ئایەتی قورئان لەگەڵ (مافي التوراة)ی ئێستایان غەیرە قابلە ...

حاصڵی ما فی التوراتیان ئەمەیە: «کەسێک بکوژرابوایە، لاشەی لە دەرەوە فرێبدرایە، ئەبوایە شیوخ و قضاتی بنی اسرائیلی بچن تەماشا بکەن، ئەم لاشەیە لە کامە گوند نێزیکترە، گۆیا ئەوان متهم ئەبوون. بۆ دەفعی تهمەت، شیوخی ئەو دێیە گۆلکێکی جووت و مووت پێنەکراو هەلگرن، بیبەنە شیوە دۆلێ، کە ئاوی دائم پێدا بڕوا و نەکێڵدرابێ. لە وادییەکەدا ملی عجلەکە بشکێنن، ئەوجا شیوخی ئەم دێیە، دەستی خۆیان لە سەر کەلاکی عجلەکە بشۆن و، هاواربکەن: دەستی ئێمە ئەو خوێنەی نەرژاندووە.. چاوی ئێمە نەیدیووە.. خوایە عفوی شعبی خۆت بکەی.

« ئەوجا ئەوانی، کە دەخلیان لە قتل هەبێ، ناوێرن ئەمە بکەن ».
ئەوە لە کوی؟ و ما فی القرآن لە کوێ؟!.
جارێ ابداً موافقە لەگەڵ (اضربوه ببعضها) ناکا و، تاویلی (کذلک یحیی الله الموتی)ش ڕوحی ئایەتەکە ئەبا (ویریکم آیاته لعلکم تعقلون). ئەبێ بە چاوی کوێر و بێعەقڵی تەماشا بکرێ، چونکە ئەو حیلەیە (کولی نانییەکانیش) ئەیکەن، مثلاً دزی یێ بکرێ لە پەلکەنانان ناونوس ئەکەن، ئەڵێن ئەوی ئەودزییەی کردبێ، پەلکەنانەکەی پێی قووت نادرێ، لە گەرووی ئەمێنێ.. پێی ئەخنکێ!. ئەوجا واهمە ئەیانگرێ،ماڵەکە ئاشکرا ئەبێ.
عجبا ئەوە ئایەتێکە کە خودای تعالی بەو نەوعە بەیانی قودرەت و حیکمەتی خۆی پێبکا؟
تێناگەم (مجددی مصری)، کە کێوی علمە، باقری دقایقە، لێرە و لە مسئلەی ڕەفعی کێو لە سەر بنیاسرائیلی، ئەو لەق و لۆقە، ئەو تزلزل و اضطرابە بۆ ئەکا؟
من کە ئیمان بهێنم بە شقی بحر، بە دەرکۆڵینی دوازدە کانی لە بەرد؟ بۆ ئیمان ناهێنم بە هەڵگرتنی کێو و، زندوو کردنەوەی مردوو؟ مع انە امر بە ذەبحی بقرە، بۆ کەشفی سرێکی مکتومە، نەدەبوو لە مجددی مصری، علامەی عصری بزربێ!.. لە ایامی فراعنە، مصری علیالاکثر بقرە پەرست بوون، بقرەیێ بە نەوعێک لە اشکال و ڕەنگ و علامەتی ممتاز؛ بنی اسرائیلیش (خدمە)ی ئەو گۆلکانە بوون ـ کە ولی عهدی الوهیتی بقرەیە لە واندا انتخاب ئەکرا ـ بۆیێ محبەتی عجل لە دڵیاندا شین بووبوو، زۆر مائل بوون بە بقرەپەرستی. غایەتی بعضێ لە خۆفی موسی اظهاریان نەدەکرد؟، بعضێکێش، کە لە ئەوان دوون تر بوون لە غیبوبتی (موسی) بۆ میقات، فورصەتیان زانانـد تمثالی گۆلکیان پەرست، بقیەش لەو سۆز و گودازە دابوون بۆ خاتری ظریف (ما فی الضمیر)یان بە دەربکەوێ. لەم

حادثەیە (فرصةً بالاستفادة) حەضرەتی (موسی) ئەمری کردنی، بقرەیێ بکوژنەوە، چونکی آلهەی مصری‌یە، دائماً لە خەیاڵیاندا تجسمی کردبوو، زۆر ترسان، کە لەو جنسە، بقرە مقصود بێ، بۆیێ قەناعەتیان حاصل نەکرد، الا بە نفي (علامەتی فارقە). ئەوجا دڵیان هاتەوە سەرخۆی. لاکن حەضرەتی (موسی) تێی گەیشت، چەجای ئەو بنی ایسرائیلی یانە بەئەو احیایە ئیمان بهێنن!؟ کفریان پێ زیاد بوو. دیارە (بقرە) خصوصاً، کە نەوعە امتیازێکی هەبێ، سرڕێکی حەیاتی تێداهەیە، کە بە لێدانی بعضێ لە گۆشتی پاش کوژرانەوەی، ظاهریش مردی زندوو ئەبێتەوە. ئەمەش دیارە سرّێکی الوهییەتە. لەبەر ئەوە ئەفەرموێ:

﴿ ثُمَّ قَسَتۡ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ ﴾ لە پاش ئەم احیایە ﴿فَهِيَ كَٱلۡحِجَارَةِ أَوۡ أَشَدُّ قَسۡوَةٗۚ ﴾ دڵی ئێوە وەکو بەردە، بەڵکو لەبەرد ڕەق ترە.

قابلە، بحر بە عصا شەق ببێ، ئاو لە بەرد دەرکوڵێ، بەڵام فێر بوون و چشت زانین، ئەبێ لە مەیل و هەوەسێک بێ، کە لە دڵی نەرم دەرکوڵێ.. هەموو اعضا و أعصاب نەرم بکا، کە توجە بکاتە مزرەعەی علم، بە فکر و نظر، کشت و کەیلی بکا، حقائق و دقایقی لێ بهێنێتە دەرەوە. ئەوە اصلا بە ضربی عصا نابێ..

استادی مشفق ئەبێ سعی بکا، ئەو مەیلە لە دڵاندا شین بکا، دیارە دڵی ئێوە لە بەرد ڕەق ترە، چونکی:

﴿وَإِنَّ مِنَ ٱلۡحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنۡهُ ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ ﴾ ذاتەن ئەوزێیە گەورە گەورانە، لەو ڕوبارانە پەیدا ئەبێ، کە سەرچەشمەیان لە چیایان هەڵئەکوڵێ.

﴿وَإِنَّ مِنۡهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخۡرُجُ مِنۡهُ ٱلۡمَآءُۚ ﴾ بعضێک هەیە لەو بەردانە، لەبنەوەیان ئاو هەیە، ئەو ئاوە وردە وردە تاثیری تێئەکا، نفوذی ئەبێ لە لای سەرەوە، گەلێ درزی تێدا پەیدا ئەبێ.. ئاوەکەی لێدێتەدەرێ.

**﴿وَإِنَّ مِنۡهَا﴾ بعضـێک هەیە لەوبەردانە ﴿لَمَا يَهۡبِطُ مِنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِۗ﴾ وردە وردە بە بەفر و باران و شەختە و با، پارچە پارچەی لێ ئەبێتـەوە، نقصان ئەکا،ضـعیف ئـەبـێ، وەک کـەسـێکی، کـە خـوفی خـوا تـاثیری تـێبکـا بـی تاوێنێتەوە، گەلێک لەو بەردانە هەیە، کە هیچی نامێنێ، دەبیـتن بـە ڕەمـل، بەڵام دڵی ئەو بنیاسرائیلی‌یانە، نە بە ڕفق و مـەرحـەمـەت، نـە بـە عنـف و شددەت نەرم نەبوو.**

**ماء الحیاتی ئیمانی تێدا پەیدا نەبـوو، ئـەو نـەوعـە کـەسـانە لـە هـەمـوو طوائفی بشری زۆرن. تعجب ئەوەیە بعضـێ دڵ لـە نـەرمـی حیـزیدا، واڕەق ئەبێ.. هەزار چشتی بێناموسی و بێغیرەتی و مذلـەت و احتقـار بـەسـەری دادێ، اصلا متاثر نابێ، بەڵکوو وا ئەبێ کەیفی پێدێ، دیارە هەموو چشت افراط و تفریطی مذمومە، دڵ نە ئەوەندە ڕەق بێ ئیمان بە خـودا نـەهێنـێ، نە ئەوەندەش نەرم بێ بە ناوی خودا گەووادی و دەویتی قبووڵ بکا، ئەوجـا عەذابی ئەوانە چ بێ؟ بە چینێ نایێتە خەیاڵ و تـصور، بـە غـەیری ئـەوەی، کە بڵێین:**

**﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ٧٤﴾ هەر کەسـێ گـوێی لـەو ئایـەتانـە بـێ، تەماشای (سیر)ی بنیاسرائیلی بکا، قطعی امل لە ڕشاد و هیدایەتـی ئـەوان ئەکا.**

**لـە ڕەوشـتـی عالـەم معلـوم بـووە و عـەقـڵ جزمـی پـێدا نـەهێنـێ، هـەر حکومەتێ، هەر دینێ، هەر مـذهبێ، هـەر حزبـێ، کـە تـشکل بکـا.. ئیمـانی ئەوان بەو مبادئەی، کە ئەساسی تەشکیلاتی لە سەر ئەکەن.. لـە اخلاقیـان بە قووەت ترە.. ئەوی مقصودیان ئەیکەن بـە (مثلـی اعلـی).. ڕوح و مـاڵ و اولادیان لە ئوغوردا صەرف ئەکەن.**

**بنیاسرائیلی‌یەک ئەوە حاڵی اسلافیان بـێ، عجبـا ئـەبـێ اخلافیـان چۆن بێ؟**

کەوابێ ئەی موسڵمانینە! ﴿أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُوا لَكُمْ﴾ ئایا ئێوە طمع ئەکەن، کە ئەوانە بۆ خاتری ئێوە و لە محبەتی ئێوە ئیمان بێنن؟ کە علاوەی ئەو هەموو سیئاتە (زاد في الطنبور نغمة).

﴿وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِن بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ٧٥﴾ تا ئێستا باس و خواسی رجالی (حل و عقد) بو. ڕؤساء و سەرآمەدەکان معاملەیان چۆن بوو لەگەڵ حەضرەتی (موسى)، بەیان کرا.. لەم فەصلە بەیانی حاڵی مەلایەکانیانە لە گەڵ کتێبی ئیلاهی.. ئەوانیش سێ فرقەن:

قسمێکیان، زۆر چاک لە تەورات گەیشتوون، قسمێکیان هەروا سەرسەری بە(ظاهری ألفاظی) هەڵخەڵەتاون. قسمێکیش هەم تێی گەیشتوون، هەم عملیان پێکردووە.. ئەمما ئەوانە ئەوە نین بە فرقە و قسم یاد بکرێن، لە میانەدا اشارەیان بۆ ئەکرێ.

١ ـ قسمی اول: فضل لە ئەوەی عملی پێبکەن، تحریفیان ئەکرد لە پاش ئەوەی، کە بە زەریفی تێی گەیشتبوون و شک و شوبهەیان نەمابوو، وەکو حەکیمی جەربەزە، با وجودی لە حقایقی اشیا زەریف ئەگا، ئەمما فکری مشاغبە و مغالطە غەلەبەی لێ ئەکا، تحریف و تبدیلی حقائقی موجودات ئەکا. تبدیل و تحریفی ئەوانیش وا نەبوو بە مەعنابێ، بەڵکوو بە الفاظ ئەیانگۆڕی. ئەو نەوعە فرقەیە حیلەیان زۆر گەورەیە، قیاسی لە هیچ مەکر و کەیدی تر ناکرێ.

کتێبی ئیلاهی وەک هەنگوینێکی زەهر ئالوودی لێ ئەکەن،خەڵقی بە هەنگوینی تێ ئەگا ئەیخوا، بەڵام زەهر ئاڵوودە ئەکوژێ و هەر دینێ، کە تێک چووبێ، بەو نەوعە مکارانە تێکچووە، مع الأسف دینی اسلامیش بەو نەوعە مکارانە لە باریەک هاتەدەرەوە.

﴿وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ کە ملاقاتیان ئەکرد لەگەڵ ئەو مەلایانەی

خۆیان، کە بە ڕاستی ئیمانیان هێنابوو، فکری خۆیان ئەکردە تابعی حەق، نەوەکو حەق بکەنە تابعی فکری خۆیان.

﴿قَالُوٓاْ ءَامَنَّا﴾ ئێمەش وەکو ئێوە ئیمانێکی بە ڕاستیمان هەیە، تەورات کتێبێکی منزلە لە طرف خوداوە بە سەر حەضرەتی (موسی)، تفریقی محکم و متشابهی ئەکەین، ئەوی علممان پێی نەبوو ڕائەوەستین، تجاوز لە مقداری فهم و ادراکی خۆمان ناکەین.

﴿وَإِذَا خَلَا بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٍ﴾ کە بعضێ لەم فرقەیە، ئەچوونە لای بعضێکیتر لە خۆیان ﴿قَالُوٓاْ﴾ ئەم بعضە بەو بعضەیان ئەگوت:

﴿أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ﴾ گۆیا ئەم تحریفات و تبدیلات و تغییراتەیان، کە ئەکرد بە فتوحاتێکی ئیلاهییان ئەزانی، ئەیان گوت ئێوە بەحث ئەکەن بەم فتوحاتەی، کە خودا لەگەڵ ئێوەی کردووە، لە گەڵ ئەو مەلایانەی، کە ملاقاتیان لە گەڵ ئەکەن، ئەو ئایەتە کلمەیەکی پێ ئەوێ، کە تێیدا زیاد بکرێ.. وە الاّ مەعنای نایێ.. یا ئەبێ ئەو ئایەتە شتێکی زیادە لێی فرێبدرێ، یا ئەو لفظە بە لفظێکیتر بگۆررێ.

حاصلی ئەو کتێبە نقصانە، ئەبێ اکمال بکرێ، ئەمانەیان بۆ باس ئەکەن، کە بەیانیشی بکەن.

﴿لِيُحَآجُّوكُم بِهِۦ عِندَ رَبِّكُمۡ﴾ بە حجەت و بە دەلیل، غلبە بکەن لە سەر ئێوە لای خوای خۆتان. بڵێن: یاربی ئەوانە دەشڵێن ئەم کتێبە کلامی تۆیە، کەچی ئەڵێن ئەم کتێبە احتیاجی هەیە بە اکمال، بە ترمیم. وەلای ئەهالیش شەرمە زار ئەبن، چونکە ئەم فتوحاتی ئێوە، هێشتا نەچۆتە اذهانان؛ ئەمڕۆش لە عالەمی اسلامەتیدا ئەم نەوعە فرقە هەیە وەک، (بهائی) و(قادیانی) ئەڵێن حەضرەتی (محمد) پێغەمبەرە، قورئانیش کلامی خودایە، ئەمما احتیاجی بە اصلاح هەیە.

عەجایب ئەوەیە، ئەوی بەجیهەتی اصلاحی ئەزانن، لە قوانینی فەرەنگیان وەرگرتووە، خۆیان پێئەکەن بە مصلح و ئەمڕۆش خۆیان لە جێێ نادەن، کە بزانن مەلای چاکی تێدایە! بەڵام لەناو قەومی ضعیف العقل اظهاری ڕسالەت ئەکەن، فضل لە اصلاح.

﴿أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ٧٦﴾ ئەوەندە عەقڵەتان نی‌یە، ئەوان الزامتان ئەدەن مفتضحتان ئەکەن، صبر بکەن تا ئەم فکرە، وردە وردە استیلای اذهانی قەوم ئەکا، ئەو وەقتە علی العموم، ئەو تحریفاتەی ئێمە بە فتوحاتی ئیلاهی تلقی ئەکەن.

ئەو جۆرە مەلایانە نامێنن، ئەگەر بشمێنن نفووزیان نامێنی، میللەت گەمەیان پێئەکەن.

جنابی حەق لە ڕەددی ئەو گرۆهە غافڵە ئەفەرموێ، بالغرض ئەوا خۆتان نەجاتدا لە ئابرروو چوونی دنیەوی. حیلە و کید و فێڵی خۆتان بزر کرد، ئەدی چ دەکەن لە جهەتی خودا؟

﴿أَوَلَا يَعۡلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعۡلِنُونَ ٧٧﴾ ئایا نازانن، کە خودای تعالی عالمە بەوەی بە دزی ئەیکەن و، بەوەی ئاشکرا ئەیکەن. ئەگەر بڵێن ئەوانە وەکو بعضێ حکماء ئەڵێن خودا علمی بە جزئیات نی‌یە، یا بڵێن شت هەتا ئاشکرا نەکرێ، خودا نایزانێ، ئەڵێین ئەو قصە بالکلیة لەگەڵ ئیمان بە نبووەت دوورە، مەلا باشەکان فرقەی دووەم بوون.. ئەمما وەکو عەرضم کردن، چونکی کەم بوون لە میانەدا ئیشارەی بۆکرا.

٣ ـ فرقەی سێیەم ﴿وَمِنۡهُمۡ أُمِّيُّونَ﴾ لە حەقیقەت جاهلن ﴿لَا يَعۡلَمُونَ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّآ أَمَانِيَّ﴾ هیچ لە کتێب نازانن، الا مقدرات و خەیاڵی خۆیان بە علمی تام تێئەگەن، بێمحاکمە و تفکر،دوای (اکذوبە) و خەرافات ئەکەون، خصوص کە ناوی معجزە و کەرامەتیش هاتە سەر، ئەوجا مەپرسە! وەکو (قصاص) و حیکایەت خوانەکانی ئێمە، حکایات و خەرافات عینا وەکو

حکایەتی ئەسکەندەر و ڕوستەم، قسەی پووچ تێک ئەخەن. لە مەقامی وەعظ بە سەر موسڵمانانیا ئەخوێننەوە.. موسڵمانانیش (صدق ونیم دەق) پێیان بڕوا ئەکەن.

﴿وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ﴾ ئەو فرقەی کەوا کلامی خوایان تحریف ئەکرد، وەکو عەرضم کردن (من حیث اللفظ و العبارة) بوو، نەوەک تحریفی مەعنا و بەس. بۆیێ خودا ئەفەرموێ:

﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ الْكِتَابَ بِأَيْدِيهِمْ﴾ بە دەستی خۆیان کتێب ئەنووسنەوە ﴿ثُمَّ يَقُولُونَ هَٰذَا مِنْ عِندِ اللَّهِ﴾ پاشان ئەڵێن ئەوە لە طەرەف خودایە. عجبا ئەو جەسارەتە بۆچی ئەکەن؟ خۆیان مستحقی ویل و حقارەت و ئابڕروو چون و، حەسرەتمەندی ئەکەن؟.

﴿لِيَشْتَرُوا بِهِ ثَمَنًا قَلِيلًا﴾ تاکوو بەو محرّفة فائدەیێ کەم، عەرضێکی دنیەوی و دەنی بکڕن.. بیهێننە دەستی خۆیان. ئەوەش حقیقة موجبی حەسرەتە.. گوناهی دەنائەت کارانەیە.

﴿فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ﴾ لە خەط دەستی خۆیان، یا لە دەست - خەتی خۆیان. هەم لە مەکتوب هەم لە کتابەت.

﴿وَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا يَكْسِبُونَ ٧٩﴾ هەم ویل بۆ ئەوانە لە سەر ئەوەی، کە کەسبی ئەکەن لەو (ثمنەقلیله)ی، کە وەری ئەگرن، یەعنی لە مکتوب و کتابەت و فائدەی کتابەت ئەوی بۆ ئەوان بێ حەسرەت و ئەندۆە و عەذابە..

ئەو فرقە لە عالەمی اسلامەتی‌دا هەیە، بەڵام ناتوانن اظهاری تحریفاتی خۆیان بکەن، لە بەر بعضێ اسباب: -

اولاً: قورئانی عظیم الشان، لەبەر بەلاغەت و فەصاحەت و جزالەت و تەرتیب و نظمی، هیچ کلمەیەکی اجنبی قبووڵ ناکا.. وەکو دورر و لؤلؤ و

یاقووت و مەرجان، (خەرمهرەی) لەگەڵ ناهۆندرێتەوە!. کەسێ بیشیکا پێی داناپۆشرێ، زوو بە دەر ئەکەوێ.

دووەم: کثرەتی حفاظی قورئان. حتی ئەمرۆش کەسێک لەسەر مەحفەل، یا لە مەجلسێک قورئان بخوێنێ، ئەگەر غەلەطیك بكات لە هەموو طەرەف صدای (چی-چی-چی-چی) بڵند ئەبێ، وائەبێ (قارئ القرآن)ەکە لە خەجاڵەتان قورئانی پێناخوێندرێ.

ئەمما لە تحریفاتی معنەوی قصوریان نەکردووە، کەسێ تەماشای تفاسیری (رافضی)یان بکا، قورئانی بە شەهنامەی علی، خودا یا پێغەمبەری بە (فردەوسی) دێتە بەر نظر (ویل لهم ویل لهم) وە لەمەودوا لە تراجیمی قورئان بێشک تحریفاتی زۆر ئەکرێ، خۆزیا کە تەرجەمەش ئەکرا لە طەرەف مەلایەکانی بەدین و زوبان زان و محرری چاک بکرایە.

سابقاً عەرضمان کردن مەداری نەجات، بە ئیمان بە خودا و ڕۆژی جزاو بە عملی صالحە. ئیمانی صحیح بە قیامەت - لاشک - ئینسانی سەوق ئەکا بۆ چاکە، ئەگەر ئەو ئیمانە صحیحە نەبێ، ئینسان چاک نابێ، ڕوو لە چاکە ناکە..

کەوابێ یەگانە سەبەبی جسارەتی ئەم گرۆهە چی یە؟ بێئیمانییە ئەم هەموو فساداتانەیان ئەکرد.

﴿وَقَالُواْ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعۡدُودَةً﴾ ئەیانگوت ئاگر بە ئێمە ناکەوێ ئێمە ناگرێ، الاّ چەند ڕۆژێک نەبێ، ئەوەش بۆ ئەوان، کەسانەیە، کە عبادەتی عجلیان کرد و، نائلی شەفاعەت نابن. هەفت ڕۆژ بە قەدەر عومری دنیا، کە هەفت هەزار ساڵە عەذاب ئەدرێین. ڕۆژێ مقابل هەزار ساڵ (حەقیقة) حسابی زۆر ناڕێکە، زۆر بێمەعنایە، ئەگەر بە قەدەر ایامی عبادەتیش بوایە، هەر چاک بوو نسبەتێکی هەبوو! (مع انه) زەمانی عەذاب بە گوێرەی زەمانی، کفر و گوناە نییە.

مثلاً کەسێ هەفتا ساڵ لەسەر کفر بژیێ، بڵێ خوا نییە. خۆ ناڵێ خوا

هەفتا ساڵە نی‌یە، بەڵکوو لە آنێکدا نەفی‌ی وجودێکی ازلی و ابدی ئەکا.
کەسێ زللەیەک لە یەتیمێ ئەدا، عەذابی ئەو بە گوێرەی ئەو آنە نی‌یە، کە زللەکەی لێ‌ئەدا، بە گوێرەی ئەو قساوەت و دڵڕەقی‌یە، کە بووەتە کیفیەتێکی ڕاسخ لە دڵی‌دا.

مەلایانی ئێمەش لەو نەوعە اغرایە خۆیان نەپاراستووە، حتی بعضێ ئەڵێن: گەرمی‌ی جهنم لە سەر موسڵمانان، بە قەدەر گەرمی‌ی حمامە، وە ئەو موسڵمانی بچێتە ناو جهنم، خەوی لێ‌ئەکەوێ.

سبحان‌اللە، کە ئێمە الحمدللە موسڵمانیشین، ئیمانمان بە خودا و پێغەمبەر و ڕۆژی جزا هەیە، گەلێ شەو لە هاوین لەبەر گەرما خەومان لێ‌ناکەوێ، خاصة کە پێشکەش دەورەمان لێ‌بدا، دیارە ئەو قەومە چەندیان ئیمان بە حمام هەیە، هەر ئەوەندەشیان ئیمان بە جهنم هەیە، (مع انە) کەس لە ناو حمام خەوی لێ‌ناکەوێ.

﴿قُلْ﴾ یاڕسول الله ﴿أَتَّخَذْتُمْ عِندَ ٱللَّهِ عَهْدًا﴾ ئایا عەهد و پەیمانتان لە خزمەت خودا وەرگرتووە؟ ﴿فَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ عَهْدَهُۥٓ﴾ ئەوە قطعی‌یە، کە خودای تبارک و تعالی عەهدی خۆی ناشکێنێ.

﴿أَمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٠﴾﴾ یا خود افترا ئەکەن قسە هەڵ ئەبەستن، ئەوە جهلی خۆتانە ئەڵێن خوا وای فەرمووە، بێ‌وەثیقە و دەلیل و بورهان. (حقیقة) ئینسان، کە ترسی لە خودا نەبێ لە هیچ ناگەڕێتەوە، کوا شخصی وەک (مهیب) لە خوا نەشترسێ عصیانێ نەکا، ئەو نەوعە کەسە نادرە، حتی ئەویش فەرضی‌یە. سەروەری کائنات، حبیبی خودا لە هەموو کەس زیاتر لە خودا ئەترسا خەڵقی دی چۆن ئەبێ نەترسێ، بەو هەموو عەیب و عار و گوناە و شەرمەزاری‌یە؟!

بزانن. ئاگاداربن ئەی (قربای) کرامم، ئەوانەی کە لە (ملیّون) حساب ئەکرێن دوو قسمن: مطیع و عاصی؛ هەریەک لەو دوو قسمە دوو نەوعە:

دڵنەرم و دڵقاسی.

گوناهکاری دڵ نەرم، ئەگەر لە سەوق و شەوقی شهوانی، گوناهێکی لێ صادر بێ، شکستێکی قلبی، انکسارێکی ڕوحی، ئێشێکی وجدانی بۆ پەیدا ئەبی. ئەو ذیللەتە، ئەو انکسارە، ئەو ژانە خۆی جەلبی لطف و مەرحەمەتی ئیلاهی ئەکا. حتی خەجاڵەت و انفعال ئەیگەێنێتە نێزیک مایوسی، ئەو خەجاڵەتەی لا، گەلێک لە عەذابی حسی گرانترە، وەک (خیام) ئەڵێ:

با نفس همیشه در نبردم چ کنم
و از کردەی خویشتن بە دردم چ کنم
گیرم کە مرا فرو گذاری بە کرم
زان شرم کە دیدی کە چ کردم چ کنم[1]

گونەهکاری دڵ ڕەق خاصە، کە اولادی دڵ ڕەقان بێ وە، یا خود بە نەسەبی مغرور بێ هەزار گوناە بکا، ذەرڕەیێک متاثر نابێ خەجاڵەت نایگرێ! ئەو نەوعە کەسە ئەگەر ئیمانیشی هەبێ، ئەوەندە کەمهێزە اصلاً نابێ بە مانع. ئەو جۆرە کەسە نەفسی خۆی بەرەڵڵا ئەکا، هەموو نەوعە گوناهێک ارتکاب ئەکا، گوناە دەورەی لێ‌ئەدا حسیش ناکا، ئەهمیەتی پێنادا.. دیارە ئەو گرۆهە مقصودن بە ڕەدد و ابطالی دەعوای کاذبە.

﴿بَلَىٰ مَن كَسَبَ سَيِّئَةً﴾ هەر کەسێ گوناهێ بکا لە هەر طائفەیێ بێ، موسڵمان یا جوولەکە، اسرائیلی یا سید، کورد یا عەرەب ﴿وَأَحَٰطَتۡ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ﴾ (سيئة) گوناهێکە، کە خۆی مقصودبێ. (خطيئة) گوناهێکە، کە وەسیلە بێ بۆ گوناهی‌تر. (کانە) گونەهکار لەو گوناهە، شەقاو ئەهاوێ بۆ گوناهی‌تر.

کأنە گوناە لەسەر گوناە، ئەکاتە پێپلقە پێ‌یدا هەڵئەچێ بۆ گوناهی‌تر.

---

(١) — چبکەم، هەموودەم لەگەڵ نەفسي خۆما ڕێگە دەرناکەم، لە کردەوەی خۆم بە ئازارم، دامنا، کە تۆ بە جوامێری خوت وازت لێهێنام، بەڵام لەو شەرمەی، کە کردەوەی منتدی، چبکەم؟    ع . بیمار

﴿فَأُوْلَـٰٓئِكَ﴾ ئەو گرۆهە عاصیيە قاسیانە﴿أَصۡحَـٰبُ ٱلنَّارِۖ﴾ ڕەفیق و هەمدەم و خاوەندی ئاگرن. وامەزانن ئەو صحبەتە ئەبڕێتەوە.

﴿هُمۡ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ٨١﴾ ئەوان لەو ئاگرەدا ابدین. مطیع و فەرمان بەردارن تێئەکۆشن، خەریکی طاعەت و عبادەتن. قسمێکیان بە عبادەت مغرور و متکبر و خودپەسند ئەبن، غەیری خۆیان خەلقی بە حشرات ئەزانن. بە دوو ڕوکعەت نوێژ، بەسێ ڕۆژ ڕۆژوو، بە پسەپستی تسبیحات، واتێ ئەگەن شەریکی خودان، خودا لە ئەمر و ئیرادەی ئەوان دەر ناچێ. (کانە) نەفەرێکی ئەمر بەرە « ما گفتیم و ایشان نوشتند ». ظاهراً زاهدن، ئەمما بۆ استیلا عابدن، ئەمما تا بیانکەنە معبود لە ژێر پەردەی (تزویر)، دین ئەفرۆشن، وەک خیام ئەڵێ:

آن قـوم کـه سـجاده پرسـتند خرنـد
زیـرا کـه بـه زیـر بارسـالـوس درنـد
ویـن از همـه طـرفـه‌تـر کـه در پـردەی زهـد
اسـلام فروشـند و ز کـافـر بـترند[1]

حقاً (شرّ)ی ئەوانە بۆ دین لە شەرری کافران خرابترە!!.

قسمیکیتریان، ئیمانی پاک، عملی چاک، دڵ و زوبانی موافق، بێریا و نفاق، بێکبر و انانیەت، شەو بە گریە و زاری، عەرضی ذللەت وانکساری لە خزمەت حەضرەتی باری ئەکەن، ڕۆژ بە مصالحی خۆیان و عبادی خودا خەریک ئەبن. لە سەر ئەو حالە لە خۆیان مقصر ئەزانن، لایان چاکەیێکیان نییە، کە شایانی قبووڵ بێ. (خودا ئەزانێ، باوکم ڕەحمەتی خودای لێبێ لەو گرۆهە بوو). ئەو فرقەی کە قورئان تعرضی بۆ ئەکا ئەمانەنە.

﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ﴾ ئەوانەی، کە ئیمانیان هێناوە، عملی

١)— ئەو کۆمەڵەی، کە بەرماڵ پەرستن کەرن، چونکە وێنەیەکی سەرسامی ساختەکارین. لە هەموو سەیرتر ئەوەیە، کە لەژێر پەردەی خوانناسیدا، ئیسلام ئەفرۆشن و لە کافر بەدترن. (ع . بیمار)

چاکەئەکەن، چاکە ئەکەن بە وەسیلەی چاکە ، ومع هذا خوا هەمووی هەر بە چاکەئەزانێ، چونکە چاکە چاکە.

﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٨٢﴾ ئەوانە خاوەندی بەهەشتن، لێک جودا نابنەوە. ئەوانی پێشوو خاوەندی جهنمن، ئەمانە خاوەندی بەهەشتن، ئەگەر کەسێکیتر بچێتە بەهەشت، یا جهنم بە تبعیەتی ئەوانەوەیە وەک خزمەتکار لەگەڵ ئاغا.

ئەوجا لەو تحریرە نایابە بە دەرئەکەوێ بۆ گوێدێران، کە ئێرە جێی تەماشا و اعتبارە، بە چاوی انصاف تەماشای خۆیان بکەن نسبەت بە گوناه، بە چاکە مەیل و تاثیر و تاثریان چۆنە، تاکو تێبکۆشن و بەڕاستیو دروستی بزانن، کە مایەی نەجات، ئیمان و عملی چاکە، بە حسب بە نەسەب، بە ئومێدی شفاعەت، بە کەمیی عەذاب هەڵنەخەڵەتێن.. جێی چک بردە چک بردەی (سنی و معتزلان)نییە.. جێی تاویل و حرفی ئەو ئایەتانە نییە بە نەوعێ، کە ڕوح و ڕەونەقی ببا.

* * *

تا ئێرە سێ فەصڵە، (یەکێ) بەیانی عەلامەتی ئەوانەی، کە اقتدا یا اهتدا بە قورئان ئەکەن و، نیشانەی ئەوانەی، کە قابل نییە ئیمان بە قورئان بێنن. وە ئەو نیشانەی ذل و انکسارە بە سینەی پڕ کینەی بنیاسرائیلییاندا درواوە کە ئەوانە لە سەر آمەدانی غضب لێگیراوانن.

(دووەم) باسی زعمای بنیاسرائیل لەگەڵ حەضرەتی (موسی) و ئایاتی.

(سێیەم) باسی مەلایەکانی، کە تەوراتیان وەرگرتبوو، گوایا عملی پێبکەنو زانیتان ئەوانە سێ فرقەن.

لەم فەصڵە، بعضێ تفصیلاتی معاملاتیان بەیان ئەکا، تا بزانن دەربارەی ئەو کتێبە: حکماً حکماً، جملة جملة چییان کردووە، بۆیێ ئەفەرموێ ئەوەش یاد بکەن.

﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ ئەوی عەهد و پەیمانی لەسەر کرابوو چبوو؟ ﴿لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ﴾ غەیری خودا عبادەتی کەس ناکەین. ﴿وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَانًا﴾ لە حەق داک و باوکان چاکە ئەکەین، ئەمما چاکە.. ﴿وَذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ﴾ وکذا دەربارەی خزمان و هەتیوان و دەردەمەندان، (کانە) خۆیان ئەو عەهدەیان تقدیم کرد، بۆیێ بە نفی و اثبات ئەفەرموێ نەوەک بە امر و نهی. ئەمما دیارە بە چاکە ولو بە زوبانیش بێ، لە خۆوە ڕوو لە خەڵقی ناکەن، بۆیێ ئەفەرموێ: ﴿وَقُولُوا۟ لِلنَّاسِ حُسْنًا﴾ قسەی چاک بە خەڵقی بڵێن، امر بە چاکە بکەن، نهی لە خراپە بکەن، خزم یا بێگانە، بەدەسەڵات یا بێدەسەڵات.

﴿وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ نوێژ بەجێبهێنن، وە زەکات بدەن ﴿ثُمَّ﴾ لە پاش ئەو عەهد و میثاقەش، کە خۆتان نواندتان و من ئەمرم پێ کردن، گوایا ئێوەش قبووڵتان کرد. ﴿تَوَلَّيْتُمْ﴾ حاشا ثم حاشا هەرچی قبووڵ بکەن؛ زەکات دان قبووڵ ناکەن، ﴿إِلَّا قَلِيلًا مِّنكُمْ﴾ الآ کەمێک نەبێ لە ئێوە، کە مەلایەِ چاک و پاکەکان بوون..

﴿وَأَنتُم مُّعْرِضُونَ ٨٣﴾ ذاتەن ئێوە ڕوو وەرگێرران، عەهدشکەنی‌یە، واتان ڕوو لێوەرگێررا، کە جاری تر ڕووی تێنەکەنەوە، ئەو عەهد و میثاقە دائر بە اخلاق و تدبیر المنزلة، (حقیقةً ) شرایعی پێغەمبەران، گەلێ لە (قوانینی دول) چاترە، مقصدی اولیە تهذیب اخلاقە، راسی تهذیب اخلاق ئیمانی بە راستی‌یە، کەسێ اخلاقی چاک نەبێ، لەگەڵ داک و باوک و ضعفاو بێدەسەڵات، چۆن چاک ئەبێ؟ لەو نەوعە بێتربیەتانە، ئەبێ چ نەوعە عائلەیێک تشکل بکا، چ خانەدانێک پەیدا ببێ؟ قانوونی دولی تەماشای اخلاق ناکا، ئیمان بە خودا ئەهمیەتی نی‌یە!.

وەی هەش بەسەریان! ئەوەندەی ئیمان فائدەی هەیە، بۆانتظامی عمومیو امن و ئاسایش و اصلاحی بشری، هەزار تۆپ و تەییارە ئەو فائدەیە نادا. جەنابی حەق، استثنای جمعی قلیل ئەکا لەو عەهدشکەنانە، دیارە ئوممەتێ وا زۆر ئەبێ جەماعەتێکیان هەبێ، کە اوامری ئیلاهی بە جێبهێنێ، کەم بن یا زۆر بن، عەهدێکیتریشیان هەیە بۆ سیاسەت المدن، هیئەتی اجتماعي، کە ئەو طبعاً لە پاش اصلاحی فرد و تشکیلی عائلە ئەبێ. هەیئەتی اجتماعی لە عائلان مرکبە، بۆیێ دیسان ئەفەرموێ:

﴿وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَكُمۡ﴾ ئەو میثاقە لە زەمانی حضارت و مدنیەتدا بووە. هەر قەومێ کە لە منکوبی و ئەسارەتدا بن، البتە لەگەڵ یەک چاک ئەبن، بەڵام لە زەمانی استقلالیەت بالعموم لەگەڵ یەک تێک ئەچن، بۆیێ عاقبەت سلطەنەتیان محو ئەبێتەوە.

ئەبینن چەند کەڵەباب بە لاقی بەستراو لەسەر بارێکیان دائەنێن، اصلا بە گژ یەک ترا ناچن، بەڵام کە بەرەڵڵا بوون، هەر کورەکەی جارانن بەسەر و پۆپرەی یەکدا ئەدەن! لە هەموو چشتێ اهم تر لەو میثاقە؛ حفظی نەفسە، بۆیێ ئەفەرموێ: ﴿لَا تَسۡفِكُونَ دِمَآءَكُمۡ﴾ خوێنی خۆتان نەڕژێنن.. هەر طائفەیێ، هەر قەومێ، هەر خانەدانێ، کە خۆبەخۆیی خوێنی یەکتریان ڕژاند؛ پەرێشان و بێهێز ئەبن، ئەگەر نەش فەوتێن، ئەبنە ژێر چەپەڵۆکی خەڵق.

﴿وَلَا تُخۡرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمۡ﴾ خۆتان لە مەملەکەتی خۆتان دەرمەکەن، زۆر بووە لە یەک عەشیرەت، فرقەیێ بە قووەت طمعی لە شعبەیێ ضعیف کردووە، لە دار و دیاری خۆی دەرکردووە، استیلای مەملەکەتەکەی کردووە، ئەوانیش بالمجبورية چوونە ژێر باڵی عەشایری ترـ خصوص ئەوانی، کە دوشمنی هەموویان بوونـ ئەمانەیش (فرصة بالاستفادة) تەحریکیان داون.. تقویەیان کردوون.. حاصڵی (بعد الكرّ

والفرّ) دوژمنەكانيان، استيلاى دار و ديارى هەموويانيان كردووه.

﴿ثُمَّ أَقْرَرْتُمْ﴾ له پاشدان ئێوه اقرار و اعترافتان كرد، كه ئەو عەهد و ميثاقه زۆر باشه بۆ ئێمه، لاكن ئەو عەهدەشتان شكاند.

﴿وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ ٨٤﴾ ئێوه شاهد و مطلعن، ئاگا له خۆن، كەچى:

﴿ثُمَّ أَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ تَقْتُلُونَ أَنفُسَكُمْ﴾ يەعنى انسالتان نا، هەر خۆتان خۆبەخۆيى يەكتر ئەكوژن ﴿وَتُخْرِجُونَ فَرِيقًا مِّنكُم﴾ لەخۆتان ﴿مِّن دِيَٰرِهِمْ﴾ لەولاتى خۆيان. ﴿تَظَٰهَرُونَ عَلَيْهِم بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ﴾ پشت دانەيەك له زەرەرى ئەوان به گوناه، به تجاوز له حەق به غەيرى ظلم و غەدر، هيچ بەهانەى ترتان نىيه..

ئەو بێچاره دەركراوانه، پەراگەندە ئەبن.. دوژمنتان زۆره، ئەكەونه ئەسارەتى دوژمنان.

﴿وَإِن يَأْتُوكُمْ أُسَٰرَىٰ﴾ ئەوجا كه ئەسيرى دەستى دوژمن بوون و، به ناچارى هاتنەوه لاى ئێوه، كه له ئەسارەتيان دەربێنن بيان كرنەوه..

﴿تُفَٰدُوهُمْ﴾ ئەيان كرنەوه، فديەيان له جياتى ئەدەن، ئەڵێن واجبه لەسەر ئێمه، شعبى بنى اسرائيلى له ئەسارەت نەجات بدەين. ﴿وَهُوَ﴾ شەئنێكى زۆر عەجايب و سەيره ﴿مُحَرَّمٌ عَلَيْكُمْ إِخْرَاجُهُمْ﴾ دەركردنيان لەسەر ئێوه حەرامه، به واسطەى ئێوه تووشى ئەو ئەسارەت و ذيللەته بوون، كەچى ئەڵێن نەجاتيان لەسەر ئێمه فەرضه، بۆيێ فديەيان ئەدەين.

﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ﴾ ئيمان به بعضێكى كتێب دێنن، عملى پێئەكەن و، كافر ئەبن به بعضێكى. خلافى ئەو، حەرەكەت ئەكەن. (حقيقةً )ئەمه شەئنى مل پانانه.

ئینسان بە کمالی حیرەت تێ ئەفکرێ، عجبا ئەو نەوعە قەومە عاقبەتیان چی‌یە، دووچاری چی‌ئەبن؟!

﴿فَمَا جَزَآءُ مَن يَفۡعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمۡ﴾ بە عەقڵ و تامل، بە (سیر)ی عالەم ئەزانێ، ئەو نەوعە کەسانە هیچ جزایان نی‌یە.

﴿إِلَّا خِزۡيٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ﴾ الاّ ڕەزالەت و دەنائەت نەبێ لە حەیاتی دنیا، چی‌تر جزای ئەوان نی‌یە، دیارە قەومێ، کە خۆبەخۆیی یەکتر بشکێنن، مغلوبی اقوامی‌تر ئەبن، بەکمالی حەقارەت و ڕەزالەت و عبودیەت، ئەگەر بمێنن ئەژین، ئەوە حاڵی دنیا. بۆ ڕۆژی قیامەتیش، خودا ئەزانێ چی‌یان لێ‌ئەکا.

﴿وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلۡعَذَابِۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ٨٥﴾ هەر ئەوەندە ئەتوانین بڵێین، لە هەموو عەذابیان بە شددەت‌ترە ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا بِٱلۡأٓخِرَةِۖ﴾ ئەوانە ئەوانەن، کە حەیاتێکی بە دەنائەت، بە سفالەت، بە ڕەزالەتیان داوە بە حەیاتێکی فاخر (ذی‌شرف) خۆش، وەک حەیاتی بەهەشت.. کەوابێ نە لە دونیا نە لە قیامەت.

﴿فَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابُ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ٨٦﴾ نە لە دنیا، نە لە قیامەت عەذابیان لەسەر سووک نابێ. نە لە دنیا و نە لە قیامەت نصرەت نادرێن. کەس بە تەمای دوژمن نەبێ!. یارو یاوەری بکا، تەشکیلی حکومەتی پێ‌بکا، بیکا بەدەوڵەتێکی مستقل، ئەو نەوعە قەومە، کە خۆبەخۆیی لەیەکیان تێک ئەدا، ئەکەونە ژێرباری خەڵق وەکی کەر، ژێرنییر وەک گاجووت.

ئەوجا بزانن قەومێ، کە لەگەڵ پێغەمبەری خۆیان، ئەو زەعیمە گەورەیە، ئەو کتێبە هادی‌یە معاملە و اطواریان وا بێ، چۆن طمع ئەکەن.. ئیمان بهێنن بە پێغەمبەری ئێوە؟! علاوەی ئەو خەباثەتە مەیلێکی تریشیان هەبوو لەحەق پێغەمبەرانێ، کە دووای حەضرەتی (موسی) هاتن و، هەر لە خۆیان

مەیل و فکرەکەش ئەوەیە، کە لە ئایەتی آتی بە دەرئەکەوێ.

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ ﴾ ئەو کتێبەی، کە باسی کرا (انه) هەر بۆ ئەو هات و، هەر بۆ ئەویش مایەوە. ﴿وَقَفَّيْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ بِٱلرُّسُلِ ﴾ لەپاش حەضرەتی (موسی)، یەک لە دوا یەک پێغەمبەرانمان بۆ هەناردن. یەک لە ئەوان حەضرەتی (عیسی)یە، کە مشهوری انامە.

﴿وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ ﴾ لەمەو دووا بەیانی دێ.

﴿وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ ﴾ تەقویەمان کرد بە جبریل، کە ڕوحێکی پاکە، یا بە ڕوحی پاکی خۆی، خاوێن لە مەیل و محابا و حب و جاه و سلطەنەت، دەربارەی ئەو رسلانە ئەوەیە، کە لەم ئایەتە ئەفامرێتەوە.

﴿أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسْتَكْبَرْتُمْ ﴾ بە استفهامی توبیخی (لوم) پێیان ئەڵێ، ئایا هەر وەقتێ رەسولێ هاتە سەرتێوە، بە موافقی هەوا و هەوەسی ئێوە نەبێ نەیحبێنن، تکبر و تعظم ئەنوێنن؟ (انە) لەوە گەورەترین پێغەمبەرمان بێتە سەر، با لە خۆشمان بێ.

﴿فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ ﴿٨٧﴾﴾ فرقەیێ لەو پێغەمبەرانە تکذیب ئەکەن، ئەڵێن درۆ ئەکەن ئێوە پێغەمبەر نین، دیارە ئەگەر دەسەڵاتیان بە سەردا بشکابوایە، ئەیان کوشتن و فرقەیێکیش ئەکوژن.

ئەوجا ئەم عەصرەیە، کە بنی اسرائیلی پێغەمبەران بکوژن، ئەوی دەسەڵاتیان بەسەردابشکێ..

﴿وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ﴾ لێرە ئێمە تەفسیری ئەکەینەوە بە محفوظ لە ژەنگ، (انه) دڵی ئێمە وەک ئاوێنەیێ صاف، یا تیغی مجوهر لە کیف و کاڵان دایە. هیچ گەرد و غوباری لێنەنیشتووە، حاجەتی بە (مصقل) نییە، پێغەمبەرمان بۆ چییە؟.

﴿بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ ﴾ وە معلومە ئەگەر دڵێکی ادنی قابلیەتێکی ئیمانی

تێدا هەبێ، جەنابی کبریائی لە لطف و مەرحەمەتی خۆی محرومیان ناکا و، ئەو قسەیەشیان عەینی جهالەتە.

ژەنگی کفر بە نەوعێکی دڵی داگرتوون، قابلیەتی (تنور)ی تێدا نەهێشتووە، لەبەر غایەتی کثافەتی خۆی، بە پاک و خاوێن تێ ئەگا. کەوابێ ڕاست ئەکەن دڵیان لە ناو غلاف دایە، ئەمما غلافی کفر و جهل.

حاڵی سوادی اعظمیان ئەمەیە، بالطبع ئەو نەوعە قەومە مؤمن لە ناو ئەوان، زۆر کەم ئەبن. ﴿فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ ٨٨﴾ جەمعی کەم کەم ئیمان ئەهێنن، ئەو جەمعە ئەوانەن، کە بەڕاستی ئیمانیان بە (کلیم) هێناوە، اهتدایان بە تەورات بووە بۆیێ ئیمان بە پێغەمبەری (آتي) ئەهێنن.

ئەمە حاڵ و شەئنیان لەگەڵ پێغەمبەرەکانی خۆیان، ئەوجا ئەبێ کردەوەیان دەربارەی پێغەمبەرێ، کە لە خۆیان نەبێ چۆن بێ؟

﴿وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ ئەو کتێبەش ﴿مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ﴾ قورئانی عظیم الشانە..

مؤید بوو ئەو چشتەی، کە لەگەڵ ئەوان بوو، او(ما معهم)یش لە ئایەتی ﴿وَكَانُوا۟ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ بەدەر ئەکەوێ.

لە پێش هاتنی ئەم کتێبە، طلبی فتح و نصرەتیان ئەکرد لە سەر ئەوانی کافر و مشرک.

روایەت کراوە لە جەمعێ لە انصار، ئەیان فەرموو لە زەمانی جاهلیەت ئێمە لە سەر جوولەکەکان غالب بووین، جوولەکەکان ئەیانگوت پێغەمبەرێک دێ، زەمانی نزیکە. ئیمانی پێئەهێنین، تبعیەتی ئەکەین،ئەوجا ئەو وەقتە ئەتان کوژین.

﴿فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ﴾ ئەیان گوت ئەوە لە (بنـي اسماعیل)ە و پێغەمبەرایەتی خاصی بنیاسرائیلیانە. لەبەر حەسەد ئیمانیان نەهێنا، خۆ معاملەی ئەوانیش لە حەق پێغەمبەرەکانی خۆیان

معلووم بوو.. پێغەمبەرێ بێتە سەر ئەوان، یا موافقی هەوای نەفسیانە، کە حوکم بە تەورات بکا و بەس، یا مخالفە کە بە گوێرەی زەمان لە احکام اصلاحاتی بکا.. یا اسرائیلیی‌یە، یا غەیری اسرائیلیی‌یە.

(علی کل حال) ئیمانیان نەهێنا، کەوابێ حاجەت ناکا خوا بفەرموێ من لەعنەتم لێ‌کردن، بەڵکوو لەعنەتەکە خۆی بۆیان دێ:

﴿فَلَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ٨٩﴾ «آمین» ئەو قەومە (کانە) خۆیان کردوەتە (ثمنی) کفر، خۆیان ئەفرۆشن. کفر نەکردن.

﴿بِئۡسَمَا ٱشۡتَرَوۡاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمۡ أَن يَكۡفُرُواْ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ (حقیقةً) معامەلەیێکی زۆر پیس و بێ‌مەعنایە. کەوابێ (شراء) لەسەر مەعنای خۆیەتی. ئەو کفرە غلیظەیان لەبەر چیی‌یە، کە ڕوحی خۆیان پێ‌داوە؟

﴿بَغۡيًا﴾ حەسادەت و تجاوز لە حد، ئەو حەسادەتەش لەسەر چی؟ ﴿أَن يُنَزِّلَ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ﴾ اسرائیلی بێ، یا غەیرە اسرائیلی بێ، حەسادەت و کبریان لێ ناگەڕێ ئیمان بهێنن، رئاسەتیان لە دەست ئەچێ، ئەبن بە تابع. ناردنی پێغەمبەران لە لای ئێمە ، محضی فضل و کەرەمە، لای (معتزلی)یان واجبە، ئەمما بعثی ئەم ذاتە یا ئەو ذاتە، لەم طائفە یا لەو طائفە - بالاتفاق - لە فضلی ئیلاهیی‌یە.

هیچ شعبێ خصوصیەتیکی نی‌یە، کە پێغەمبەرایەتی منحصر بێ لەوا.

﴿فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٖۚ﴾ خۆیان دوچاری غضب لەسەر غضب کرد. غضبی سابقی مووروث، غضبی لاحقی مکتسب.

وە لەبەر غایەتی بێ‌عاری، اصلاً لەو مقامەدا تاثیر و انکسارێکیان بە سەردا نەهات، بۆیێ نافەرموێ (ضربت علیهم الذلة و المسکنة) ئەوەی پاش مغلوبێتی قطعی ئەفەرموێ، ئەوەندە ئەفەرموێ.

﴿وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٞ مُّهِينٞ ٩٠﴾دیارە بالمآل تووشی ئەم ذیللەتە ئەبن.

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُوا۟ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ تەماشای اشخاص مەکەن ئینسانێکی، کە طالبی حەق بێ، کەیفی بە علم و حکمەت بێ، علم و حەق وەرئەگرێ. (ولو) لە گاوانێ بێ.

بۆیێ جەنابی رسالەت ئەفەرموی: (الحکمة ضالة المؤمن).

﴿قَالُوا۟﴾ لە جوابدا ﴿نُؤْمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا﴾ و بەس، کانە ئەڵێن (ما انزل الله) هەر ئەوەیە بۆ ئێمە هاتووە، باقی تر هیچی لە طەرەف خوداوە نی‌یە، بۆیێ ناڵێن (نکفر بما ورائه)، بەڵکوو خوا ئەفەرموێ.

﴿وَيَكْفُرُونَ بِمَا وَرَآءَهُۥ﴾ با وجودی ﴿وَهُوَ ٱلْحَقُّ﴾ تێک نەدراوە، تەحریف نەکراوە، چۆن نزول ئەکا (علی ملأ الناس) ئەخوێندرێتەوە، دۆست و دوژمن وەری ئەگرێ.

﴿مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَهُمْ﴾ هەر کتێبێ بۆ پێغەمبەران هاتبێ لە طرف خودا، ئەم کتێبە تاییدی ئەکا فەرقی مغشوش و نقدی ئەکا، وەک محەک. ﴿قُلْ﴾ لە رەددی ئەوان ﴿فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبْلُ﴾ ئەوانی، کە لە خۆتان بوون.

﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ۝٩١﴾ ئەگەر ئێوە راستگۆن، کە ئیمان ئەهێنن بەهەر کتێبێکی هاتبێ بۆ خۆمان.

ذاتا لە پێشەوە بەدەرکەوت، لە پاش حەضرەتی (موسی) هەر کەسێ، بەهەر نەوعێ ناردرابێ، تکذیبیان کردووە و ئیمانیشیان بە (موسی) و کتێبی (موسی) بە تەقلیدی آبائە، نەوەکو لە فکر و نظری خۆیانەوە. وقتاً کە ئەو گرۆهە، تصلب و تعصب و قووەتی ئیمانیان بە خودا و کتێب و رەسولی خۆیان نواند.

لاشک ئیمانی اجیالی دوایی لە قووەتدا، ناگاتە ئیمانی ئەوانەی حاضری زەمانی رەسولی خۆیان بوون. ذاتاً هەر چشتێ، کە لە (اول)ەوە تاسیس بکرێ، ئەوانی کە مؤسسن بۆ تقریر و تقویەی سەعی بێنهایەت ئەکەن -

لدی الحاجة ـ نفس و نفیس صەرف ئەکەن. بۆیێ جەنابی باری لە ڕووی ئەو گرۆهە متعصبە مختصراً بەیانی دەرەجەی ئیمانی اسلافی کرامیان ئەکا. ئەوجا قووەت و متانەتی اخلافیان بە ظریفی تبیین ئەکا، ئەفەرمویێ:

﴿وَلَقَدْ جَآءَكُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾کە سابقاً بەیان کرا.

﴿ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ﴾لەپاش هاتنی (موسی)، یا لەپاش چوونی بۆ میقات. ﴿وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿٩٢﴾﴾ شیمەتتان ظلمە، تەجاوزە لە حەق.

﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ﴾ بۆ وەرگرتنی بینات بەو نەوعە ﴿وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ﴾ بەو اکراه و تشدیدە ئەمرمان کردنێ:

﴿خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱسْمَعُوا۟﴾ ببیینن، تێی بگەن، سطحی بەسەری دا مەڕۆن.

﴿قَالُوا۟﴾ بێ (ثم)ە ﴿سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا﴾ بەڵێ بیستمان، لاکن قبوولمان نەکرد و نایکەین، دەرکەوت، کە ئیمانی اولین و آخرینیان بە (موسی) و کتێبی موسایش مزخرفە، ئەوجا معلوم بوو بە قیاس و نسبەتی ئیمانی (خلف)، لەگەڵ ئیمانی (سلف)، کە متانەتی ئیمانی ئێوە لە چ دەرەجەیێ دایە، ئاشکرایە بە دەرەجاتی بێ (حد و عد) تحت الصفره.

دڵی ئێوە ئەوەندە ساردبووە، لە شەختەیێ تەجاوزی کردووە، بووە بە بەرد. بزانین یەگانە سەبەبی نەفرەتی بنیاسرائیلی لە ئیمانی (بما انزل اللـه) چییە؟.. وەکو سابقاً بەیانمان کرد (حبی) عجل بوو، نەکو تمثالي.. بەڵکوو ئەو عجلەی، کە لە مصر خدمەی دەرگاهی بوون، ئەمما چۆن حبێ؟ حبێ، کە لە عمقی دڵەوە هەڵکوڵێ، بەهەموو ڕەگ و دەماریاندا بڕوا، لە هەموو بەدەنیان سرایەت بکا.

﴿وَأُشْرِبُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْعِجْلَ﴾ ئەو محبەتە بێ حد و غایەتە..

﴿بِكُفۡرِهِمۡۚ﴾ بە سەبەب کفر و جهلیان بوو. ئەگەر ئەوانە ئاثاری ئابائی کرامیان، ذەررەیێ ئیمان لە قەلبیاندا هەبوایە، ئەبوایە ڕقیان زیاتر لە (عجل) ببێ، بەڵام ئەوی حس پەرست بێ، ئەو نەوعە ئەفکارەی بە دڵدا نایێ. ئەو سررە مەکتومەی کە لێی ئەترسان ئاشکرا ببێ، لێرە بە ظەریفی لێیان ئاشکرا کرا.

﴿قُلۡ﴾ یا ڕسوڵاللە (صلی اللە علیە وسلم) ﴿بِئۡسَمَا يَأۡمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَٰنُكُمۡ﴾ ئەو ئیمانە، کە خۆتان ئەیزانن بۆ چیتان سەوق ئەکا، ئەمری ئیمانی چیـیە بۆ کفر؟

چ بۆ ئیمانی ڕاستی ئەمری لفظی نیـیە، ئەمرێکی تکوینیـیە، سەوقی وا لە دڵ پەیدا ئەکا، کە جبراً سەوقی ئەکا بۆ مقتضای خۆی. بۆیێ علمای ئێمە ئەفەرموون: (عمل داخلی حەقیقەتی ئیمانە).

حقیقة وایە، کەسێ ئیمانی هەبێ بە خودا و پێغەمبەر، ئەو ئیمانە شەوق و ذەوقیکی تێدا پەیدا نەکا، بۆ اطاعە و فەرمان بەرداری ئیمانی نیـیە.. کە لە دڵدا شین بووبێ، ئەوەندە ضعیف و بێ ئەثەرە (ایمانە لا) وەک (لا ایمان لە)وە.

﴿إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ٩٣﴾ ئەگەر ئیمانتان هەبێ بەراستی، کەمێ تێئەفکرن ئەزانن ئەو ئیمانەی، کە هەتانە سەوقتان ئەکا بۆ چشتی زۆر خراپ. ئەمما شعورتان بە بێشعوری خۆتان نیـیە..

حەقیقة ئەو ئیمانە کفرێکی مرکبە، قەومێ کە ادعای انحصاری نبووەت بکەن لە خۆیان، دیارە ادعای انحصاری نعمەتی ئیلاهی دنیەوی و اخروی ئەکەن لە خۆیان. بالخاصة ثمرەی نبووەت لە داری آخرەت بە دەرئەکەوێ.

﴿قُلۡ﴾ یا ڕسوڵاللە - صلی اللە علیە وسلم - ﴿إِن كَانَتۡ لَكُمُ ٱلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ عِندَ ٱللَّهِ خَالِصَةٗ مِّن دُونِ ٱلنَّاسِ﴾ ئەگەر ئەم ئیمانەتان ڕاست بێ، کە

نيعمەتی آخرەت لە طرف خوداوە، خالصی ئێوەیە و خاص بۆ ئێوەیە و هیچ شعبی‌تر لە بنی‌آدمی، شرکەتی لەو نعمەتەدا نی‌یە، وەکوو شرکەتی لە نعمەتی نبووەت دانی‌یە.

﴿فَتَمَنَّوُاْ ٱلْمَوْتَ﴾ تەمەنناى مردن بکەن، یا بە زوهد لە دنیا کە - داری اکدارە - خەڵقی‌تریش لەگەڵ ئێوە لەو حەیاتەدا شەریکن. کەسێ ئیمانی هەبێ بە حەیاتی خالص و خاص چۆن پابەندی حەیاتێک ئەبێ ناخۆش، مشترک لەگەڵ اغیار، لەگەڵ حیواناتی دون؟ یا بە قتال (ضمنا) بەیانی ئەفەرموێ.

﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٩٤﴾﴾ ئەگەر ڕاست ئەکەن؟! دەرئەکەوێ، کە لەم ادعایەدا درۆزنن، قاعدەیە: «رفعی لازم مستلزمی رفعی ملزومە».

﴿وَلَن يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًا﴾ حتی بە زوبانیش ئەمە زۆر سەهلە، با بەدڵ نەبێ، گەلێ کەس لە وەقتی تەنگانەیی، تەمەنناى مردن ئەکا، ئەمما ئەگەر (نوعاما) علامەتێک بەدەرکەوت، زۆر زوو پەشیمان ئەبێتەوە. سەبەبی چی‌یە ئەم تەمەننایە ناکەن؟؟...

﴿بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ﴾ بە سەبەب ئەو چشتەی ئەو گوناهانەی، کە بە دەستی خۆیان، بە قووەتی خۆیان، بە اختیار و مەیل، بێ جبر و اکراه کردوویانە، بۆ زەخیرەی (داری ابدي) پێشین ناردوویانە. ئەوی ئەیان گوت، کە ئێمە عەذاب نادرێین.. ئەوی کە عەذاب بدرێ بە عەذابی کەم، خفیف عەذاب ئەدرێ، لە دڵەوەیان نەبوو، مقصودیان هەڵخەڵەتاندن بوو، ظلم لە عبادی خودا بوو، کە ئەوانیش (لا ابالي)یانە، تووشی گوناه بکەن.

﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٩٥﴾﴾ بە گوێرەی گەورەیی ظلم، جزایان ئەدات و لە هەموو ظلمێ گەورەتر، منعی فەیضی ئیلاهی‌یە لە بەندەکانی خۆی.

﴿وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٍ﴾ تۆ ئەی رەسوڵاللە، یا هەر

کەسێ، کە وجدانی هەبێ تەماشایان بکا؛ ئەیان بینێ کە لە هەموو حریصێ، حریص ترن لە سەر ئەم حەیاتە دەنی‌یە و رەزیلانەیە با وجودی.

﴿وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ ﴾ بعضێ هەیە لە مشرکان ئەوەندە حریصن، کە ﴿يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ ﴾ حەز ئەکا هەزار ساڵ بژیێ، ئەوەندە حریصن ئەو اسرائیلی‌یانە، با وجودی (موحد)ن لەوانەش حریص‌ترن، ئەوان حەزئەکەن لەو داری دنیایە، غیرە محدود بژیین.

﴿وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِۦ مِنَ ٱلْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ ﴾ ئەو ژیانە با هەزار ساڵیش بێ، یا زیاتر بێ ئەوی دوور ناخاتەوە لە عذاب. چونکە تووشی مردن هەر ئەبێ و عەذابیش ئەبینێ.

یاخود ژیانی ابدی لەداری دنیا، ئینسان نەجات نادا لە عذاب.. زێرا لە تقدیری حیاتی ابدی دنیا، قیامەت ئەکەوێتە دنیا داخلی داری جزا هەر ئەبن.

﴿وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾ ئەوی ئەیکەن لە خودا بزرنابێ وقتاً، کە فەرمووی ئەوانە لە هەموو کەس حریص‌ترن، دێتە دڵ و ممکنە ئەو گرۆهە القاءات بکەن.. ئەو قسە قسەیێکی شاعرانەیە، مبالغەیە.. ﴿قُلْ﴾ یا محمد بۆ اثباتی ئەم مدعایە، کە ذەررەیێ مبالغەی تی‌دا نی‌یە، بەڵکوو حکمێکی ثابت و محقق و مدللە.

﴿مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ ﴾ هەر کەسێ بێ ﴿فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ ﴾ قورئانی هێناوەتە سەر دڵی ﴿بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ تۆ بە اذن و رەضای خودا ﴿مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ ﴾ لە تەورات و سائری کتبی‌تر ﴿وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٧﴾ ﴾ ئەم کتێبە هادی‌یە و بەشارەتە لە بۆ مؤمنان. ئەوەش موجب نی‌یە بۆ عداوتی جبریل، چونکی بە امری ئیلاهی چشتێکی زۆر

چاکی هێناوە، کەوابێ (تحری) و جستوجۆ بکەین سببی چی‌یە، ئەوانە عداوەتێکیان لەگەڵ (جبریل) هەیە؟

ئەوانە عداوەتیکیان لەگەڵ جبریل هەیە پێش نزولی ئەم کتیبە، پێش ناردنی ئەم پێغەمبەرە، کە ئەو عداوەتەیان کردوەتە سەبەبی ئیمان نەهێنان بەئەو کتێبەی، کە (جبریل) هێناویەتی، لێرە احتیاجیمان هەیە بە سەبەبی نزولی ئەم ئایەتە، چونکی سەبەبی نزول و سەبەبی نظمی ئایەت لەم مقامەدا زۆر موافقە.

لە روایاتی صحیحە بە دەرئەکەوێ، کە ئەو اسرائیلی‌یانە رقیان لە جبریل ئەبوەوە، چونکی لایان وابوو حرب و خەسف و مەسخ و خلاصەی هەرچی عەذاب بێ، عەیشی دونیا ناخۆش بکا لە طرف جبریلەوەیە، با وجودی ئەگەر وایش بێ صرف بە ئەمری خودایە.. بناءً علیە ئەگەر حرصی ژیانیان لە هەموو عالەم زیاتر نەبوایە، جبریلێ کە مەئموری ناردنی اسبابی عەذاب بی، بۆچی رقیان لێ‌ئەبێتەوە؟ چشتێکی‌تریشیان هەیە ئەویش دەلالەت ئەکا لە غایەتی حرصیان، کە محبەتی (میکائیلە) چونکی مەئموری هەرزانی و ترفیهی عەیش و خۆشی حەیاتی دنیایە، و فی الحقیقة ئەوی رقی لە ملائکەت، یا رسل، یا بعضە مەلەکێ لەبەر ئەو نەوعە عیللەتە خۆش‌بوێ؛ صرف عدوی خودایە بۆیێ ئەفەرموێ.

﴿مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَرُسُلِهِۦ﴾ هەر کەسێکی ببێ ﴿وَجِبْرِيلَ﴾ کە لای وابێ مەبدەئی (شرّ)ە ﴿وَمِيكَىٰلَ﴾ یا لاشی وابێ، کە مەبدەئی خێرە. چونکی لەو ئیمانەدا، لەو محبتەدا عەینی عداوەتە بۆ میکائیل، کە بیکەن بە شەریکی خودا وا دەرئەکەوێ، کە ئەوانە وەک (ثنوی)یان دوو مەبدەئیان لەلا هەیە: یەک خالقی خێر، یەک خالقی (شرّ).

لە زەمانی (عبدالملک) مەلایێ لام وایە (شعبی)یە، بە سەفارەت چووە استانبۆل، لە پاش بعضێ گفتوگۆ، فەضل و عیلمی لای امپراطۆر معلووم

بوو. گوتی:ـ

«تعجب ئەکەم لە عەرەب پیاوی وەکو تۆ هەبێ، بەو هەموو علم و فضلە عبدالملکی بن مروان بکەنە خلیفە». مەلاش فەرمووی: ـ

«ئەوت نەدیووە، وە الاّ منت ئەمەندە نەدەهاتە پێش چاو». شعبی گەڕایەوە، جاسوسی (عبدالملک) پێشین خەبەری دا بە (عبدالملک)، ئەو گفتوگۆیەی بۆ نقل کرد، کە مەلا بە حضوری خلیفە مشرف بوو، (عبدالملک) گوتی:

«لەو قسە کە امپراطۆر بە تۆی گوت، چ دەسیسەیێکی تێدایە، تێی گەیشتی؟».

گوتی «تۆ بفەرموو بزانم چیتیایە؟»

گوتی «ئەو ملعونە بەخیلی هات، کە مەلایێ وەکوتۆ لە ناو ئێمەدا هەبێ. ئەو قسەی بۆیێ کرد، تا وەکو من، کە بیستم لە فەورانی غضب بتکوژم. ئەمما ئافەرین لە تۆ، کە جوابێکی چاکت دایەوە.»

کەوابێ ئەم نەوعە محبەتە عەینی عداوەتە، هەزار ئافەرین لە (عبدالملک)ی، کە صاحبی ئەو نەوعە ذەکایە بووە، (سعدی)ش چاک ئەفەرموێ: (دشمن دانا بە از نادان دوست)[1].

﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوٌّ لِّلۡكَٰفِرِينَ ٩٨﴾ قەومێکی بەو نەوعە حریص بێ، سەوقی بکا بۆ عەداوەتی ئیلاهی و ملائکەت و پێغەمبەران، بە هیچ نەوعێ تەمەننای مردن ناکا، کەسێکی بە انصاف گوێ لەو ئایاتی سالفە رابگرێ، تصدیق ئەکا کە ئەحکامی نبوی هیچی ادعائی نییە، هەمووی ثابت و بینە.

﴿وَلَقَدۡ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ﴾ کانە (بین بنفسه)یە واضح و ئاشکرایە. ﴿وَمَا يَكۡفُرُ بِهَآ إِلَّا ٱلۡفَٰسِقُونَ ٩٩﴾ انکاری ئەو ئایاتی بیناتە ناکا، الاّ کەسێ، کە لە نووری ادراک و شعور دەرچووبێ، لە ظلماتی جهل و عناد،

---

(١) دوژمنی هوشیار لە دۆستی نەزان باشترە.

ڕوو چوو بێ.

حقاً خطاباتی جنابی رسالەت هەمووی لە طریقەی انصافە، تعرضاتی شخصیەی تێدا نییە، هەمووی احکامی ثابت و مقرّر و مدللە بە دلالەتی ئاشکرا و واضح. کانە (بین بنفسە)یە و لە پێشەوەش زاندرا، کە ئەوان عەهدێکیان کردبوو لەگەڵ خودا، کە پێغەمبەرێ بنێرێ ئەوان ئیمانی پێبهێنن و نەصرەتی بدەن، ئەو عەهدەیشیان شکاند، باز بە طریقێکی منصفانە ئەفەرموێ:

﴿أَوَكُلَّمَا عَـٰهَدُواْ عَهْدًا نَّبَذَهُۥ فَرِيقٌ مِّنْهُمۚ﴾ ئایا ئەوە ئەبێ هەر وەقتێ عەهدێکیان لەگەڵ بکرێ، فرقەیێک لە ئەوان ئەو عەهدە بشکێنێ فڕێی بدا. کانە کەسێک ئەڵێ: بەڵێ ئەوە (دیدنی) آباو و اجدادیانە، قەت انحرافی لێنەکەن؟ حاشا!.

﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ١٠٠﴾ سابقاً معلووم بوو معامەلەی بنیاسرائیلییان لە حەق ئەو پێغەمبەرانەی خۆیان، کە (بما لا تهوی انفسهم) ارسال بکرێن، (کانە) بۆ بەیانی فائدەی قیدی احترازی بەیانی حاڵیان ئەکا، دەربارەی ئەو پێغەمبەرەی لە ئەوان کە موافق بێ، لەگەڵ فکری ئەوان محضاً، بۆ تاییدی تەورات ناردرابن ئەفەرموێ:

﴿وَلَمَّا جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ رسولی حەق و بەرحەق لە طرەف حەضرەتی حەق. ﴿مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ﴾ مؤید و ناصر بێ بۆ تەورات یەک حکمی نسخ نەکات.

﴿نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَـٰبَ﴾ فەریقێ لە ئەوانەی، کە کتێبی معهودیان دراوەتێ، کە گۆیا حفظی ئەحکامی بکەن، ئەوانیش دەرعەهدەیان کردووە و لایان وایە ئەو کتێبە (لا یتغیره)..

فڕێی ئەدەن ﴿كِتَـٰبَ ٱللَّهِ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ﴾ ئەی هاوێنە پشت

خۆیانەوە، هیچ گوێی نادەنێ.

﴿كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ١٠١﴾ کانە هیچ نازانن، چییان نەبیستووە، هیچ عەهدیان لێوەرنەگیراوە؟ چ جای ئەوە، کە ئیمان بە پێغەمبەرەکان بهێنن.. لە ئیمان بە تەوراتیش دەرئەچن. ئەو فرقەیە لە پاش زەمانی حەضرەتی سلیمان ظاهر بوون، ئەڵێن دیارە ئەو نبووەتە، گەمە و گاڵتەیە.

﴿وَاتَّبَعُوا مَا تَتْلُوا الشَّيَاطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَانَ﴾ دوای ئەو نەیرەنگ و خزعبلات و عزامات و وفق و تەلەسماتە کەوتن، کە (مەرەدە) و خەبیثەکانیان ئەیانخوێند لەسەر موڵکی سلیمان. بە درۆ و افترا ئەیانگوت: سلطەنەتی حەضرەتی سلیمان بەو عزائم و تەلەسماتە بوو، بەو (خاتمی مطلسم) نائلی ئەو عظمت و شکۆهە بووە.

حقاً اعتمادی دەوامیی موڵک و توسعی فتوحات بەو نەوعە چشتە کفرە، جەهلە بە قواعد و (سننی) ئیلاهی. حەضرەتی سلیمان لەو جهالەتە بەرییە..

﴿وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ﴾ سلیمان، کە دوەمین حوکمدارانی بە قووەت بووە لە ابتدای تاسیسی حکوومەتی اسرائیلی، زۆر چاک ئەیزانی دەوڵەت چۆن تشکل ئەکا، چۆن ادامەی ئەبێ..

﴿وَلَٰكِنَّ الشَّيَاطِينَ كَفَرُوا﴾ ئەو جۆرە کفرە گرانە لە ئینسانێکی بە شیطنت و زرنگ دوورە، بەڵام فکری سیاسەت، یاعداوەت ئەو نەوعە کەسەی گەوج ئەکا، ئەوانە ئەوها ڕوویان لە کتێب وەرگێڕرا. ﴿يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ﴾ سحریان فێری خەڵق ئەکرد، تاکوو بە جارێ وەریان بگێڕرێ لە اسباب و علل و شرائطی حقیقی و زۆر نیزیکە، کە بە خەڵقیان گوتبێ، موساش ئەوی ئەیکرد هەم سحر بوو هەم ﴿وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ﴾ ئەو حقەبازێ و شعبدەکارییە، کە نازل بووە سەر ئەو دوو مەلەکە، ئەو دوو

پیاوە باشەی وەک مەلائکەت بێغل و غەش، یا ئەو دوو شەخصەی، کە ﴿بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَ﴾ لە بابل بوون، لە ناو بابلیان محترم بوون، کلمەیان نافذ بوو وەک پادشاهان. بۆیێ لە بعضە قرائەت (ملکین) بە کسری لام وارد بووە ، ئەو دوو شاهە، یا ئەو دوو ذاتە مەلەک سیمایە، سحریان فێری خەڵق کرد. وە لازمیش ناکا لە هەرجێیێ، کە (انزل) بوو بە طریقی نبووەت بێ، ئەو دوو کلمەیە، کە هاروت و ماروتە لە کلماتی بابلییە، حاجەت ناکا اشتقاقی تێدا بەیان بکەین.

﴿وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ﴾ ئەو دوو شەخصەی فرشتە سروشتە، کەسیان فێری سحر نەدەکرد ﴿حَتَّىٰ يَقُولَا إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ﴾ ئەیان گوت ئێمە ئازموودەی قلب و نقدین، وەک محەک بۆ تجربە خەڵق فێر ئەکەین.

﴿فَلَا تَكْفُرْ﴾ بە طالبەکەیان ئەگوت خۆت کافر مەکە، خۆت وەرمەگێرە. ئەوی فێر ئەبی،لە خێری صرف کە. ئینسانێک کە سعادەتی قەوم و میللەتی خۆی بوێ، ئەتوانێ بعضێ اسبابی (شرّ) بکا بە ئالەتی خێر.. وەک حەضرەتی (کاک احمدی شێخ)، کە ئەو وفق و نووشتە و دوعایەی محضاً بۆ خێری فقرا و مساکین دائەنا. حتی ئەوانی گوللەبەند و تیغبەندیان هەڵئەگرت، شەرطی لەگەڵ ئەکردن، کە حتی جنێو نەدەن، چەجای سیئاتی تر. بەڵام ئەو نەوعە ذاتە زۆر نایابن، حقاً کە بوون پێیان بڵێن (مەلەک).

ئەوجا لەسەر ئەو شەرط و پەیمانە ﴿فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا﴾ ئەوی ئارەزوویان بکردابوایە لێیان فێر ئەبوون. ﴿مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ﴾ چشتێ، کە بە ئەوی تفریقیان ئەخستە بەینی مێرد و ژنی.

الآنیش نویشتەی ژن رەش کردن لە بەر چاوی مێردی لە ناو ئێمە و جوولەکاندا هەیە. بە یەکێکی ئەڵێن (یەکساتە)، کانە وەک سم الساعە زوو

تاثیر ئەکا، یەکی‌تریشیان هەیە بۆ هەویَ باران ئەیکەن، کە لەبەر چاوی مێردی خۆشەویست ببیَ، پیَی ئەڵێن (کن فیکون)، کوردەکان ئەڵێن (کلفە کۆن).

« خودا ئەیزانیَ من ئەمانە نازانم، ئەمما لەیەکی زۆر نێزیک و (موثوق بە) ئەم مجملاتەم وەرگرتووە ».

﴿وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِۚ﴾ ئەوانە زەرەر ناگەیێنن بە ئەوەی، کە فێربوون بە هیچ کەس، الاّ بە اذنی خودا نەبیَ، یا مقصد ئەمەیە، کە ئەم نویشتە و چشتانە هیچنین، ئەوی زەرەر بگەیێنیَ هەر خودایە. وەیاخود ئەوانە پیاوی باش بوون، معلوماتی خۆیان لە جیَیَ باش نەبووایە صەرف نەدەکرد. کەسیَ مستحق نەبوایە زەرەریان پیَنائەگەیاند. (اضراری مضریش) دیارە خودا اذنی لە سەرە.

﴿وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْۚ﴾ ئەگەر چاک ئەگەر خراپ، بۆ ئەوان هەر زەرەربوو، چونکی بە اشتغال بەو نەوعە چشتە لە کاروکەسب ئەبن.

طبیعی بە یەک دوو هێلکەی سەرقەڵەمانە گوزەران ناکەن ئەبن بە سواڵکەر، لێرە و لەویَ ئەخولێنەوە، بیَقەدر و قیمەت سفیل و سەرگردان ئەبن.

چەند ساڵ لەمەو پێش، شەخصێک هاتە (کۆییَ) لە حضوری باوکم و شیخ عبدالکریم بەرزەنجی، گەلیَ چشتی عجاییات و غراییاتی کرد. حتی لە من، چوار پولە سۆرکەی سکەی عثمانی وەرگرت.. هاویشتیە ناو کاسەییَ ئاو، دەسەسرێکی بە سەردادا، نەختیَ پستەپستی کرد. پولەکانی هێنایە دەرەوە، عیناً لیرە بوو زێرری خالص و پاک، بە تاریخ و طورەی شاهانە!

من پێمگوت: مادام ئەمە ئەزانی، بۆ ئەگەڕیَی بەم لباسە شرروو ونجرە، لە میَو لەویَ ئەخولیَیەوە؟ هەر وەقتیَ ئارەزووت کرد یەک دوو پولەکە

سۆرکە بکە لییرە و بۆخۆت زەریف گوزەران بکە.

گوتی: قوربان ئەوە (بۆفە، ڕووکەشە، مزخرفە) کەم وەقتێ خۆی بە لییرە ئەنوینێ، پاشدان ئاشکرا ئەبێ. نیهایەت سەرم بە هیلاک ئەچێ.

دوایی لییرەکانی هاویشتەوە ناو کاسەکە، بعضێ ئەفسون و مەفسوونی پێدا خوێند. هێنایەوە دەر پولە سۆرکەکانی خۆم بوو. بەستەزمانە بەو نەیرەنگی و شعبداتە، بووبوە سەرسەری و سواڵکەر.

﴿وَلَقَدْ عَلِمُواْ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْأَخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ﴾ بە حەققەت زاناندیان، معلومیان بوو ئەو طائفە لە معلوماتی خۆیان، نە بۆ حەیاتی دونیا، نە بۆ قیامەت چ نصیبیان نەبوو.

﴿وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ﴾ چشتێ زۆر خراپ بوو، کە نفسی خۆیان پێدا، خۆیان ضایع کرد، زۆر نزیک بوو بە کەسابەت، یا بە اشتغال بە علومی نافعە ببنە پیاوی دەوڵەمەند، ذواتی معتبر و خێردەرەوە. لە سەر ئەم حاڵەتەش، هێشتا ئەوانە لە (دجالەکانی) ئێمە چاکترن.

چەندێ لەمەوپێش جەماعەتێک لە حقە - بازانی ئێرانی هاتنە (کۆیێ) لە حەوشی قەهوەخانەی متصل بە مزگەوتی گەورە، گەلێ ئیشی سەیر سەیریان کرد. بانگی موسڵمانانیان ئەکرد:

« ئەی برادەران! پێمان هەڵمەخەڵەتێن، بە خودا ئەوە گشتی پڕوپووچە. حەقیقەت نییە. دیارە اربابی ئەو صنعەیە لە کۆیە نین، ئەگەر ئێمە لە (تبرێن) بواین لە مێژ بوو حیلەمان بە دەر ئەکەوت ».

لە سەر ئەوراستییە، گەلێ ئافەرینم لێکردن. (مع انه) ئەگەر بەناو شێخاتی بهاتابونایە و ئەو عجاییبات و غراییباتانەیان بنواندا بوایە، گەلێ کەس پێیان هەڵئەخەڵەتان، ئەبوون بە مریدیان، گەلێ ماڵیان بە دەست ئەکەوت و بە کەمالی حورمەت ئەژیان. جا چشتی زۆر خراب بوو.

﴿لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ۝١٠٢﴾ ئەگەر بیان زانیبوایە علم و هۆشێکیان

هەبوایە، کە رووی لەو کارە پڕوپووچە وەربگێررایە، ڕوویان بکردبوایە سنن و قواعدی ئیلاهی ئەو فەرقە لە زەمانی انحطاط پەیدا ئەبن، رووی میللەت لە کار و کەسب و تعلیم وەرئەگێررن، خاصة علمی طب و فنونی عەسکەری، جەنگآوەری.

حتی ئەوەندە گێژ ئەبن، سەبەبی شێتی نازانن، ئەچنە لای ئەو (کلی نانیانە) عەزیمەتیان بۆبکەن، بلێ ئەمە جنۆکەیان چووەتە ناو دەروون:

(اخرج بحق آەشراه. اخرج بحق سلیمان، بحق قرنائیل و رفێمائیل) جا لێی ئەدەن: جنۆکان بلێ، ناویان بینە: (سوژن، بوژن، تریانە، کوتک، تەبەق)

ناوەکانیان ئەنووسن، ئەیخەنە ناو ئاگرەوە ئەی سووتێنن و جنۆکەکانیش ئەسوتێن و، هەم وا اعتقاد ئەکەن ئەم دەوڵەت و سەلطەنەت و حشمەتی موسڵمانان، بە سایەی دوعا و هیممەت و بەرەکەتی فلان پیری بووە. مەرقەدی فلان کەس لە فلان شارایە.. حفظی ئەکا چ حدی هەیە دوژمن نزیکی بکەوێ.

بە ئەمری فلان کەس تۆپ بۆ خۆی چوو بۆ مەیدانی حەرب، لە خۆیەوە گوللەی فرێئەدا، دوژمنی شکاند!. کەوابێ چ احتیاجیمان هەیە بە سوپا و فنونی حربي.

وەک شیخ ڕەضا لە مدحی (ناصرالدین شاه)دا ئەڵێ:

از انجمش سپاه فزونتر بود ولي
آنجا کە حیدر است چ حاجت سپاهرا [(١)]

خۆزیا ئێمەش بە یەکی وەک (حیدر) هەڵخەڵەتابواین، ئەوجا لە هەموو طەرەفەوە ئەو میللەتە نشست ئەکا، لە هەموو طەرەف دوژمن بەسەریاندا غالب ئەبێ، سەلبی مولک و سەلطەنەتیان لێئەکا. هەزار دوعا بە پوولێک

---

(١) — ئەگەرچی لەشکری لە ئەستێرەکان زیاترە، بەڵام کە (حەیدەر) لەوێ بێت پێویستی بە لەشکر چیە؟ (ع. بیمار)

کەڵک ناگرێ.

﴿ وَلَوْ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَمَثُوبَةٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ خَيْرٌ لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٣﴾ ﴾ ئەگەر ئەوان ئیمانیان بهێنابوایە بە راستی بە خودا، بە کتێب اهتدایان پێبکردابوایە، خۆیان بپاراستابوایە، لەم دەنائەت و رەزالەتە، نائلی جەزای چاک ئەبوون لە طەرەف خودا و، جزای چاک لە طەرەف خودا چاکترە لە دونیا و لە (مافیها)، کەسێکی ئینسان بێ، ادنی علمێکی هەبێ، چۆن ئەو خێرە عظیمە لە کیس خۆی ئەدا.. (مثوبة) بە هەنگوینیش ئەڵێن، جەنابی حەق لە عەسەلی مصفیی، جزای خێر مەذاقمان شیرین بکا.

وقتاً کە لە ئایاتی سابقە معاملەی عنودانەی بنیاسرائیلی لەحەق حەضرەتی ( موسی ) معلوم بوو، جەنابی حەق موسڵمانان لە سلوکی رێگای ئاوای اخطار ئەفەرموێ، نە آنکە بە سوئی ادب، بە جەسارەت، دەربارەی پێغەمبەری خۆیان معاملە بکەن، بەڵکوو بە چشتێکی، کە موهمی سوء ادب بێ، مواجههەی حەضرەتی رسالەت نەکەن. ئەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقُولُوا۟ رَٰعِنَا ﴾ مەڵێن ئەی موسڵمانینە، ئەی ئەو کەسانەی، کە بە راستی ئیمانیان هێناوە، ببە بە گوێ لەمستی ئێمە، چیت عەرض ئەکەین وامان بووبکە. خوارقمان بۆ بنوێنە.

﴿وَقُولُوا۟ ٱنظُرْنَا ﴾ بڵێن بە چاوی عنایەت تەماشامان بکە، چی مەصڵەحەت بێ بۆ ئێمە، وامان تعلیم و تربیە بدە، حتی ئەگەر لە (راعنا)ش ئەو مەعنایەتان مقصودبێ بە تەعبیری لطیف، بێایهام تەعبیری بدەنەوە.

﴿وَٱسْمَعُوا۟ ﴾ ئێوە گوێبدەنە فرمایشتی نبوی، زەریف تێبگەن هەتا پێبگەن.﴿وَلِلْكَٰفِرِينَ ﴾ خاصة ئەوانەی، کە لەرێگای ئیمان کافر ئەبن،

لەڕوو بەحەق بزرئەبن ﴿عَذَابٌ أَلِيمٌ ١٠٤﴾ عەذابی زۆر بە ئێش هەیە.

﴿مَّا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ﴾ حەز ناکەن ئەوانەی، کە کافر بوون لە ئەهلی کتاب چ جوولەکە، چ دیان.

﴿وَلَا ٱلْمُشْرِكِينَ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْكُم مِّنْ خَيْرٍ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ هیچ خێر بێتە سەر ئێوە لە طرف خودای خۆتان، کەوابێ زینهار! ئەمانەت سەد ئەمانەت!. لێیان ئەمین مەبن، حەسوودن، دوژمنن، پێیان هەڵمەخەڵەتێن ئەمما.

﴿وَٱللَّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ١٠٥﴾ گوێیان مەدەنێ، کە ئەڵێن ڕەحمەتی ئیلاهی خاصی شەعبی بنیاسرائیلییە، نبووەت هەر لە ئەواندا ئەبێ، چونکە خودای تبارک و تعالی خاوەندی انعام و احسانی گەورەیە، شامله بۆ هەموو عباد، دەرگاهی فضلی ئیلاهی بە قسەی ئەم و ئەو سد ناکرێ و، بالخاصة ئاگاداربن لە ملعنەتیان، کە ئێوەش وەکی خۆیان بە داوی خوارق گرفتار بکەن، تاکوو لە فکر و نظر اعتبار، کە فیضێکی ئیلاهیە محروم بن.

زێرا جەنابی کبریائی قودرەتی هەیە. ئەو عالەمە دائماً لە ژێر پەنجەی قودرەتی ئەوە. بناءً علیه خودا ئەفەرموێ:

﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا﴾ هەر ئایەتێ، هەر خارقەیێ، کە ازالەی بکەین، یا بە جارێکی لە فکری خەڵقی ببەینەوە، وەک ئەو پێغەمبەرانەی، کە ناو و نیشانەیان نەماوە.

﴿نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ﴾ لە ئەوی چاکتر و عەجایب تر، ئەگەر بزانین مەنفەعەتی هەیە، ئەیهێنین. ﴿أَوْ مِثْلِهَآ﴾ یا اتیان بە مثلی ئەکەین. علی الاقل، کەوابێ وەکو (مجددی مصری) ئەفەرموێ: مقصد لە ئایەتی معجزەیە نەوەک ئایەتی احکام. بۆیێ جەنابی حەق ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ﴾ ئەی طالبی رشاد ئایا تۆ نازانی؟

﴿أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ١٠٦﴾ هەرچشتێ بێ معتاد و غیره معتاد، مادام لە دائرەی امکان دابێ، مقدوری خودایە. ئەمما ئەوی محاڵ بێ، قابلی بوون نییە، هەر کەسێ تجویزی ادنی محاڵێکی لاهەبێ، هدمی دینی اسلام ئەکا و، ئاگای لە خۆی نییە.

ئەگەر مقصد لە ئایەتی (حکم) بوایە، ئەیفەرموو: (الم تعلم ان الله علیم حکیم) یا چشتێکی ئەوها، کە مناسبی نسخی احکامی شرعیەبێ، (حقیقة) ئێرە جێی نەسخ نییە، بۆیێ باز بە تاکید ئەفەرموێ:

﴿ أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ ﴾ کەوابێ عادلی مطلق، مالک الملک علی الاطلاق لە اتیان بە خوارق عاجز نییە و ئایاتی ئەو، کە لە موڵکی سماوات و ئەرض دایە، ئەگەر بە فکر تەماشای بکەن، بە هەزار دەرەجە لە فوقی خوارقە.

﴿وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٍ ١٠٧﴾ بە غیری خودا کەس صاحبی ئێوە و نصیری ئێوە نییە. بناءً علیه، ئەو مفسدانە بەخێرخواهی خۆتان مەزانن، وە ئەگەر ئێوە طلبی ئایات ئەکەن، مقصودتان چییە؟ اولاً ئێوە وەکو بنیاسرائیلی نەبوونە ژێر چەپەلۆک، ئەگەرچی لە طرفی فارس، لە طرفی رۆم استیلای سەر بعضێک لە ئێوە کردووە، بەڵام ئەوان بە حورمەت ئەژین. وەکو اسرائیلییەکان مسخر نەکراون، کەوابێ حاجەت نییە ئێوە بە معجزە نەجات بدەم، ئەگەر مقصودتان هدایەتە ئایاتی سماوات و ارض بۆ ئەهلی نظر و اعتبار کافییە، بەڵکوو اکفایە، وە ئێوەش زەکاییێکی فطریتان هەیە، بە جبر و شددەتی اقوامی اجنبیەی غالبە نەکوژاوەتەوە.

﴿ أَمۡ تُرِيدُونَ أَن تَسۡـَٔلُواْ رَسُولَكُمۡ كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبۡلُۗ ﴾ یا ئێوەش حەز ئەکەن، کە سؤال لە رەسولی خۆتان بکەن وەکو قەومی (موسی)، کە سؤالیان لە (موسی) ئەکرد، لێشتان معلووم بوو، کە لە نەتیجەی بە غەیری

قەساوەت چی‌تر نەبوو بناءً علیە:

﴿وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَٰنِ﴾ ئەوی تبدیلی کفر بکا بە ئیمان یەعنی ئیمان، بدات و کفر وەرگرێ، یاخود لیباسی ئیمان لە بەر کفر بکا و کفر بە ئیمان بنوێنێ، صەرفی نظری عالەم بکا لە ئایاتی بیناتی ئیلاهی، ڕوویان بکاتە خوارق العادە، کە وەکو بروسکە هەڵئەبێ و ئەکوژێتەوە، نە عامە بۆ عالەم، نە دائمی‌یە..

﴿فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ١٠٨﴾ بە حەققەت ڕێی ڕاستی گوم کردووە، وە ڕێ بە ڕێگای ڕاست نابا و، ئەو تبدیل و گۆڕینەوە لە ئێوە دوورە. ذاتەن لە سوورەتی (فاتحە) طلبتان کرد، کە هدایەتتان بدا ، بۆ ڕێگای ڕاست. ئەو گرۆهە لە مشرکان، اولاً حەز ئەکەن ئیمان نەهێنن، کەیفیان بە سعادەتی ئێوە نایێ، ئەگەر ئیمانیش بێنن.

﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا﴾ زۆر لە ئەهلی کتاب، جوولەکە و دیان ئارەزوو ئەکەن، ئێوە بگێڕرنەوە لە پاش ئیمانتان، بتان کەنەوە (کفار)ی مرتد، ئەوەیش دیارە لە بەر خێرخواهی ئێوە نی‌یە، بەڵکوو..

﴿حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم﴾ لەبەر حەسادەتێ، کە نەشئەتی لە نەفسی خۆیانەوە کردووە، هیچ سەبەبی نی‌یە ئەو حەسادەت و بەدخواهی‌یە، کانە لە ئەواندا بووەتە چشتێکی فطری، وەکو شاعر ئەڵێ:

نیش عقرب نە از پرکین است

مقتضای طبیعتش این است[1]

﴿مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ﴾ لە پاش ئەوە کە حەق بۆ ئەوان تبینی کردووە، کە ئەم دینە، ئەم کتێبە هیچ خەوشەی تێدا نی‌یە، مع انە کەسێ

(١) – ئازاری چزووی دووپشک لەبەر قینداری نی‌یە، بەڵکوو سروشتی دووپشکەکە ئەوە ئەخوازێ کەوابێ. (بیمار)

کە حەقی بۆ ئاشکرابوو، حەقی ئەوەیە، کە قبوولی بکا. ئەوانە فضل لە قبووڵی، خەڵقی تریشی لێوەرئەگێررن.. ئەگەر دەسەڵاتیان هەبێ.

جنابی کبریائی مقصدی لە اظهاری بغض و، حسادەتی ئەوان بۆ موسڵمانان ئەوەیە، کە خۆیان لە شەڕیان بپارێزن، بە دۆستی ظاهری ئەو نەوعە دوژمنانە هەڵنەخەڵەتێن. ئەمما مستمع لە حەق ئەوانە، کە هیچ و پووچ و خۆررایی ئەو بەدخواهی‌یەیان لە حەق ئەکەن. غضبی دێتە فوران، قصد ئەکا هجوومیان بکاتە سەر، پارچە پارچەیان بکا، بۆیێ جەنابی حەق بۆ تەسکینی غضبیان ئەفەرموێ:

﴿فَٱعۡفُواْ وَٱصۡفَحُواْ﴾ عەفو بکەن، اعراض بێنن، ڕوو وەربگێررن.. اشارە بۆ بێمبالاتی لە حەق ئەو حەسودانە، بە صەراحەت نەیفەرموو (عنهم).

﴿حَتَّىٰ يَأۡتِيَ ٱللَّهُ بِأَمۡرِهِۦٓۗ﴾ هەتا خودای تعالی ئەمری خۆی دێنی بۆ ئێوە، ئەوسا چۆنی فەرموو وا ڕەفتار بکەن. ئەو ئەمرە (مجددی مصری) تەفسیری ئەکاتەوە بە (نصرەت)، بعضێ بە امری قتال. ئەمما تەفسیری بە قیامەت و جزای قیامەت زۆر دوورە، ئەو اسرائیلی‌یانە ذاتاً لێی ناترسن.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١٠٩﴾ ظاهراً دوور بوو، کە موسڵمان لەو ضعف و قیللەتی تێیدان بگەنە دەرەجەیێ، کە ئەمریان بکرێتێ بە قتال و نصرەتیان بدرێ لەسەر ئەو دوژمنانە، بۆ اطمئنانی قلب ئەفەرموێ، خودای تبارک و تعالی اقتداری لەسەر هەموو چشت هەیە.

ئەمڕۆ ڕۆژی (حرب)نی‌یە، ڕۆژی ئەوەیە بە خۆتان مشغول بن، ڕابطەی اجتماع لە بەینی خۆتان تقویە بکەن.

﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ﴾ وە هەرچی چاک بێ و منفعەتی تێدا هەبێ بیکەن.

﴿وَمَا تُقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ﴾ هەر جۆرە خێرێ ببێ. ﴿تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ﴾ لای خودا ئەی بیننەوە، لە خودا جزای خۆتان وەرئەگرن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١٠﴾﴾ ئەوی بیکەن لای خودا بزر نابێ، ظاهر و باطن لای ئەو عەیانە. ئەگەر عەیبێکی هەبێ لە ئەو بزر نابێ، ئەوجا تێکۆشن، اعمالتان بێ غل و غش بێ.

ذاتێ بووە لە قدمای صوفیە، مشهوور بووە بە (شێخی نساج)، جاوی دروست ئەکردو ئەیفرۆشت، گوزەرانی پێئەکرد. جارێ بە ڕادایی تۆپە جاوێکی بۆ شەخصێک دروست کرد، لای وابوو زۆر بێعەیبە، شەخصەکە تەماشای کرد، یەک دوو عەیبی لێدیتەوە، عەرضی شێخی کرد، شێخ دەستی کرد بە گریان.

شەخصەکە گوتی: قوربان مەگریێ، پارەکە ئەدەم و جاوەکە قبووڵ ئەکەم. فەرمووی: «بۆیێ ناگریم. بۆیێ ئەگرییم تۆ لەو تۆپە با وجودی زۆر سەعیم تێدا کردبوو کە هیچ عەیبم لێنەئەدیت، عەیبت دیتەوە. جا خودا بەو علیم و بصیرییە ئەبێ چەند هەزار عەیب لە عملی من بدوزێتەوە، کە لای خۆم زۆر بە خالص و مخلصی ئەیکەم».

﴿وَقَالُواْ﴾ ئەهلی کتاب بۆ اغرا و اغوای عالەم ﴿لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ﴾ ابداً محاڵە کەس داخلی بەهەشت نابێ. ﴿إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ﴾ الاّ کەسێ جوو بێ یا دیان!! ئەهلی جەننەت لە نظری ئەهلی کتاب، یەکێکە لەو دوو فرقە:

﴿تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ﴾ ئەوە ئەمەلی بی ماحصلە، خەیاڵی خاوە.

﴿قُلْ هَاتُواْ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١١١﴾﴾ بفەرموو دەلیل و حجەت و برهانیان بهێنن لە سەر ئەم دەعوایە، ئەگەر ڕاست ئەکەن.

﴿بَلَىٰ﴾ ئەو حصر و اختصاصە باطلە ﴿مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ﴾ هەر کەسێ

پاک بکا ذاتی خۆی، بە دەماغ و قلب و ڕوح نییەت بۆ خودا، ڕووی هەر لە ئەوبێ، ظاهر و باطن توجه نەکاتە هیچ. شائیبەی شرک لە دڵیدا نەمینێ ﴿لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ﴾ چاک بێ، اعمالی ڕێک و پێک بێ، ئەو کەسە ﴿فَلَهُۥٓ أَجْرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ﴾ جوولەکەبێ، دیان بێ، موسڵمان بێ، غەیرە بێ، هەرچی بێ.. لە هەر شعبێ بێ، بۆ ئەوە ئەجری خۆی لای خودای خۆی، خودا هەر خودای بنیاسرائیلی نییە، بەڵکوو خودای هەموو عالەمە.

ذاتەن لە صدری کتابەوە افتتاح کرا بە حەمد و ثەنای ربالعالمین.

﴿وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ١١٢﴾ خوف استیلایان ناکاتە سەر، عاجز نابن، ئەزانن ئەجریان بە خۆڕایی ناچێ. ئەهلی کتاب.. دوو ادعایان هەیە، یەکێ چوونە بەهەشتیان، بێ حق و حساب هەر چۆنێ ببن، دووەم غەیری ئەوان (ولو) مؤمنێکی خالصاً مخلصاً للە بێ، ناچێتە بەهەشت.. یەعنی دخولی بەهەشت بێ خوف و حزن، بۆ ئەو نەوعە کەسانەیە، کە مسلم و محسن بن، بە ناوی جوولەکەیی و دیانی و موسڵمانی نییە.

ئەو نەوعە مکارانە، اولاً جهەتی ترس نیشان ئەدەن، کە پێیان هەڵخەڵەتان، ئەوجا ڕێگای ترسانیان بۆ ئەکەنەوە، پاش ئەو ادعای اجمالییە، ئەوجا بزانین تفصیلی دەعوایان چۆنە.

﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ لَيْسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَىْءٍ﴾ جوولەکە ئەڵێن دیان لەسەر هیچ نین، دینیان نییە، هەمووی اوهام و خیاڵاتە، کەوابێ بەهەشت خاصەی ئێمەیە.

﴿وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ﴾ بالمقابلە ئەڵێن: ﴿لَيْسَتِ ٱلْيَهُودُ عَلَىٰ شَىْءٍ﴾ کەوابێ بەهەشت خاصەی ئێمەیە. ئەم قصەیە لەو دوو طائفەیە زۆر عجایبە، ئەگەر کەسێ جاهل بیکردابوایە، هەر چۆنی بوایە قەیدی نەبوو.. ئەمما ئەوانە.

﴿وَهُمْ يَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ﴾ جوولەکە تەورات، دیان انجیل، کەسێ کتێبی خودا

بخوێنێ بە تێگەیشتن، چۆن ئەم قصە پڕوپووچە ئەکا، بالخاصة (دیان) ئەگەر تەوراتیان بە دەستەوە نەبێ، ئەوان چییان هەیە لە گوفتاری جهالەت، آثاریان بەدەر ئەکەوێ، ئەوانە جاهلن، علمیان بە کتێبی خودا نییە.

﴿كَذَٰلِكَ﴾ وەکو ئەو لاف و گەزافە ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ لە سائری ملل.

﴿مِثۡلَ قَوۡلِهِمۡ﴾ قسەیێ وەکو قسەی ئەوان، حتی گەلێ لە موسڵمانانیش ئەڵێن.. هەر ئێمە (ناجین)، غەیری ئێمە هەموو فرەقی اسلامی ئەچێتە ئاگر، نە تەنها فرەقی اعتقادیات، بەڵکوو اربابی طرق و مذاهبیش وا ئەڵێن.

ئەگەر انصاف بکەین، ئەو لاف و گەزافی لە ناو ئێمەدا هەیە، باوڕ ناکەم لە ناو جوولەکە و دیاناندا هەبێ، بەڵام ئەوانە قورئانخوێن نین، اعتقاد بە قسەی ڕۆسای خۆیان ئەکەن.

لە کتێبیکی ڕافضی یانم دیت، کە خودا ئەفەرموێ « هەر کەسێکی (علي) خۆش بوێ، تاعنانی ئاسمان گوناهی هەبێ، من لێی خۆش ئەبم، ئەوی ڕقی لە (علی) ببێتەوە، ئەگەر مابینی ارض و ئاسمان چاکەی هەبێ، لێی قبووڵ ناکەم عەذابی ئەدەم».

منیش نووسیم: ئەگەر حسنی معاملەی لەگەڵ خودا هەبوایە، ئەبوایە ئەویش لە مطیع و محبانی خوا خۆشبێ، یا ڕقیشی لێیان ببێتەوە! بەڵێ ئینسان بە قسەی خۆشکەڵە خۆشکەڵە، هەڵئەخەڵەتێ. ئەو نەوعە خودپەسند و هەرزەگۆیانە ئەبێ جزایان چیبێ؟هەر خودا ئەیزانێ، بە کەس نایێتە بەیان، بۆیێ ئەفەرموێ:

﴿فَٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ١١٣﴾ خودا حوکمیان لە بەینیدا ئەکا لە ئەوەی، کە اختلافیان تێدا هەیە، فصلی قضا، دەفعی نزاع، هەر کەس بە جزای خۆی گەیاندن عائدی ئەوە.

وقتاً کە معلوم بوو تسویلاتی بنیاسرائیلی صرف بۆ ئەوەیە، کە ڕووی

عالەم لە خودا وەربگێررن. ئەو عبادەت گاهی، کە بۆ خودا بناکرابوو بە صوەر و تماثیل و هیاکل بیکەنە بتخانە، وەکوو مشرکەکانی عەرەب. جەنابی حەق بۆ اظهاری ئەم ظلمە، ئەم تەجاوز لە حەقە ئەفەرموێ:

﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ ﴾ کێ ظالمترە لەو کەسەی، کە مەنعی مزگەوتانی خودا ئەکا، کە ذکری خودای تێدا بکرێ بە خالص و مخلصی، بێشائبەی شرک.

﴿ وَسَعَىٰ فِى خَرَابِهَآ ﴾ کۆشش بکا بۆ تێک دانی ئەو مزگەوتانە. ذاتاً تعمیری مزگەوت بە طاعەت و عبادەتی پەروەردگاری عالەمە، کە سکانی خالص و مخلصی تێدا نەما، (ولو) بنە و بارەگا و گونبەدی سەر بکێشێتە قوببەی فەلەکی مینا ڕەنگ، هەر بە وێرانە حسابە. دیارە ئەو نەوعە کەسانە تاکوو دڵیان بە حبی بت و اصنام و تماثیل نەبووبێتە بتخانە، مزگەوتانیش ناکەنە بتخانە و سەعیش ناکەن بۆ تێک دانی دڵی موسڵمانان، کە تلویثی بکەن بە تماثیل. ئەمڕۆش تەماشای مزگەوتان بکەن نسبەت بە سائری مواقعی عبادەت، کثافەت و بێڕەنگی و بێنەیرەنگی توحیدی تێدا ئەبینن، ئەوانیتر بە بتخانە، مسرحی تیاترو، ملعبەی ڕەقص و سەما و چەپڵە ڕێزانە زیاتر ئەچن، بەڵکوو عیناً (بیت الاصنام)ن غایەتی ناویان جودایە.

ئەو ئایەتە ڕابطەیەکی زۆر عەجیبە، بۆ نظمی ماقبلی لەگەڵ مابعدي.

﴿أُوْلَٰٓئِكَ ﴾ ئەوانەی، کە سعی ئەکەن بۆ تخریبی مساجدی ئەهلی توحید. ﴿مَا كَانَ لَهُمْ أَن يَدْخُلُوهَآ إِلَّا خَآئِفِينَ ﴾ بۆ ئەوانە نەبوو، کە بچنە ناو ئەو مزگەوتانە، الاّ لەگەڵ ترس و خوف و خەشیەتی خودایی. حەقیان ئەوە بوو بچنە ناو ئەو مزگەوتانە بە کمالی خضوع و خشوع، ڕووبکەنە جانبی ئیلاهی. بەڵام حبی صورەت و اشکال، ڕابطی دڵیان بە جهەت ڕووی لە خوداوەندی بێجهەت وەرگێرران.

﴿لَهُمْ فِي ٱلدُّنْيَا خِزْيٌ﴾ بۆ ئەوان هەیە لە دونیا ئابڕووچوون، (حقیقة) ئەوە ئابڕووچوونێکی زۆر گەورەیە. کەسێ لە (ملیّـــون) بێ خانەی ئیلاهی وەربگێڕێ، تماثیلی کفر و ضلالی پێوە بکا.

﴿وَلَهُمْ فِي ٱلْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١٤﴾﴾ کەوابێ بالعکس بۆ ئەوانەی سعی بکەن، دڵی عباد و عبادەتگاهیان لە پیسی پاک بکەنەوە، جزای خێریان ناییتە بەیان، (مع انه) ئەو مساجدانە ببن، یا نەبن چ نقص بۆ عظمتی پەروەردگار نییە.

﴿وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ﴾ بۆ خودایە هەموو ئەرز، ئەورووپا و ئاسیا، ئەمریکا و ئەفریقا، ئەوی عبادەتی خوا، بکا ئەتوانێ لە هەموو جێیەک بیکا. لای خودا پەرست، قدسیەت بۆ جهەت نییە. قدسیەت بۆ ئەو کەسەیە، کە منزهە لە جهەت، لە هەموو جهەت هەر ئەوی ڕووی قلبی هەر لە ئەوە.

﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ﴾ غایەتی لە بەر بعضـــێ مناسبە، بعضە جهەتی انتخاب کردووە، کە لە صورەتی ظاهری عبادی خودا ڕووی تێبکەن، هەر جێیێ ئەمریان پێبکا ڕووی ئەکەنێ، ئەمما ڕوویان هەر لە خودایە.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿١١٥﴾﴾ محصور نییە لە مەکانێک، محدود نییە بە جهەتێک، محددی جهات و محددی محدد الجهات هەر ئەوە. قودرەت و علمی احاطەی بە هەموو چشت داوە، لەسەر ئەم تقدس و تنزهە، کە جەنابی کبریائی هەیەتی، ئەو جاهلە گومڕاهانە جەنابی کبریائیان لە زومرەی نباتات و حیوانات حساب ئەکرد.

﴿وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا﴾ چ کوڕ چ کچ، جەهالەتیان گەیشتبووە دەرەجەیەک، فضل لە جهەتی گۆڕرین بە خەیاڵی فاسدی خۆیان، حقیقەتی خودایان ئەگۆڕری.

﴿سُبْحَٰنَهُۥ﴾ جەنابی کبریائی منزهە، وەک لە سوورەی اخلاص

ئەفەرموێ: نە کەسی لێ بە وەلد بووە، نە لە کەس بە وەلەد بووە، کێیە لە عالەمی موجودات وەلەدی خودا بێ؟

﴿بَل لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ ئەوی لە ئاسمان و ئەرزدابێ، هەمووی مملوک و عەبدی خودان.

﴿كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ١١٦﴾ هەمووی بۆ ئەو خاضع و ذەلیل و مسخر و بێدەسەڵاتە.

﴿بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ مخترعی ئاسمان و ئەرزە، ئاسمان و ئەرزی بێوێنە ایجاد کردووە، یاخود بێنظیرە لە ئاسمان و ئەرز. کەوابێ کێ ئەبێتە وەلەدی خودا؟ ئەوی ئێوە ئەڵێن وەلەدی خودایە، لە (مبدعات) کەمترە، دنیا مالامالە لە اشباه و انظاریان.. امثالی خۆتانن، ئێوەش وەکو ئەوانن، ئەوانیش وەکو ئێوە (زەمانی)ن و (مکانی)ن، اجرامن، اجسامن، محاطن، محدودن.

بدیعێکی وایە ﴿وَإِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ١١٧﴾ کە انفاذی امرێ بکا، حکمێ بفەرموێ، لە سەر آلات و ادوات معطل نابێ، مجرد امری تکوینی بێ مباشرە و، وەضع و نسبەت کافییە بۆ بوونی.

هەر چشتێ، کە قصدی بکات ئەوچشتە ڕووی مخالفەی نییە در عقب ئەبێ، وەکو عەرضمان کردن ئەم ئەمرە، ئەمری تکوینییە، ئەمری تکلیفی نییە. ئەمر و ئیرادەی تکوینی مخالفەی غیرە قابلە، کەس لەو شەئنەدا شرکەتی لەگەڵ خودا نییە، هەرچی بێتە وجود بە طریقی توالد، یا ابداع هەمووی بە تکوینی خودایە.

قەدەر چییە؟.. احضار و ئامادە کردنە بۆ بوون.

قەضا چییە؟.. انفاذ و بە جێهێنانی چشتە بالفعل، لە قەدەر خۆپاراستن ئەبێ، ئەمما لە قەضا نابێ، ممکن نییە.

روایەت کراوە، جەنابی ڕسالەت پەناە بە تەک مەغارەیی مائل بە کەوتن

خێرا ڕۆیی و تێپەڕی، تا لە ئاقاستی دەرچوو. عەرضیان کرد: تۆ لە قەضای خودای فرار ئەکەی؟

فەرمووی: لە قەضای خودا فرار ئەکەم بۆ لای قەدەری.

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾ گۆیا ئەوی تێپەڕی قسەی زانایەکانیان بوو، ئەوی نازانایەکانیان ئەیان گوت:

﴿لَوۡلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ ﴾ بۆچی خودا قسە لەگەڵ ئێمە ناکا؟ ظاهراً ئەوەش بە تحریک و دەسیسەی زانایەکانیان بوو، وە الاّ عەوامی هەر میللەتێک هەبێ خۆی لە زمرەی خواص حساب ناکا ﴿أَوۡ تَأۡتِينَآ ءَايَةٌ ﴾ یا قسەمان لەگەڵ بکا بە زەریفی بیناسین، یا خارق العادەیێ وامان بۆبێ، کە ناچار ئیمان بهێنین، حاصلی، ادعایان کرد، کە علمێکی ضروریمان ببێ بە خودا، وە الاّ ئیمان ناهێنین.

﴿ كَذَٰلِكَ ﴾ وەکو ئەوە لە جەهل و عناد.. ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم ﴾ گوتیان ئەوانی پێش ئەوان ﴿مِّثۡلَ قَوۡلِهِمۡ ﴾ قسەیەک وەکو قسەی ئەوان.

﴿ تَشَٰبَهَتۡ قُلُوبُهُمۡۗ ﴾ دڵیان پێک ئەچێ،بۆیێ قسەیشیان پێک ئەچێ. (حقیقةً) ئەو قسە زۆر بێ مەعنایە، ئەوی ئەو القاءاتەی کردووە،ئەگەر مقصودی اضلال و اغوا نەبێ، ئەزانێ ئەگەر خودای تعالی قسە لەگەڵ هەموو کەس بکا.. نبووەت نامێنێ (عیسی، موسی، ابراهیم) بۆچییە؟ وە ئەیان زانی ئیمانی الجائی، ضروری قاعدەی تکلیف تێک ئەدات. ئیمان ئەبێ ئینسان خۆی بە فکر و نظر پەیدای بکا! بۆ ئەو جهەتەش:-

﴿قَدۡ بَيَّنَّا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ١١٨ ﴾ لە مەلەکوتی سماوات و ئەرز، ئایەتی (لا یعد ولا یحصی)مان داناوە، لەسەر زوبانی پێغەمبەران شەرح و ایضاحمان کردووە، بۆ قەومێکی بزانن، لە حقایق بگەن بە زانین و تێگەیشتنێکی مەحکەم.

خوارق ڕۆیی، دەوری تێپەری. نەتیجەی معلوم بوو. زەمانی فکر و هۆشە و، کەسێ فکری هەبێ لە ئایاتی انفس و اکوان، هەزار ئایاتی بۆ کەشف ئەبێ، کە هەزار مەرتەبە لە خوارق بە فائدە ترە.

﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ ﴾ ئێمە تۆمان ناردووە بە علم، بە فکر، بە نظر سەوقی ئینسان بکەی بۆ کەشفی اسراری فیطرەت.

﴿بَشِيرٗا وَنَذِيرٗاۖ ﴾ بەشارەت بدەی بۆ ئەو کەسانەی، کە بە ڕاستی ئیمان بهێنن و چاکە بکەن، دڵیان خۆش بکەی. ئەوانەی کە مزخرف و منافقن بیان ترسێنی، حەقی تۆ ادای ڕسالەتە.

﴿وَلَا تُسۡـَٔلُ عَنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡجَحِيمِ ١١٩﴾ تۆ مسؤول نی لە جهل و ضلاڵەت و کفری ئەوانەی، کە خاوەندی جحیمن، ڕەفیقی ئاگرن.

مەلایێ صەرفی قودرەتی خۆی بکا بۆ تێگەیاندنی فەقێ. فەقێ کە تێنەگا، مەلا چ قصوری هەیە؟ ئیشارەمان کرد، کە قسەی ئەو جاهلانە بە دەسیسەی مەلایەکانیانە، بوێ ئەوانەی لەمیانە فرێدا و فەرمووی:

﴿وَلَن تَرۡضَىٰ عَنكَ ٱلۡيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمۡۗ ﴾ خصوص (جهلە)ی عەرەب لە قەید و بەندی قسە لەگەڵ کردنی خودا و ئایاتی ضروریە دانین. ئەگەر قسەیەکی وابکەن بە القاءاتی ئەهلی کتێبە، ئەوانە لە تۆ ڕاضی نابن، هەتاوەکو تابعی دین و ئایینی ئەوان ئەبی.

﴿قُلۡ﴾ تۆ بفەرموو، یا رسول الله ئیمانم هەیە بە خودا، زۆر چاک بڕوا ئەکەم ﴿إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلۡهُدَىٰۗ ﴾ هدایەتی خودا هەر ئەو هدایەتە، من کە سەر فیطرەتی ئیلاهی ماوم، دوای هەوا و هەوەس نەکەوتووم. غەریزە، حس، عقل کفایەت نادا، الهام و وحیی ربانی پێئەوێ.

ئیمانم هەیە، کە (موسی و عیسی) لە پێغەمبەرانی خودان، هیدایەتیان ئیلاهیە. پاش ئەوە کە خودای تعالی کەشفی ئەحواڵی ئێوەی بۆ کردم، لە

شقاق و عناد و نفاق و حەسەدی ئێوە تێگەیشتم.. تبعیەتی من بۆ هەواو هەوەس و خیاڵات و ئەوهامی فاسدەی ئێوە محاڵە، لە دائرەی امکان چووەتە دەر. و(مع هذا)ش خۆی راساً ئەوە نافەرموێ، تاخودا ئەفەرموێ:

﴿وَلَئِنِ ٱتَّبَعۡتَ أَهۡوَآءَهُم﴾ بالخاصة، وە هي (ولد) بۆ خودا ﴿بَعۡدَ ٱلَّذِي جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ﴾ علم بە خباثتی ئەوان و بەسائری حقائقی اشیا، کە لە طرف خوداوە بۆت هاتووە.

﴿مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٍ ١٢٠﴾ یەعنی بالغرض و التقدیر، ئەگەر تۆ اتباعی هەوا و هەوەسی ئەوان بکەی، قطعی امل لە خودا بکە. لە طەرەف خودا هیچ یار و یاوەرتنابێ کە لە طەرەف خوداوە یار و یاوەرت نەبێ، هەر نابێ.

ئەمە حاڵی سەودای اعظم لە بنیاسرائیلی چ جوو، چ دیان. بەلام بعضێ هەبوون لە بنیاسرائیلی، فکریان لەسەر حەق (کانە) لەگەڵ ئەوان هەریەک نەبوون، بۆیێ بێعطف ئەفەرمووێ.

﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ ئەوانەی، کە ﴿يَتۡلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ﴾ کتێبەکەیان ئەخوێندەوە، بەحقی خوێندنەوە کە تامل و تدبر و تفکرە، لە مەعنا گەیشتنە. رەشخوێنی هیچ اعتباری پێنییە. مقصد فەهمی مەعنایە ﴿أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۗ﴾ ئەوانە بە ڕاستی ئیمان بە کتێبەکە ئەهێنن، بۆیێ ئیمان بە (ما انزل علیک)یش ئەهێنن، قطعی نظر لە اشخاص ئەکەن، ئەزانن دەعوەتی تۆیش، وەکو دەعوەتی (عیسی و موسی)، حەقە.

﴿وَمَن يَكۡفُرۡ بِهِۦ﴾ ئەوی کافر ببێ بە کتێبەکە ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ١٢١﴾ بە ڕاستی ئەوانە خەسارەتمەندن، ئیمان بە تۆش ناهێنن.. یەعنی ئەوانی کە ئیمانیان بە کتێبی تۆ نەهێناوە، ئیمانیان بە کتێبەکەی خۆشیان نەهێناوە. خاک بە سەر لە هەردوو دنیا بوون. خائب و خاسر، لە هەر دوو دین محروم

بوون. جەنابی حەق خطاب لەگەڵ ئەوانەی، کە ئیمانیان بە حەضرەتی (محمد) هێنا، فەرمووی:

﴿ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَنِّي فَضَّلۡتُكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٢٢ ﴾

ئەوانی کە بە عنوانی تەشریف پێیان ببیژرێ (یا بنیاسرائیل) ئەمانەن، ئەوی شایان بێ، کە تذکار بکرێ بە نعمەتی ئیلاهی ئەمانەن، هەروەکو تفضیل دراون لە طرف خودا بحق، ئەوانە، قبووڵی ئەم تشرفەیان کردووە، کە ئیمانیان هێناوە بە خاتم الرسل. عیناً ئەمریان ئەکاتێ و ئەفەرموێ:

﴿ وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا لَّا تَجۡزِي نَفۡسٌ عَن نَّفۡسٖ شَيۡـٔٗا ﴾ نەکەن بە دینی جدید هەڵخەڵەتێن، کەس لە ڕۆژی جەزا لە فریادی کەس ناگا، نە (ابراهیم)، نە (موسی)، نە (عیسی)، نە (محمد).

﴿ وَلَا يُقۡبَلُ مِنۡهَا عَدۡلٞ ﴾ ذاتاً ئێوە لەسەر فکری فدیە نەبوون و، لە (دینی مبین)یشدا فدیە نییە.

﴿ وَلَا تَنفَعُهَا شَفَٰعَةٞ ﴾ نفع نادا بە هیچ نەفس، هیچ شفاعەت، سابقاً بەیانی مسئلەی شفاعەتمان کرد، احتیاج بە اعادەی ناکا.

﴿ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ١٢٣ ﴾ ئەوانەی، کە بەوخیاڵاتی باطلە، هەڵخەڵەتاون، نەصرەت نادرێن، یار و یاوەری ناکرێن، لە خودا بەر گەشتەن، هەر کەسێ خودایی بێ لە ئەوان، بەرگەشتە ئەبێ.

لەو ئایەتی کریمە بە دەر ئەکەوێ، کە دەعوەتی محمدی، انذاری احمدی بۆ دۆست و دوژمن، مؤمن و کافر، موافق و منافق، ظاهراً و باطناً، سراً و علناً، هەر یەکە فرِوفێڵ و خدشەی تێدا نییە (صلی الله علیه و سلم وجزاه عن الرسالة حق الجزاء) سابقاً فریادی تظلمی موسڵمانان لە دەست ئەو ظالمانەی، کە منعی مساجدی خودایان ئەکرد، لە ذکری خودا تێدا کردن بۆ گوێی ئەهلی انصاف کرا..

بعضێ لە مؤمنی بنیاسرائیلی اجابەی دەعوەتیان کرد، کتلەیێکی (مرکب) لە اسرائیلی و اسماعیلی لە ژێر رایەتی هدایەتی محمدی گردبوونەوە بالاتفاق، ئەو مساجدانە لە چەنگ ئەو ظالمانە نەجات بدەن. وە اعظم و اهمی مساجدی ئەهلی توحید ئەو مزگەوتە بوو، کە لە طرف حەضرەتی ابراهیمەوە بنا کرابوو. حەضرەتی ابراهیمیش مصدری (فرقتین) بوو ابی اعظمی اسرائیلی و اسماعیلی بوو. بۆیێ بە تذکار بەیانی حاڵی ابراهیم و کیفیەتی بنای مسجد ئەفەرموێ:

﴿وَإِذِ ٱبۡتَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ﴾ کە خودای ابراهیمی، ابراهیمی امتحان کرد ﴿بِكَلِمَٰتٖ﴾ بە چەند احکامێ، کە شایان بێ امتحان خلیل الرحمانی پێبکرێ، دیارە اوامرە بە نینووک کردن، بەر تاشین، طهارەت کردن.. ئەو جۆرە اموری تافهە نییە، تا لە مەقامی ﴿فَأَتَمَّهُنَّۖ﴾ تحسین و ئافەرینی ئیلاهی دەربارەی بگوترێ ـ ئەگەرچی نظر بە (قون نەشۆرە)کانی دیانان هونەرێکی تیدا هەیە ـ تەواوی کردن بە مکملی بە جێی هێنان وەکو لە امتحان دەرچوو، (کانە) لە مکافات ﴿قَالَ﴾ خودا فەرمووی: ﴿إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامٗاۖ﴾ ئەمن ئەتۆ ئەکەم بە پێشەوا (مقتدی بە الانام) ﴿قَالَ﴾ حەضرەتی خلیل عەرضی جنابی باری کرد: ﴿وَمِن ذُرِّيَّتِيۖ﴾ بعضێکیش لە اولادو احفادم بکە بە امام و مقتدی بهی انام. ﴿قَالَ﴾ جەنابی باری فەرمووی دوعات قبووڵە، لاکن ﴿لَا يَنَالُ عَهۡدِي ٱلظَّٰلِمِينَ ١٢٤﴾ عەهد و پەیمانی من ناگاتە ظالمان، (کانە) عەهدی خودا خۆی (ابا) ئەکا لە ظالمان، ئەمما بۆ ئەوانەی، کە لە اخلاق و تربیە و آدابی پاکیزەی تۆ دەرنەچن، وەکو تۆ عەهد و پەیمان بە جێبهێنن، نائلی شەرەفی امامەت ئەبن.

ذاتاً حەضرەتی ابراهیمیش ئەمەی مقصود بوو، ئەوانەی کە ذریتی ئەون، مادی و معنوی اولادی ئەون، ئەوان نائلی عەهدی خلافت ببن، لاکن

بۆخاترێ نەبێ بە بەهانە بۆ سفهایان، جەنابی حەق تصریحی پێکرد.

لە پاش ئەوەی، کە حەضرەتی (ابراهیم) نائلی شەرەفی امامەت بوو، بالطبع جێگایەکی پێئەویست، کە بیکا بە مرکزی امامەتی خۆی، لە هەموو قطعاتی دنیا جێگایەکی اختیار کرد بێزیب و زینەتی مدنی، بێ تزویق و مزخرفاتی وثنی، مجرد لە هەموو آرایش و لذائذی دنیایی. زۆر نەچوو ئەو جێگایە بوو بە مجتمعی ناس بە نەوعێ، کە زۆر دوور بوو لە خاطر و خیاڵ، کە محضاً بە جعلێکی ئیلاهی بێ.

﴿وَإِذْ جَعَلْنَا ٱلْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ﴾ چونکی خەڵقەکە بۆ زیارەتی ئەو (بیت)ە ئەچن، مقرەکەیان هەر بیتە. ﴿وَأَمْنًا﴾ اول چشتێ، کە جنابی کبریائی ئەمری بەو خەڵقە کرد.

﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى﴾ لە مقری امامەتی ابراهیم، جیگایەک بۆ اقامەی شعائری دینی دروست بکەن، ئەوان مباشرەیان بە بنای مسجد الحرم کرد لە دەوری بیت. ئەمما بنای نفسی بیت، در عهدەی حەضرەتی (ابراهیم) و جگەر گوشەی ئەو، کە (اسماعیل)ە کرا.

﴿وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ﴾ نەفسی خۆیان ﴿أَن طَهِّرَا بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ١٢٥﴾ دەرعەهدەی ابراهیم و اسماعیلمان کرد، کە بەیتی من تطهیر بکەن، پاک بکەن لە ڕسوم و نقوش و تماثیل و هیاکلێ، کە معابدی ئەهلی شرکی پێتلویث کرابوو، بۆکێ؟ بۆئەوانەی کە دەورەی ئەو بەیتە ئەدەن، زیارەتی ئەکەن، لە مزگەوت خۆیان حبس ئەکەن، اعتکاف ئەکەن، ئەو گرۆهەی ڕاکع و ساجد، خاضع و خاشعن بۆ خودا، خلاصە وای پاک بکەن کە شایان بێ پێی بڵێن «بیت الله».

﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا﴾ ئەو جێیە بگێرە بە شارێکی محفوظ لە شەڕی دوژمنی دنیا و دین.

﴿وَٱرۡزُقۡ أَهۡلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ﴾ لە عەهدی سابق جنابی باری فەرمووی: عەهدی من ناگاتە ظالمان، لە دوعای ئێرە کە حەضرەتی (ئیبراهیم) دوعای ڕزق ئەکا بۆ ئەهلی شارەکە، بە نەوعێ اظهاری نفرەت لە ظالمەکان ئەکا، کە خودا هیچ ڕزقیشیان نەداتێ، بەڵکوو ئەم ڕزق و ثمراتە خاص بێ بۆ:

﴿مَنۡ ءَامَنَ مِنۡهُم بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ﴾ جەنابی حەق دوعای قبوڵ ئەکا، لاکن ئەفەرموێ من ئەوانی، کە بێ ئیمان بن محرومیان ناکەم، لاکن ﴿قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلٗا﴾ منفعەتی کەمی پێئەگەیینم.. ذاتاً منفعەتی دونیا، ئەگەر زۆریش بێ کەمە. ﴿ثُمَّ أَضۡطَرُّهُۥٓ﴾ لە قیامەت ﴿إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِۖ﴾ مادام ئەوان لە دنیا بە اختیار و مەیلی خۆیان، کفریان لەسەر ئیمان ترجیح کرد، ڕوویان لە متابعەی تۆ وەرگێڕرا، من مجبوریان ئەکەم کە بچن بۆ ئاگر، چ ڕێگای تر نییە بۆ کوێ ئەچن، (مع انه) بدیهییە کەس بە مەیل و شەوقی خۆی ناچێ بۆ ئاگر، ئەم ئاگرەیش ﴿وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ١٢٦﴾ مصیر وەکو لە قاموس ئەڵێ بە موضعێ ئەڵێن، کە لە اطرافییەوە ئاوی بۆ بگەڕێ، بچیتێ، (کانە) ئەو جێگایە حەمامیکی صیفییە.

ئەورووپایی زۆر کەیفیان بەو نەوعە حماماتی صیفی دێ - خودای تعالی حفظمان بکا لەو جێیە -

﴿وَإِذۡ يَرۡفَعُ إِبۡرَٰهِـۧمُ ٱلۡقَوَاعِدَ مِنَ ٱلۡبَيۡتِ وَإِسۡمَٰعِيلُ﴾ ئەوەی زۆر چاک یادبکەی حقاً جێگای اعتبارە وەقتێکی، کە (ابراهیم) و (اسماعیل) بناغەی کەعبەیان لە سەر ئەساسی شەرەف و مجد و بڵندایی دانا، بزانین چییان ئەگوت بە کمالی تضرع و، زاری عەرضی نیازیان ئەکرد لە خزمەت باری.

﴿رَبَّنَا تَقَبَّلۡ مِنَّآۖ﴾ خودایە لێمان قبووڵ بکەی، لێمان ڕاضی ببی. ﴿أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ١٢٧﴾ دوعای ئێمە ئەبیێی، ئاگاداری ما فی الضمیری

ئێمەی ئاگات لەهەموو چشت هەیە، هیچ چشت لە تۆ بزر نابێ.

﴿ رَبَّنَا وَٱجۡعَلۡنَا مُسۡلِمَيۡنِ لَكَ ﴾ ئەی خودای ئێمە، ئێمە بگێرری بە منقاد و مطیع بۆ تۆ، لە ذللەتی خضوع بۆ غەیری تۆ بمانپارێزی.

﴿ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةٗ مُّسۡلِمَةٗ لَّكَ ﴾ وەهەم پەیدا بکەی لە (ذریتی) ئێمە، ئوممەتێکی منقاد بۆ تۆ و بەس.

﴿ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا ﴾ عبادات، یا مواقعی عباداتمان نشان بدەی ڕای العین، بە اتفاقی ئێمە و معتزلە، ئەو نەوعە شەریعەتە، بە خودا نەبێ بە کەس داناندرێ، حتی حەضرەتی (ابراهیم) و (اسماعیل)، بەو هەموو عەقڵ و درایەتەی خۆیان، لەخۆیان ڕانەدیت، کە شەریعەتی پاک و خاوێن و بێ غلو غەشیان بۆ دانێن.

﴿ وَتُبۡ عَلَيۡنَآۖ ﴾ دینی سووک و حەنیفمان بۆ دابنێ، نەکەوینە ژێر بارێکی گران، دیارە ئەو مەقامە مەقامی طلبی دانانی شرعە، مەقامی گوناه و پەشیمانی لە گوناه نییە.

﴿ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ١٢٨ ﴾ تۆ دائماً (کرةً بعد کرةٍ) ڕووی لطف و مەرحەمەت ئەکەیە عبادی خۆت، مقتضای ئەو لطف و مەرحەمەتە ئەوەیە، کە تکالیفی زۆر و صعب لە سەر عبادی خۆت دانەنێی، مەبادا تووشی گوناه ببین، ذاتەن شرائعی ئیلاهی هەمووی بۆ تعدیلی طبیعەتە. ئەگەر قەومێک خۆیان گرانبار نەکەن، خودا باریان گران ناکا.

﴿ رَبَّنَا وَٱبۡعَثۡ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ ﴾ پێغەمبەرێ لە خۆیان بۆ خۆیان بنێری. ئەو پێغەمبەرەیش ﴿ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِكَ ﴾ ئایاتی تۆیان بە سەردا بخوێنێتەوە، چ مکوَن، چ منزَل، شەرح و ایضاحیان بۆ بکا، تێیان بگەیێنێ. ﴿ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ ﴾ ئەو کتێبەی، کە بۆی ئەنێرێ، ئەو احکامی، کە تێی دا هەیە، زەریف بۆیان بەیان بکا، لە اعتقادی و لە

اعمالی، یا خود فێری نووسینیان بکا. (حقیقةً) ئەوە زۆر مناسبی حاڵی ئوممەتێکی (امي)یە.

﴿وَٱلۡحِكۡمَةَ﴾ حقایقی اشیایان تێبگەیێنی، آداب و اخلاقی فاضلەیان فێر بکا. ﴿وَيُزَكِّيهِمۡۚ﴾ ظاهر و باطنیان پاک بکاتەوە، بێغل و غەش و فکری فساد بن. (حقیقةً) ئەو دوعایە زۆر باشە بۆ مەلایان (بە خصوصي). زۆر مەلا هەن بە علم و حکمەت ئەبن بە جەربەزە، مفسد، عنود، ئەو علم و حکمەتە بۆ ئەوان ئەبێ بە ئافەت. جاهلێ، لەو نەوعە مەلایە گەلێ چاترە.

﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١٢٩﴾ حاڵی ئینسان لە بەینی حضارەت و بداوەت، یەعنی شارستانی و لادێیی زۆر سەیرە. انسانی مدنی مەیلی علم و حکمەت و کتابەتی ئەبێ، سەعی ئەکا، تێئەکۆشێ، کە ببێتە یەک لە سەرامەدانی زەمان. ئەمما نفاق، شەیطەنەت، کبر و انانیت، اخلاقی ذمیمە، اعمالی سیئە ڕووی تێئەکا، دەوری لێئەدا، زۆر نادر و نایابە انسانێکی دڵ خاوێن لە حضارەت هەڵ بکەوێ.

(بەدەوي) لادێیی، جهل و غباوەت و تێنەگەیشتن، نەفرەت لە کەسبی علم و کتابەت و حکمەت لە سەری زیاد ئەکا. لەگەلێ لە کرمانجانم ئەبیست لە دەوری سابق، ئەیان گوت، ئەوەندەی لە قەڵەم ئەترسین، ئەوەندە لە تفەنگ ناترسین.

حەضرەتی (ابراهیم)، کە لە مەیلی بنی (اسماعیل) ئاگادار بوو، دیتی زۆر کەیفیان بە بەداوەت دێ و سائری عربی (رحالة) لە اطرافی (مکە) ڕوو چوو بوون لە احواڵی بەداوەت، زۆر دووری زانی، کە ئەو دوعایە قبووڵ ببێ، بۆیێ لە خاتمەی دوعا عەرضی جەنابی کبریائی کرد: «یاربي، تۆ غالبی، قووەتت بەسەر هەموو چشتدا هەیە. دانایێکی وەهای کە ئەتوانی چشتی وادابمەزرێنی، موقعێکی وای بۆ ببینیەوە، کەعەقڵ تێیدا حەیرانە».

ئەگەر حەز ئەکەی بە تەواوی لە سرری ئەو ئایەتە بگەی، تەماشای اوائلی سورەی (صف) بکە، ئەوجا جەنابی حەق دوعای (ابراهیم) و (اسماعیل)ی قبووڵ کرد. پێغەمبەرێکی بەو نەوعە محضاً لە عیززەت و حکمەتی خۆی بۆ ئەو قەومە نارد. ماوەتەوە قەوم استفادە بکەن لەو مرشدە عظیمە، لەو دینە پاک و خاوێنە.

بناءً علیە، کەسێکی بە هۆش بێ، ممکن‌نی‌یە ئیمان بەو پێغەمبەرە نەهێنێ، ئەو دینە خاوێن و پاکە قبووڵ نەکا، ئەگەر کەسێکی نەیکا، جێی (تعجبە) هیچ وجهی نی‌یە، الاّ سفاهەت نەبێ.

﴿ وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَٰهِـۧمَ ﴾ کێ مەیل ئەکا لە میللەتی (ابراهیم)، صەرفی مەیلی خۆی لێ‌ئەکا؟ کەس. ﴿إِلَّا مَن سَفِهَ نَفْسَهُۥ﴾ الاّ کەسێکی خۆی خۆی سفیە بکا، نەفسی خۆی لە صلاحی دنیا و دین وەربگێرێ. حتی کەسێکی (حقیقةً) سفیە بێ قابلە اصلاح بکرێ، کە کەمێ تێگەیاندرا مەیل ئەکا بۆ میللەتی ابراهیم مەیلی لێ‌ناکا، ئەمما ئەوی خۆی کەر و ئەحمەق بکا، علاجی ناکرێ بە (جعل وتحمق)، بە ملعنت و خباثت، رووی خۆی لەو میللەتە پاکە وەرئەگێرێ، و الحال حەضرەتی ابراهیم.

﴿وَلَقَدِ ٱصْطَفَيْنَـٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا﴾ بە حەققەت ئێمە ئەومان اختیار کردبوو لە دونیادا، بەهەموو افعال و اقوال و اطواری ممتاز، پاک وخاوێن بوو.

﴿وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ١٣٠﴾ کەوابێ ئەی بنی‌اسرائیلی و اسماعیلی! تێبفکرن بە تقلیدی آباء و اجدادی خۆتان، خۆتان گومراه مەکەن، روو لە حەق وەرمەگێرن.

نابینن حەضرەتی ابراهیم لە دنیا لە کێ‌پاش کەوتبوو ئەگەر تقلیدی آباء ببێتە بەهانە بۆ ئێوە. حەضرەتی ابراهیم ئەبوایە شوێن آبائی خۆی بکەوێ.

فعلی هذا چۆن ئەبوو بە پێغەمبەر، مختاری خودا، مەداری مفخرەتی

فریقین، ئەگەرچی لە دونیا پاشەکەوتی صالّحان نەبوو، بەلاّم لە قیامەت لە زومرەی صالّحانە. ئێوەیش وابن، علی العکس مەکەن. لە دونیا اولادی صالّحان بن لە قیامەت بچنە ریزی سەفیهان.

(ولن ينفع الاصل من هاشم		اذا كانت النفس من باهله)

وەجهی ئەم اصطفایەی دنیا و قیامەتی ابراهیم چییە؟

﴿ إِذۡ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسۡلِمۡۖ ﴾ دەرحالّ، بێ توقف، بێ (ثم و في و واو) ﴿قَالَ﴾ ئەفەرمویّ بێ قال.

﴿أَسۡلَمۡتُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٣١﴾ ذاتاً خۆشی لە پێشەوە لەگەڵ اسماعیل ئەم دوعایەیان کرد و، خوداش دوعای قبووڵ کردن و، دوعایشیان بۆ ئێوە کرد.. ئەگەر ئێوەیش پاک و خاوێن بن، ئەڵێن: (اسلمنا لرب العالمين). چەند جوانە لە طرف جەنابی کبریائی(ربّه) لە جوابی حەضرەتی ابراهیم (رب العالمين) ئێمەش لە (صدری) کتابەوە گوتمان: (الحمدلله رب العالمين). ئەگەر لەو حەمد و ستایشە، راستگۆ بین، لێرەیش منقادی امری (رب العالمين) ئەبین.

حەضرەتی ابراهیم ئەو استسلامەی تەنها بۆ خۆی نەبوو ﴿ وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبۡرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ﴾ هەموو اولادی خۆی، نە تەنها حەضرەتی ابراهیم ئەو وەصییەتەی فەرموو: ﴿وَيَعۡقُوبُ﴾ ئەویش وەصییەتی لە اولادی خۆی کرد، بە میللەتی ابراهیم فەرمووی:

﴿يَٰبَنِيَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ ﴾ خودای تعالی اختیاری کردووە بۆ ئێوە ئەم دینە پاکە، امتیازی لای خودا بە دینە، نە بە نەسەب.

﴿فَلَا تَمُوتُنَّ ﴾ ئێوە مەمرن لە هیچ حالآن ﴿إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٣٢﴾ دەوام بکەن لەسەر ئەم دینە، رێی شکوک و شوبهە مەدەن، هیچ هەڵمەخەڵەتێن، لە سەرەمەرگیش ئاگاتان لە خۆتان بێ، لە خودا غافڵ مەبن.

گەلێ جار عەرضی موسڵمانانم کردووە لە وەعظ، کەسێ لە حەیاتی خۆی سەعی بکا، ئیمانێکی کامڵی بێ غل و غەش بهاویتە ناو دڵی خۆی، لە سوئی خاتمە ئەمینە حاصڵی کە ئیمان بوو بە(مَلَکە)، زەواڵی نابێ، بەڵکوو لە سەرەمەرگدا قووەتی زیاد ئەبێ، ئەوی بیستووتانە، کە لە سەرەمەرگدا کافر بووە، محقق لە حاڵی زندەگانی ئیمانێکی باشی نەبووە، بەڵام ئاگاداری خۆی کردووە، بە بەرزی ماوەتەوە، لە هەنگامی مردن ئەو هۆش و متانەتەی نامێنێ، کە غل و غەشی خۆی بپۆشێ، کفری زەمانی حەیاتی لێ ظاهر ئەبێ، بۆیێ بعضێک لە اولیاء ئەیان فەرموو: ئێمە لە خاتمە ناترسێن لە اولی ئەترسێن، حتی گەلێک لە انسان ئەبینین لە وەقتی شێنەیی مؤمنی باشە، موسڵمانە، طاعەت گوزارە، ئەمما کە شیددەتیکی هاتە سەر، مصیبەتێکی لێقەوما، تووررە ئەبێ، هەزار کفریات ئەکا.

(توصیە) لێرە بە مەعنا عەهد و پەیمانە، صاحبی قاموس ئەفەرموێ: «اوصیە و وصیە توصیة عهد الیە» وە ئەو عەهد و پەیمانەی حەضرەتی یعقوب، هەم لە زەمانی حەیاتی هەم لە سەرەمەگیدا بوو بە دزی نەبوو، ئاشکرا بوو.. مەیگۆررن. ئەوەندە بە حددی (تواتر) گەیشتبوو(انە) حاضری بالمجلس بوون. ﴿ أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ ﴾ کانە حاضری بالمجلس بوون ﴿إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ ٱلْمَوْتُ ﴾ کە مردن نزیک بوو لە حەضرەتی یعقوب ﴿إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ ﴾ کە بە اولادی خۆی فەرموو، بۆ وەرگرتنی عەهد و میثاقی نهائی ﴿مَا تَعْبُدُونَ مِنۢ بَعْدِى ﴾ کێئەپەرستن، دوای من؟ ﴿قَالُواْ﴾ تێکررا ﴿نَعْبُدُ إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ ءَابَآئِكَ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ﴾ پەرستشی خودای تۆ و خودای آبائی تۆ، کە ابراهیم و اسماعیل و اسحاقن ئەکەین. فەرقی اسماعیل و اسحاق ناکەین، ئەویش لە زومرەی آبائە، ئەویش جگەرگۆشەی (خلیل الله)یە، بنی اسماعیلیش وەکو خۆمان حساب ئەکەین.

﴿إِلَٰهًا وَاحِدًا﴾ عبادەتی خودایێکی تاک و تەنها و بێ شریک و بێ نظیر ئەکەین ﴿وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ١٣٣﴾ ئێمە بۆ ئەو خودایە، مطیع و منقاد و فەرمانبەرداریین، ئیمانمان بە تقلید نییە. لەو آیاتی بیناتە بە دەرئەکەوێ کە مایەی سعادەتی (دارین)، سعادەتی (نشاتین) ئیمانی دروست و اعمالی صالحەیە، (روح القدس)ی حەق، جەوهەری مجردی خەلاص، خولاصەی ارشاد، حەقیقەتی هیدایەت، (فذْلکە)ی کتبی سماوی مضمونی ئەو ئایەتەیە، کە ئەفەرموێ:

﴿ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ ﴾ ابراهیم و اسماعیل و اسحاق و یعقوب و ئەمانە، هەمووی تێپەڕی، ڕۆیی، خۆیان و اعمالیان و چاکەی خۆیان تێپەڕرین.

﴿لَهَا مَا كَسَبَتْ﴾ ماوەتەوە ئێوە ﴿وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ﴾ هەرکەس خۆی و عەمەلی. ﴿وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ١٣٤﴾ ئێوە سؤالتان لێ ناکرێ لە ئەوەی ئەوان کردوویانە، ئەگەر ئێوە چاک نەبن، چاکەی ئەوان کەڵکی ئێوە ناگرێ. هەر کەس سؤالی عەمەلی خۆی لێئەکرێ.

ئینسان تعجب ئەکا لە حاڵی موسڵمانان، چۆن لەم ئایەتە غافڵ بوون؟! ئەڵێی اصلاً نەیان بیستووە، مع انە ئەبووایە، هەر موسڵمانێ عالم و جاهل، عارف و عامی، سید و امی، عمری و حیدری، اشعری و جعفری، ئەو ئایەتەی لە لوحەي (خاطر) خۆی بنووسێ، دائماً بیهێنێتە بەر نظری تفکر و اعتبار.

نەکا پشت بەکەس ببەستێ، بەذل و انکسار لەبەر دەستی کەسێک ڕابوەستێ، ئومێدی نەجاتی بە ئەو و ئەم بێ.

خودائەیزانێ ئەگەر موسڵمانان ئەو ئایەتەیان بکردبوایە دستور العمل، نە لە دین، نە لە دنیا نشستیان نائەهێنا. ئەو روحە، کە لە صدری اسلام چووە بەر بەدەنی موسڵمانان، لە ناو دڵیان قەراری گرت، حەیاتێکی پێدان، بە نەوعێک سەعی و اجتهادیان کرد، وا سەرکەوتن، کە بوونە سەر

تاجی لەم، بەڵام ئەو ڕوحە زوو دەرچوو، بەڵکوو زوو دەریان چوواند.

هەیکەلی ئوممەت، وەکو بەدەنی بێ‌ڕوح (تفسخی) کرد، ئەعضای لە باریەک هاتە دەرەوە، پارچە پارچە بوو، بوونە ژێر چەپەڵۆکی عالەم.

وایێش!!... عیززەتی پاش ئیللەت چەند خۆشە، ئیللەتی پاش عیززەت - کەسێ حسی هەبێ - چەند ناخۆشە، لە مردن تاڵ ترە!!

مع الأسف بعضـــێک مەلامان بوون، لە هەر ئایەتێ ڕوحی حەیاتی ئوممەتیان تێدا ببیتابولیە، دەرحاڵ زەهرێکی هەلاهل، (قتال)یان ئەهاویشتێ، ڕوحەکە ئەدەما، ئایەتەکە وەکو مقەببای بۆش ئەمایەوە. ئوممەت مەحروم بوو، ( حالاً ) یش کۆنەقسەی ئەوان لە سەر زوبانی مەلایانی عەصری، دەوران ئەکا و بە دڵ و گیان قبوولی ئەکا، خۆزیا ئوممەت، کە هەرهە ڵ ئەخەڵەتا بە لطفی ئیلاهی، بە شفاعەتی نبوی خۆیان خۆش بکردبولیە، بەڵام اعتماد ئەدەنە سەر بعضـــێکی، کە لە (بهائم) بێ ادراک ترن.

هەزار هەزار فرسەخ لە ساحەی(قرب و قبول) دوورن، اصلاً دەرگەی شفاعەت بۆ ئەوانە ناکرێتەوە، چ جایێ، کە شفاعەت بکەن پاش ئەو ئایاتی کریمە، ئەبوولیە بنی اسرائیلی علی الاقل سکوت بکەن،کەمێ خەجاڵەت بیانگرێ، لاکن قەساوەتی دڵیان، چەسارەتیان لەسەر قسەی پڕوپووچ مانع بوو لە تاثر، لە خەجاڵەت و انفعال، باز لەسەر جەهل و عنادی خۆیان، اصرار ئەکەن.

﴿وَقَالُواْ كُونُواْ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ تَهْتَدُواْ﴾ جوولەکە ئەڵێ ببنە جوو، دیان ئەڵێ ببنە دیان، ئەوسا هیدایەتتان ئەبێ، ڕێگا بە مقصود ئەبەن، لە عەذاب ئەجاتتان ئەبێ، ئەچنە بەهەشت، حتی ئەو قسەیان بە حەضرەتی رسالەتیش ئەگوت.

﴿قُلْ﴾ یا رسول اللە لە جوابیاندا بفەرموو: ﴿بَلْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِـۧمَ حَنِيفًا﴾

بەڵکوو ئێوە تابعی میللەتی ابراهیم بین، کە من لحیای ئەکەمەوە، حەضرەتی ابراهیم ذاتێک بوو ڕاست، مستقیم الاطوار، دینی ئەو دینێ بوو مائل بە چاکە، (متنفر) لە خراپە.

﴿وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ١٣٥﴾ خۆی لە مشرکان نەبوو، میللەتی لە شائبەی شرک پاک بوو. (توحید) ئایینی هەموو پێغەمبەرانە، ئیمان بە نبووەت و شرک، لە دڵێکدا گرد نابنەوە.

یا بفەرموو: من تابعی میللەتی ابراهیمم لەسەر ڕەوشتی ئەوم. چۆن ئەو ڕووی وەرگێررا لە ادیانی باطلە، منیش بەو نەوعە ڕووم وەرگێرراوە، لە هەموو دینێ باطل، کەوابێ چۆن ببمە جوولەکە، یا ببمە دیان؟ کە دینی جوولەکەیی و دیانی، سەراسەر (شرک)ە و، بە موسڵمانەکانیش ئەفەرموێ:

﴿قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ﴾ ئیمانی خالص لە شائبەی شرک دوور. ﴿وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا﴾ قورئان، کە بۆ ئێمە هاتووە، ئێمەیش چاک وەری ئەگرین.

﴿وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ وَإِسْحَـٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ﴾ اسباط لە بنیاسرائیلی، یا بنی اسحاقی، وەکو قبائلە لە بنی اسماعیلی. (سبط)یش بە دارێک ئەڵێن، کە کەلی زۆربێ، ئەو شعبانە (کانە) وەکو کەل و لقی دارێکی کە لەیەک اصل بێ. کەوابێ غەرض لە اسباط اولادی یعقوب نییە، زێرا، غەیری یوسف، ئەوانیتر علی التحقیق، نەبوونە (نبي) فضل لە رسول.

(حقیقةً) ئەو قەساوەتی، کە لە حەق حەضرەتی (یوسف)یان نوواند، زۆر دووری خستنەوە لە ساحەی نبووەت. ئەو قسەیەش لای (مجددی) مصریو (سیدی آلوسی) قسەیێکی مقبولە، (حقیقةً )مقبولە.

هەم ئیمانمان هەیە بە ﴿وَمَآ أُوتِىَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ﴾ ئەو کتێبەی، کە دراوەتە موسی و عیسی، نە ئەو تەورات و انجیلە محرّفە و هەڵبەستراوەی، کە لە دەست ئێوەدا هەیە. ئیمان بە ئەوانە کفری محضە.

﴿وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ﴾ هەم بە ئەوەی، کە دراوەتە انبیایان لە طەرەف خودای خۆیان، لە هەر قەومێک ببن، لەهەر شعبێک ببن.

﴿لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ﴾ تەفرقەیان ناهاوێینە بەینی، بلێین، افکار و دەعوەتیان لە یەک جودایە، بەڵکوو ئیمانمان هەیە هەموویان یەک فکر و یەک مەشرەب دەعوەتی خەڵقیان کردووە، بۆ خودایێکی بێشریک.

﴿وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ١٣٦﴾ ئێمە انقیاد و اطاعەمان هەر بۆ ئەوە، پێغەمبەرەکان بە واسطەی ارشاد ئەزانین، نەوەک بە شرکاء و ابنائی خودا ـ معاذ الله ـ

﴿فَإِنۡ ءَامَنُواْ بِمِثۡلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهۡتَدَواْۖ﴾ عظمای ئوممەت لێرە (مشوشن)، بەعضێک ئەڵێن: کلمەی (مثل) (حقیقةً)لە قورئانە، ئەمما زائدە، چونکی خودا مثلی نییە.

بەعضێک وا ئەنوێنن، کە ئەو کلیمە هەر لە قورئاندا نییە. لە قرائەتی (ابیة)« فان آمنو بالذی آمنتم به»یە.

لە قرائەتی (ابن عباس) «فان آمنو بما آمنتم به»یە.

بەڵام ئەم قسانە هیچنین، هەموو(صحابە) کلمەی مثلیان لێرە بە قورئان قبووڵ کردووە، ئەگەر ئەمە بە (تواتر)، بە تحقیق ثابت نەبووایە، کەوا نازل بووە چۆن ئەم کلیمەیان لێرە زیاد ئەکرد. بەعضێ علمای محقق وەکو (زمخشەری) مەعنایێکی لطیفی فەرمووە. ئەڵێ:

«ئەوە بۆ اسکات و الزامدانی جوولەکە و دیانانە، یەعنی ئەگەر خودا مثلی هەبێ، ئێوە ئیمان بەو(مثله) بهێنن، هدایەتتان ئەبێ. خۆ معلومە خودا بێمثلە، ئیمان بە چشتی نەبوو، محاڵە خصوص بۆ خودایەتی. کەوابێ ئەگەر مقصدیان هدایەت بێ،ئەبێ ئیمان بە خودایێکی بێ شریک و بێ مثل و بێولد بهێنن».

بەڵام لای من سررێکی لطیف تری تێدا هەیە.. چونکی ئەو خودایەی، کە

ئەوان ئیمانیان پێهێنابوو، ئەوەندە دوور بوو لە مەقامی الوهییەت. حتی هێنابوویانە زومرەی حیواناتێ، کە توالد بکا بارێ، هیچ نەبێ ئەو خودایەی، کە ئیمانیان پێ هێناوە، لەم دەنائەت و دەناسەتە پاکی بکەنەوە، نوعاً ما قدسییەتێکی، کە بتوانین بڵێین: بەڵێ ئەوە مناسبەیێکی لەگەڵ الوهییەت هەیە. وەک (بلاکفه)ی ئێمە ئەڵێن: جسمە لەسەر عەرش دانیشتووە، هەوراز و نشێو ئەکا، بەڵام تەنزیهی ئەکەن لە لوازمی جسمیەت و دانیشتن وحرکە، چ نەبێ ئەوانەش با ئیمان بە خودا بهێنن، با لایان وابێ لە جیهەتە و جسمە، بەڵام نەی هێننە ئەم دەنائەتە و ئەم تطوراتە، کە بەسەر(پێشوله) و سائری حیواناتی محقرەدا دێ. ئەگەر بەو جۆرەش ئیمان بهێنن، نائلی هدایەت ئەبن. ئەمما حاشا بەو مثلەیش ئیمانیان نییە.

﴿وَإِن تَوَلَّوْاْ﴾ ئەگەر اعراضیان نا و بەو جۆرە ئیمانیان نەهێنا ﴿فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ﴾ ڕوو چوون لە عەداوەت و مخالفە بۆ عصیان، چ معذرەتیان نییە الا عنادی نەبێ، ئەی ڕەسول تۆ ئەهمیەتیان مەدەیێ.

﴿فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللَّهُ﴾ زۆر دوور ناڕوا، خودا شەڕری ئەوانە لەسەر تۆ دەفع دەکا، خودا کافییە بۆ دەفعی شەڕری ئەوان.

﴿وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿١٣٧﴾﴾ هیچ چشت لە ئەو بزر نابێ، هەر کەس بە جزای عەمەلی خۆی ئەگا ئەو میللەتی ابراهیمی، کە ئێمە قبووڵمان کردووە، تابعی بووین.. ﴿صِبْغَةَ اللَّهِ﴾ فیطرەتێکی ئیلاهییە، ڕەنگیکی بێ نەیرەنگییە، خودا واحدە، هەرچی وەحدەتێکی تێدا هەبێ ئەوە ڕەنگێکی خوداییە، توحید وەظیفەی عقڵە، تفریق وەظیفەی خەیاڵە، بۆیێ لە زەمانی استیلای خەیاڵ شرک لە بەشەردا زۆر بوو بە انواعی مختلفە، حتی هەر نەوعە خۆشییەکی لە بەشەردا بوبوایەوە، (کذا) هەر ناخۆشییەکی عمومی ظهوری بکردابوایە، خوداییێکیان بۆ دائەنا. هەیکەلێکیان بۆ دروست ئەکرد.

جهەتی وەحدەتیان نەئەدیت، کە بزانن قاعدەی خەلق و ایجادی (خیر و

شرّ) یەکە. هەتا بزانن واضعی ئەو قانوونەیش هەریەکە.

﴿وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبْغَةً﴾ ڕەنگی کێ لە ڕەنگی خودا چاکترە؟

﴿وَنَحْنُ لَهُۥ عَٰبِدُونَ ١٣٨﴾ ئێمە هەر بۆ ئەو مطیع و فەرمانبەرداریـن. حاصڵی، ڕەنگی ئێمە بێڕەنگییە، (متلون) نابین، لە ڕەنگی فیطری لانادەین.

﴿قُلْ﴾ ئەی بنیاسرائیلی! ﴿أَتُحَآجُّونَنَا فِى ٱللَّهِ﴾ ئەوە مجادلە لەگەڵ ئێمە ئەکەن؟ ئەڵێن خودا هەر خودای ئێمەیە؟ فضڵی هەر لەگەڵ ئێمەیە؟ ئەڵێن غەیری ئێمە باقی هەموو لە خودا و فضڵی خودا محرومن باوجودی:

﴿وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ﴾ خودای ئێمەیە و خودای ئێوەیە لە مواهبی فطری ئێوە، چ فضڵتان بەسەر ئێمەدا هەیە؟ ﴿وَلَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ﴾ ئەوە دیارە ئێمە چی ئەکەین و ئێوەیش چیئەکەن.

﴿وَنَحْنُ لَهُۥ مُخْلِصُونَ ١٣٩﴾ ئەوا عەمەلمان دیارە، کە خالصاً مخلصاً بۆ خودایە. ئێوەش بە انصاف تەماشای عەمەلی خۆتان بکەن، بزانن چەند لە اخلاص دوورن.

کەوابێ بە چ دەلیلێک، بە چ حجەت و بورهانێک، ادعای ئەو اختصاصە ئەکەن؟ خودای تعالی اختیاری ابراهیم و غەیری ابراهیمی لە بەرچی کرد؟ ئەی هەر لەبەر اخلاص نەبوو، لە ذاتیان و لە لایەن ماهییەتی انسانی چ امتیازیان هەبوو؟

وەکو حکماء ئەفەرموون: نسبەتی هەموو عالەم بۆ خودایەکە، ئەبێ خەڵق خۆی سەعیبکا، استعداد و لیاقەتی پەیدا بکا، کە ببیتە مظهری (فیضی) ئیلاهی، لە سەر ئەو ئیمان و اخلاص و انقیادەی، کە هەمانە بۆچی ئێمە لە فەیضی ئیلاهی محروم ببین؟ ئەوە محضا تحکمە، خودا ئەیزانی عەینی دەعوای جوولەکە و دیانان هاتە ناو موسڵمانان، حاجەت

ناكا من بە تفصیل عەرضتان بكەم، خۆتان تەماشا بكەن، ئەحواڵی خۆتان لەگەڵ ئەو ئایەتە لێک بدەنەوە، ئەزانن چەند دوور کەوتوونەوە لە هیدایەتی قورئان. ئەو ئایەتانە لەگەڵ حدیثی (دار قطنی) «ان اللە خلق الخلق فاختار منهم العرب الخ» لێک بدەنەوە، ئەزانن چەند دوورن و مەعلومتان ئەبێ، کە ئەو فکرە فکرێکی اسرائیلیيە، لە دەعوایان دەرئەکەوێ خودای تبارک و تعالی (انه) بە مەیلیکی فیطری قەومێکی ئەوێ و قەومێکی ناوێ؟!.

ئەی واه!! چییان بە اسلامیەت کرد، چۆن روحی قورئانیان برد. حقاً اسلامیەتێکی، ئینسان لە قورئانی عظیم الشانی وەربگرێ لەگەڵ اسلامیەتێ، کە لە (محدثان و نقالانی) ئەبینێ، زۆر لە یەک جودان، فەرقیان ئاسمان و رێسمانە.

مع الأسف (صبغة الله)یان‌دا بە نەیرەنگی، بە هەزار (لون) تفرقەیان هاویشتە بەینی عناصری ئیسلام.

﴿ أَمْ تَقُولُونَ إِنَّ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ وَإِسْحَـٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطَ كَانُوا۟ هُودًا أَوْ نَصَـٰرَىٰ ﴾ ئەو نەوعە قسە بێ‌مەعنایە لە ناو (ملیـّون) ان دەرناچێ، حتی بەعضێک پیاوی بە هۆش و گۆش لە موسڵمانان بعضاً مجادلە ئەکەن ئەڵێن: پێغەمبەر حنفی بووە، یا شافعی، قادری بووە، یا نقشبندی، حتی رافضی لە تەفسیری آیەتي (وان من شیعته لابراهیم) ئەڵێن ئەو ضمیرە بۆ (علی)یە. ابراهیم لە شیعەی (علی)یە، وە حکایەتیشی بۆ هەڵ ئەبەستن، ئەگەر خودا کەرەم بکا و بگەینە تەفسیری ئەو ئایەتە، عەرض ئەکرێ و حتی لە کەیدی ئەهلی (بدعە)، مەلای گەورە گەورە مشهور لە ناو موسڵمانان ئەیانکەنە هەم مەذهەبی خۆیان، تاکوو ئەوانی کەم‌عەقڵەکان پێیان هەڵبخەڵەتێن، بڵێن: مادام ئەو هەموو مەلاگەورە لە سەر ئەو مەذهەبە بن دیارە حەقە. ئەمما ئەوی ئاگاداری قورئان بێ، ئەڵێ: (تلک امة

قد خلت).

﴿قُلْ ءَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ ٱللَّهُ﴾ ئەو قسە گاڵتەیێ، زۆر گەورەی تێدایە دەر حەق جوولەکە و دیانان. (کانە) لە فضل و علم خصوصی بە حقائقی تاریخیە، لە دەرەجەی مخلوقات دەرچوون، کەس نییە معادلەیان بکا، مەگەر خودا، ئەوجا کەسێ عالم بێ، بە تاریخ ئەفەرموێ: « وەی ئافەرین » نەماوە الاّ جهەتی تفضیل کامیان شارەزاترن؟!

﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَٰدَةً عِندَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ﴾ کێ ظالم ترە لەو کەسەی شاهدییێکی لەلابێ و لە خودای بزر بکا؟..

ئەمە وەرگێررانی (ما هو خلق الله)یە. صەرفی نظر لە نبووەت، تاریخ چۆن ئەگۆررێ؟ خصوص چشتێ وا ئاشکرا خودا ئەیزانی، عالەم ئەیزانێ، ئەو ذواتی کرامە، گەلێک پێش عیسی و موسی بوون. میللەتیان زۆر لە پێش میللەتی ئەوانە بوو. بەلاّم ئەوانە لە غایەتی حەماقەت و جهالەت، هەموو چشت تحریف ئەکەن، فضل لە تاریخ، فضل لە کتێبی ئیلاهی، کە تحریف و تبدیلی ئەکەن بە اوهام و خەیاڵی فاسدەی خۆیان، تحریفی الوهییەت ئەکەن، بەڵکوو تحریفی ذاتی مقدسی کبریائی ئەکەن، ئەیکەنە (ابن و روح القدس)، ئەیکەن بە حیوانێکی صاحب ولد، ئەیکەن بە ذەررەییێکی محقر، کە بە تطورات ببێ بە ئینسان، (سبحان الله) ئینسان دەهشەت ئەیگرێ، نازانێ بڵێ چی؟ عەذابیان چییە؟ ئەوەندە ئەڵێ:

﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ١٤٠﴾ وقتاً کە ئەم ئوممەتە جەسارەتی گەیشتە ئەو دەرەجە، دەرکەوت ئەوانە لە حیاتی عملی (منسلخن)، بەڵکوو لە بشری، لە حیوانی (مسخ) بوونەوە، وەک (بەردە مردوو)یان لێهاتووە.

اشارە بۆ ئەو گرۆهە ئەفەرموێ: ﴿تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ﴾ رابوردن، مردن، بە طمعی ژینیان مەبن، قابلی اصلاح نین.

﴿لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ﴾ ئێستا بە خاطرتاندا نەیێ، کە ئەو قەومە خبیثە (واجب الازالە)ن، مانەوەی ئەوان موجبی مسؤولیەتی ئێمەیە.

﴿وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ ١٤١﴾ لە اعمالی خبیثەی ئەوان، ئێوە مسؤول نین.

بناءً علیە، ئەگەرچی ئەو ئایەتە عبارةً مکررە، لاکن نظر بە موقع لە مەعنادا فەرقیان هەیە و، جهەتی اخطار و ایقاضیان جودایە.

با وجودی ئەو ئایەتە تاتکرار بکرێ، لە نظری ئینسانی هۆشمەند، قیمەتی زیاد ئەبێ. حتی من ئارەزوومە، قودرەتم بوایە بە زوبانی خۆش، بە گوفتاری ئاودار، لە ئادەم تا بە خاتەم، لە خاتەم تا ئەمڕۆ، فەصڵ فەصڵ مجملاً احواڵی (امم) بیهێنمە قەڵەم، لە پاش کلی فەصڵێ، وەک (ترجیع بندی) - سعدی - ئەو ئایەتی کریمە بنووسم، هێشتا لام وایە حەقی ئەو ئایەتە تەواو نابێ.

* * * *

تەفسیری جزئی اول بحمد الله تعالی خلاص بوو، ڕجائەکەم بە چاوی انصاف تەماشای بکەن. مەفەرموون ئەو تەفسیرە مخالفی (تفاسیر)ەکانی ترە، چونکی من لەسەر نەظمی قورئان تەفسیرم دەرعەهدە کرد، حقاً ئەوەیش زۆر گرانە، امدادی ئیلاهی پێ ئەوێ، چونکی تەرتیبی قورئان مخالفی نەظمی (وضعی) لەگەڵ (نظمی طبیعی)، زۆر لە یەک دوورن.

حتی ئینسان لە گەلێک جێ ئەبێ بالکلیە دووری بکاتەوە لە سەبەبی نزول، وە الاّ هۆندنەوەی حاضری بۆ هە ڵناستێ. لە پاش امدادی ئیلاهی، لە گەلێک جێ زۆرم مشەقەت خواردووە، تا مناسبەی ئایەتەکانم بۆ بەدەرکەوتووە. لەسەر ئەوەیش قصورم زۆرە، ڕجای عفو ئەکەم، چونکی لە پێش خۆم چ تەفسیرم نەدیتووە، کە بە تەواوی لەسەر نەظمی قورئان تالیف کرابێ.

(مجددی مصری) قصوری نەفەرمووە، بەڵام ئەویش لە گەلێک جێ‌كۆڵی داوە، فقط هەزار رەحمەتی لێ‌بێ دەرگەیێکی چاكی كردەوە. بە تەفسیرە كوردی‌یەكەی من مەڵێن (كوردی‌یە و خۆ كردی‌یە)

- والاجر من الله الكريم -

(ئەصلی) مسودە رۆژی دووشەمو، نێزیک عصر (٣)ی ذی الحجة مطابقی شەشی مانگی مارتی رومی، ١٣٥٢ هجری قمری.

(تەمین)ی ٣ی محرەم روژی سێ شەمو بعد الظهر موافقی چواری نیسانی رومی ١٣٥٣ هجری قمری تەواو بوو.

وەقتاكی لە ئایاتی سابقە بەیان كرا، كە كعبة البيت الحرام بناكردەی حەزرەتی خليل و اسماعيلە، قيبلەی (انام) بووە بالخاصة (حنفا)- كە ئەو موسڵمانانە ئیدیعا ئەكەن، ئیمە لەسەر میللەتی ئیبراهیمین، بە ڕەنگی حنفی فیطری، خۆیان ڕەنگ كردووە.

واردی خاطری نەزانان ئەبێ بە وەجهی مناقضە، بڵێن: «ئەدی بۆچی ئەوانە ڕوویان لە كعبە وەرگێڕراوە، لە اووەل تا ئەمڕۆ ڕوویان كردۆتە بيت المقدس، دیارە دوعایان باطلە، لە مەقامی ابراهیمی، اتخاذی مصلایان نەكردووە؟ ».

جەنابی حق بۆ احضاری جەواب، پێش وقوعی سؤال ئەفەرموێ: ﴿سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾ (ظاهراً) عامة لە بنی اسرائیلی و عەرەب، هەتا ممكنە، كە ئەوی ضعيف العقل بێ لە موسڵمانانیش ئەو قسەی بێتە دڵ بڵێن: « ئەو میللەتی ابراهیمی یە، ئەگەر ڕاست ئەكەن لە دەعوای سابقیان ئەدي؟»

﴿مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِى كَانُوا۟ عَلَيْهَا﴾ چی ئەوانی وەرگێڕاوە لە قیبلەی خۆیان؟ كە (حنفا) لە دەوری ابراهيم، تا ئەمڕۆ ڕوویان تێ‌كردووە، وە لە سەری بوون وەكو لە پێشەوە، كە جەنابی (نبوی) اظهاری تظلمی كرد لە

حەق ئەوانەی، کە مەنعی ساجدی ئیلاهیان ئەکرد، کە ذیکری خودای تێدا بکرێ، آن جمله أعظمی مساجد، کە بیتالحرامە، کرا بووە (بیت الاصنام)، بالكلیة لە طهارەتی حنفی دوور کرابووە، ﴿قُل﴾ لێرەیش بفەرموو: ﴿لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ﴾ مشرق و مغرب بۆ خودایە، ئێمە روومان لە جیهەت نییە، رووومان لە خالیقی جیهەتە.

﴿يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٤٢﴾﴾ خودای تعالی، هەرکەسێ حەزی لە رێگای راست بێ، هیدایەتی ئەدا بۆ رێگای راست پێی نیشان ئەدا، وە ذاتاً ئێمە لە صدری قورئانی مجید پاراینەوە لەبەر خوا، کە رێگایەکی راستمان نیشان بدات. وە لە اوەلی سورەت، وەعدمان لە خودا وەرگرت، کە رێگای راستمان نیشانئەدا. وە لێرەیش ئەفەرمووێ ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا ﴾ من ئێوەم گێرراوە بە ئوممەتێکی معتدل، سالکی رێگایەکی راست و مستەوی ﴿لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾ بە عەمەلی چاکە، بە تەسلیم بوون بۆ خودا، بە رەنگی بێ نەیرەنگی ببنە شاهد لە سەر عالەم، کە دینەکەتان هەقە، خۆتان هەق پەرستن، راست روون،راست رەو و یا خود راست رو، روو لە جیهەت نین. ﴿وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ﴾ فەردی (اکمل) لە گروهی (رُسُل) ﴿عَلَيْكُمْ شَهِيدًا﴾ ئاگادار و مطلعی ئەحوالی ئێوەیی ظاهری و نیهانی.

لە پاش ئەو مقدّمەیە تصریح بە جەواب ئەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِى كُنتَ عَلَيْهَآ﴾ تا ئەمرۆ کە بیتالمقدسە ﴿إِلَّا لِنَعْلَمَ﴾ الاّ بۆ خاتری ئەوەی، کە بزانین، تەفریق بکەین ﴿مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن﴾ لە ئەو کەسەی کە ﴿يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ﴾ ئەگەرێتەوە پاشەوە، تەبەعی یەتی پێغەمبەر ناکا،

ئێوە بزانن هەر دینێ، مەذهەب و حیزبێ، کە لە اوەلەوە (تشکّل) بکا، لازمە مدیر و ڕەئیسی ئەو حیزبە ئاگادار بێ، ئینسانی (مُذبــذَب)، بێمەبدەا و (مسلک)، داخیلی زومرەی ئەو نەبێ، ئەوەیش بە امتحان دەرئەکەوێ، تەکلیفیکی بکا، کە ساغلەم و چرووک ئاشکرا ببێ.

لە صەدری ئیسلام دوو سەبەب هەبوو، کە رەسولی کبریا ڕووی نەئەکردە کعبە. یەکێ: ئەوە امتحانە. ئەگەر لە ئەوەڵەوە ڕووی لە کعبە بکردابوایە، گەلێ لە منافقی عەرەب موافقەیان ئەکرد، چونکی ڕوو لە کعبە کردنیان پێخۆش بوو، پرر بوو لە بت و اصنام، ئەو وەقتە لە ئەوەڵەوە ئیشەکە لە موسڵمانان تێک ئەچوو، ئەمما کە ڕووی کردە (بیت المقدس)، ئەو نەوعە لایان گران بوو، ڕوویان تێ نەکرد.

دووەم: وەک ئیشارەمان بۆ کرد، کعبە لەسەر طهارەتی زەمانی ابراهیمی نەمابو، (بیت‌الله) نەبوو ئەو وەقتە بەڵکوو (بیت‌اللات)[1] بوو، اصلاً قابل نەبوو، کە جەنابی رسالەت ڕووی تێبکا، ئەگەر کەسێ بڵێ: جەنابی ڕسالەت ئەو وەقتی لە (مکە) بوو، کعبەی ئەهاویشتە بەینی خۆی و بیت‌المقدس. قەت.. قەت بررِوا مەکە (ولَــو) ئەو کەسە (حَبْــر الأمــة) و ترجمانی قورئانیش بێ، چشتێ، کە مەعنای نەبێ، صحەتی سەنەدی بێ قیمەتە، ئەو فەرق و تەمییزە ﴿وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً﴾ با زۆریش گران بێ ﴿إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ﴾ ذاتاً ئەگەر امتحان بە چشتێکی زۆر گران نەبێ، تەزویری (حیالان) بە دەرناکەوێ ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَـٰنَكُمْ﴾ خودا ئیمانی ئێوە بە ضایع نابا، ئەمرتان بکاتێ ڕوو بکەنە (بیت الاصنام) امتحانێکتان بۆ دانەنێ، کە پاک و پیس لە یەک جودا ببێتەوە، حاشا خودا ئەو اضاعەیە ناکا.

---

[1] ـ لات: ناوی یەکێ لە بتەکانی عەرەب بوو.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ١٤٣﴾ لە کەمالی (رافت) و ڕحمەتی ئەوە، کە دینی پاک و پاکیزەیان بۆ دابنێ و، نەهێڵێ غلّ و غەشی تێکەڵ ببێ، بەڵام شەرت ئەوەیە خەلق خۆی لەو ڕەحمەتە بێ پایانە محروم نەکا، ڕسولی ئەکرەم بالطبع ئارەزووی هەبوو، کە ڕوو بکاتە کعبە و ئایاتی سابقە شەوقی ڕسالەت پەناهی زیاد ئەکرد، بەڵام ئارەزووی وابوو یەکەم: کعبە پاک بکاتەوە، بیباتەوە سەر ڕفعەتو طهارەتی اوەلی، ئەوجا اتخاذی بکا بە قیبلە، بۆیێ دائماً ڕووی نیازی لە دەرگاهی بێنیاز بوو، کە موفقی بکا کعبە لە شائبەی (شرک) نەجات بدات، خودایش ئەفەرموێ:

﴿قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ﴾ ئێمە ئەبینین، ئەیزانین ڕووکردنت بۆ تەرەفی ئاسمان، کە قیبلەی دوعایە نیازی تۆ پێک ئەهێنین، دوعات قەبووڵ ئەکەین. ﴿فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا﴾ ڕووت ئەخەینە قیبلەیەکی، کە لات خۆش بێ، دڵت لە سەری ڕابوەستێ، ئەم لاو ئەو لای بۆ نەنۆڕی ﴿فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾ ڕوو بکە جهەت و ناحیە و تەرەفی مسجدالحرام، ئەو مزگەوتە، کە لە تەرەفی (بیت)ە، ئێستایش نافەرموێ (بیت)، زێرا «چونکە» حالاً پاک نەکراوەتەوە، اما جنابی حق، کە اعلم و احکم الحاکمینە، قەراری وادا لە ئەوەڵەوە لە نوێژ و عبادەت ڕووبکەنە ئەو جهەت، تا وەکو ئەو ڕووتێکردنە ببێتە ڕووتێ کردنێکی نەجاتدان بۆ (بیت)، کە لەو خصوصەوە زیاتر اهتمام ئەکەن بۆ فەتحی (مکە)، ئەگەرچی ئوممەت بالطبع تابعی حەزرەتی ڕسالەتن، ڕوو لە هەر جێیەک بکا، ڕووی تێئەکەن، بەڵام لەسەر کەمالی عنایەت و توجهی استقلالی ئوممەت ڕاساً، ئەمریان[1] پێئەکا بە ﴿وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ﴾ وە ئێوە ئەی موسڵمانینە! لە هەرجێیەک ببن ڕووبکەنە ﴿شَطْرَهُۥ﴾ ناحیەی

[1] - لە اولەوە خطاب لەگەڵ پێغمبر بو، لێرە لەگەڵ هەموو مسڵمانانە (وحيثما كنتم..)

مسجد الحرام ﴿وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ﴾ لە جولەکە و دیان، ئەگەر خۆیان نەگۆڕن ﴿لَيَعْلَمُونَ﴾ بەڕاستی ئەزانن، کە ﴿أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ﴾ ئەو تحویل و تەوجیهە، حەقێکی مقرر و ثابتە لە طەرەف خودای ئەوان، ئەگەر ئەوانیش بە ڕاستی ئیمانیان بە خودای خۆیان بهێنابوایە، معارضە و مجادلەیان نەئەکرد، بەڵکوو متابعەیان ئەکرد ﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ١٤٤﴾ خودای تەبارەک وە تعالی غافڵ نیە لە ئەوەی، کە ئەیکەن ادنی ملابسەیێکی لەگەڵ غەفڵەت نییە، با وجودی ئەم حەقە صریحە، کە بە تەواوی ئەیزانن ﴿وَلَئِنْ أَتَيْتَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ﴾ لە هەردوو طائفە جوو و دیان ﴿بِكُلِّ ءَايَةٍ﴾ بە هەموو آیەتو حوجەتی قطعی بێشکو مریە ﴿مَّا تَبِعُواْ قِبْلَتَكَ﴾ تابعی قیبلەی تۆنابن ڕووی تێناکەن، (لاشک) ئەوانەن، کە ڕوو چوون لە بغضو عداوەتی پێغەمبەر، سەعی ئەکەن بۆ ابطالی ئەو دینە پاکە. وە ئەمڕۆیش ئەم نەوعە گرۆهە لە فەعالیەت دان، تنفری عالەم ئەکەن کە متابعەی حضرەتی ڕەسول ﴿وَمَآ أَنتَ بِتَابِعٍ قِبْلَتَهُمْ﴾ ئەوە معلومە، محاڵە، کە تۆ ڕوو بکەیتە قیبلەی ئەوان، خاصة مشرق و مغرب، کە قیبلەی مشرک و ڕۆژ پەرستانە.

ئەو ساڵە[1] کە لە بەغدا بووم شەخصێکی هیندۆسی (طاوس) ناو لەو ئوتێلە بوو، کە منی تێدا بووم، ئەویش لە حوجرەیەکی دابوو زۆر ترددی لای منی ئەکرد، لە دینی خۆی پیاوی باش بوو، رقیق‌القلب بوو، ئەمدی ئێوارە و سبەینە ڕوو لە مشرق و مغرب، خەریکی عبادەت بوو، کتێبێکی ئەخوێندەوە، کە لە لایان کتێبێکی (سماوی) بوو، ڕۆژێ پێیم گوت: «تۆ بۆ ڕوو ئەکەیتە مشرق و مغرب لە وەقتی عبادەت؟ گوتی ئێمە ڕۆژ ناپەرەستین، بەڵام لە وەقتی هەڵاتن و ئاوابوون ڕووی تێئەکەین، تا وەکوو شاهدیمان بۆ بدا لە خزمەت خودا. گوتم: عجبا ئێوە بە چی ئەزانن؟ ڕۆژ

---

[1] - ١٩٢٤ م

عیلمی هەیە؟ ئاگاداری حالّی ئێوەیە؟ سەنەدتان لێوەرگرتووە، کە ئەدای شهادەت لە خزمەت خودا بکا، و ئەگەر ئەدای شهادەتی نەکرد، عجبا خودا نازانێ، کە ئێوە عیبادەتی ئەو ئەکەن؟ کە وامپێگوت تەماشای کردم ئاوی لە چاو هات، گوتی: چی بکەین وایان پێگوتووین...

روایەتیش ئەکەن یەکێک لە رهبانان، پاش (رەفعی) عیسی، گوتی: من بە خزمەت عیسی گەیشتم فەرمووی: من رۆژم زۆر خۆش ئەوێ، هەموو رۆژ بە شعاعی خۆی سەلامی من تبلیغی سکانی ئەرز ئەکا، بۆیە دیانان مشرقیان کردە قیبلە. سەیری دەسیسەی ئەو نەوعە مەلایانە و، حەماقەتی ئەو نەوعە ئوممەتە!.

﴿وَمَا بَعْضُهُم بِتَابِعٍ قِبْلَةَ بَعْضٍ﴾ نە جولەکە تابعی قیبلەی دیانان ئەبن، نە دیان تابعی قیبلەی جولەکان ئەبن. ﴿وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُم﴾ بالغرض و التقدیر، ئەگەر تۆ تابعی هەوا و هەوەسی ئەوان ببی ﴿مِّن بَعْدِ مَا جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ﴾ پاش ئەوەی، کە ئەم عیلمەت بۆ هات، حەق بۆت ئاشکرا بوو ﴿إِنَّكَ إِذًا لَّمِنَ الظَّالِمِينَ ١٤٥﴾ بە حەققەت تۆش ئەو وەقت، داخلی زومرەی ئەو ظالمانە ئەبی، کە ظلمیان لە حەد بەدەرە، دیارە بۆ حەزرەتی رسول نییە، محالّە، فقط مقصود (تنبیە و ایقاظی) ئوممەتە کە بە دەسیسەی ئەوان هە لّنەخەلّەتێن. وقتاکی معلووم بوو تحویلی قیبلە ئەمری حەقە، ئەوانیش ئەیانزانی حەقە (مع انە) کردیانە شوبهەی (قادح) لە رسالەتی محمد (ﷺ)، دەفعەیێ روو لە بیت المقدس ئەکا و، دەفعەیەک روو لە مسجد الحرام ئەکا. بۆ اظهاری خباثەتیان دەربارەی ذاتی نبوی ئەفەرمووێ: ﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ﴾ پاک و پیسیان ﴿يَعْرِفُونَهُ﴾ پێغەمبەریان ئەناسی ﴿كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمْ﴾ هەر وەکوو کوررانی خۆیان ئەناسی، لە سەر ئەو حالّەش ﴿وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ﴾ فرقەییێکی گەورە لە ئەهلی

کتاب ﴿لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤٦﴾﴾ حەق بزر ئەکەن، با وجودی ئەزانن، کە حەقە، حسادەت و عناد، بغض و عداوەت، کە لە دڵدا قووەتی ساند ڕووی ئینسان لە حەق وەرئەگێڕێ، ئەو نەوعە (عنود و حسود)ە لە هەموو زەمانێ زۆرن، لە ناو هەموو قەوم و صنفی بەشەر بڵاون، کەسێ ئەحواڵاتی ڕوحیەی اقوام بزانێ، تجاربی بەشەری کردبێ، هیچ گرفتی لەو قسەدا نییە، شەخصێک لە خزمانی خۆم محبەتی لە حەقم هەبوو، کە ناوی ئەهێنام بە (علامە)ی یاد ئەکردم، تصادفاً ساردییەک کەوتە بەینێ، بیستمەوە، کە ناوی ئەهێنام ئەیگوت: (فەقێ محمد) منیش (تبسمم) کرد، گوتم: بۆ دوێنێ (علامە) بووم، و ئەمڕۆ بووم بە فەقێ محمد؟!

دیارە معظمی بەشەر هەواو هەوەسی خۆی ئەپەرستێ. ﴿ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾ ئەو حەقەی، کە بۆ تۆ (تجلای) کردووە، (خاصە) اطلاعی لەسەر ئەحواڵی ڕوحیەی امم لە طرەف خوداوە بۆ تۆ هاتووە و، تقرری کردوە بە (هذیان) و توڕەهاتی ئەو نەوعە گرۆهە (دەغدەغە) بە خاطر مەگەیێنە ﴿فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿١٤٧﴾﴾ لە زومرەی گوماندار و صاحب شک و شوبهە مەبە.

﴿وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ﴾ هەر کەسێ وجهەیەک و ناحیەیەکی هەیە ﴿هُوَ مُوَلِّيهَا﴾ ئەو ڕووی تێئەکا (موجە یا غیری موجە) بە مەیل و هەوای نەفس، یا بە دەلیل و بورهان. ﴿فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ﴾ هەرچی خێر بێ لێی پێش بکەون، ڕێ بڕرکەی لێبکەن، مەهێڵن بڕوا و لە دەستان بچێ، لە هەموو چشت چاکتر، لە هەموو مقصودان بە فائدەتر، ڕوو لە خودا کردنە، کە هەر ئیش و کارێ بیکەی (لوجه الله ) بێ، مەبدەا ئەوە، مرجعیش هەر ئەوە ﴿أَيْنَ مَا تَكُونُوا۟ يَأْتِ بِكُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا﴾ لەهەر جێیەک بن، خودای تعالی هەمووتان گرد ئەکاتەوە، کە وابێ لە هەر جێیەک بن ڕووبکەنە ئەو، بە جهاتی مختلفە

تەفرەقە مەکەن، دڵ بە جیهەت مەدەن، جیهەت نامێنێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٤٨﴾﴾ زۆر ئاسانە بۆ خودا هەمووتان گرد بکاتە وە و جزاتان بدات، چاکە، بە چاکە وە خراپە بە خراپە عەرزمان کردن، ڕوو لە بیت الحرام کردن مجرد ظاهری نی‌یە، بەڵکوو مقصود ڕووتێ‌کردنیەتی بە عەزم و هیممەت و غیرەت، بە اتفاق کە نەجاتی بدەن، پاکی بکەنەوە، بۆیێ دەربارەی رسول و ئوممەت، تکرار ئەفەرموێ: ﴿ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾ لە هەر جێ‌یەک چوویە دەرێ، لە هەرچی جێ‌یەک بیت، وە بۆ هەرجێ‌یەک بچی، ڕوو بکە ناحیەی مسجدالحرام ﴿وَإِنَّهُۥ لَلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾ ئەم ڕووتێ‌کردنە حەقێکە لە تەرەف خودای تۆوە بۆ احقاقی ئەو حەقە سعی و کۆشش بکە، مشهورە (توفیقی خودا تابعی سعی عەبدە) حەق ئەوە هەروەکو مەشهورە مشهودە ﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٤٩﴾﴾ سەعی وکۆششی ئێوە بە خۆڕرایی ناڕوا، جەزاتان، ئەدا. لێرە زیادە اعتنا بە ڕەئیسی تکرار ئەفەرموێ: ﴿ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾ چاک تێبگە مقصودم لەو ئەمرە چی‌یە، دیارە ڕووتێ کردنی (صوری)، ئەوەندە ئەهمیەتی نی‌یە. وە بۆ ئوممەتیش ئەفەرموێ: ﴿وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ﴾ لە هەرجێ‌یەک بن ﴿فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ﴾ ڕووبکەنە تەرەفی مسجد الحرام، بۆ جەنابی نەبەوی لە هەمووی (خرجت) ئەفەرموێ، ئیشارەت بۆ ئەوە، کە جەنابی ڕسالەت ئاوارە و دارە دیارە لە هەر جێ‌یەک بێ بۆ ئەو هەر خروجە، تا ئەگاتە مە فتن ﴿لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيْكُمْ حُجَّةٌ﴾ مەبادا خەلق بە دەلیل لەسەر ئێوە غالب ببێ، بڵێن ئەوانە ئەگەر ڕاستیان ئەکرد، (حنفی) بوون، ئەبوایە (تطهیری بیت) بکەن لە اصنام، وەکوو

ابراهیم و اسماعیل، اعادەی مجد و شەرەفی بۆ بکەنەوە، پاکی بکەنەوە بۆ ئەوانەی، کە دەورەی (بیت) ئەدەن، لە مسجد اعتکاف ئەکەن (راکع و ساجد)ن ئەگەر بەو نەوعە ڕووی تێبکەن، کەس محبەتی لەسەر ئێوە نامێنێ ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنْهُمْ﴾ ئەو کەسانە نەبی، کە پیشەیان دائماً ظلمە، وە تجاوز لە حەددە، وا ئەنوێنن، کە ئەبێ پێغەمبەر وەک صۆفییەکان ڕیش پان و بەرماڵ بە شان بێ، بە سواری کەرێ لەوێ و لەوێ بخولێتەوە! نازانن حەزرەتی (خاتم) شەخصێکە، کە شەرەف ئەدا بە ڕسالەت. بە دەستێک بورهان، بە دەستێک شیری بڕران دەعوەتی عالەم ئەکا. ئێوە بە (هذیانی) ئەو نەوعە کەسانە فتور مەکەن، سستی بە عەزم و جەزمی خۆتان مەدەن.

﴿فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَٱخْشَوْنِي﴾ لە وان مەترسن لە من بترسن، ئەوەی لە خودا بترسێ، خۆی ئەپارێزێ، بەڵام لە کەس ناترسێ، وە هەم بۆیێ ئەم ئەمرەتان ئەکەمێ ﴿وَلِأُتِمَّ نِعْمَتِي عَلَيْكُمْ﴾ نیعمەتی خۆم بەسەر ئێوە تەواو بکەم ﴿وَلَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥٠﴾﴾ ئێوە تەماشا بکەن ابتدای نیعمەتم ئەوەیە ﴿كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ﴾ لە ناو ئێوە ﴿رَسُولًا مِّنكُمْ﴾ پێغەمبەرێ لە خۆتان، کە بە تەواوی مستقل بن، هەتا بۆ احکام و قوانینیش احتیاجتان بە کەس نەبێ، کەس خۆتان لە سەر هەڵنەکێشن، هەتا ئەوە نیعمەتێکی زۆر گەورەیە ﴿يَتْلُواْ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا﴾ (قرآنی و اکوانی) ئەمما خوارق، شواذ، نەکەن بەلایەوە بچن ﴿وَيُزَكِّيكُمْ﴾ پاکتان بکاتەوە ﴿وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ﴾ قورئان، یان نووسین ﴿وَٱلْحِكْمَةَ﴾ علیم بە ئەسرار و حقائقی اشیا و قەواعد و (سننی) ئیلاهی ﴿وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ ﴿١٥١﴾﴾ لە حوسنی ئاداب، لە احکامێکی، کە عقل ڕێگای پێ نابا، وە (کذا) احواڵاتی ڕۆژی

جەزا و اهمی هەموو چشت ئەوەیە، کە تێتان ئەگەیینی، کە (شواذ) و (خوارق) بێکەڵکە. کەسێ ئەو نیعمەتەی لە حەق ئێوە کردبێ چۆن ئەبێ اتمامی نەکا؟ چۆن ئەبێ لە پاش ئەو هیدایەتەی ئێوە ئەو دینە بلاو نەبێتەوە؟ وە سائری ناس استفادەی لێ نەکەن؟ وە ئەو دەعوەتەی ابراهیمی، کە دووبارە حەزرەتی (محمد) قبووڵی کردووە، کە بە (هبا) بڕوا.

﴿فَٱذۡكُرُونِیٓ﴾ یادی من بکەن لە هەموو وەقت، (خاصةً) لە وەقتی سیعەت و شێنەیی ﴿أَذۡكُرۡكُمۡ﴾ خودا ئەفەرمووێ: منیش یادتان ئەکەم لە هەموو وەقت، (خاصةً) لە وەقتی شیددەت، ﴿وَٱشۡكُرُواْ لِی﴾ اعتراف بە نیعمەتی من بکەن، مغرور مەبن بە قووەتی بازو ﴿وَلَا تَكۡفُرُونِ ١٥٢﴾ لە ڕێگای ئیمان و هیدایەت خۆتان بزر مەکەن، ئەوانەی بە دین کافر ئەبن چارەیان ناکرێ، قابلیەتی صلاحیان نامێنێ.

﴿یَٰٓأَیُّهَا ٱلَّذِینَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَعِینُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ﴾ ئەی ئەوانەی ئیمانیان هێناوە! استعانە بکەن بە خۆڕاگرتن، (ثبات)، ثابت قدم بن، هەراس بە دڵ مەدەن، وە هەم بە نوێژ بیکەنە ڕابیتەی اتحادی خۆتان، ڕووکردنە قیبلە لە نوێژدا بکەنە وەسیلە بۆ فەتحی (مکە)، نەجاتدانی بیتاللە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِینَ ١٥٣﴾ صابر لە هەموو کەس نزیکترن لە خودا، ئەوەی دڵی (متین) بێ، مشوەش نابێ، تێکناچێ، ڕشتەی تدبیر بەرەڵلا ناکا.. گەلێ وابووە ئینسانێک بە صبری یەک چارەک سعات دەوڵەتی خۆی نەجات داوە، وە دوژمنی ڕەزیل کردووە. ئینسانی عجولی بە جووڵەجوڵ لە هەموو کەس لە خودا دوورترە، شوبهە نییە لەو ڕێگایەدا، تووشی شەرر ئەبن، ئەکوژن و لێشتان ئەکوژرێ.. مەڵێن ئەوەی لە ئێمە ئەکوژرێ بە فیڕۆ ئەڕوا، بەو خەیالاتە سستی مەدەنە دڵی خۆتان.

﴿وَلَا تَقُولُواْ لِمَن یُقۡتَلُ فِی سَبِیلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتُۢۚ﴾ مەڵێن لە حەق ئەوانەی لە

ڕێگای خودا ئەکوژرێن، مردوون ﴿بَلۡ أَحۡيَآءٞ﴾ بە ڕاستی ئەوان زیندوون، مردن لە ڕێگای خودا و دین و وەتەن و میللەت، عەینی ژیانە. ﴿وَلَٰكِن لَّا تَشۡعُرُونَ ١٥٤﴾ ئێوە شعورتان نییە، نازانن حەیاتی میللەت بە سەربەرزی، گەلێک لە حیاتی شەخصیٚ خۆشترە، هەر قەومێک استحقاری ژیانی خۆی نەکا، نائلی ئەو حەیاتە نابیٚ، الآنیش ژیانی کوردان لە سایەی صلاح‌الدینی کوردییە.

روایەتە کە ابوبکری صدیق بۆ خالدی ابنی ولیدی نووسی: «استحقاری مردن بکە، تا بگەی بە حەیات»، چەند حەکیمی قیمەتدار حەیاتی خۆیان بەخت کرد تا (تەیارە)یان گەیاندە ئەو دەرەجەیە، کە ئەمرۆ ئەیبینن و بزانن دوژمنتان بە قووەتە تووشی خەسارەت و برسیایەتی ئەبن، سستی مەکەن، نوشستی مەهێنن، امتحانی خودایە ئەبیٚ لە امتحان دەرچن.

﴿ وَلَنَبۡلُوَنَّكُم بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلۡخَوۡفِ وَٱلۡجُوعِ ﴾ (شيء) احتمالی تحقیر و تعظیمی هەیە لەو جیهەتە، کە خودا امتحانتان پیٚ ئەکا، دیارە گەورەیە بەڵام نابیٚ ئەوەندە بە گەورەی بزانن، کە واهمە غەلەبەتان لیٚ بکا، بکەونە ترس و لەرزەوە نەتوانن بیکەن، بناءعلیە ئەبیٚ لاتان کەم بیٚ و چشتی زۆر گەورە نەبیٚ، وە هەم امتحانتان ئەکا بە ﴿وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِۗ ﴾ کەمی لە ماڵ و نەفس و بەر و ثمرات، زۆر یا کەم اهمیەت مەدەن، صبر و ثبات بکەن ﴿وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ١٥٥﴾ موژدەیان بدەیێ بە نەیلی مقصود ﴿ٱلَّذِينَ﴾ ئەو صابرانەی ﴿إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ﴾ کە مصیبەتێکیان پیٚ‌گەیی، بەڵاییکیان هاتە سەر، چ لە ماڵ، چ لە سەر، (جزع و فزع) ناکەن، ترس و هەراس غەلەبەیان لیٚناکا، مشوەش و مایوس نابن. ﴿قَالُوٓاْ﴾بەکەمالی خاطر جمعی ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ١٥٦﴾ ئێمە خۆمان عەبد و مملوکی خوداین، ماڵ

چ ئەهمیەتی هەیە؟ ئێمە ڕجوعمان بۆ خزمەت ئەوە، ڕەضای کبریائی بۆ ئێمە لە نیعمەتی دنیا و قیامەت چاکترە، کەسێکی بەڕاستی و بە دروستی، ئیمانی بە حەیاتی ابدی هەبێ بۆ تحصیلی سعادەتی اخروی، ڕوحدانی زۆر پێخۆش ئەبێ، ئەگەر بە درۆ بێ، وەکو جولەکان حەز ئەکا لەم دنیایە هەر بژێی قەت لێی نەچێتە دەرەوە، کەوابێ ئێوە وەکو جولەکان مەبن.

﴿أُوْلَـٰٓئِكَ﴾ ئەو صابرانە ﴿عَلَيْهِمْ صَلَوَٰتٌ مِّن رَّبِّهِمْ﴾ سەراپەردە و خەیمەی تعظیماتیان لە تەرەف خوداوە لەسەر هەڵئەدرێ، مقابل بەو ڕەشماڵەی ذیللەت و مسکنەت و ڕەزالەت، کە لە سەر بنیاسرائیلی یان هەڵدرابوو، ئێوەیش ئەی موسڵمانینە حەزتان لە کامیانە؟ ئەویان بۆ خۆتان اختیار بکەن، دیارە ئەهلی ئیمان، اصلاً بە (ذل و هوان) و حقارەت ڕازی نابێ، دائماً بۆ نەیلی شەرەف، بۆ مقاماتی عالیە سعی و کۆشش ئەکەن. مردنی بە عیززەت لەسەر ژیانی زیللەت تەرجیح ئەدەن، ذاتاً بنی اسماعیلی وەکو بنی اسرائیلی، تووشی ذیللەت و حقارەت نەبوون و اڵبتە لەپاش شەرەفی ئیسلام فیکری تعالیيان زیاتر ئەبێ. ﴿وَرَحْمَةٌ﴾ هەم ڕەحمەتی خوایان لەسەرە، یەعنی تعظیماتی بێ مسخرە ﴿وَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُهْتَدُونَ ﴿١٥٧﴾﴾ بەڕاستی هەر ئەوانە ڕێگایان بە مەقصەد بردووە، عدول لە قەواعدی طبیعی ناکەن، بە معجزات و خوارق لە سوننەتی ئیلاهی لانادەن، بە مصیبەت فتور ناهێنن، نایکەنە عەلامەتی بێ لطفی خودا لە حەق خۆیان، بەڵکوو لە کەمالی (حریت)ی خۆیان ئەو مصائبانە ئەکەن، مەصقەلی نەفسی خۆیان نایکەنە ژەنگ، وەکوو شاعیر ئەڵێ:

للــه درّ النـــــــائبات فــأنّها صدأُ اللئام و صيقل الاحرارِ

ئەصحابی ڕەسول ئەحواڵاتی عالەمیان زۆر چاک ئەزانی، پیاوی مەیدان بوون و لە ئایاتی قورئانیش زۆر چاک تێئەگەیشتن، بۆیێ هیچ کەس لە ئەصحابی گوزین عەرضی صاحبی ڕسالەتیان نائەکرد « مادام کو خودا

وەعدەی بە ئێمە داوە، کە اتمامی نیعمەتمان بۆبکا. وە ئەو دینە بە ضایع ناد،ا با خۆی بە سووک و ئاسانی دوژمنمان بفەوتێنێ، (مکە)مان بۆ فەتح بکا، نەجاتی کەعبەمان بۆبدا.. بۆچی ئێمە بە کوشتن ئەدا؟ تووشی ترس و برسیایەتی و نەقصی ماڵ و سەرمایە مان ئەکا؟».

بەڵکو بە قووەتی ئیمان فکریان ئەبوو بە یەک، قووەتیان زیاد ئەبوو، بە زۆری بازوو فەتح و فتوحاتیان ئەکرد و ذەررەیەک خەلەلیان لە ئیمان بە وەعدەی ئیلاهی، بە قودرەتی ئیلاهی نەدەبوو.. بەڵکوو خۆیان ئەکردە (مظهری) قودرەتی ئیلاهی، بە کەمالی قودرەت و مەتانەت، ڕوویان ئەکردە کێوان لە ڕەگ و ڕیشەیان هەڵئەکەند.

ئەمما ئەوانی لە دوای ئەوان هاتن، قودرەت و ئیرادەی خودایان کردە حائلِ، لە بەینی خۆیان و سەعی و تێکۆشین، سەلبی قودرەتیان لە خۆیان کرد. خۆیان کردە عاجز و بێدەستەڵات و بێئیرادە ـ ئەوەشیان بە عەینی ئیمان ئەزانی! ـ بۆیێ وەکوو بنی اسرائیلی خیمەی ذلەتیان لەسەر هەڵدرا و ڕەزالەت و دەنائەتی نەفسیان لا خۆش بوو! کەسێ عاقڵ بێ ئەزانێ ئیمانی (خەلەف) لەگەڵ ئیمانی (سەلەف) فەرقیان زۆرە، وەکو (حکماء) ئەڵێن: (اختلافی اثر دەلیلە لەسەر اختلافی مؤثر).

ئەی یارانی مصطفی و! ئەی اخوانی صەفا و! ئەی ئەربابی مرووەت و وەفا، وەقتێ کە ڕووتان کردە مسجدالحرام، تەماشایەکی صەفا و مەروە بکەن. ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ﴾ لە معالم و عەلامەتی دینی خودایە ﴿فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ﴾ کەسێکی بۆ حەجی بەیت بچێ ﴿أَوِ ٱعْتَمَرَ﴾ یا خود بۆ زیارەتی بچێ ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ﴾ چگوناە و گرانی لەسەر نییە ﴿أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا﴾ کەمێک لێیان نزیک ببێتەوە. بزانن ئەهلی شرک ئەو دوو موقعەیان چۆن گۆڕریوە، چ علامەتێکیان لێ داناوە؟ (صفا) لە لغتدا بە بەردێک ئەڵێن خاوێن، خالص، خۆڵ و مۆڵی تێکەڵاو نەبووبێ، صاف و لووس بێ،

گرنی گرنی نەبێ. (مروة) بە بەردێک ئەڵێن سپی، نەرم. اساساً لەبەر ئەو دوو مەعنایە، سەعی لە بەینی صەفا و مروە ئەکرا، یەعنی پاک و خالص بن، سپی و نەرم و بە تواضع بن، دڵ ڕەش و دڵ بە قەساوەت مەبن. لاکن لە زەمانی جاهیلیەت هەر یەکە هەیکەلێکیان لەسەر دانابوو، (الیاف) لەسەر صەفا، (نائلە) لەسەر مەروە، وە اصلاً ئەیان گوت الیاف لەگەڵ نائلە لە ژوورەوەی کعبە زنای کرد، خودا کردنی بە بەرد بۆ عیبرەت، الیاف لە سەر صەفا و، نائلە لەسەر مەروە داندرا. پاش بەینێک ئەوەیان لە فکر کرد، بۆ تقدیس و تعظیم زیارەتیان ئەکردن.

بەڵام ظاهر وایە، کە لە دوایی فکری تەمسیلی ئالهە، ئیلاهی حەرب بە پیاو، ئیلاهی سەلام بە ژن کەوتە دەماغیان، وەکوو ڕۆما و یۆنان و مصریەیان، ئیلاە و ئیلاهەیان تەمسیل کرد، وە بەو مناسبەیەش هەیکەلی پیاویان لە صفا، کە بەردێکی موادی اجنبیەی تێدا نەبێ و لووس بی و ڕەق دانا، وە هەیکەلی ژن لە جێیەک کە سپی و نەرم بوو دایاننا، ئەگەر ئەم فکرە لە زووەوە بکەوتابوایە دەماغی عەرەب، ڕسوخی ببەستابوایە قەت چارەیان نەئەکرا. ﴿وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا﴾ ئەوی قودرەتی خۆی صەرف بکا بۆ اکتسابی خێر ئەو هەیکەلانە لابدا، ئەوەندەی احسان ئەگاتێ، کە خودا شوکرانەی بکا ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ ١٥٨﴾ ئەوی لائقی تعظیم و احترام بێ دەربارەی ئەوانە بە جێی ئەهێنێ و هیچ چشت لە خودا بزر نابێ، بە گوێرەی ئەو سەعیی یە جزایان ئەدا لە اعظمی نیعەمی ئیلاهی لە حەق موسڵمانان، ئەوە بوو ڕەسولی ئەکرەم، کە ئایاتی بۆ ئەهات بە ئاشکرایی بەسەری دا ئەخوێندنەوە، دۆست و دوژمن، مؤمن و کافر تێی ئەگەییشتن و لەبەریشیان ئەبوو. بناء علیه کەس پێی نەئەکرا (کلمەیەک) لە وەحیەکە (کتم) بکا. ئەمما ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلْنَا﴾ وەکو یهود و نصاری، کە ئایاتی (بینات)یان بزر ئەکرد ﴿مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ لە ئایاتی بیناتی (بنفسه)

﴿وَٱلۡهُدَىٰ﴾ دەلائلی عەقلّی ﴿مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّـٰهُ﴾ پاش ئەوەی، کە تەقریر و ایضاحمان کرد، ئەوە دەلیلی عەقلّی یە ﴿لِلنَّاسِ﴾ بۆ خەلق بە نەوعێ کە ئەوەی پیێ بلّین خەلق فەهمی بکا. ﴿فِي ٱلۡكِتَـٰبِ﴾ لەو کتێبەی، کە بۆ پێغەمبەرەکانمان ناردووە، هەر پێغەمبەرێ بە بێ بزر کردنەکەیش، فرێدان یا تێزیاد کردن، یا مەعنا گۆررین لە تەرجمە، لە تەفسیر، لە تاویلاتی دوور، احتمالاتی رووکەش، القای شکوک و شوبهەت لە (دلائلی عقلّی)یە ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ﴾ ئەوەی ئەم کتمانە بکا بە هەر جۆرێ ببێ ﴿يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ﴾ خودای تبارک و تعالی، لە رەحمەتی خۆی دووریان ئەخاتەوە، رەحمەتێکی، کە «وسعت کل شيء»ە لێی بێ بەش ئەبن ﴿وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّـٰعِنُونَ ١٥٩﴾ دوعای طرد و تبعید لە رەحمەتی خودایان لێ ئەکەن، ئەوانەی، کە ئاگادارن وە لەسەر حەق ماون، ئەمینی دینی پاکن لەگەلّ خودا و پێغەمبەر و کتب و ئوممەت. ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ﴾ لەو گوناهە گەورەیە ﴿وَأَصۡلَحُواْ﴾ دلّی خۆیان چاک بکەن، نەفسی خۆیان پاک بکەن، کە جارێکیی تر ئەو (غلّ) و غشە و خیانەتە نەکەن ﴿وَبَيَّنُواْ﴾ ئەو حەقە ی بزریان کردووە ئاشکرای بکەن، بەیانی سیئاتی خۆیان لە تەحریف و تاویل و القای شوبهات بۆ عالەم اظهار بکەن. ﴿فَأُوْلَـٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيۡهِمۡ﴾ لو گوناهە عظیمەیان خۆش ئەبم، تۆبەیان لێ قبوولّ ئەکەم. ﴿وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ١٦٠﴾ خودا ئەفەرموێ من گەلێ جار رووی رەحمەت ئەگێررمەوە بۆ ئەو کەسانەی، کە رووی انابە و تۆبە لە دەرگاهی ئێمە بکەن، ئێمەش رووی رەحمەتیان تێ ئەکەینەوە، ئەوەیش لە کەمالی مەرحەمەتی‌یەتی لە حەق عیبادی خۆی. حقاً ئەگەر جەنابی کبریائی لە غایەتی تەجاوز و کەرەم کاری نەبوایە، اصلا رووی رەحمەتی تێ نەئەکردن، ئەمما محقق بزانن لە ملیونێ، یەکێک لەو نەوعە مفسدانەی

تحریفی کلامی خودا بکا، تاوەکوو (حەق) تابعی فیکری خۆی بکا، صەرفی ئایاتی قورئانی و عقڵی لە وجهەتی خۆی بکا، مەگەر تۆبە بکا بەو نەوعە تۆبەیە.

من فکری مەلایان چاک ئەزانم، تا مەلاتر بن (عنود)تر ئەبن و، لایان وایە حەق ئەوەیە، کە ئەوان بیڵێن: «کالشمس فی رابعة النهار» غەلەطی خۆیان لێ معلوم ببێ، دەستی لێ هەڵ ناگرن، بە قونکە بیور لە تەختەی ناو چەوانیان بدەی ناگەڕێنەوە، خصوص بۆ حفظی مەقام و نفوذی خۆیان لەسەر ئوممەت، اصلاً پێ لەحەق نانێن، خۆیان ناشکێنن.. هەتا بەعضێک وایان لێ دێت، لە فەرش تا عەرش حوکم ئەکا بە فەنا و نەبوون، و ئاگای لە خۆی نییە، کە ئەو ذەرەیەکی (احقر)ە لەو کائناتە عظیمە.. ئەگەرچی لازمە بڵێم (الحذر! الحذر!) لەو نەوعە کەسانە، ئەمما چ فائدە ئیشی خۆیان کرد، خرافاتیان لە دەماغی موسڵمانان ناوە و چەسپاند، ڕوحی حەیاتیان برد، «انا لله و انا الیه راجعون».

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾ ئەوانەی، کە مانەوە لەسەر کفر و ضلال، کەتمی حەق و تحریفی کتاب، تشویشی ئایاتیان کرد ﴿وَمَاتُواْ وَهُمۡ كُفَّارٌ ﴾ لە سەر ئەم حاڵە مردن، تۆبەیان نەکرد.

﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ لَعۡنَةُ ٱللَّهِ﴾ لەعنەتی خودا لەسەر ئەوان ثابت و مقررە، لەسەریان لا ناچێ (مع انه) (ارحم الراحمین)ە ﴿وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ ﴾ باوجودی ملائکەت ئەرواحی لطیفن، شەفەقەت و مەرحەمەتن ﴿وَٱلنَّاسِ ﴾ هەموو کەس، خصوص ئەوانەی، کە دوایان کەوتوون، ئەوانەی بە ئومێدی شەفاعەتیان بوون ﴿أَجۡمَعِينَ ١٦١ ﴾ تێکرا ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾ لەو لەعنەتە عظمیە ﴿لَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابُ ﴾ کێ عەذابیان لەسەر کەم ئەکا؟. ئەوەی ئەمەلێکی ڕەحمەتی پێ بکرێ لەعنەتیان لێ ئەکا. ﴿وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ١٦٢ ﴾

موهلەت نادرێن، یا تەماشا ناکرێن بە چاوی مەرحەمەت کەس نەماوەتەوە مەرحەمەتیان پێبکا، مەگەر شەیتان وە ئەو کەسیٍ ڕوحی ئایات ئەبا، کە ڕوحیٍ حەیاتی ئوممەتە وەکوو ئایەتی «واتقوا یوماً لا تجزی نفس عن نفس شیئا» وەکو ئایەتی «تلک امة قد خلت» بۆ افسادی ئوممەت ئەوانە کەمتر نییە. اهمی مهمات لە نظری خودا و پێغەمبەران ئیمان بە واحدانیەتی خودایە، ئیمانێکی کە لە ڕێگای تفکر و تامل لە ئایاتی بیناتی ئیلاهی، بۆیێ بە خطابی عام ئەفەرموێ ﴿وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ﴾ یەکە خودای هەمووتان، بێ شریکە لە ذات و لە صفات وە لە افعال. ئەو تەفرەقەیە بۆ؟ ئەو کتمی حەقە سەبەب بەچی؟ اثباتی شریک وە (ولد) بەچی دەلیل؟ چ نەقصێک لە قووەت و قودرەتی ئەودا هەیە اکمالی بکەن؟ چ تغییر و تحویلێک لە ذاتی کبریائیی دا هەیە، جێنشینی بۆ پەیدا بکەن؟ خالق و مخلوق چ نسبەتێکیان لەگەڵ یەک هەیە؟ خالق بە مخلوق وە مخلوق بە خالق بگۆڕن؟ تەمسیلی خودا بکەن بەاشکالی مختلفە؟.. ﴿لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ ١٦٣﴾ بە غیری ئە و، هیچ خودا نییە، هەر ئەو ڕەحمانە و ڕەحیمە، ڕوو لە خودا وەرئەگێڕن؟ ڕوو ئەکەنە کێ؟ ئومێدی مەرحەمەت لە کێ ئەکەن؟

لە صەدری کتابەوە زانانتان، گەورەیی هەر بۆ خودایە، ڕەحمەت صفەتێکی (لا یتغیر)یەتی، صاحب و پادشاهی ڕۆژی جەزا، هەر ئەوە، بەو خیانەتە عظیمە، کەسێ هۆشی ببێ خۆی بۆ لە ڕەحمەتی خودا دوور ئەکاتەوە؟ بۆچی خۆی ئەکاتە مستحقی لەعنەتی ئەبەدی؟ خودا یەکە، نیسبەتی لەگەڵ هەموو عالەم یەکە، ڕەنگاوڕەنگی لە واحدی حقیقی دوورە.. محاڵە، ڕەحمەتی شاملە، نیعمەتی کاملە، ئایاتی بیناتی بۆ هەموو کەس ظاهرە، منافعی خەلق و ئیجادی بۆ کافەی بەشەر، بەڵکوو بۆ حیوانات مساوییە، بە هیچ (وەجە) خصوصیتی لەگەڵ کەس نییە، ئەگەر امتیازێکی فیطری دابێتە کەسێک، بۆی داوەتێ، کە لە منافعی عمومی

صەرف بکا، جاهلان تێبگەیێنێ، نقصانان پێ بگەیێنێ، حجاب لادا لە بەینی عەبد و خودادا، ئاياتی ئەگەر (خفا) یێکی تێدا هەبێ جلوەی پێبدا، ئاشکرای بکا. از جملە ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ علوی و سفلی، بڵند و نوی ﴿وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ﴾ بەو نەوعە اختلافە، کە لە بەعضێک جێگا نێزیکە لە (تساوی) دوایی، لەم لاو لەو لای اقلیم بە اقلیم، موقع بە موقع کورت و درێژیی شەو ئەگۆڕێ، تا ئەگاتە جێیەک، ساڵێکی ئێمە شەو و ڕۆژێکی ئەوانە، ئەویش لە نیسبەتی ئەرض لەگەڵ ڕۆژ، علوی لەگەڵ سفلی پەیدا ئەبێ.

﴿وَٱلْفُلْكِ ٱلَّتِي تَجْرِي فِي ٱلْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ﴾ ئەو سفینەو واپۆڕەی کە لە بەحردا دێو ئەچێ، چ محیط چ غەیری محیط بۆ مەنفەعەتی مخلوقات، یاخود گەڕرانەکەی بە چشتێکە، کە ئەویش زۆر بە مەنفەعەتە بۆ ئینسان، وەک با و بخار. (وسائطی بحری) اساسی خۆی بۆ مەنفەعەت داندراوە، ئەمما (کتمی حق) چونکی لە شێوەی بەشەرییە، ئەوەیشیان گۆڕری. دەوڵەتەکانی حاضری، کە لە بەحردا بە قووەتن ئەو وسائطە نافعە بۆ ضرری عباد صەرف ئەکەن، دار و دیاری بێ دەستەڵاتانی پێ وێران ئەکەن.

﴿وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٍ﴾ وە لە چشتێک، کە خودای تبارک و تعالی لە بڵندی، لە ئاسمان ناردوویەتی، کە ئەویش چییە؟ ئاوی بارانە، ئەو ئاوەیش مەبدەئی حەیاتە. ﴿فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا﴾ ئەو ئەرضانەی کەوا دێمەکارن پێیان زندوو ئەکاتەوە، وەکو لە مقدمەی بەیتی (دمدم) لە مەدحی خودا ئەڵێ:

ئاو دێری دێمە کاران کەسی بێ کەسو هەژاران

﴿وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ﴾ هەر حیواناتێ، کە بژیی لە سەر ارضی؛ بە واسطەی ئاو و محصولاتی ئاو بڵاوی کردووەتەوە لە ارضی؛ هەر ئەرضە بە

نیسبەت خۆی؛ حوشتر لە ڕەملستان بە (حوشترالوک) ئەژیینێ، بزنەکێوی لە شاخ و داخان، بە گیا و بەرگ و بەری داران بە خێویان ئەکا.. سمێکی ئەدانێ کە پێی بەسەر بەردی مایپلوس، سەرەو ژێردا ئەڕوا.

﴿وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ﴾ وەرگێرڕانی با بۆ شەرق و غەرب و جنوب و شمال ئەویش لە غایەتی نەفعدایە بۆ تلقیحی دارو گیا کە بە ئەمەرەی ئەو زەواجە، ئینسان و حیواناتی پێ ئەژیینێ ﴿وَٱلسَّحَابِ ٱلْمُسَخَّرِ بَيْنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ﴾ ئەو هەورەی، کە ڕاگیراوە لە بەینی ئەرض و ئاسمان، نە ئەوەندە دوورە لە ئەرضی کە ئەو بارانەی لێ دێتە خوارێ، ببێ بە (هبا) و نەیگاتێ، نە ئەوەندەیش نێزیکە، کە بە داڕژاندنی باران علی الدوام مزروعاتی پێ بە فساد بچێ. لە هەموو لە ئەوانەی کە ذکر کرا ﴿لَأَيَٰتٍ﴾ نەیەک،نەدە، بەڵکو هەزارەها ئایاتو دلائلی تێدا هەیە، بۆ کێ؟ ﴿لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ١٦٤﴾ بۆ قەومێکی، کە عەقڵیان هەبێ.. تێ بفکرن کەسێکی عەقڵی هەبێ، چۆن کەتمی ئەو حقایقە ئەکا و ئەڵێ: خالقی ئەرض و ئاسمان (عیسی)یە؟ کەسێکی کەمێ شعور و ئیمانی هەبێ، چۆن ئەڵێ تدبیری کائنات بە (قوتب) سپاردرایە، بێ ئەمر و ئیرادەی ئەو، ذرەرراتی کائنات حەرەکە ناکا؟ ئەو نەبێ ئەرض و ئاسمان وەرئەگەڕێ؟ کەسێکی لە غایەتی (جهل) نەبێ، چۆن ئەڵێ (علی) (مکوّری لیل و نهارە)؟ باری لە نبووەت صەرفی نەزەر! بۆچی بە عەقڵ، خەیاڵی صحیح تەماشای ئەرضو ئاسمان ناکەن، بزانن ئەو عالەمە چیی یە؟! بزانن ئەو عالەمە عظیمە بە چ قووەت و ئیرادە و عیلمێک خەلق کراوە؟ بە چ حیکمەتێک بەو انتظامە غریبە داندراوە، بەڵام کە عەقڵ نەما، قسە لەگەڵ کێ بکەین؟ بالخاصة، کە کەرامات هاتە گۆڕێ بە جارێ عەقڵ و عیلم و حیکمەت ئەفڕێ، نظامی کائنات ژێر بەرەژوور ئەبێ.. حەق و حەقیقەت گوم ئەبێ.

خودایە تۆ شاهیدی هەر دینێک، هەر مەذهەبێک، هەر مەشرەبێک لەگەڵ عەقڵ مخالف بێ، من لێی بەریم؛ دینێکم ئەوێ.. بە مەذهەبێک ڕازیم، کە بە امتزاجی عەقڵ و نبووەت ڕوحێکی خالصی تیا پەیدا بوو بێ و، منیش نائلی ئەو حەیاتە معتدلە ببم و، ئەو دینەیش (حقیقةً) دینی ئیسلامە. ئەم امتزاجەیش خالقی (اکوان)، منزلی قورئان بۆ ئێمەی کردووە، ئێمەیش (للە الحمد) پێی ممتزج بووین و، زۆریش سەعی ئەکەم، کە عەوامیش بە ڕاستی لە حەقو حەقیقەت بگا با لە لایشیان (منفور) و بێ حورمەت ببم.. خودا ئەزانێ لە (عبدالرحمنی جەلی)[1] هەتا من، کە لە (کۆیێ )ژیاوین، خیانەتمان لەگەڵ دین و میللەت نەبووە.

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ ﴾ ئەمما چ (ناس)؟ هەزار جار بەقوربانی نەسناس بن. ﴿مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا ﴾ ئەمثالی خودا اتخاذ ئەکەن، اعراض لە خودا ئەنێن، ئەمما چ ئەمثال؟ ئەمثالێک، کە هیچ نیسبەتیان لەگەڵ مەقامی الوهیەت نییە (جماداتن). حیواناتن، ئەخۆن، ئەخۆنەوە، ئەڕۆن، ئەڕرین، نەوەکو (ندّي) تەنهانە وەکو دو (لا یعد ولا یحصی)[1] هەرچی هەوەسیان هێنای ئەیگێڕرن بەخودا، داخلی زومرەی ئالهەیان ئەکەن (کانە) الوهیەت، ڕوتبەێیکە وەکوو ڕوتبەی حکومەت، فیکری حەق بزر کردن لە عالەمی (بشریت)دا چ (ملیّــون) چ حکما کەم و زۆر، یا بەعضێک لە مخلوقات ئەبەنە مەقامی الوهیەت، یان خودا لە مەقامی الوهیەت ئەهێننە خوارەوە و، الحاقی ئەکەن بە ممکنات، هەتا (حکمای الهیون) بەو هەموو عیلم و فەضلو حیکمەتەی، کە هەیان بوو قولیان ئەکرد بە (عقولی مجردە) ، کە وەکوو جەنابی کبریائی (مقدّس) و (منزّە) بن لە زەمان و لە مەکان و لە جیهەت، مزخرفاتی (ملیّــون) انیش نایێتە حدّ و حساب.

---

(١) باپیرە گەورەي دانەري تەفسیرە و زانایەکي گەورەو مەلایەکي مایەدار بووە.

(١) نەک هەر یەک یادو هاوتا (ندّ)یان داناوە بو خودا بەلکو بە کومەڵ هاوتا و شریکیان بو پەیدا کردوە. ملیون و حکما هەردویان لە پەیدا کردني ئەو شریکانە بەشدارە بەلام هەر لایە بە شکلیکي تایبەتي خوي.

﴿يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ﴾ ذاتەن لایان لەگەڵ خودا مساوین، خودایان چەند خۆشئەوێ، (انداد)ەکانیشیان ئەوەندە خۆشئەوێ.. بەزری محبەت کە لە دڵدا شین بوو، ڕەگی داکوتا بەو دەمارانە، کە بە دڵەوە متصلە ئەڕواتە خوارێ، تا وەکو لەگەڵ خۆین و گۆشت و ئێسک، مێشک تیکەڵاو ئەبێ، (جبرا) ئینسان سەوق ئەکا بۆ (اطاعه)، بێ توقف و تامل و محاکمە، چی یان پێ ئەمر بکا بەجێی ئەهێنن. ئەو (مکار)آنەی، کە دەعوەت بۆ بدعەتی خۆیان ئەکەن ئەزانن محبت لە هەموو چشتێ بە تاثیرترە، لەو ڕێگایە دێنە پێشێ، ئالهەی خۆیان بە انواعی درۆ و دەلەسە، خۆشەویست ئەکەن.. ئەوی مائل بە سەفالەت بێ بە دانەی تزویریان هەڵ ئەخەڵەتێ محبت ظالمێکی وایە، اصلاً عقڵ و ئیرادە ناهێلێ! تەماشا بکەن لە حیکایەتی، (اسکندر)و (ڕۆستەم) و (عەنتەر) پاڵەوانێک، کە مەدحی زۆر بکرێ و لە اغلب شەرران بە سەربکەوێ.. (خاصة) شیرێکی لە تەوقی سەری دوژمنێکی (قویال) بدا، مەردو و (مرکب) بە تیغی ئابدار وەک خەیاری تەرر بکاتە دوو کەرتک، سامعین چەندیان خۆش ئەوێ، هەزار جار خۆیانی بە قوربان ئەکەن...

«وەک دەستت نەرزێ! چاوی سەرمبی، لە منت کەوێ! غولامی گوفکێت بم!»

با وجودی نە ئەصڵی هەیە نە فەصڵ، کێ هەیە حیکایەتی ئەسکەندەری گوێ لێ بێ و، بابا نەسیم و ئەرستۆ و محمد شێرزادی خۆش نەوێ؟ کێ هەیە ڕقی لە جالینۆس و شێرزاد خانی شیردرره و هەیکەلانی پیر نەبێتەوە، تەماشا بکەن بە بەندوباوی دەروێش و صۆفییان، بە حیکایەت و چیرۆکەی مەلایان، عالەم چ محبەتێکی لەگەڵ شێخان پەیدا کردووە، بە خودایان ئەزانن بەڵکو خودایان هەر بۆیێ ئەوێ، وەکو نەفەری (ئەمر بەر) ئەمرو ئیدارەی شێخ پێک بهێنی و، ئەو اعتقاداتەیش بە حق و

حقیقەتی دینی ئیسلام تێئەگەن ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِلَّهِ﴾ محبەتی خودایان لەهەموو چشت لەلا زیاترە، محبەتی خودا بە نەوعێک جێگیر ئەبێ لە دلّی ئیماندارانی بە حەق، کە محبەتی غەیر جێی تێدا نابێتەوە، ئەوی خۆشیشیان بوێ، بۆ خودایان خۆشئەوێ، حەقیقەتی ئیمان وا لە (قضا) ئەخوازێ، بەڵام ئەمڕۆ باوەڕ ناکەم لە دوو ملیار نفوسی بەشەری صەد کەس هەبێ، (بحق) خودای خۆش بوێ، وە ئەگەر نەیکەنە (سوء الظن) ئەتوانم بڵێم لەسەر ئەرض محبی خودا نی‌یە.. نی‌یە. حبی ڕۆسای دین بە نەوعێک جێ گیر بووە، کە صاحبی دینیان (بالکلیة) فەرامۆش کردووە. محبەت پەیدا ئەبێ.. پەیدا ئەکرێ ، جەلبی خاطر بۆ زانایان زۆر سەهلە، لاکن محبەت چی یە؟ حەقیقەتی نازانرێ ، بەس ئەوەی محبەتی هەبێ بە ویجدان، ئەزانێ چ شتێک هەیە سەلبی صبر و ثبات و قرار و ڕاحەتی لێ ئەکا.. ئیرادەی پێ ناهێڵێ.. وەکو (مصطفی بەگی کوردی) ئەڵێ:

صبر و ثبات و تاقەت و ڕاحەت نەما لەلام هەرماوە
ڕوح وپێی بڵێ (کوردی)ئەتۆش بڕۆ

محبەت ئاگرێ لە دڵدا هەڵئەکا، باڵۆن بە هەوای ئەخا، صاحبیشی نازانێ: ئەوە چی یە، دائما لە یادی محبوبی خۆیەتی، اصلاً لێی غافل نابێ.. وە نازانێ لەبەرچی‌یە. تا محبەتی خودا لە دڵاندا هەبوو، عالەمی ئیسلامیەت چۆن بوو! کە محبەتی خودا لە دڵاندا نەما.. چی لێهات؟ موسڵمان چۆن بڵاو بوونەوە؟ سەر بەرە و ژێر بوون. ئەمڕۆ لازمە محبەتی خودا لە دڵاندا پەیدا بکەن، نە ک وەکو (مرجئە)[1] عالەم بکەینە صەگە بەڕەڵڵا. هەرچی خودا پێی ناخۆشە بیکەین، وەبڵێین ئیمانمان کافیە بەڵکو بە نەوعێک، کە ڕووبکەنە چاکە، نەفرەت بکەن لە خراپە، بزانن خودا چاکە چاکەی ئەوێ، چاکی خۆش ئەوێ (ملاذ)و ملجای خاصە لە ڕۆژی جەزا

---

(1) مرجئە و معتزلە دوو فیرقە ی ئیسلامن.

هەر ئەو لە (حديث ) ئەفەرموێ:

«قەومێک ڕۆژی قيامەت لەسەر (منابری نور) دادەنشن پێغەمبەر نين، (نبی)يش نين، ئەمما ڕسل و انبيا، تايبەتی بە ئەحواڵی ئەوان ئەخوازن، عەرضيان كرد يا ڕسول الله ئەوانە كێن؟ فەرمووی: «ئەوانە، ئەوانەن خودا لای عباد، و عباد لای خوا خۆشەويست ئەكەن».

محقق بزانن تا محبەتی (ئەم وئەو ) لە دڵاندا بێ، محبەتی خودای ناچيتێ. تاويلی محبەت، كە مەلايانی ئێمە وە (معتزلە)[٢] ئەيكەن، باشنیيە، وەحی ڕوحی محبەت ئەبا.. ساردی ئەكاتەوە بەو نەوعەی، كە قورئان ئەفەرموێ: محبەتی خوداتان هەبێ، بە محبەتی اغيار كەتمی محبەتی خوا مەكەن.

﴿وَلَوْ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟﴾ ئەو ظلمە عظيمە، كە ئەو (محقرات)ە ئەپەرستن ﴿إِذْ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ﴾ وەقتێ، كە عەذابی خودا ئەبينن، ئەوسا لێيان معلوم ئەبێ بە (رای العين) ئەيبينن ﴿أَنَّ ٱلْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا﴾ ئەزانن قووەت بۆ خودايە، كەسیتر لەو وەقتەدا هيچ (حول) و قووەتی نیيە، كە ئەوانە لە عەذابی خودا نەجات بدا، ئەگەر ئەم شركايە چشتێک بوبونايە ئەبوايە لەسەر عيبادی خۆيان بە جواب بين، نەهێڵن عەذابيان بدا ئەو ڕۆژە ئەيزانن ئەمە بێ فائدەيە، ئەمڕۆ بيزانن باشە و، ئەشزانن ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعَذَابِ﴾ خودای تعالی عەذابی شديدە زۆر بە ئێشە، ئێشی دوو ڕۆژ و سێ ڕۆژ نیيە. جەهەننەمە، حەمام نیيە، جێگای خەوتن و استراحەت نیيە، آن زيادە ئەو ظالمانە شددەتی عەزاب لەو وەقتەدا ئەچێژن، كە ﴿إِذْ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟﴾ تبرّا ئەكەن و حاشا ئەكەن، ئەوانی متبوعن لەوانەی، كە تابعيان بوون ئەڵێن: حاشا ئێمە ئێوەمان اغوا نەكردووە، ئێوە ئەتباعی ئێمە نين!

وای لەو حەسرەت و ئەندوهە، لەو یەئس و انفعالە، لەو تاثر و ئێش و دەردە، چۆن متبوعەکان حاشایان لێ ناکەن، زێ خۆیان لێ هەڵ ناتەکینن؟! ﴿وَرَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ﴾ ئەوانیش عەذابی خۆیان دیت، قوورریان بە سەر خۆیان، خەلاص ئەبن، تا خەلق خەلاص بکەن؟ ﴿وَتَقَطَّعَتۡ بِهِمُ ٱلۡأَسۡبَابُ ١٦٦﴾ بررا بە سەبەب کفری ئەوان، ئەو پەتکو گوریسەی ئەوان، کە دەستیان پێوە گرتبوو، بررا ئەو داوی (تزویری) ئەوان دایان نابوەوە، پارچە پارچە بوو، ئەو داوە پسپسۆکە خۆی لەبەر ئاگر ناگرێ، زۆرترینتان دیتان ئەو رۆژە، کە (کۆیێ ) بۆمباردومان کرا، سەگ و شێخ و مەلا و صۆفی و فەقێ هەموو هەرایان ئەکرد خۆیان ئەشاردەوە، ئەچوونە ناو ئەشکەوتان، کونەسەگان. ئەوجا قوورتان بەسەر بە طمعی ئەوەن، کە ئەوانە لە (هول)ی قیامەت نجاتتان بدەن؟ پەناو ملجا و ملاذتان ئەوانە ئەبن؟ نموونەی قیامەت لە دونیا زۆرە، بەڵام چ بڵێم ئوممەت کەررە، کوێرە ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُواْ﴾ کەدیتیان معبودەکانیان کەڵکیان نەگرتن، حاشاو ابایان لێ کردن بەتەمنای حەسرەتەو مەندانە، بە هەناسە ساردی ئەڵێن: ﴿لَوۡ أَنَّ لَنَا كَرَّةً﴾ خۆزیا ئەگەر ببوایە بۆ ئێمە چوونەوەی دونیا ﴿فَنَتَبَرَّأَ مِنۡهُمۡ﴾ تۆڵەی خۆمان ئەکردەوە، حاشامان لەوان ئەکرد ﴿كَمَا تَبَرَّءُواْ مِنَّاۗ﴾ چۆن ئەوان حاشایان لە ئێمە کرد. ئەمما ئەو تەمەنایە بۆ ئەوان هیچ کەڵکی نییە، زیادە ئەندوە و حەسرەتیان ئەداتێ ﴿كَذَٰلِكَ﴾ وایە﴿يُرِيهِمُ ٱللَّهُ أَعۡمَٰلَهُمۡ حَسَرَٰتٍ عَلَيۡهِمۡۖ﴾ خودای تعالی ئەعمالی ئەوان بەوان نیشان ئەدا، بە گەلێک حەسرەت و دەردمەندی ﴿وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ ١٦٧﴾ ئەوان لە ئاگر ناچنە دەرێ، گەررانەوە بۆ دونیا نییە. چۆن ئەچنە دەرێ؟ کێ بیان باتە دەرێ؟ خۆیان لە خوا محروم کرد، شریکەکانیش کەڵکیان نەگرت،

ئەمجا کەسێک صادق بێ لەگەڵ قەومی خۆی، احواڵلاتی قیامەتیان ئیمڕۆ بۆ تەمثیل ئەکا، تا تەماشا بکەن، بەموو پشتی خۆیان نەبەستن‌و، بزانن بەغیری ئیمانی دروست و عملی چاکە، هیچی تر بۆ ئەوان کەڵک ناگرێ. (سیَر)و تەئریخی عالەم ئایاتی قورئانی حکیم دوو شاهدی عەدلن، کە ادیان‌و کتبی سماوی. سەبەب بە تەمەعی ڕۆسای دین بە فساد چوون، ئەگەر چی (اساسا) نەشئەتی لە فقرو ضەرورەت کردبێ، (بعدە) تەمەع بوویتە طبیعەت بۆ ئەوان، وە زانیویشیانە علی الاطلاق، ئوممەت کەیفیان بەڕاست گۆیان نایەت، خزمەتی خائنەکان ئەکەن، لەبەر ئەوە تا ئەمڕۆ دەرگای افسادی دین کراوەتەوە، ئەمجا لە ضمنی خطابی عام، اشارە بۆ ئەو منشای فەسادە ئەفەرموێ وە لە ئاخری ئەو چەند ئایەتە تصریحی پێ ئەکا.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِى ٱلْأَرْضِ حَلَٰلًا طَيِّبًا﴾ ئەی ئینسانینە!- تابع و متبوع- بخۆن لەوەی، کە لە زەویدا هەیە حەڵال و زەلال.. پاک وخاوێن، کە خودا بۆ ئێوەی خەلق کردووە، بەکەسابەت و معاملە بە دەستی خۆتانی بخەن‌و عافێتی بکەن. بە حیلەو دەسیسە، بە حوکمی خوا گۆڕرین، بە کتێبی خوا تیکدان ڕوو لە (ما فی الارض) مەکەن.

﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾ دوای شوێنی شەیتان مەکەون، خۆتان هەڵمەخەڵەتێنن گوایا ئێمە- ڕۆسای دین- ماڵی خەڵقی بۆ ئێمە حەڵاڵە، بە هەر نەوعێک چنگمان کەوێ حسابمان لەسەرنی‌یە!

﴿إِنَّهُۥ﴾ شەیتان ﴿لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ١٦٨﴾بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە، ئەوی بە دوژمن هەڵخەڵەتێ، بە هیلاک ئەچێ. نەتان بیست بە چ حیلەیەک ئادەمی لە بەهەشت هێنایە دەرەوە، لە سەر ئەو هەموو نیعمەتە فراوانە، ئەو دارە لێی حەرام کرابوو چۆنی بۆ ئارایش و زینەتدا.. نەکەن ئێوەش بەو نەوعە (تسویلاتە) هەڵخەڵەتێن.

﴿ إِنَّمَا يَأْمُرُكُم بِالسُّوٓءِ وَالْفَحْشَآءِ ﴾ ئەمرتان ئەکاتێ بەهەرچی خراپ بێ بالخاصة (بخیلی ).. ئەوی بخیل بێ، تەماعی زۆر ئەبێ، حەز لە چاکە ناکا، کە تەماعیشی بوو، بەهەر حیلەیەک بێ، سەعی بۆ کۆ کردنەوەی دونیا ئەکا.

﴿ وَأَن تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ١٦٩ ﴾ و ئەمرتان پێ ئەکا بلێین بە درۆ و (افتراء علی الله) ئەوی کەوا نایزانن. ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ﴾ ئەگەر بگوترێ بە ئەوانە، کە اتباعی شەیتانن و مفتری علی (اللە)ن ﴿ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ ﴾ تابعی ئەو کتێبەبن، کە خوا ناردوویەتی ، چۆنی فەرمووە وا بکەن، فێڵ لە خەڵقی مەکەن﴿ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ ﴾ لە جوابیان دا ئەڵێن ئێمە دەخلمان نییە بەسەر، لە سەرچی بوون تبعیەتی ئەوە ئەکەین، ئەڵبەتە بە خۆرایی ئەو احکامەیان بە ئێمە نەگەیاندووە، ئەوان چاکتریان زانیوە، نزیکتر بوون لە صاحب کتێبەکە، ئەڵبەتە لەویان وەرگرتووە ﴿ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ١٧٠ ﴾ ئایا ئەوان دوای ئابائی خۆیان ئەکەون، ئەگەرچی لە هیچ نەگەن.. ڕێ بە هیچ نەبەن، ئەگەر بابی ئێوە سەجدەی بۆ بت بردبێ، ئێوەیش ئەیبەن؟ ئایا ئەگەر اتباعی (آباء) بۆ ئێوە، ببێتە عذر بۆ گاپەرست و قالۆنچەپەرست و پشیلەپەرستیش، ئەبێتە عذر؟ ئایا چۆن الزامیان ئەکەن بیانکەن بە جوو، یا بە دیان، یا بە موسڵمان؟ ﴿ وَمَثَلُ الَّذِينَ كَفَرُوا ﴾ حاڵ و حیکایەتی ئەو کەسانەی کە کافر ئەبن بە تقلیدی ئابای خۆیان، لە جواب دانەوە ﴿ كَمَثَلِ الَّذِى يَنْعِقُ ﴾ وەک مثلی ئەو کەسەیە، بقیرڕینێ وەک قەل ﴿ بِمَا لَا يَسْمَعُ إِلَّا دُعَآءً وَنِدَآءً ﴾ بە غەیری دەنگ و بانگ، چی تر نابێ، قسەکانیان بێمەعنایە، هەتا بەعضێ حیوانات لە دەنگ و بانگ تێئەگەن، فەرقی خێر و شەرر ئەکەن،

بەعضێک هەیە وەک عەلیشیش، حبارای[1] گێژو وێژ دە ڕوا، وە جووره جوورێک ئەکا، گێلەکە.. گێلەکە، خۆیشی نازانێ ئەڵێت چی. ئەو قەومە ﴿صُمٌّ بُكْمٌ عُمْىٌ فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ١٧١﴾ کەررن، لاڵن، کوێرن لە هیچ ناگەن. پاش ئەو خطابە عامە، ڕوو ئەکاتە مسڵمانان، چونکە الآن ئەوان جێی ئەمەلی مەقصود لەو تەمثیلاتە بۆ ئەوانە، کە هەڵنەخەڵەتێن. ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَـٰتِ مَا رَزَقْنَـٰكُمْ﴾ بخۆن لەو ڕزقە پاکە، کە ئێمە بە ئێوەمان کەرەم کردوە بە خەلق و ئیجاد، بە قاعدە وشرع ﴿وَٱشْكُرُوا۟ لِلَّهِ﴾ شوکری خودا بکەن، نیعمەت لە خودا بزانی، ئەگەر بە فەتحو ظەفەریش ماڵێکتان بە چەنگ کەوت، هەر لە خودای بزانن ﴿إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ١٧٢﴾ ئەگەر ئێوە بە ڕاستی عبادەتی خودا ئەکەن، هەر ئەو ئەپەرستن، شوکرانەی نیعمەت بکەن، مەستی صەهبای دەوڵەمەندی مەبن، (تامل ) بکەن لە لطفی خودا چ وسعەتێکی داوەتە ئێوە، هەتا بە شەرعیش چەند شتێکی کەمی لە ئێوە حەرام کردوە، کە ئەوانیش بۆ ئێوە (مضرّە مادة) (معنی)، ئەمەیش دیسان عەینی کەرەمە ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ﴾ حەرامی کردوە لەسەر ئێوە مردار ﴿وَٱلدَّمَ﴾ خوێن ﴿وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ﴾ گۆشتی بەراز، مردار و خوێن، هەم مضرن وە هەم طەبیعەت نەفرەتیان لێ ئەکا، گۆشتی بەرازیش بەعضێ دەردی بێ دەرمان ئەدات، کە ئەطبای بەراز خۆرەکان هاوار ئەکەن: ئەی قەومە مەیخۆن. الا بە بەعضە شرائط نەبێ، کە ئەویش بۆ هەموو کەس ڕێک ناکەوێ ﴿وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ ٱللَّهِ﴾ والا ئەوی بە ناوی غەیری خودا بۆ غەیری خودا بکوژرێتەوە، تەعظیمی غەیری خودای پێ بکرێ، ئەویش شتیکە دێنی ذەبیحەیکی تەعظیمی خودای پێبکرێ نەظر بە ذەوقی دینی

---

(٢) حباري: جۆره بالندەییکە.

لە مردار مەنفورتر و لە بەراز پیسترە، وە لەگەڵ ئەوەش ﴿فَمَنِ اضْطُرَّ﴾ ئەوی مەجبورکرا، (کانە) ضەرورەتی حفظی حەیات مەجبوری ئەکا، ئەویش ناچار ئەبێ قاعدەی مقررەیە لەدوو شەرر ئەهوەن ئیختیار ئەکرێ ﴿غَيْرَ بَاغٍ﴾ حاڵی ئەویش وابێ، طبعا مەیلی نەکات ﴿وَلَا عَادٍ﴾ تەجاوزیشی پێ نەکرێ، یەعنی نەبە طەبیعەت مەیلی بکا، وە نە لەبەر حفظی حەیات پێی بکرێ لێی لادا، ئەو کەسە ﴿فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ﴾ گوناهی لەسەر نییە، وە ڕوخصەتە بۆی بخوات لەهەر کامێکیان بێ، لەو محرماتە، لە نفی (اثم) نفی حورمەت ئەفامرێتەوە، لەحاڵی ئیضطیرار خواردنی حەرامی بەقەدەر دەفعی ضەرورەت واجبە، (لکن) مەقامی ئیستیعظامی لە قەضا ئەخوازێ، ئیقتصار بکرێ لەسەر نفی گوناه﴿إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ١٧٣﴾ خودای تعالی عەیب پۆشە، ڕەحیمە، حوکمی زەمانی وەسعت وەضەرورەت، چۆن وەک یەک ئەبن؟هەتا ئەوی بۆ غەیری خوداش بکوژرێتەوە (لدی الاضطرار)بۆ بێچارەکانی ئیباحە ئەکا، (لکن)بەهیچ وەجە ڕوخصەت نادا، مقابلی حەق بزر کردن، تەحریفی کتاب، شەرع گۆڕرین شتێک وەربگرن بۆیە ئەفەرموێ:

﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلَ اللَّهُ مِنَ الْكِتَابِ وَيَشْتَرُونَ بِهِ ثَمَنًا قَلِيلًا﴾ ئەگەر هەموو دونیاش بێ، بە مقابلی کەتمی حەق کەمە، (اصلاً- ابداً) خودای تبارک وە تعالی ئەمە ڕوخصەت نادا ﴿أُولَٰئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ إِلَّا النَّارَ﴾ ئەوانە ناخۆنەوە لە زکی خۆیان، الاّ ئاگر خواردنی بەراستی لە ناو مەعدە دایە، لەوێ هەضم ئەبێ هی ناو زار(دەم ) قیمە کردنە، مع انە ئاگر بکەوێتە ناو چشتێ ئاگرەکە ئەو ئەخوا﴿وَلَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ کەسێکی خۆشەویستت پێت بڵێ ئەگەر: ئەو ئیشە بکەی، قسەت لەگەڵ ناکەم، ئەگەر بە ڕاستی خۆشت بوێت؟ نایکەیت (ولو)بزانی ڕوحت

دەرنەچێ ﴿ وَلَا يُزَكِّيهِمْ ﴾ پاكیان ناكاتەوە، هەتا بە ئاگریش پاك نابنەوە، تا لێیان ئینقطاع ببێت ﴿ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ١٧٤ ﴾ ئەمجا ئەوی مەلای مسڵمانان بێ، تەماشا بكات بچێت قورر كاری بكات چاكترە، با هەزار جار بمرێ لە برسان، بۆی دروست نییە حەرفێك لە قرآن، یا حوكمێك لەشەرعی خودا بگۆڕێ، وە بە خلافی حەق وە حەقیقەت فتوا بدات.

﴿ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ ﴾ ئەوانەی ئایاتی خودا بە قیمەتی كەم ئەفرۆشن ئەوانەن ﴿ اشْتَرَوُا الضَّلَالَةَ بِالْهُدَىٰ ﴾ لە دونیا ﴿ وَالْعَذَابَ بِالْمَغْفِرَةِ ﴾ لە ئاخرەت.

﴿ فَمَا أَصْبَرَهُمْ عَلَى النَّارِ ١٧٥ ﴾ عەجایب صەبرێكیان هەیە لەسەر ئاگر، لە دنیا تێیاندایە، لە قیامەت تێیدان ﴿ ذَٰلِكَ ﴾ ئەوی ذكركرا لە بەرچییە؟

﴿ بِأَنَّ اللَّهَ نَزَّلَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ ﴾ خودای تعالی كتێبی، هەركتێبێ ببێ، بەحق ناردووە، چ نقصانی نیە، ئیكمال بكرێ، چی خەراپی تیا نییە، فرێ بدرێ هەموی حوكمو حكمیاتو عبرە، باعثی سەعادەتمەندی ئینسانە، بۆچی ئەیگۆڕن؟ ئەوان لەخودا عالمترن؟حسنو قبح چاكتر لەیەك ئەكەنەوە؟ دەرحەق بەعبادی خودا بەمەرحەمەت ترن تسهیلاتیان بۆبكەن؟ حەقیان لێبگۆڕن؟ ﴿ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِي الْكِتَابِ ﴾ ئەوانی ئیختلافیان هەیە لە كتێبی خودا، خودا ئەو كتێبەی چۆن ناردووە، كەلام؛صفەتی خودایە،چۆن نەقل و نزول ئەكا؟ خودای تعالی چۆن قسە ئەكا، مەخارجی حروفی هەیە یان نا؟ ئەوجا هەر كەس بە گوێرەی خەیاڵو فكری خۆی قسەیێك ئەڵێ، تەصویری ئەكا، حقاً ئەوە اختلافە،ئەوتاویلاتە، ئەوتصویراتە، ڕەونەقی كتێبی خودا ئەبا، ئەو گرۆهە﴿ لَفِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ ١٧٦ ﴾ لە ناو خلاف و خصام و جەدەلێكی دەوردان بە ئەوهام، وە خەیاڵی خۆیان ناگەن بە هیچ. برای باوكم، عەزیزی خۆم! تۆ چیتە لەگەڵ ئەم فاك و فیكە، چ معطەل بوی لەسەر زانانی

کیفیەتی تکلمی خودا؟ تەماشای کەلامەکە چی تیایە قبوڵی بکە، تەربیەی وەربگرە حکمەت فێرببە، نەتیجەی ئەو جدالە تەفرەقەیە عەداوەتە هەر کەسە ڕوو ئەکاتە طەرەفی، اتحادیان نامێنێ، یەکی بۆ مشرق ئەڕوا، یەکێک بۆ مغرب ئەچێ، ڕوو لە ڕێگای (وسط)ناکەن، حاصلی بەیەک مشغول ئەبن، ئاگایان لە صەلاحی حاڵ نامێنێ، وا تێ مەگەن ئەو خصام و تەفرەقەیە باشە، زۆر خراپە، زۆر شەڕە﴿ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ ﴾ چاک نی‌یە ڕووی خۆتان بکەنەلای مەشرق ومەغرب (اساساً) مەشرق ومەغرب قبلەی ڕۆژ پەرستانە، ئەو کەسێکی، کە ڕوو بکاتە جهاتی مختلف چاک نی‌یە ﴿وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ ﴾ چاک ئەو کەسەیە، کەئیمانی بەخودا هەبێ بە ئیمانی خاوێن پێی لە دائرەی عەقڵ نەچێتە دەرەوە﴿ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ﴾ بە ڕۆژی قیامەت بەو نەوعەی، کە بەیان کرا، (محقق) ئەزانن دێ، ئەمڕۆ یا سبەی لازم نی‌یە، ئەو علمە عائدی خودایە ﴿وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ ﴾ لە طەوری ممکناتیان ناکەنە دەرەوە (ذاتاً) لە پێشەوە دەرەجەیان معلوم بوو، چۆن لە کتێبی خودای باسیان ئەکا بەو نەوعە ئیمانیان پێ هەیە، ناڵێن (بنات الله)ن، مدبرن، رب النوعن ﴿وَٱلْكِتَٰبِ﴾ کردویانە بە ئیمامی خۆیان، اقتدای پێ ئەکەن، تبدیل و تحریف و تاویلی ناشیرین ناکەن، ئەزانن کەلامی خودایە، پەکی خۆیان ناخەن، بزانن خودا چۆنی گفتارکردووە،﴿ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴾ ئیمانیان هەیە بە پێغەمبەران لە طەرەف خودا ناردراون انسانن، محتاجی لقمە نانن، شەریکو کوڕی خودا نین، فکری رئاسەت و تسلطیان نی‌یە، وەکو دەجالە (مکارە)ەکان ﴿وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ﴾ تەنها ئیمان اکتفا ناکا، لە چاکە تێ ئەکۆشی. ماڵی چاک لە وەختی حەیاتو عافیەت ئەبەخشێ، ئەیداتە ﴿ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ ﴾ خزمانی خۆی. ﴿وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ ﴾ چ لە

خزمانی خۆی بێ، چ بێگانە بێ ﴿وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِ﴾ ئەوی لەسەر ڕێیان فڕێ دراوە، هەڵگیراوە کەپێی ئە ڵێن: (لقیطة)، یاخود ئەوانەی لەبەر ضەعیفی و شەلی و سەقەتی ناتوانن بگەڕێن، لە سەرە ڕێیان ئەکەون، یاخود ئەوانەی بۆ نفعی ئوممەت سیاحەت ئەکەن، خریطە ئەگرن تا (لدی الحاجة) بۆ ئوممەت بە کاربێ، ئەمما ئەوانەی سەرسەری بە مێزەری سپی و سەوز ئەخولێنەوە، حرامە ماڵ پێ دانیان، دەرگای سفالەت بۆ ئوممەت ئەکاتەوە، عیلم و سیادەت ڕەزیل ئەکا، ئەوانە مجبور بن بۆ خۆیان کەسابەت بکەن، داکاسێن ﴿وَٱلسَّآئِلِينَ﴾ ئەوانن، کە عوذریان هەبێ بۆ سؤال و دەست پان کردنەوە،لە دین مبین، تاممکن بێ ڕێی (تسئل) نادا ئەبێ. یا حکومەت یا ئوممەت علاجی ئەو بێنەوایانە بکەن ﴿وَفِي ٱلرِّقَابِ﴾ ماڵ صەرف ئەکا بۆ ئازادی ئەسیران، مل لەناو طەوقی عبودیەت، چ مادی، چ مەعنوی، ئەسیری مەعنوی گەلێ خراپترە لە ئەسیری حسی، ﴿وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ بە زەریفی نوێژ بەجێ ئەگەیێنێ، ڕابیتەی اجتماع تێک نادا، (ولو) زۆریش گەورە بێ لە ڕیزی عەوام ڕائەوەستێ، ناڵێئەوە عیبادەتی عەوامە بۆخوا نییە ﴿وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ﴾ بە خواهشی خۆی زەکات ئەدا، بە مستحقانی ئەگەیینێ، حیلە ناکا. ﴿وَٱلۡمُوفُونَ بِعَهۡدِهِمۡ إِذَا عَٰهَدُواْۖ﴾ کە عەهدو پەیمانێکیان دا بەجێی ئەگەیینێ، (خاصةً)لەگەڵ خودا وەفا بە عەهد گرانە.. ئەوی موسڵمان بێ زۆر احتیاط ئەکا، یا عەهد ناکا، یا کە بیکا بەجێی ئەگەینێ، ئەگەر سەریشی تیدا بچێ، بەڵام مع الاسف سیاسەت (وەفا بە عهد)ی نەهێشت بە بایدا ﴿وَٱلصَّٰبِرِينَ فِي ٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ﴾ ئەمە بەڕاستی خۆیەتی لە مەقامی شیددەت و ناخۆشی و زەرەر، مەتانەتی ئیمان بەدەرئەکەوێ. ﴿وَحِينَ ٱلۡبَأۡسِۗ﴾ (خاصةً) لە وەقتی تووش بوونی شیددەت و ناخۆشی ﴿أُوْلَٰٓئِكَ

ﭐلَّذِينَ صَدَقُوا وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ١٧٧﴾ ئەوانە ئەوانەن (بحق) ڕاستگۆن لە دەعوای ئیمان، ئەوانە هەر ئەوان خۆپارێزن بە تەواوی، دوورن لە (شرک) و ڕیا و خیانەت و ڕەزالەت و خسەتی نەفس، قورئان بۆ ئەو نەوعە ئیماندارانە هیدایەتە، (حقیقةً) خوا و پێغەمبەر و دین ئەو ئیماندارانەیان ئەوێ، دینی ئیسلام بەو نەوعە کەسانە پایەدار ئەبێ.. ئوممەت بە ئەوانە بە قووەت ئەبێ، باقی یا زەرەری (محضن) ، یا زەرەریان زیاترەلە قازانج.

ئەی امنای دین و ئەی ڕۆسای دنیا!.. وەی علمای ظاهر و، وەی اولیای باطن!. ئێوە و خودا تەماشای لەوحەی خاطری خۆتان بکەن، لەگەڵ ملاحظەی ئەو ئایەتە، ئەوجا بزانن لەو حیکمەتە باهرانە لەو (تەزکیە)طاهرانە، هیچی تێدا هەیە؟ بەسی یە انصاف چاکە مەڵێن (هکذا وجدنا آبائنا) بڵێن (تلک امة قدخلت) لە پاش ئەو ئایاتی بینات، کە انزاری ئەوانەی، کە کەتمی حەق ئەکەن، وە لە بیانی ئیمان و کردەوەی ڕاستگۆیان چەند احکامێکی، کە امتحانی ئەهلی ئیمانی پێ بکرێ ذکر ئەکا، لە هەمووی (اهم ) حفظی عەدالەتە لە انتقام و تۆڵە کردنەوە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِي ٱلْقَتْلَى﴾ ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە، بەو ئیمانە ڕاستە لەسەر ئێوە نووسراوە (قصاص) لە کوژراوان یەعنی لەو هەنگامەی ناخۆشییە، کە کەسێکتان لێ بکوژرێ خۆتان بگرن، لە عەدالەت مەچنە دەر، وەکو کوردی ئەڵێ: «بە قاعیدەی تقاص و تقوص پێکەڵ پێک تۆڵەی خۆتان بکەنەوە» اولاً یەک بە یەک بە اعتباری نەفس و بە اعتباری وەصف ﴿ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ﴾ (ولو) قاتل پادشاە بێ ﴿وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ﴾ (ولو) لە اخصی بەندەکانی هەمایون بێ ﴿وَٱلْأُنثَىٰ بِٱلْأُنثَىٰ﴾ (ولو) مەلیکە بێ و قەصاصیشی لازمە، کەس حەقی عەفووی نییە، بەس حەقی عەفوو بۆ خاوەندی خوێنە. ذاتەن مەقصەد لە قصاص دەفعی فیتنەیە، کە خاوەندێ خوێن واز لە

حەقی خۆی بهێنێ، ترسی فیتنە نامێنێ ﴿فَمَنْ عُفِيَ لَهُۥ﴾ کەسێک عەفوو کرا (محض) بۆ خاتری خۆی، یەعنی قەتلەکە لە عەداوەت و قەساوەتی دڵ نەبووبێ حەقێکی هەبێ، کە چاوپۆشی لێ بکرێ اهتمام بە کوژرانەوەی نەکرێ، بۆیێ ئەفەرموێ: ﴿مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ﴾ (کانە) قەتلەکە (اخوّتی) ئیسلامیەی تێک نەداوە، ئەو کەسە (قصاصی) لەسەر نامێنێ، ئەمما بۆ (جبری)، نقصانی اخووەت (دیەت) لازمە، مەگەر لە ئەویشی عەفوو بکەن ﴿فَاتِّبَاعٌۢ بِالْمَعْرُوفِ﴾ مفسرەکان ئەفەرموون: ئەوی عەفوو ئەکا پاش عەفوو، عەفوەکە اتباع بکا بە (معروف)، یەعنی بە (دیە)یەکی[1] کە لەلای خەڵق باش بێ، پێدانەگرێ بڵێ زۆرم ئەوێ، ماڵی زیادەی چاکم ئەوێ ﴿وَأَدَآءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَٰنٍ﴾ ئەوی عەفویش ئەکرێ (دیە) کە بە چاکی بگەیێنێتە خاوەندی خوێن، تاخیری نەکا.. بە پچرر پچرر نەیداتێ، ئەمما ئەو مەعنایە لەو عیبارەتە نافامرێتەوە و، ادای مەعنای ئەم ئایەتە بەو تفریقە، لام احسانی تێدا نێیە، ظاهر وایە هەر دووکی عائدی عەفو کراو بێ، یەعنی مقابلی ئەو عەفوە، کە حەیاتێکی تازە ئەدا بە قاتل، حەق وایە ئەویش مقابلی ئەو احسانە، دۆستی بکا لەگەڵ خاوەنی خوێن، تواضعی بۆ بنوێنێ، بیلاوێنێتەوە بە نەوعێ، کە هیچ کدورەت لە خاتری دا نەمینێ، بێ ئەوەی، کە ئەو داوا بکا (دیە)ی کوژراوەکە بە تەواوی و بە زەریفی بەو برایە، بەو جوانمەردە بگەیینێ.

﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەو حوکمە ﴿تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ﴾ تخفیف و مەرحەمەتێکە لە تەرەف خوداوە، وە الاّ ئەبوایە رێی عەفوو نەدا، چونکە متانەتی ئیمان، اخوّتی ئیسلامیە، وا لە قەزا ئەخوازێ، کە ئەهلی ئیمان هەتا لە وەقتی (فورانی غضب)، خۆی مەنع بکا لە کوشتنی برای خۆی، دیارە ئەو نەوعە

---

() دیە: ئەو پارەوماڵەي لەجیاتي خۆیني کوژراوان ئەدري.

قاتلە ئیمانی زۆر مەحکەم نیە و، قابلە امنیەتی پێ نەکرێ، بەلام بە ئەمەلی ئەوە، کە ئەو انفعالو تاثرو خەجالەتە، ئیمانی وا بە قووەت بکا غالب بێ لەسەر قووەتی غضب، جاری تر نەهێلێ (قتل)ی لێ صادر ببێ، رێی عەفوو درا ﴿فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ﴾ لەهەر دوولا ﴿بَعْدَ ذَٰلِكَ﴾ پاش ئەوەی ذکر کرا لە عەفوو و(دیە) دان لەیەک بکوژن، دیارە نە عەفووی ئەو لەبەر اخوەتی ئیسلامیەیە..نە قتلی قاتل، دۆستی، ئەدای لە معذرەتێکی مقبوول نیە لەبەر ئەوە﴿فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ ١٧٨﴾ بەعضێک ئەفەرموون: قاتلی پاش عەفوو الا ئەبێ بکوژرێتەوە و، رێی عەفوو نیە، ئەمما (مختاری جمهور) ئەوەیە، کە رێی عەفوو ناگیرێ. دیسان ئەگەر خاوەندی خوێن عەفووی بکا، شەرع قبوولی ئەکا. ئیمامی شافعی و ئیمامی مالک هەردووکیان لەسەر ئەوەنە، مقصود لە (عذابی الیم) عەذابی قیامەتە.

﴿ وَلَكُمْ فِي ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ يَـٰٓأُو۟لِي ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴾ حەیاتی دونیا وەکوو هەموومان ئەی بینین زۆر ناخۆشە.

(ابو علای معری) ئەڵێ: ئەوی لە سەرەمەرگ ئاوزنگان ئەدا، ئەوە تالاتی حەیات (قەی) ئەکاتەوە. وە گەلێ کەس مردن بە دەرمان ئەزانن بۆ دەردی حەیات، شەریعەتی طبیعەت، تا ئەمڕۆ تنظیمی حەیاتی نەکردووە، لەسەر ئەو ناخۆشی یە، بەشەر بە (شەرر) زیاتر ناخۆشی بکا شایانی عەقل و ئینصاف نیە. حوادثیک، کە خەلەل بە امن و نظامی عام بگەیینێ متوالیاً ئەبێ بۆ مەنعی انتشاری فساد چارەسازیەک بکرێ، بۆیێ عقلای ئینسان رێیان بە تەشکیلی حکومەت بردووە (آلهیون، طبیعیون) ئەو تەشکیلەیان لە ضروریاتی حیاتی اجتماعی دیووە و، ئەفرادی حکوومەت طبعاً مقدّس نین، ئەوانیش بەشەرن میولی فاسدەیان هەیە، بۆیێ احتیاجیان دیوە بە قانونێک، کە اکمالی ئەو تەشکیلە بکا. بناءً علیه ئیجاب ئەکا واضعی قانون بێ مەیل و محابا، صاحبی وجدانی پاکبێ بە احوالی ڕوحیەی ئینسان

خەبەردار بی، ئەو جۆرە بەشەرە لەهەموو زەمان زۆر کەمن، (خاصةً) لە عەصری حضارەت و مدنیەت،محقق بزانن ئەمڕۆ لە شەرق و غەرب، لە شمال و جنوب، لە قطعاتی خمسەی ئەرض یەک ئینسانی تێدا نییە بە وجدانی (نزیە)،بە قلبی پاک لە مەیلی دین، طائفی، مذهبی، حزبی هەبێ، هەر قانوونێکی دابنێن خاڵی نییە لە مەیلی فەساد. بە لافو گەزافی (سیاسیون ) هەڵمەخەڵەتێن ئەوان لە هەموو کەس غەشیان زیاترە، ئێمە بۆیێ ئێمە ئەڵێین (لا بدّ) شارعی قانون ئەبێ خودا بێ، کە ربّ العالمینە،ئەسراری عباد، مەیلی صلاحو فەساد بە ئێمە بگا، ئەو ذاتە بە چاوی بێ فەرقی تەماشای خزمو بێگانە بکات و،ڕەوشتی عالەم شاهدە کە بەشەر لە هەزاری، نۆسەدو نەوەد و نۆی بە ترس نەبێ اصلاح نابێ، کە وابێ ئەگەر کەسێک بە زوڵم و (تعدّی)، بەتصوّر و تصمیم کەسێک بکوژێ، بۆ پڕ بوونەوەی ئەو برینە لە هەیکەلی اجتماعی چی چاکە بکرێ، (حقوقیون) تا ئەمڕۆ دوو فیرقەن:

فیرقەیەک: تەرەفداری (قصاص )نین، ئەڵێن: قاتل اصلاح بکرێ بە حەبس، خەڵقیش لە شەرری ئەمین ئەبن، ئەویش پاشماوەی حەیاتی امرار ئەکا لە حەپسخانە بە ساکتی و سالمی، (کانە) کە چووە حەپسخانە ئەبێتە پیاوی مقدس، چاک و پاک. فیرقەیێکی تر، تەرەفداری اعدامن، ئەفەرموون: ئەو جۆرە قاتلە ازالەی وجودی نەکرێ، ئەو برینە پرر نابێتەوە، جەنابی حەق، کەخۆی (اعلم العالمین) و(احکم الحاکمین)ە، ئەو فکرە تەرجیح ئەکا و بەیانی سببیشی ئەفەرموێ بە نەوعێک، کە ئەوی صاحبی وجدان بێ، تصدیقی ئەکا و، ئەفەرمووێ: لەو نەوعە قصاصە عادلانە بۆ ئێوە حەیاتێک هەیە، ئەمما چ حەیات؟ حەیاتیک، کە وەصف ناکرێ بۆ ئێوە، ئەی خاوەندی عەقڵی خالص و پاک!

(حقیقةً) ئەوی صاحبی (لبّ) بێ، تصدیقی ئەو حوکمە ئەکا، ئەزانێ بڕینەوەی نزاع، کوژانەوەی فیتنە، ئارامی دڵی خزمانی مقتول بەڵکو

استراحەتی ظاهری قاتل لە اعدامی دایە، ئەو نەوعە قاتلە ئەمەلی اصلاحی لێ ناکرێ، تا وەکو فطرەتی بشریەی (بالكلية) ملوّث نەبووبێ، اقدام لەسەر نەوعە قەتلە ناکا. ئەو نەوعە کەسە دەستەلاتی بەسەر هەرکەسێک دا ببێ، لاشک ئەیکوژێ، بۆیێ خودا ئەفەرموێ: «ئەوی نەفسێ بکوژێ، کانما هەموو کەسی کوشتووە» مانعی فطری، دینی لە دڵیدا نی‌یە ئەو حەیاتەی قاتل لە حەپسخانەدا ڕای ئەبوێرێ، ئەگەر لەگەڵ عەذاب و (اعمالی شاقە) بێ، مردن گەلێ خۆش‌ترە لەو عەذابە دوور و درێژە، ئەگەر خزمەت بگرێ لە بالاخانەێی هەوادار، مینابەند، ناظر لەسەر باغ و باغات، ئێوارەو سبەینە بێ ڕەنج و (تعب)، لەکیسەی ئوممەت حتی لە ماڵی ئەیتامی مقتول،سفرە و شیلانی بۆ بڕازێندرێتەوە، بە کەوچک و چەتاڵ (محەللەبی) فرربکا، گۆشتی سورکراوە نۆشی گیانی بکا. غایە مافی الباب فێری بەتانیە دروست کردن و، کیفە سعاتی منقش و کلاوی قولابەچن ببێ و زەمانی حەبسیشی وردە وردە کەم ببێتەوە بە عەفووی شاهانە، جلوسی ملوکانە، ولادەتی همایون، انقلابی سەڵتەنەت. بە مەرگی مەلیک و دانیشتنی مەلیکێک، بە موژدەی (فتح) و پیرۆزی،بەو نەوعە حەپسە چۆن اصلاح ئەبێ؟ اولاد و اقاربی مقتولی مظلوم لەو حەپسە، چ فەرامۆشی یەکیان پێدێ، خەڵقی دی چ عیبرەتێ ئەگرێ، حاصڵی تەجروبە شاهدە، کە فکری فیرقەی اووەل، فکرێکی فاسدە، ئەگەر مەلیک ئەمر بکا مەصرەفی ئەو مجرمانە لەسەر ئەو صاحب مەرحەمەتانە بێ، عجباً ئەو فکرەیان ئەمینێ؟ ئەو نەوعە کەسە ئەگەر معاش خۆری حکوومەت بێ، نزیکی سەری مانگ پارە لە صندوق‌دا نەبێ حکوومەت بۆ تامینی معاشی افندی گۆشت و پیست لەرەعیە بکاتەوە عجبا افندی دڵی پێی ئەسوتێ؟ (حاشا..ثم حاشا).

کەسێک بچێ بۆ کەسابەت، بە ئەمەلی قازانجێک بێتەوە بۆ جەژن، پڵاوێ بۆ منداڵانی خۆی دروست بکا، چ نەبێ سەرو کراسی چیتی سوریان بۆ بکا، وقتاً ئەو سوورە ساقەتانە ئەبینن ناگاە، لاشەی بابیان بە مێشکی پڕژاو،

بەسنگی شەق کراو، بە زگی درراو، بە جەرگی پارچە پارچە کراو بۆیان بێتەوە، ئەو تەرەفدارانەی مجرمەکان، ئایا دوو قران ئەدەن بۆ ئەو مایوسانە؟. بۆ ئەو دڵ سووتاوانە بدەن بە جلک، چێشتی جەژنیان بۆ لێنین.. پێنج شەش فلسیان بدەنێ، بچن بۆ جۆلانە و چەرخ و فەلەک. هیهات! هیهات! پۆلێکی خۆی بە حەیاتی هەموو بەشەر نادات، وەکو مەسەلی کوردی «کفن بە من ببرێ، مردوو گۆرر بە گۆرر چێ».

تعجب ئەوەیە بەعضێک موسڵمان بە سەفسەتەی ئەو محامیانە هەڵ ئەخەڵەتێن، (طعن) لە دینی خۆیان ئەدەن، نازانن ئەوانە بقیەی ئەو مفسدانەن، کە پێیان خۆش نییە هیچ خێریک لە تەرەف خوداوە بۆ ئێمە بێ. عجیبترین ئەوەیە علمای تەفسیر و بەلاغەت، سەعی ناکەن بۆ تەئیدی ئەو ئایەتە، بۆ اجرای ئەو معدلتە، خەریکن مقابلەی ئەو ئایەتە کریمە ئەکەن لەگەڵ مەتەڵۆکێکی عەرەبان (القتل انفی للقتل) بەسەد (چک بردە چک بردە) مەنع و معارەضە، گۆیا اثباتی ئەکەن ئەو ئایەتە بەلیغ ترە لەو عیبارەتە، (مع انه) ئەو کەلامە کەلامێکی زۆر بێ تامە، ئینسانی بالغ شەرم ئەکا بەرابەر عیبارەتی قورئانی ئەو قسە پڕو پووچە بنوسێ، پاش ئەم طول و تفصیلە، عەرض ئەکەین مع الأسف موسڵمانان لەو امتحانە دەرنەچون، لە پاش (فاروقی أعظم)تا ئەمڕۆ ڕەئیسێک بە مرۆسێک، بە قووەتێک بە ضعفێک، دەستەڵاتدارێك بەبێ دەسەڵاتیک نەکوژراوەتەوە. وجودی مسعودی سەرکاری ئاغای خۆشبێ، با سەد هەزارکەس لەوسەگە گەررانە بکوژێ، چ ئەهمیەتی هەیە، ئەم حوکمی قصاصەش ئەنجامی دێ بە ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ١٧٩﴾ بە ئومێدی ئەوەی خۆتان بپارێزن لە قەتلی ناحەق.

دووەم: حوکم لە ئەحکامی امتحانی، حوکمێکە تعلقی هەیە بە مردن و ڕەبطی تەواوی هەیە لەگەڵ ئایاتی (واتى المالَ عَلى حُبِّهِ) کە لە ئایاتی

صادقینە ئەفەرموێ: ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ ﴾ نووسراوە، تثبیت کراوە لە تەرەف جەنابی کبریائی وەقتێ، کە یەکێک لە ئێوە عەلامەتی مردنی لەسەر ئاشکرابوو و، کەوتە سەرەمەرگ ﴿إِن تَرَكَ خَيْرًا ﴾ ئەگەر بەجێ بهێڵێ ماڵێکی، کە شایان بی، پێی بڵێن خێر، یەعنی زۆربێ بەگوێرەی حاڵی مردوو و وەرەثەی پێی بڵێن زۆرە. چیتان لەسەر نووسراوە؟ ﴿ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ بِٱلْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ١٨٠﴾ ئەو حوکمە ثابتە و حەقە لەسەر خۆپارێزان، کە نیهایەتی مەرتەبەی صادقانە.

علمای ئیسلام نظر بە مەعنای ئەو ئایاتە سێ فیرقەن:

١- بەعضێک ئەفەرموون لە صەدری ئیسلام وەصیەت لە وارثان دروست بوو، پاشان بە ئایاتی ارث و قەولی ڕسول (لا وصیە لوارث) نەسخکرایەوە.

٢- بەعضێک ئەو وەصیەتە بۆ دایک و باوکو خزمێکی، کە بالفعل ارث لە مردوو ئەگرێ، (ولو) لەبەر کفریش بێ لەو هەنگامەدا، صلەی ڕەحمیان لەگەڵ بەجێ بهێنن، ڕۆژی دیداری آخرتە با (بالمرة) قطعی مناسبە لە بینیی دا نەبێ، ئەو حوکمە ثابتە زۆر جوانە، کە باوکو دایک، خزم و اقارب لە ماڵی مردووی خۆیان مەحروم نەبن.

٣- بەعضێک ئەفەرموون ئەو وەصیەتە، ئەو عەهدە لە تەڕەف خودایە، یەعنی عەهدی خودا ئەوەیە وای لەسەر ئێوە نووسیوە، کە خێری (متروک) بۆ والدین و خزمانی نزیک (الأقرب فالأقرب) بێ، دوای ئەوە بە (ئایاتی مواریث) هەر کەس بەیانی حەقی خۆی بۆ ئەکرێ، ئەو دوو فیرقەیە ڕێک کەوتوون لەسەر ئەوە، کە ئەو حوکمە نەسخ نەکراوە، وە لە کەلامی مەلایەکی محقق ئەفامرێتەوە، مقصد لێرە تەقسیمی میراثە لەبەینی وەرەثە، بەڵام جەنابی حەق تەقسیم کردنەکەی (تفویض) و سپاردەی ئوممەت کردووە، ئنجا پاش ئەوە ئەو تفویضەی نەسخ کردووە، خۆی تعیینی سهامی وەرەثەی فەرمووە، (کانە) ئەوە ڕێگەیەکی (وسط)ە، لە بەینی

نەسخ و (تثبیت)ی ئەو حوکمە.

بێگومان مەعنای ئەو ئایەتە و دوو ئایەتەی دوایی، بە اختلافی ئەو رەئیانە ئەگۆررێ، مع الاسف عالمەکانی تەفسیر حوکمێکی وایان لەو ئایەتە (تلقي) نەکردوە و، وەرنەگرتووە، کە بە تەواوی فهمبکرێ، ئەوجا بزانین عەمەلی پێئەکەین یان نا.

ئێستا چەند کەلیمەیەک دەربارەی (نەسخ)عەرض ئەکرێ، دوایی روو ئەکەینە مەعنای ئایەتە کریمەکە. (نسخ) لە زمانی عەرەبی دا، بە مەعنا لابردن، تەغییر، ابطالی چشتێکە لەگەڵ دانانی چشتێکی تر لە جێی ئەو، وەکوو صاحبی (قاموس) ئەفەرموێ، ئەمما لە (صحاح) و کتێبی تەفسیرو اصول، ئەو زیادەمان نەدیوە بڵێ: (نەسخ) حوکم بێ بەدەل دروستە، یا دروست نییە، اصولی اختلافیان تێدا هەیە، بەڵام ئەمە عائدی (لغەت) نییە، نەسخی ئایەت ازالەی حوکمی ئایەتێکە بە ئایەتێکی تر، کە ئەو دوو ئایەتە حوکمیان بە نەوعێک مخالف بێ، اصلاً چارە نەکرێ، وەکوو تناقض حوکمێک بێ، نابێ وئەوی تر بێ، حوکمی دوایی پێشی ناهێڵی و مەحوی ئەکاتەوە، سوادی اعظم لە علمای ئیسلام ئەفەرموون: نەسخ لە قورئان دا هەیە بەعضێکیان بە زۆری،، بەعضێکیان بە کەمی، هەتا ممکن بێ بۆ نەسخ ناچێ لە جوملەی ئەوانەیە (ئیمامی شافعی) چەند ئایەتێکی مەلایانی پێشوو فەرمویانە (منسوخە)ئەو (تثبیتی) کردووەو مەعنایەکی باشی لێداوەتەوە، مفسری مەشهور (ابنجریری طبری)یش لەسەر ئەو فکرەیە، (مجددی مصری)یش بەو رێیەدا رۆیشتووە.

ئەمما (ابومسلمی اصفهانی) ئەفەرموێ: اصلاً (نەسخ) لە قورئان دانییە، بەعضێ عالمانی اصول تەئویلی فەرمایشی (ابومسلم)یان کردووە، ئەمما لەگەڵ مەشرەب و مەزهەبی ابو مسلم موافقە ناکا و، بنا بە فیکری (ابومسلم)یش اصلاً خەلەل بە نبووەتی رسالەتپەناە ناگا، بەڵکوو مەقصدی ابو مسلم محافظەی شەئن و شەرەفی قورئانە، عیلمی (من انزل

القران) فەضلی (من انزل علیه القرآن) له هەر ئایەتێ، کە فەرمووبێتیان منسوخە، مەعنایێکی پاکو بە (دقتی) لێداوەتەوە، کە اصلاً قابیلی تغییر و ازاله نەبێ، مع الاسف تەفسیری ئەو مفسری عظیمە لە بەینی موسڵمانان ضایع بووە.

(فخری رازی) له بەعضە جێ، نەقڵی لێ فەرمووە (بعضا)- حسب المذهب- ڕووی کردوەتەوە علمای (سِیَر)- سیرەتی نبوی- ئەفەرموون بە اجماعی أصحابێ ڕسول قورئان کۆکرایەوە، بناءً علیه نایێتە ذهن ئایەتێکی بێحوکم بهاوێنە ناو قورئان. حوکمێکی ثابت، عبارەتێ لە قورئاندا نەهێڵن. لای من وایە ئەوی لە مابینی دوو بەرگی مصحف نووسراوەتەوە، هیچ منسوخ نییە! بەڵێ بەعضێ احکام بە طبیعەتی حاڵ ڕائەوەستێ، بەلام (الی الأبد) بێ حوکم نامینێ، بۆیێ حەضرەتی ڕەسول، یارانی گزین، ئەو ئایەتانەیان هێشتوەتەوە، تاوەکو ڕۆژی خۆی بۆ ئوممەت بەکاربێ.

ئەمڕۆ گرۆهی بێ دەستەلات لە موسڵمانان ساکنی (لوندەرە)، متوطنی پاریس، نشیمەنی بەرلین، دەرحەق بە دوژمنانی قوی چیئەڵێن؟ دەڵێن «لکم دینکم ولی دین، ربنا اخرجنا من هذه القرية الظالم اهلها، واعفوا واصفحوا» عجبا ئەمریان ئەکرێتێ بە؟ «واقتلوهم حيث ثقفتموهم، واضربوا منهم كل بنان» حاشا، ثم حاشا حوکمێ لە وەقتی عزّ و شکۆە و سەڵتەنەت، لەگەڵ حوکمێ لە زەمانی فقر و ذیللەت و مەسکەنەت، چۆن وەکوو یەک ئەبێ؟ زۆر لەیەک دوورن. حوکمێک جەنابی کبریائی بۆ حەضرەتی ڕسالەت پەناهی بنێرێ، چۆن نەسخی ئەداتە دەست جەنابی نبوی، حوکمێکی ئیلاهی ثابت و مقرر، چۆن عیبارەتی لە قورئاندا ناهێشترێتەوە؟ حاصڵی هیچ نەبێ وەکوو (ئیمامی شافعی) بە زۆری ڕێی نەسخ نەدرێ باشە، مع الأسف ئەمڕۆ سەبەب بە تعصبی علمایانی مەذهەب و، بێ تەفریقی زەمانی (صعود و هبوط)، شریعەتی اسلامیه بالكليه سقوطی کردووە،هەتا دەولەتە ئیسلامەکان بۆ (محاکم) قوانینی اجنبی

وەرئەگرن و حوکمی پێ ئەکەن، و لەگەڵ ئەوەیش ئێمە خەریکین، ئایا نەسخ لە قورئاندا هەیە یان نا؟ عجبا ئەوانەی، کە ئەفەرموون ئەو حوکمە منسوخە ئایەتی کریمەی ﴿فَمَنۢ بَدَّلَهُۥ بَعۡدَ مَا سَمِعَهُۥ فَإِنَّمَآ إِثۡمُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُۥٓۚ﴾ مەعنای چۆن لێ ئەدەنەوە؟ دیارە ئەمە حوکمێکی ثابت و مقررە، کەوابێ کەسێک تبدیلی ئەو حوکمە بکا لە پاش ئەوەی، کە بیستی گوناهی نی‌یە الاّ لەسەر ئەو کەسانەیە، کە تبدیلی ئەکەن. گۆڕرینی ئان زیادە لە تەرەف ڕۆسای دینە، خەڵقی ئەگۆڕرن نەهێڵن لەبەینی موسڵمانان (جریان) بکا بەربەستیان لی‌ئەکەن؛ «عزیزم: ماڵی خۆت بۆ دوژمنان بەجێ مەهێڵە.. نەذری فلانکەسی بکە، بیدە بە خودا، اقرار بکە ئەوە ماڵی فلاّن زادە، اقرار بۆ غەیری وەرەثە بە اتفاقی مذاهب قبووڵە..».

خلاّصە بە ئەنواعی تەسویلات، ئەو قورر بەسەرە هەڵ ئەخەڵەتێنن، اولا سلبی عەقڵ، دوایی سلبی ماڵی لێ‌ئەکەن، عائلەی پەرێشان یا ئەکەونە بن دەرگایان، یا ئەمرن لە برسان، ڕەحمێکیان پێ ناکەن، لەمحصولاتی ماڵی خۆیان حقە نانێکیان بدەنێ. ئەو نەوعە حیالانە تەئریخی عالەم شاهدە، تا ئەمڕۆ فەردێکیان فلسێکیان نەکردووەتە وەصیەتو نایکەن، عجبا ئەو نەوعە کەسانە نازانن؟

﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ١٨١﴾ (حقیقةً) کەسێکی ئیمانی هەبێ، کە خودای تعالی سرتەی قسە ئەبیێ و ئەگاداری ما فی الضمیرە، ئەو نەوعە تزویرە ناکا، ڕێ لە موسڵمان ناگۆڕرێ.

﴿فَمَنۡ خَافَ مِن مُّوصٖ جَنَفًا أَوۡ إِثۡمٗا﴾ کەسێکی ئەهلی (تقوی) بێ، لەگەڵ خوداو عبادی خودا ئەمین بێ، بترسێ لەو کەسە، کە (وصیەت) ئەکا، چ لەسەرەمەرگ، چ لە حاڵی صحەت و عافیەت، کە مەیل بکا لە حەق، یان گوناە وصیەت لە ئەندازە بە دەربکا، لەماڵی خۆی بچێتە دەر، بە تسویل و وەسوەسەی ئەو نەوعە ئینسانانە یا لەبەر ڕقی..بێ مەیلیی یەک لەگەڵ

مندالّی خۆی- فرضە خزمەکانی دلّیان ڕەنجاندووە، بێ مەیلی‌یان لەگەلّ کردووە.

﴿فَأَصۡلَحَ بَيۡنَهُمۡ﴾ ئەوجا ئەو موسلّمانە، بچێ بە وەعظ و نصیحەت، بەینیان چاک بکا «عَفَى اللهُ عَمَّا سَلَف» وەقتی انتقام نی‌یە، هەتا ئەگەر ئەو خزمانە کافریش بن، محرومیان مەکە.. ڕوو ئەکەیە خودا دلّت غەلّ و غەشی تێدا نەبێ، خودا ئەمری کردووە بە صلەی ڕەحم، ئەو وەرەثانە دوژمنت نین، تۆ قطعی «ما امر الله ان یوصل به» مەکە.

﴿فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِ﴾ ئەو کەسە هیچ گوناهی لەسەر نی‌یە، بۆ کەس نەهاتووە اعتراضی لێ بگرێ، چیت بە سەرەوەیە، بۆ خۆتی تێ هەلّ دەقوتێنی؟! ئەوی موسلّمان بێ، ئەهلی صلاح بێ، ئەوی خێر بێ بۆ موسلّمان، ئەبێ خەریکی بێ با مەنفەعەتی خصوصی خۆیشی تێدا نەبێ هەر ئەوەندە گوناه نەبێ کافی‌یە بۆ تعقیبی. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١٨٢﴾ خودای تعالی گوناه دائەپۆشی، صاحبی لطف و مەرحەمەتە، ئەوی موسلّمان بێ، اقتدا بەخودای خۆی ئەبێ، سەعی‌بکا لە عەیب پۆشینی موسلّمانان، لە اظهاری مەیلی فاسد، ڕەحمێ بەبێ دەستەلاّتان ئەکەن، ئەوی خودا حەقی دابیتێ، سەعی ئەکەن بۆ پێ گەیشتنی، مع الأسف موسلّمانان لەو امتحانەش دەرنەچوون. (الآن کان کما کان) داخلی کتبی شەرعی کرا، مەلای گەورە گەورە فتوایان پێدا. ئەم ئایەتە بە مناسبەی ماقبل و مابعدی، ئەبوایە وابێ (کتب علی الذین یحضرهم الموت منکم الوصیة)، بەلاّم ئەگەرچی مەسئەلە نوعاماً خصوصیەتێکی هەیە، بەلاّم بۆ مەنعی ئەو نەوعە فەسادانە، کە بەیان‌کرا ئەبێ هەیئەتی عمومی، بۆ ارشادو دلالەت مداخلەیێکیان هەبێ، ئەوجا بۆیێ ئەفەرموێ (کتب علیکم)، بەلاّم مع‌الأسف حوکمەکە ڕعایەت نەکرا، هەتا حیکمەتەکەی ڕعایەت بکرێ.

سێیەم: ئەمرێکە عائدی صبر، تحملی مشاق، زۆرانی لەگەلّ نەفس گرتن،

خۆگرتن بە خشونەتی عیش، گوێ نەدان بە برسیایەتی، کە امتحانی موسڵمانانی پێئەکا و قابلە شکستی پێ بێ تەقە.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ ﴾ ڕۆژوو لەسەر ئێوە نووسراوە﴿كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ﴾ وەکو لەسەر ئوممەتەکانی پێش ئێوە نووسراوە، یەعنی حوکمی صیام قدیمە لەشرایعی پێشوودا هەیە، تەکلیفێک نییە تازە. زانیمان ئەوان چییان کرد، بزانین ئێوەیش چیئەکەن؟ بۆیێ نووسرا لەسەرتان﴿لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ١٨٣﴾ بەڵکە خۆتان بپارێزن لە لذائذ، لە نەوسنی، چڵێسی پێتان بکرێ نەفسی خۆتان تربیە بکەن، ڕام ببی لە هەواو هەوەس، بیگێررنەوە ﴿ أَيَّامٗا مَّعۡدُودَٰتٖۚ ﴾ ڕۆژی چەند ڕۆژێکی هەڵبژاردراو، چەند ڕوژێکە، چ ئەهمیەتی هەیە بۆئێوە؟! ئەو چەند ڕۆژە بە ڕۆژوو ببن، بالخاصە ڕۆژی ئەو (ایامە معدوداتە) لەسەر بێ معذرەتانە. ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا﴾ ئەوی لە ئێوە ناساغ بێ﴿أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٖ﴾ یا لە سەفەردابێ، یا لەسەر سەفەربێ﴿فَعِدَّةٞ مِّنۡ أَيَّامٍ أُخَرَۚ﴾ چەند ڕۆژێکی تر لە ڕۆژانی صحەتو (حضر) بە ڕۆژوو ببێ ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ﴾ بنا بە فەرمایشتی مەلایەکانی پێشوو ئەڵێن: لەسەر ئەوانەی، کە تاقەتی ڕۆژوو گرتنیان هەبێ، ئەگەر بە ڕۆژی نەبن، (فدیە)یان لە سەرە، لە پەنای خۆی بە ئایەتی (فمن تطوع خیراً) نەسخکرا. مەلایانی شافعی مەذهەب بە ئەمە ڕازی نین (الاّ)یەکی ئەهاوێنە سەر، بەڵام (مجددی مصری) ئەفەرموێ: (اطاقە)ادنی دەرەجاتی مەکنەت و قودرەتە، عەرەب ناڵێن (اطاق الشيء) الاّ بۆ کەسێک، کە بە عنایەتی جهد و سەعیو تێکۆشین ئیشەکە بکا، بناءً علیە، مەعنای ئەو ئایەتە وایە «لەسەر ئەوان کەسانەی، کە ناتوانن بەڕۆژی ببن، الاّ بە مشقتی تەواو، کە نهایەتی قووەی لێ صەرف بکەن».

﴿فِدۡيَةٞ طَعَامُ مِسۡكِينٖۖ﴾ فدیەیان لەسەرە طعامی مسکین، ئەگەر ممکنیان

ببێ، ئەمەیش وەكوو پیری افتادە، ژنی شیردەر، سەپان، عەسكەر لەزەمانی حەربدا.

﴿فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا﴾ ئەوی زیاتر لەطعامی مسكینبدات ﴿فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ﴾ حەسەنەێیكە بۆ خۆی ئەكا، شرعا لەسەری نیيە. یاخود ئەوی بە طبع و مەیلی خۆی زیاد لە (ایامی معدودات) بە ڕۆژی ببێ خێرە بۆ ئەو، زۆر باشە، چاكە، نەفس زیاتر خۆی تعلیم ئەدات، لە وەقتی لێقەومان صبری زیاتر ئەبێ لەسەر برسیایەتی.

﴿وَأَن تَصُومُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ ئەگەر ئێوە بە ڕۆژی ببن ئەی ئەهلی ئیمان، لە دنیا و قیامەت خێر و نەفعی بۆ خۆتانە، ئەگەر (تبسط) بكەن لەخواردن لە هەردوو سەرا، زەرەر ئەكەن وا ئەبێ بە قەرزاری ئەمرن.

﴿إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ١٨٤﴾ شێوەی قورئان لە تكالیف دانان زۆر غەریبە، محیرە بە نەوعێكی تەسهیلی ئەكا، شەوقێكی ئەوها لە سامعین پەیدا ئەكا، كە بە كمالی ذەوق و نشاط بۆ بەجێ هێنانی ئەمرەكە، حازر و ئامادە بێ، هەتا ئەوی نەشتوانێ بڵێ ئەیكەم بەسەرچاو.. قبوڵمە هەر ئەوەندەیە تعیین طلب ئەكا لەخودا، ئەوجا جەنابی كبریائی، حوكمەكەی بۆ (معیین) ئەكا بە گوێرەی خۆی، ئەوجا بزانن ئەو (ایامە معدوداتە) عبارەتە لە مانگی ڕەمضان.

﴿شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ﴾ مانگی ڕەمەزان ئەو مانگەیە، كە قورئان دەربارەی ئەو، یا لە ئەودا نازل بووە ﴿هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْهُدَىٰ وَٱلْفُرْقَانِ﴾ ئەو قورئانەیش هیدایەتە بۆ (انام)، بیيناتی واضح و ئاشكرایە، نەفس خۆی هۆیدایە لە هدایەتدا بە نەوعێك، كە ئینسان بەتێگەیشتنی خەریك نابی لە عمل پێ كردنی. بیناتی واضحە لە جودا كردنەوەی حەق و باطل قورئانێكی ئەوها كە ئەمرتان بكاتێ بە چشتێك

ئیجاب ئەکا درحال امتثالی بکەن، یاخود مانگێک کە ئەو قورئانە عظیم‌الشانە، تێیدا نزولی کردبێ حەقی ئەوەیە احتفالی بۆ بکەن، احترامی بگرن، کلی ساڵ لە مثلی ئەو شهرە بە تزکیەی نەفس، بە قیرائەت و ترتیلی ئەو قورئانە خەریکببن، بۆیێ لە زەمانی اوەل، شەوی ڕەمەزان (خاصةً) لە تەراویح قورئانیان زۆر ئەخوێند، سورەتی گەورە گەورەیان (جهراً) لە ڕکعەت ڕکعەتی نوێژ تلاوەت ئەکرد، معظمی صەحابە قورئانیان لە نوێژدا وەرئەگرت و لەبەریان بوو.. ئەمڕۆیش، کە ئیمام (علی التوالی) مکرراً (انا أعطینا ولإیلاف) ئەخوینێ، هەر کەسێکی شەوێکی تەراویح بکا، بەڵکو ئەو منداڵانەی، کە لەگەڵ بابیان ئەچنە مزگەوت (انا أعطینا ولایلاف) یان لەبەر ئەبێ.. مەبادا توهمی ئەوەی بکرێ، پاش تعیینی ڕەمەزان ڕۆژی بوونی لەسەر معذور، غیره معذور قطعی‌یە.

﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾ ئەوی حضری بێ لە مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بی ﴿وَمَن كَانَ مَرِيضًا﴾ یا (حضر)یش بێ ﴿أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ﴾ یا ساغیش بێ ﴿فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾ بەعضێک علما ئەفەرموون: ڕۆژوو بوونی ئەو چەند ڕۆژە (ادایە) ، ئەگەر پێی بلێین (قضا) مجازە بە مناسبەی ئەوە، کە بە قەدەر ئەو ڕۆژانەیە، کە لە ڕەمەزاندا نەیگرتووە و هەم ئەو شەوق‌و ذەوقی، کە لە ئایاتی سابق بۆ موسڵمان پەیدا بوو بە نەوعێک حەرەکەی پێدان بۆ (ڕۆژی بوونی) ڕەمەزان، کە ئاگایان لە ڕوخصەتی سابق نەمینێ، ئەگەرچی پیری ئیفتادە بێ و لەسەفەردا بی، هەتا سەفەری حەرب بە قەتعی بە ڕۆژی ببێ، بۆیێ دووبارە ئەوانەی (استثناء) کردووە، (فی الحقیقة) مەقصەد بە (ریاضتی) ڕۆژی ئەوانەن، کە حضری و بە تاقەت بن، ئەوانە بن کە شەئنی مصارعە و مصادەمەیان ببێ لەگەڵ نەفس، تاکو اعتیاد بکەن بە تحملی مشاق، ئەمەیش بۆ ایامی حەرب زۆر لازمە ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ﴾ بۆیێ ئەگەر چشتێکی گرانتان

لەسەر دابنێ، لە ئەووەڵەوە وردە وردە فێری تحملی باری گرانتان ئەکا، تا لاتان ئاسان و سووک بێ.

﴿وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾ مەقصەدی ئیلاهی لە وەصفی ئەحکام، عەذاب و مشقەت و تضییق نییە ئوممەتەکانی تریش هەر وا بوون، بەڵام خۆیان باری خۆیان گران کردووە، ئێوە پەیڕەوی ئەمری خودا بکەن بە تەتتبعی ئاثاری ئوممەتان خۆتان هەڵ مەخەڵەتێنن و، هەم ئەمر بە صومی مانگی ڕەمەزان لە بەینی سائری مانگەکانی تر، مزیەتێکی تریشی هەیە.

﴿وَلِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ﴾ بۆ خاتری تەواو کردنی (عدّەی ایام) بە اتصالی مانگی ڕۆژوو بە مانگەکانی حەجی (بیت الحرام)، حەجیش بێ مشقەت نییە، یەکەم سهولەت نواندنێکی پێئەوێ، بە تایبەتێ لێرە هەروەکوو نوێژ کرا بە مقدمە بۆ فەتحی (مکە)، ڕۆژووش داندرا بۆ (تحمّلی مشاق) لەڕێی فەتحی بەیتی خودا.

سبحان اللە لەو نەظمە غەریبە، زەمان و عبادات و سەهل و گران، عەزیمەت و ڕخصەت پێکەوە ئەهۆنێتەوە، بەس ماوە نەظمی ئێوە ئەی موسڵمانینە لە موڵکی اطاعەت.. هەتا بۆ ڕەبطی دوو زەمان، ئەوەڵی ڕۆژی (شوال) بە جەژن داندراوە.. بەڵام ئەسراری نەظمی قورئان، کێ تێئەگا؟ خصوص علمای (مەذاهب، نحو، وبلاغە) لەبەر چکبردە، چک بردەی خۆیان ئاگایان لە نەظمی قورئان نەماوە، بەڵکوو لە بەعضێک جێی ئەوەی زۆر منتظمیشە، پچرر پچرری ئەکەن، بویێ تەفسیری منظومیان پێ نەکراوە.

﴿وَلِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَاكُمْ﴾ تێ بفکرن خودا زۆر اعتنا بە ئێوە ئەکا، چی مەصڵەحەت و چاک بێ بۆ ئێوە، واتان ئەمر پێ ئەکا. کە وابێ ئێوەیش خوداتان زۆر لە لا گەورە بێ، بەو اعتنایە نەکەن -معاذاللە- وەکو ئوممەتەکانی تر خوایان لا سووک ببێ و، بیکەنە ئەمربەری خۆتان.

تەماشا بکەن ئێوەی بە نەوعێک هیدایەت داوە، کە حەیواناتی چەند

(اممی)وەکو ئێوە بە خودای ئەزانن کردویەتی‌یە مەلیکی ئێوە، بناءً علیە تعظیمی خودا بکەن لەسەر ئەو هیدایەتە، کە ئالهەی قەومەکانی تری کردوەتە مەلیکو مسخری ئێوە، ئێوەیش بیان کەنە قوربانی لە ڕێی خودای خۆتان، ئەو تکبیرەیش زیادە ڕەبطیك ئەدا، لە بەینی صیام و حەج.

﴿وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿١٨٥﴾﴾ بۆ خاتری ئێوە شوکرانەی خودای خۆتان بکەن، بالمقابلە اعتنای بە اجرای اوامری اجتناب لە نەواهی بکەن، نەوەک بە زوبان، بە عەمەل.

﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي﴾ مەلایانی پێشوو ئەفەرموون: موسڵمانان سؤالیان لە پێغەمبەر کرد، ئایا خودا نێزیکە لە ئێمە، خلْوەتی لەگەڵ بکەین؟ یا دوورە، تا بانگی بکەین و هاواری بکەینە بەر؟. ئەم سؤالە لە موسڵمانان دوورە، بەڵام قبووڵمان کرد، با وابێ، ئەمما ئیرادی ئەو لەو مەقامە لەبەینی شەو و ڕۆژی ڕەمەزان، چ فائدەیێکی هەیە، چ مناسبەیێکی هەیە لەگەڵ نەظمو هۆندنەوەی قورئان؟ کە ئەڵێین قورئان بە نەظمی (معجزة) وەختێ، کە موسڵمانان ئەمریان کرایێ لە نوێژدا ڕوو لە قیبلە بکەن و، ئیستایش لە (صدد)ی ڕوو تێکردنی بیتن بە حەج، معلومیش بوو هەر عبادەتە قیبلەیەکی هەیە، قیبلەی زەکات و صەدەقەی هەژاران و مسکینەکانن، کە بەیانکرا قیبلەی قتال صەفی دوژمنە، قیبلەی دوعا ئاسمانە، بناءً علیە موسڵمانان دێتە خاطریان، ئێمە لە وەختی ڕۆژوو ڕوو لە کێبکەین؟ ئەبێ جەنابی کبریائی، چ قیبلەیەکمان بۆ دابنێ؟ جەنابی حەق ئەفەرموێ: ئەگەر عبادی من، بەتایبەتی، عبادی ڕۆژووگر، کە بە ڕۆژوون سؤال لە من بکەن، چ قیبلەییکیان بۆ دابنێم؟ لە وەختی ڕۆژوو جەوابیان بدە لە تەرەف منەوە، کە قبیلەی ڕۆژووی ئەوان منم ﴿فَإِنِّي قَرِيبٌ﴾ ئەمن نزیکم لە ئەوان، جهەت دوورە لە هەر جێیەک ببن، نیسبەتی من لەگەڵ عبادی خۆم یەکە، چ لە (سیبریا ) و چ لە ناو (بیتالله) لەنەظەری من

فەرقی نییە ﴿أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ﴾ کەسێکی بە شەوق و ذەوق عیبادەتی من بکا، ذیللەت و انکساری خۆی بۆ من بنۆێنێ بە زوبانی پاک، بە دڵێکی خاوێن عەرضی نیازمەندی بکا، بۆ دەرگاهی کبریائی ئێمە دەعوەتی قبووڵ ئەکەین، سەعی بە خۆڕرایی نابەین﴿فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِى﴾ با ئەوان دەعوەتی من بەجێ بگەێنن، قبووڵی اوامری من بکەن، بە اخلاص بۆ من بەڕۆژوو ببن، نەفسی خۆیان (تربیە) بدەن.

﴿وَلْيُؤْمِنُواْ بِى﴾ ئیمان بە ڕاستی بە من بهێنن، نە لە اعتقادیان نە لە عملیان شەریک بۆ من پەیدا نەکەن، ڕۆژووش وەکو ئیمان، خودا قیبلەیەتی، نە ئاسمان.. نەکەعبە.. نە شەرق.. نە غەرب، خولاصەی هیچ جیهەت بۆ ڕۆژوو ئیمان نابێتە قیبلە، موسڵمان لەوەقتی ڕۆژوودا ئەبێ هەرڕووی لە من بێ (أَيْنَما تَوَلّوا فَثَمَّ وَجْهُ الله)، لەبەر ئەم توجهە خاصە، کە لە بەینی عبادات دا بۆ ڕۆژوو هەیە، لە (حدیثی قدسی) ئەفەرموێ: (الصوم لي وانا الذي اجزي به)-ڕۆژوو بۆ منە، هەر من جەزای ڕۆژیی داران بە ڕۆژی ئەدەمەوە- ڕۆژووێکی،کە عەبد لە وەختی ڕووزە رداری ڕوو لە هەموو چشت وەر ئەگێڕێ، هەتا لە مەداری ژیان، کە خواردن و خواردنەوەیە، لە ڕفیقەی حەیات، کە جلیسی خڵوەتیەتی و، جووتی حەیاتی دونیا و قیامەتیەتی.

﴿لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ١٨٦﴾ بە ئومێدی ئەوە ئەو عبادە ڕێی صلاح بگرن، کە لە دونیا و قیامەت هەر خودا قیبلەیە، هەتا لە عباداتی بە قیبلەیش، بە دڵ ڕوویان هەر لە خودابێ، دڵ بە جهەت نەبەستن، والاّ تووشی (ضلال) ئەبن، مەبادا ئەو (انقطاعە) سەر بکێشێتە انقطاعی کلی، بە جارێک عبادی خودا، غەیری خودا ڕوو لە هیچی تر نەکەن، ئەفەرموێ:

﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ﴾ حاڵی بەشەر زۆر سەیرە، لەلایێ ئەیگێڕیەوە، لە لایەکی تر دەرئەچێ، نەفسی ئینسانی زوو منفعل

ئەبێ، ڕوو لە خودا ئەکەی ئەیەوێ دەست لە هەموو چشت هەڵگرێ، ئەی گێرریەوە نەختێ ڕووی لە دونیا ئەکەی، ئەیەوێ مستغرق بێ لە لذائذی دونیا، بۆیێ لەوی (هادی)بێ، ئەبێ دائماً ئاگادار بێ، وەکوو ئەو سوارانەی (جوانوو) تەعلیم ئەدەن، دار بە دەستەوە ئەگرن، لەم لاو لەولای ملی جوانووەکە ئەدەن، تا ڕاست بڕوا و لاری نەبێ، بۆیە (ئەفەندییەکانی) ئێمە ئەڵێن ئەوی شێخبی، ئەبێ دائماً دائماً ئاگاداری حاڵی مرید بێ بە قووەی (قدسیە) لە خراپەی بگێرریتەوە، بەڵێ ئەگەر ببێ، ئەبێ وابێ، بەڵام ئەو (تسلطه معنوی)یە نەدراوەتە پێغەمبەر، نازانم چۆن ئەدرێتە خەڵقی تر ؟ یەعنی ئەم (توجه الی الله)تان لە حاڵەتی ڕۆژوو وابێ، ئەمما شەو لەگەڵ انیس و جلیسی خۆتان ڕفیقەی حەیاتتان، هەمدەمی خلْوەتتان معاشرە، بکەن ئەمما لە مەیلی فیطری زیاتر نەبێ بە قەدەر دەفعی دەغدەغەی شەهوەت بێ، وەکوو ئیشارەت ئەفەرموێ: ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ﴾ ئەوەندە، کە سەتری یەکتری پێبکەن، کە بیکەنە (لباس)ی تەقوای جەنابی حەق، ئەو اخطارانەتان ئەکا، چونکە ﴿عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ﴾ خودا ئەیزانی ئێوە خیانەت لەگەڵ نەفسی خۆتان ئەکەن، لە وەقتی شەنگ و تاقەت مغرور ئەبن، باری خۆتان گران ئەکەن، دوایش نایتوانن، ئەمە خیانەتە ﴿فَتَابَ عَلَيْكُمْ﴾ بۆیێ جەنابی باری بە گوێرەی تاقەتو تحمل، بە عاقبەت بینی تخویفتان لەسەر ئەکا، بۆ ڕێگاییێکی عدل لە بەینی افراط وتفریط، ئەفەرموێ: ﴿وَعَفَا عَنكُمْ﴾ مەحوی ئاثاری میولی فاسدەتان لێئەکا، مادام بەو ئەمرە تەنبیەکرانو تەنبیهتان بوو ﴿فَالْآنَ بَاشِرُوهُنَّ﴾ ئێستا زەرەر و زیانی نییە ﴿وَابْتَغُوا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ﴾ ئەوی خودا بۆ ئێوەی قەرار داوە لە هەر دوو کتێب، بە ئەمری تکوینیی و بە ئەمری تکلیفی، ئەوەی طلب بکەن خالقی اکوان و منزلی قورئان یەکە،

ئەمری تکوینی لەگەڵ ئەمری تکلیفی موافقە، ئەگەر میولی فاسدە نەبوایە، حاجەت نەبوو جەنابی کبریائی ئەو ئەمرانەمان پێ بکا.

﴿وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ﴾ لە شەوی صیام بخۆن و بخۆنەوە، ئەویشتان بۆ حەلال کراوە، کەوابێ بە دەرئەکەوێ (صیام)، مەنع بوونە لە مباشرە و خواردن و خواردنەوە، ئەو (مباحاتە) لە هەموو اجزای شەو بۆتان هەیە ﴿حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ﴾ پاش نووستن، پێش نووستن، بەڵام لەیەک کردنەوەی خەتی ڕەشو سپی لە فجر لە بۆ هەموو کەس ئاسان نییە، بۆیێ (احتیاطاً) وا باشە کەمێکی لە شەو بمێنێ امساک بکەی ﴿ثُمَّ أَتِمُّواْ الصِّيَامَ﴾ لە فجرەوە ﴿إِلَى الَّيْلِ﴾ هەتا شەوێ، بەم گوێرە تا ڕەمەزان خەلاس ئەبێ، خواردن و خواردنەوە لە شەوی ڕەمەزان (من حيث الزمان و المكان) مباحە، ئەمما (مباشره!)وانییە ﴿وَلَا تُبَٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَٰكِفُونَ فِي الْمَسَٰجِدِ﴾ ئەگەر لە مزگەوتەکان دا (معاشرە) بشێ، زەرەر بە ڕۆژوو ناگەیێنێ، ئەمما مخالفە لەگەڵ حاڵی اعتکاف لەگەڵ حورمەتی مزگەوت، معاشرە وەکو خواردنو خواردنەوە ضروری نییە، هەردوو تەرەف ئەتوانن چەند شەوێکی خۆیان بگرن، بەتایبەتی ژن لە هەموو مانگان، (حیض) ئەبینێ (عادةً) تەرکی معاشرە لە بەعضێ ڕۆژی مانگ بوویتە طبیعی، چ تکلیفی تێدانییە، لەبەر ئەوە خۆ مەنع کردن لە زەمانی اعتکاف، چ گرانیی تێدا نییە و، مساجدیش عاممە، اعتکاف لە هەر مزگەوتێک بێ دروستە و، سوادی اعظم لە عالمان لەسەر ئەم قسەن ﴿تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ﴾ ئەو احکامی باسکراو، حدودی خودایە، وەکو حدودی زەوی و خانوو و دوکان ﴿فَلَا تَقْرَبُوهَا﴾ نزیکی مەکەون، نەک لێی تێبپەڕن، تێکی بدەن وەکوو لەحدیث ئەفەرموێ (ئەوی نزیک بێ لە حدودی پاوان، نزیکە بچێتێ) حاصڵی،

احتیـاط لازمـە ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ ١٨٧﴾ بـەو نەوعە خودای تعالی بەیان ئەکا بۆ ئێوە ئایاتی خـۆی، بـە ئـومێدی ئـەوەی خۆتان بپارێزن، ئەوەندە ئاشکرایە بە غەیری خۆپاراستن چیتر لەسەر ئێوە نییە.

ئەڵێن دوو کەس، یەکێک زۆر خۆر و قـەڵـەو، یـەکێـک کـەم خـۆر و لاواز چوونە شارێک، بە جاسوسی اتهام کران، لە (اوطە) ژوورێک حەپـس کـران، سد البابیان لێکرا، پاش دوو سێ ڕۆژ سەریـان لـێدان، دیتیـان قـەڵـەوەکـە مردبوو، لاوازەکە مابوو، تعجبیانکرد! هۆشمەندێک گـوتی: ئـەمـە عـاجبـاتی نییە ئەگەر بە عەکسەوە بوایە عەجایب بوو، ئەوەی قەڵەو فێری برسیایەتی نەبووبوو مرد، ئەوی لاواز فێربوو قەیدی نەکرد.

ئێمەیش لە زەمانی قاتی و گرانی ساڵی ١٣٣٦هـ دیتمان گەلێ کەس، کە بە لذائذ فێربوبوو لەبەر بێ ڕزقی نەمرد، لـەبـەر بـێ لـذائـذی مـرد، کـەوابـێ اقتیات بۆ دنیاو قیامـەت باشـە و، حـەکیم ئـەڵـێ: (بخـۆ بـۆ ئـەوەی بـژی، نەوەک بژی بۆ ئەوەی بخۆی).

باسی قصاص، قتـل و وەصـیەت و میـراث و صـومـی ڕەمـەزان، هـەمـوو مقدمەن بۆ قتال، کە سەبەبە بۆ نەجاتدانی کعبە لـە اصنام، لـەبـەر ئـەوە ڕوخصەتی خواردن و خواردنەوە و وقاعی دا، بە شەرتێ بـە قـەدەر مـەیلـی فطری زەرەر بە قووەت نـەگـەیێنـي، بـۆ اباحـەی خـواردن و خواردنـەوەیـش نوعاًما، حدێ دائەنێ لە ضمنی نەهـییەکی عـام ئـەفـەرمـوێ: ﴿وَلَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَكُم بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ﴾ مـاڵی خۆتـان لـە بـەینـی خۆتـان بـێهـوودە صـەرفـو هیلاک مەکەن، (خاصةً) لە افطار (بەربانگ) و پارشێو، اجتناب بکەن لە زۆر خواردن، سفرە بە تەعامی گۆناگۆن ئارایش مەدەن، لەو صەرفـە مقـصدتـان خودا نییە، والاّ ئەوی بەو تبذیر و اسرافە اهلاکی ئەکەن بۆ خودا بە تـدریج بیدەن بە فەقیر و مسکین و هەتیو و بێوەژن، بەڵکوو مقصودتان ئەمەیە:

﴿وَتُدۡلُواْ بِهَآ إِلَى ٱلۡحُكَّامِ﴾ بە واسطەی ئەو صەرفیاتە باطلە، خۆتان بخەنە ڕیزی حاکمان، گەورە گەوران، یاخود مەقصەدتان ئەوەیە بیکەن بە وەسیلەی نزیکی لە حاکمان، خۆتان ڕەپێش بکەن لایان، نەتیجەی ئەو صەرفو اهلاکە خۆهێنانە ڕیزی حاکمان، قەرزداری‌یە، (کانە) غایەتان ئەوەیە ﴿لِتَأۡكُلُواْ فَرِيقٗا مِّنۡ أَمۡوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلۡإِثۡمِ﴾ هەتا گەلێ مالی مخلوقان بخۆن.. بکەوێتە قورگتان بێ‌حەق، بێ معذرەت خۆتان گوناهکار ئەکەن، وەکوو بقاڵ و شەکر فرۆش و سائری اصنافی بازاری، یا بە ئارایشی مێزی ئەبەنۆسی و هەناردنی سینی تەعامی لذیذ بۆ حکامان، ئەیکەنە وەسلیەی خواردنی مالی خەلق، تاکو ئەگەر شکایەتیش بکەن حاکم گوێی خۆی نەداتێ، کەوابێ بە اقتصاد گوزەران بکەن بە خواردنێ، کە خۆتانی پێ ڕابگرن اکتفا بکەن، حفظی مالی‌یەک، لە (ضروریاتی خمسە)یە.. پارازتنی دین، پارازتنی عەقل، پارازتنی نەسەب، پارازتنی ناموس و شەرەف.. نە حەج نە قتال بێ‌مال ناکرێ. ﴿وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ١٨٨﴾ کە ئەو نەوعە صرفیاتە وەبالی زۆرە، عاقبەتی خراپە، بەلام ئینسان بێ‌عارە، بێ‌اعتبارە.. گەلێکمان دی لە گرانی سالی ١٣٣٦هـ بە دەخیل و ئامان، بە سؤال و پاڕانەوە، تا لقمە نانێکی چنگ ئەکەوت، بە هەزار (جرنیا و فرنیا) تا نەجاتیان بوو، ئەمڕۆ بە نان و ساوار و نیسک و داندۆک ڕازی نابێ، دەستی خۆی بە خواردن پیس ناکا، بە کەوچک و چەنگال ئەخوا، ئەلێی نە بای پێدا هاتووە و نەباران.

﴿يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡأَهِلَّةِۖ﴾ ئەو سؤالە لەو مەقامە پەیدا ئەبێ، لە ڕەبطی صیام بە (شهری هلالی) متصل بە اشهری هلالی و، سؤالە بنا بەو ڕوایەتەی، کە لە (معاذ) کراوە شەیطەنەتیکی ئیسرائیلی‌یانی تێدا هەیە، (انە) بە موسلمانانیان ئەگوت؛ تا ئێستا ئێوە (امي) بوون و قەید و کتابەتتان نەبوو، حساب و کتابتان لەسەر سەیری هلال ضروری بوو، بەلام

ئێستا ئێوە بوون بە ئەهلی کتاب و بە ئەهلی کتابەت و قرائەت، وا ئیجاب ئەکا ئێوەیش وەکوو میللەتە متمدنەکان، ڕەبطی احکام بە مانگەکانی شمسی بدەن، شمس نەبیری أعظمە، مانگ چ شەرەفێکی هەیە، کە بکریتە معالم لە سەر اوقاتی ئەو نەوعە عباداتە. ﴿قُلۡ هِيَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلۡحَجِّۗ﴾.
یەکەم: (قمر) لە اشکالاتی مختلفە گیرانی وی، بە عەلامەت لەسەر ازمنەی متغیرەی متحولە، زۆر مناسبە.

دووەم: بە سهولەت بۆ أمّی و غیرە امی حسابی پێ ئەکرێ، خاصة لادێیی و عوربان، پێیان ناکرێ حساباتی وردە وردە لەسەر سەیری شمس بگرن.

سێیەم: حسابی شمسی بۆ هەموو اقطاری أرض نابێ، اطرافی دوو قطبی جنوبی و شمالی، کە ساڵێکی شەمسی ئێمە، شەو و ڕۆژێکی ئەوانە، اوقاتی خاصە بە سەیری شمس چۆن تعیین بکەن؟ بەڵام بە (قمر ) زۆر باش ئەبێ، بە بیست و هەشت ڕۆژ دەورێک ئەدا، لە (احد النصفین) لای (احد القطبین) بە دەرئەکەوێ بە زەریفی، ئەتوانن تقویمی ساڵ تحریر بکەن، دینی عام ئەبێ شامل بێ بۆ اقطاری عالەم، لەبەر ئەو سررە وەکوو (مجدّدی مصری) ئەفەرموێ: پێش تعیینی ڕەمەزان ئەفەرموی (ایاماً معدودات) ئەوە (انە) بۆ ئەو جێیانەیە ، کە نەظمی شمس هەڵئەگیرێ بە سایەی قمر ، ئەتوانن تنظیمی ئەو ایامە بکەن، تطبیقی بکەن لەگەڵ ڕەمەزان و لازمە شامل بێ بۆ (ازمنە) ، ئەگەر تعیینی ازمنە بە شمس بکرابوایە، سائری فصول محروم ئەبوون لە بەرەکەت و فیضی ئەو عبادەتانە، بەڵام بە واسطەی قمر لە ظرفی ٣٦ ساڵ، چ ماهی صیام ، چ اوقاتی حەج لەسەر حسابی هەموو فەصل ئەگەرێ، (انە) قمر پەیکی لوطفی ئیلاهی‌یە، ئەوی حسابی لەسەر سەیری ڕۆژ بکرێ، بە ئاسانی و بە عمومی وەکوو اوقاتی نوێژ ڕەبط بە شمس ئەدرێ، اعتبار بە قمر ناکرێ،

هەر کەس لە ئەهلی شار و لادێ، ئەتوانی بە بڵندی و نویی ئاوابوونی شمس، ئەوقاتی نوێژی خۆی بزانی، هەتا لە اطرافی قطبیش تطبیقی زۆر سەهلە، ڕوو.بکە جنوب لە تەڕەفی معموره ڕاستو چەپ، پاشو پێش تعیین بکە لە وەقتێ، کە ڕۆژ بە دەرەوەیە بە اعتباری ئەو نقاطەیە، مکملی اوقاتی نوێژی تعیینئەکرێ.

وەختێ کە مەنشەئی ئەو سؤاله ئەو منافقانە بوون، کە دائماً لاڕێ ئەڕۆیشتن، وەکوو شەیطان لە پشتەوە ئەهاتن بۆ وەسوەسەدان، بۆ تعریضی ئەوان و خۆپاراستنی موسڵمانان ئەفەرموێ: ﴿وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ بِأَن تَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا﴾ لەلای قونەبان چوون بۆ خانوو خێر نییە، نیشانەی درزیی و خیانەتە، شێوەی منافقییە ﴿وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰ﴾ چاک ئەو کەسەیە، کە تەقوا بکا خۆبپارێزێ، بە کەچی نەیێتە پێش، کەچی لەگەڵ ڕاستی ڕێک ناکەوێ، کەوابێ ئەی سالکانی ڕێی هیدایەت، پەیڕەوی ئەو منافقانە مەکەن.

﴿وَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا﴾ بەڕاستی وەرنەپێش، لە دەرگای خۆیانەوە بڕۆن بۆ خانوان، لە سؤال کردن مقصدتان کەشفی حەقایق بێ، استفادە بێ، (تشکیکو تشویه) نەبێ ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾ خۆتان بپارێزن لە خودا، خۆتان تووشی غەضەبی خودا مەکەن، چەند جار بەیان کرا، مقصد خودا پەرستنە بە اخلاص، زەمان و مکان و جهەت ئەهمیەتی نییە ﴿لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ١٨٩﴾ مداری (فوز وفلاح)، نەجات و قازانج، تەقوای خودایە. وقتاً کە هیلالی صیام لە نظری موسڵمانان موقعی نمایان بوو، ئاگری شەوقی لە دڵیان هە ڵایسا، کەوتنە حەرەکە بە (سیر)ی هیلالی، وەکوو (بدری تمام) لە مطالعی مسجد الحرام سەربهێننە دەرەوە ئەو ئافاقە مظلمە بە نوری ئیمان، کە لە شەمسی سپهری ڕسالەتیان وەرگرتووە،

درەخشان بکەن (هەرچی باداباد) ظاهر و باطن ڕوویان کردە ئەو طەرەفـە، بێشک (نیلی) ئەو مقصودە بێقتال نابێ:

(عــــروس دهــــر کــــسی تنــــگ در بغلگیــــرد
کــــه بوســــه بــــر دم شمــــشیر آبــــدار زنــــد)

بەڵام بۆ ئـەو سـەفـەرە دوو چشتیان لازم بـوو. اولا: قواعدی عادلانـەی قتال، دووەم: مناسـکی حـەج ﴿وَقَـٰتِلُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ شـەڕر بکـەن لـەڕێی خودا، غەرەض لە قتال خوێن ڕژاندن نـیـە، بـەڵکو نـەجاتی بـەشـەرە لـە (خبائثی)، کە بـەشـەری لـە (بشریەت) بـردوەتـە دەر، محضاً بـۆ خـودا ئەوانەی ڕێی خودا تێک ئەدەن، فیطرەتی بەشەری مەحوو ئەکەن، ازالەیـان بکەن وەکوو لە حدیث ئەفەرمووێ: (آخـر الـدواء الکـی) شـەڕر لـەگـەڵ کـێ بکـەن؟ ﴿ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ﴾ ئـەوانـە کـە شـەڕر لـەگـەڵ ئێـوە ئـەکـەن، ڕێگاتـان لێئەگـرن ﴿وَلَا تَعْتَدُوٓاْ﴾ تـەجـاوز لـە حـەد مـەکـەن. ذاتـاً سـابقاً اخطـاری فەرموو: (ولکم فی القصاص حیاة یا اولی الألباب) لە (مقاتله و غیر مقاتله) لە مقابلەی بالمثل دەرمـەچـن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١٩٠﴾﴾ ئـەوی تـەجـاوز لـە حـەد بکـا، خـودا خۆشـی نـاوێ، ئـەگـەرچـی موسـڵمانیش بێ.. (حقیقةً) حەقی خوداوەندی عادل رب العـالمین ئـەوەیـە و، ئـەو نـەوعـە عدالەتە شایانی ئیسلامە، لە پاش ئەوەی، کە ئـەوان اعلانـی حـەرب بکـەن، قـصدی کوشـتنتان بکـەن ئێـوەیـش اعلانـی حـەرب بکـەن ﴿وَٱقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ﴾ بیانکوژن لە هەرجێیەکی تووشـیان بـوون، ئـەممـا بـە (حذاقـەت) یەعنی ئاگاتان لە خۆ بێ، بێ هوودە خۆتان مەدۆڕرێنن، ڕق و قین، جڵەوی هـۆشو ئیـدراکتان لـە دەسـت نـەباتـە دەرەوە. ﴿وَأَخْرِجُوهُم مِّنْ حَيْثُ أَخْرَجُوكُمْ﴾ دەریان بکەن لە هەر شوێنێ، یا لەو جێیـەی، کـە لـێیـان دەرکـردوون، کـە

(مكه)یه، ذاتاً مقصد ئەوەیە.. باقی وەسیلەیە. بێگومان ئەوانی اعلانی حەرب ئەکەن زۆرن، لە کوشتنیان یا لە ئەمر بە کوشتنیان لازم ناکا، کە هەموو بکوژرێن و، فەردی ئافەریدەیان لێ نەمێنێ، تا کەس بۆ اخراج نەمێنێتەوەو، لازمیش نییە ئەوی مانەوە، هەموو دەربکرێن.. قۆڵیان بگرن و فڕێیان دەن؛ بەعضێک ئەگیرێن، بەعضێک ئەکوژرێن.. بەعضێک موسڵمان ئەبن، بەعضێک لەترسان فرار ئەکەن. کەوابێ ئەمر بە کوشتن و بە اخراج زۆر موافقن. سیدی ئالوسی لە جواب دا ئەفەرموێ: (مقصود کردنێ ما تیسر من احد الأمرینێ یا ئەم یا ئەو هەر کامێکی ببێ)، بەڵام ئەوە لەگەڵ (او) مناسبتر بوو، نەک لەگەڵ (و) حاصڵی ضمیر (هم) ڕاجعە بۆ قەومی زۆر، وا ئەوی نییە ئەکوژرێ، ئەمر بە اخراجی ئەو بکرێ، ئەمما ئینسان لە حەق بێضمیران بڵێ چی؟ ئەگەرچی انصار لەجملەی ئەوانە نەبوو، کە دەرکرابوون لە (مكه)، بەڵام لەبەر کەمالی اتحاد و تاثر، ئەوانیش خۆیان بە دەرکراو ئەزانێ.

﴿وَٱلۡفِتۡنَةُ أَشَدُّ مِنَ ٱلۡقَتۡلِۚ﴾ مقصودتان لەو قتالە فیتنە ئەنگێزی نەبێ، ئاگری شەڕر هەڵایسێنن و خۆتان بکێشنەوە، چونکی فتنە خراپترە لە کوشتن، کەسێکی مەرد بێ، کوشتنی خۆی تەرجیح ئەکا لەسەر فیتنە ئەنگێزی: یاخود ئەو فیتنەی، کە ئەوان ئەیکەن، کە بە تزویر و درۆ ڕووی عەرەب لە حەق وەرئەگێڕن، دڵیان پڕرئەکەن لە (بغض) و قین، گەلێ (اشد)ترە بۆ ئێوە، یا لە (نفس الأمر)دا لە کوشتن حەق وایە، ئێوە بۆ دەفعی ئەو فەسادە عظیمە تێ بکۆشن، تا (مكه) نەیێتە بەردەستی ئێوە، لەم فیتنەیە ئەمین نابن. لەسەر ئەو حاڵەیش خوداوەندی حەکیم، نەهیان ئەکا لەپێش دەستی لەلای مسجد الحرام.

﴿وَلَا تُقَٰتِلُوهُمۡ عِندَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ حَتَّىٰ يُقَٰتِلُوكُمۡ فِيهِۖ﴾ هەتا ئەوان شەڕرتان لەگەڵ نەکەن لەکن مسجد الحرام ئێوە، شەڕریان لەگەڵ مەکەن، حاصڵی ئێوە

دافعی فەساد و مدافع بن، متعرّض مەبن.

﴿ فَإِن قَٰتَلُوكُمْ فَٱقْتُلُوهُمْ ﴾ ئەگەر ئەوان لەکن مسجدالحرام شەرریان لەگەڵ ئێوە کرد، ئێوەیش بیانکوژن، ئێوەیش وەکو پێشوو ضمناً وعدەیێکی نەصرەتی تێدا هەیە.

لە قرائەتی (حمزە و کسائی) «فان قتلوکم»ە (اعمش) بە اعتراض لە (حمزە) ئەڵێ: چۆن ئەبێ کەسێ بکوژرێ بکوژێ؟ (حمزە) لە جواب دا فەرمووی: عەرەب ئەگەر یەکێکیان لێ بکوژرێ، ئەڵێن کوژراین.. ئەگەر لە یەکێکیان درا، ئەڵێن لێدراین، خلاصەی قەومی متحد هەم فکر وهەم قووەت، کوژرانی یەکێک لە خۆیان بە کوژرانی هەموویان حساب ئەکا. بێگومان اصحابی نبوی چ (قاتلوکم ) بێ، چ (قتلوکم) بێ زۆر چاک لە فەرمایشتی خودا گەیشتوون، خەیاڵێ، کە بە دڵی ئەو مەلایانەی کتوکوێر داهاتووە بە خاطری ئەواندا عبوری نەکردووە.

﴿ كَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ ١٩١ ﴾ بەو جۆرەیە جزای کافران، ئەوان یا غەیری ئەوان لە طەرەف ئێوە، ئەبێ جزاء بالمثل بێ تعدّی لە ئێوە و لە دینی ئێوە ناوەشێتەوە ﴿ فَإِنِ ٱنتَهَوْا ﴾ لەقتال ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ١٩٢ ﴾ ئێوەیش اقتداءً بالله، چاو پۆشیان لێبکەن لە جیهەت ڕەحمەوە، دەست لە قتالیان هەڵبگرن.

﴿ وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ ﴾ ئەوەندەیان شەرر لەگەڵ بکەن، تا نەتوانن لەحەق موسڵمان فەساد بکەن ﴿ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ ﴾ دینی حەق بۆ خودابێ بە (علنی) بە ئاشکرا، بێخەوف و خشیەت اقامە بکرێ، پێیان نەکرێ ڕێتان لێبگرن، بێگومان ئەوەیش ممکن نابێ مادامە بتێ بە کەعبەوە بمێنێ و، سائری مشاعری دینی پاک نەکرێتەوە ﴿ فَإِنِ ٱنتَهَوْا فَلَا عُدْوَٰنَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ١٩٣ ﴾ ئەگەر وازیان هێنا لە قتال مەنعی اظهاری شعائری دینیان نەکرد باشە،

چونکە تەجاوز نىیە الاّ لەسەر ظالمان نەبێ. ئەگەر ئەو ظالمانە قبوولّیان نەکرد وازیان لێ نەهێنن، تا دەفعیان ئەکەن.

جمهور ئەو ئایەتە وا تەفسیر ئەکەن، ئەڵێن: (فان انتهوا) لە کفر (حتى لا تكون فتنة) کفر نەمینێ (ويكون الدين لله) دینی خالص بێ بەقای کفر (فلا عدوان الاّ على الظالمين) ئەوانەی، کە لە سەر کفر ئەمینێن، ئەڵێن مقصد ئەوەیە نابێ عەرەب لەسەر کفر بمینێ لەگەڵ ئایەتی (تقاتلونهم او يسلمون)، کە لەمەودوا دێ تەفسیریان یەکە، بەڵام تەفسیری ئێمە لەگەڵ مەقام و عیبارەت مناسبترە، هێشتا ئەو ڕۆژە نەهاتووە، ئەوە پاش ظفری قطعییە، قانونی عدالەتی حەرب (نظر) بە اشخاصو مکان و زمانە، کەوابێ ﴿ٱلشَّهۡرُ ٱلۡحَرَامُ بِٱلشَّهۡرِ ٱلۡحَرَامِ﴾ ئێوە عاداتی حسنەی قەوم مراعات بکەن، مادام ئەوان حورمەتی مکان و زەمان بگرن، ئێوە مەیشکێنن، ئەگەر ئەوان شکاندیان (بالمجبوريه) ئێوە مدافعە ئەکەن، لۆمەتان لەسەر نىیە.

ئەڵێن لە زەمانێک میصری تقدیسی پشیلەیان ئەکرد، ئێرانی کە چوونە سەر میصر، ئەوەیان زانی لە ڕۆژی شەرر، بعضە پشیلەیان لە پێشی لەشکری خۆیان ڕاگرت، میصرییەکان تیریان نەدەهاویشتنێ، مەبادا بەسەر پشیلەکاندا بڕروا و حورمەتی پشیلەکان بشکێ، ئێرانی بە کەیفی خۆیان تیرەبارانیان ئەکردن.. وردە وردە لێیان ئەچوونە پێشێ، تا بە سەریان دا غالب بوون، حورمەتی خۆیان شکاند بۆ حفظی حورمەتی پشیلە. ئێستایش ئەو نەوعە کەسە زۆرە، ناموسی خۆی ئەبا بۆ شەرەفی خەڵق.

﴿وَٱلۡحُرُمَٰتُ قِصَاصٞ﴾ هەرچی لازم الحفظە، ئێوە حفظی بکەن، سەربەخۆ حورمەتی مەشکێنن، ئەوی لە حەق ئێوە حفظی ئەوانەی محترمن ناکەن، ئێوەیش بە قانونی (تقاص و تقوص)، کە کوردی ئەڵێ یەعنی (پکیەل پیکی) معمەلە بکەن، تەجاوز مەکەن. بناءً علیە ﴿فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ﴾ ئەوی تەجاوز لەسەر ئێوە بکا ﴿فَٱعۡتَدُواْ عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ﴾ لە مقابلەی

بالمثل تەجاوز مەکەن.

الله! لەو معامەلە عادلانە، ئەی ئەهلی انصاف! تەماشای ئەو ئەحکامانە بکەن، هیچ میللەت کتابی و غیرە کتابی ئەو قانوونەیان نییە، قانونی (عیسی) وەکو صۆفیەکانی ئێمە، کە بە تبعیەتی مەسیحی وەریان گرتووە، حتی (شێخی عربی ) ئەفەرموێ: جزای خراپە خراپە، کەسێ خراپەت لەگەڵ ئەکا گوێی مەدەرێ، مقابەلە مەکە، وە الاّ تۆیش وەکو ئەو تووشی خراپە ئەبێ.. ئەو نەوعە قانوونە بە مطلقی غەڵەتە، خصوص ئێرە هەرجێی نییە، ئەویش موقعێکی تر هەیە، وە قانونی (عیسی) لای عیسوەیان بە قەدەر ذرەررەیێک ڕعایەت ناکرێ، ئەورووپایی گوایا عیسەوین، لە هەموو عالەم دوورترن لە قانونی (عیسی)، بە بەهانەییێکی هیچ و پووچ شارێک بۆمباردومان ئەکەن، ژن و منداڵ و خەستەخانە و حیوانات ناپارێزن، ئێمە خۆمان دیمان بە زەریفی، لە سیاسەتی ئوممەتی رەسولی سەلام گەیشتین!

ئای لەو بێ شەرمییە! الآنیش (طعن) لە حەضرەتی (محمد) ئەدەن، کە حەربی کردووە، قەواعدی حەربیش ئەوەیە، کە ئەیبینن و خۆی و خلفای لەسەر ئەو ڕێیە ڕۆیشتن، هەتا لە حەضرەتی (ئیمامی علی) نەقل کراوە لەگەڵ پیاوێکی پاڵەوان و نەبەرد زۆر تێکۆشی، تا لە ئەرزیدا، لەو وەختە تفێکی لە (ئیمامی علی) کرد. حەضرەتی (علی) دەستی لێهەڵگرت، کابرا لە ڕووی تعجبەوە گوتی: ئەمە بۆ؟

فەرمووی: تا ئێستا بۆ خودا شەررم لەگەڵ ئەکردی، چونکە تفت لێ کردم، قینم هەڵستا.. ئەگەر بتکوژم هەوای نەفسی تێدایە.

کابرا لە ڕووی ئینصاف موسڵمان بوو، ئەورووپایی لەسەر ئەو هەموو (ظلم و تعدا)ی بێ ئەندازە، ئێستایش بەشارەت ئەدەن بە رەسولی سەلام، رەسولی سەلام لای عالەم خۆشەویست ئەکەن، تاوەکو ئەوی بکەوێتە داویان، وەکوو خۆیان بیکەنە مایەی فەساد.

﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ لە هەموو کارتان ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ١٩٤﴾ دائما لە ژێر عنایەتی حەضرەتی کبریائین، ﴿وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ نەفس و نەفیسی خۆتان لەرێی خودا صەرف بکەن ﴿وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ﴾ خۆتان بە دەستی خۆتان مەخەنە هلاکەت، کورد ئەگەر ئیشێکی خراپ بکا لە مەقامی تاثر و ندامەت ئەڵێ: (بە دەستی خۆم چیم کرد لە خۆم) خۆتان بێهودە بە کوشتن مەدەن، ماڵ بە خۆڕایی صەرف مەکەن، لە ئۆغری میللەتو وەتەن و دین، دەستی خۆتان مەگرن، ئیمدادی پێویستان بدەن ﴿وَأَحۡسِنُوٓاْ﴾ لەهەمووکاران جهەتی چاکەی بگرن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٩٥﴾ ئەگەر حەزئەکەن خودا خۆشی بوێن، چاکە بکەن، جەنابی حەق (حبّ و بغضی) لە حەق اشخاص نی‌یە، لە حەق اعمال و اخلاقە.

دوای قانوونی قتال بەیانی (مناسکە)، موسڵمانان منتظرن ئەحکامی حەج وەربگرن (متوکلا علی الله) توّجە بکەن بۆ بیت‌الحرام ئاگایان لە شەرر و شۆڕی علمای فقە نی‌یە.

﴿وَأَتِمُّواْ ٱلۡحَجَّ وَٱلۡعُمۡرَةَ لِلَّهِ﴾ ئەگەر موفق بوون (حرباً یا سلماً) چوونە مکە حەج‌و عەمرە بەجێبهێنن بە تەواوی بۆ خودا مقصودتان (غرض‌و عوض) نەبێ، غەیری اقامەی شعائری دینی خودا ﴿فَإِنۡ أُحۡصِرۡتُمۡ﴾ ئەگەر مەنع کران لە طەرەف ئەو فیتنە ئەنگێزانە کە ئێوەیان دەرکردبوو لە دەستی ئەوان فریادی (تظلمتان) بڵند ئەکرد، بەڵام ئەهلی مروەتێک نەبوو بە فریادتان بگات، ﴿فَمَا ٱسۡتَيۡسَرَ مِنَ ٱلۡهَدۡيِ﴾ قاعدەیە «الضرورات تبیح المحظورات» هەزار ئافەرین لەو کەسە بێ، کە بە گوێرەی احوالات احکام دادەنێ ﴿وَلَا تَحۡلِقُواْ رُءُوسَكُمۡ﴾ سەری خۆتان مەتاشن ﴿حَتَّىٰ يَبۡلُغَ ٱلۡهَدۡيُ مَحِلَّهُۥ﴾ کامین (محلّ) محلی ضرورەت ئەمما، تا (میسر)بێ نزیک بخرێتەوە لە محلی حقیقی، ئەگەر

بمویرایە عەرضم ئەکردن مقصد ئەوەیە، زینەت و لەذذەت لە خۆتان حەرامبکەن، تا وەکو ئەو پێشکەشانەی تقدیم ئەکەن بۆ بەیتی خودا، ئەگاتە جێی خۆی ئەتوانی سەربەخۆ بچێ، کەس نەتوانی بیگێڕەتەوە، لازمە غیرەت بنوێنن، تا بە مقصد ئەگەن. لە کتبی (سِیَرْ) ئەڵێ:

(ابو سفیان و یارانی لە پاش شکستی شەڕی (بدر ) لذائذیان لە خۆیان حەرام کرد، نزیکی ژنی خۆیان نائەکەوتن، مووی مردارییان نەئەتاشی، تا ئینتقامیان لە ذاتی وەکوو پێغەمبەر ساندەوە) البتە موسڵمانان لە غیرەتکەشی، نابێ لە ئەوانە کەمترین.

﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا﴾ کەسێ ناساغ بێ لە ڕجالی حەرب نەبێ ﴿أَوْ بِهِۦٓ أَذًى مِّن رَّأْسِهِۦ﴾ وەکوو ڕشک و ئەسپێ و پند، یا چشتێک کە تاشینی بۆ باش بێ قەیدێ ناکا، با سەری خۆی بتاشێ، ئەمما دیسان بەخۆڕرایی نابێ ﴿فَفِدْيَةٌ﴾ فدیەیێکی لەسەرە ﴿مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ﴾ فەرقی نیيە ڕۆژوو یا اطعام یا شاتێک ﴿فَإِذَآ أَمِنتُمْ﴾ کە ترستان نەما کەس نەیتوانی مەنعتان بکا، ئەوجا بە خواهشی خۆتان شروع بکەن لە حەج، چ بە تمتع چ قران، چ بە افراد ﴿فَمَن تَمَتَّعَ بِٱلْعُمْرَةِ إِلَى ٱلْحَجِّ﴾ ئەوی لە میقات احرام بە عمره بە مجرد زیارەتی (بیت) ببەستێ، پاش طەواف وسەعی لە احرام بێتە دەر، دوایی لە (مکه) بچێتەوە ناو احرام نەگەڕێتەوە میقات دروستە، بەڵام ئەبێ قوربانییەک بکا، خوێنێک بڕێژێ ﴿فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْيِ﴾ ئەوی بۆی (مَیْسَرْ) و سهل بێ، بە گوێرەی مقدرەتی خۆی سەرێ ببڕێ، ئەو خوێنە (دمالجبر)ی پێئەڵێن ﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ﴾ (هدي) دەست نەکەوت، نەبوو، یا نەیبوو ﴿فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ فِى ٱلْحَجِّ﴾ لەایامی احرامی بە حەج، تا ڕۆژی (نحر) ﴿وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ﴾ حەوت ڕۆژیش، کە گەڕرانەوە ماڵی خۆتان و گەیشتنە جێی خۆتان، وەکوو لە

(حديث) بەدەرئەکەوێ، ئەگەرچی ئەوە تفرقەیەو بە هەمە حاڵ جەمع لە تفرقە چاکترە، بەڵام بۆ ارتباطی قلب لەگەڵ (قبلە)، ئەو تفریقە چاکترە، بویێ ئەفەرموێ ﴿تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ﴾ کەوابێ ئەوی طعن لە قورئان بدا و بڵێ، کلمەی (کاملة) زیادە، (حقیقةً) لە نقصانی خۆیەتی، کمال بە زیاد ئەزانی، بەڵێ، قوتابیش ئەزانێ سێ و حەوت ئەکا دە، ئەمما لێرە مقصود کمالە لە جهەتی قبوول نەک کمالە لە جهەت هەل ژماردن ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەوی ذکر کرا لە (تمتّع و هَدي) ئەگەر نەبوو صیامی علی التفریق[1] ﴿لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُ حَاضِرِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ بۆ ئەو کەسانەیە (حضری ) نەبن، لە اطرافەوە بۆ (مکە) بچن، ذاتاً خطابی سابق لەگەڵ ئەوانە بوو، کە لە لای (مدینە)وە ئەچوون بۆ (مکە) خارجی میقات بێ مەعنایە ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ چۆنتان احکام بۆ دائەنێ، وابکەن لاهو جیم مەڵێن﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ١٩٦﴾ بۆ ئەو کەسەی تەقوا نەکا بناءً علیە خۆتان هەڵ مەفریوێنن، گۆیا ئێمە لەسەر ئەو هەموو مشقەت و محصورییە هاتین بۆ حەج، ئەگەر نابەجێیەکیش بکەین، البتە خودا مسامحەمان لەگەڵ ئەکا ئێوە بزانن جزای خودا زۆر بە شیددەت و بە قووەتە، بە خەیاڵی خاو ناگەڕێتەوە، سابقا فەرمووی «الشهر الحرام بالشهر الحرام» تا ئێستا اوقاتی حەجی بۆ سامعین تەعین نەفەرمووە، (عجبا) ئەبێ چۆن تەعین بکرێ؟ تغیراتی دێتەسەر، نایێتەسەر؟ بۆیە ئەفەرموێ ﴿الْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَاتٌ﴾ (تغیرات)ی تەوقیتی حەج بکا بە وەقتێک، لە ئەیامی یەکێک لەو مانگانە، کە (شوال)و (ذی القعدة) وە ئەوائلی (ذی الحجة)یە، صاحب قاموس ئەفەرمەوێ: (الفرض کالضرب التوقیت ومنه) ﴿فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ الْحَجَّ﴾ یا وەکوو مفسرەکان ئەڵێن: یەکێک

---

(١) ٣ ڕۆژ لە کاتی حەجو ٧ ڕۆژ دوای گەڕانەوە، کە دەکەن ١٠ ڕۆژ.

لەسەر خۆی فرض و لازم بکا، لاکن نە وەکوو بەو نەوعەی، کە فەرمـوویانـە بە (شروع) لە حەج اتمامی لەسەر واجب ببێ، وەکوو لە پێشەوە فـەرمـووی (واتموا الحج) وبالاتفاق، اتمامی حج و عەمرە واجبە، بەڵکوو بەو نەوعە، کە ئێمە عرض ئەکەین لە ئەوەڵی، تا ئێرە جنـابی حـەق اشعاری بـە وجـوبـی حەج نەفەرموە، چونکە مەوقعـی نـی‌یـە (بـل دون ذلـک اهـوال) نـابینن. لـە هـەرە ئـەوەڵـەوە فـەرمـووی: (إن الـصفا والمـروة مـن شـعائرالله فمـن حـج البیـت..الآیـة).. (کانـە) بـە ئـارەزوو و بـە اختیـار، نـەوەک بـە ئـەمـر.. وە فەرموی: (فلا جناح علیە ان یطـوف بهمـا) بـە نفـی (جنـاح) اکتفـای کـرد، نەیفەرموو تەوافیان بکەن، بەڵام کـە شـروعیان پـێکـرد، یـا لـەسـەر خۆیـان لازمو فەرض کرد، ئەوجا خودای تعالی حوکمێکی منـاسبیان لـەسـەر ئـەکـا سبحان الله لەو اسرار و وەقـایعـە بـەڵام مناعـاتی مـەذهـەب بـزری کـردووە، نابینی لێرە بە (تفریع) ئەفەرموێ:﴿فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي ٱلۡحَجِّ﴾ دیسان ئەمری پێ ناکا، لەپێشەوەیش ئەمر ئەکا بـە اتمـامی للـە، لـە ایـامی حەج معاشرەت لەگەڵ ژن، منافرە لەگەڵ یەک، حتی بە قیل وقال منازەعەو مکابرە نی‌یە، ئەمرۆ تعزیەیە.. زەمانی یەکی‌یە، وەختی تێکوشین و تـەرکـی لذائذە، هێشتا بە قووەی بازوو، ئیـستیلای (مکـە) نـەکـراوە، نهایـەت (بعـد التی واللتیا) ئەمین بوون بۆ چوونە (مکە)، ئەوەیش قیمەتێکـی نـی‌یـە، کـە مذللەتی پێشوو لەفیکر بباتەوە، بـەڵکـو ئـەو حوکمـە بـۆ تـذکارو احتراسـی ئوممەت هەر ئـەمینـێ، لـە زەمـانی عیـزز و اسـتقلالیـەتـیش ئـەبـێ بکـرێ.. حاصڵی چی‌خراپ و ناشیرین بێ لە ڕۆژانی حەج مـەیکـەن ئـەوی چـاک بـی ئەوە بکەن.

﴿وَمَا تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ يَعۡلَمۡهُ ٱللَّهُۗ﴾ ئەوی بیکەن لە چاکە، خـودا ئـەیزانـێ، بەچاکە جەزاتان ئـەداتـەوە، نـە تـەنهـا چـاکـە بکـەن بـە زەخیـرە و تێشوو ﴿وَتَزَوَّدُواْ﴾ بە چاکە لـە چاکـە ﴿فَإِنَّ خَيۡرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقۡوَىٰ﴾ خۆپاراسـتن لـە

هەموو زادێ چاکترە نە لە ڕۆژانی ذیللەت مایوس ببن.. وە.. نەلە ڕۆژانی عیززەت مغرور، ﴿وَٱتَّقُونِ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ١٩٧﴾ خاصة خۆ لە من بپارێزن، ئەزانن من چیم لە ئێوە ئەوێ، بە ئیمانی کلۆر تێکی مەدەن، ئەمما کارو کسب خراپ نىیە، بەڵکو ئەویش لە ئەسبابی خۆپاراستنە ﴿ لَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ ﴾ چ گناە و وەباڵ لە سەر ئێوە ﴿أَن تَبۡتَغُواْ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّكُمۡۚ ﴾ کە طلبی ڕزقێ، قازانجێک بکەن لە فەضڵی خودای خۆتان، بەبێ غڵوغەش لە دائیرەی ئینصاف.

الآن مەعنایەکم بە دڵداهات، لام وایە زۆر باشە، وەختێ جەنابی پێغەمبەر و یارانی لە مکە زۆر تضییق کران، هەتا قرەیشییەکان قەتعی معاملەیان لەگەڵ کردبوون.. خواهشی موسڵمانەکان وابوو مقابلەی بالمثل بکەن، کە لەگەڵ ئەهلی مکە معاملە نەکەن، ئەوەی لزومیانە لەگەڵ خۆیان بىبەن و هیچ معاملە لەگەڵ مکەیىیان نەکەن و ممکنە معاملەکردن لەگەڵ ئەهلی مکە چشت لێ کڕین بەگوناە بزانن، بۆیێ بە خطاب لەگەڵ ئەوان ئەفەرموێ (وما تفعلوا من خیر... الخ) وە الاّ مەقامی تجارەت و معاملە نىیە، تائێستا نەگەیشتووینە زەمانێکی وەفدی (یمن) بێن لەسەر قەدەمی (توکل) بێزاد و زەخیرە، ئەوجا سؤالێ بکەن و خودا نەهیان بفەرموێ: ئێمە خەریکی قتال و تێکۆشینین، ڕێیەکمان چنگ بکەوێ بۆ چوونە (مکە). بناءً علیه نەظمی قورئان ئیجاب ئەکا، ئەو نەوعە ئایەتە صەرف بکرێ لە نەظمی نزول، محقق تەفسیری قورئان لەسەر نەظمی نزول منتظم نابێ، بۆیێ من گەلێ زەحمەت ئەکێشم، تا نەظمێکی جوان ئەبینمەوە، کە ئایاتی قورئانی پێ بهۆندرێتەوە، ﴿فَإِذَآ أَفَضۡتُم مِّنۡ عَرَفَٰتٖ ﴾ پاش شروع لە ئەعمالی حەج، کە لە عرفاتەوە بۆ مشعر الحرام ﴿فَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ عِندَ ٱلۡمَشۡعَرِ ٱلۡحَرَامِۖ ﴾ عرفات شوێنێکی ناسراوە،

احتیاج بە تعریف ناکا، بەڵام مەلایانی (نحوي) بۆ توجیە و ئیعراب وایان تێک داوە، کە نەناسریێ، مشعر الحرام (مزدلفە)یە. ﴿وَٱذۡكُرُوهُ كَمَا هَدَىٰكُمۡ﴾ چی بۆ داناون بەونەوعە ذکری خودا بکەن.

﴿وَإِن كُنتُم مِّن قَبۡلِهِۦ لَمِنَ ٱلضَّآلِّينَ ١٩٨﴾ ئەگەرچی لەپێش هیدایەتی خودا، ئێوە لە گومڕاهان بوون، گومڕاهی ئێوە لە قضای ئەخواست، زیاتر ڕوو بچن لە جهل،بەڵام عنایەتی ئیلاهی بە کارتان هات.

﴿ ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنۡ حَيۡثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ ﴾ لە پێشوو خەڵق لەکوێ بۆ کوێ چوون، ئێوەیش وا بکەن، مەڵێن لەگەڵ مشرکان تێکە ڵ نابین، بە گوێرەی اقوالی (مفسران) ئێرە زۆر ئاڵۆزە، بەعضێک (من حیث افاض الناس)یان کردووەتە (عرفات)، بەعضێک قەلبی عبارەت ئەکەن، حاصڵی سەرەدەری لێ ناکەن، ئەوی دێتە فەهم وەکوو (جبائي) ئەڵێ، افاضەیە لە (مزدلفە) بۆ (منی) ئەوەیش سەبەبی نزولە، وا چاکە ئێمەیش عەرض بکەین (ثم افیضوا من حیث أفاض الناس) ﴿وَٱسۡتَغۡفِرُواْ ٱللَّهَۚ﴾ ئەگەر هفوەیەک، چشتێکی ناجائزتان لێ صادر بوو، داوای لێ خۆش بوون بکەن لە خودا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١٩٩ فَإِذَا قَضَيۡتُم مَّنَٰسِكَكُمۡ﴾ کە عباداتی حەجتان بەجێ هێنا و ئەداتان کرد ﴿فَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ﴾ بە کەمالی فخرو مباهات ذکری بکەن، کە ئێوەی لە جهل و (وثني) هێناوەتە نوری توحید، لەو دەنائەتەی نەجات داون. ﴿كَذِكۡرِكُمۡ ءَابَآءَكُمۡ﴾ وەکوو لە زەمانی جاهلیەت خۆتان بە ئابائی خۆتان هەڵئەدا و، افتخارتان پێوە ئەکردن، ﴿أَوۡ أَشَدَّ ذِكۡرٗاۗ﴾ کە نیعمەتی حەیاتی جسمانی و ڕوحانیتان لە تەرەف ئەوە، نسبەتی عبودیەت و ڕبوبیەّت گەلێک بە هێزترە لە نسبەتی «بنووەت و ابوەت»- منالی و باوکایەتی- جەنابی حەق لەو مەقامە آن

زیادە اعتنا ئەفەرموێ بەو آدابەی، کە لە میانەی ئەعمالی حەج ذکری ئەکا، هەتا لە هیچی ئەمر بە ئەعمالی حەج نی‌یە، چونکە جەنابی ڕسالەت و یارانی، دڵتەنگ بوون شەوق و شەطارەتیان بۆ اقامەی شعائر نەبوو، یەکەم:مەنع کران.. دوەم: بە تامینێکی نالایق و محدود و محصور، ڕێدران بۆ چوونە ناو مکە بە چ شادی و دڵگوشادی، ڕوو بکەنە ئەو دیارە بە چ جلالو کبریائی، جەنابی حەق ئەمریان بکاتێ (کانە) جەنابی حەق نوعاًما اشتراکیان ئەکاو، لەو حوزنە بە معذوریان ئەزانی، بۆیێ بە وەجهێکی سارد ئەعمالی حەجیان بۆ ئەنوینێ، هێشتا (مناسک) تەواو نەبووە ئەفەرموێ: کە مناسکتان ئەدا کرد، ئەمە بکەن و، لە میانە چوار قسم بەشەر، نیسبەت بەاملی خصوصی و عمومی، بەیان ئەفەرموێ: ﴿فَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا﴾ لە دونیا ئەوی ئارەزوومانە بمان‌دەیێ، چی‌ترمان ناوێ، ئەو کەسە ﴿وَمَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنۡ خَلَٰقٖ ﴿٢٠٠﴾﴾ لە ئاخرەت هیچ نەصیبیان نی‌یە. ئەوروپایی و ئەوانی بە اخلاقی ئەوان ڕەوشتدار بوون لەو قسمەن، با وجودی لە (الاهیوّن)ەکانن، کە قەطعی مناسبەیان لەگەڵ خودا کردووە، ئەڵێن: ئیمان و دین، مانعی (ترقیّ)یە، (حقیقةً) بۆ ئەوان وابوو لەو وەختە، کە صرف ئیمانیان بە طبیعەت هێنا بوون بە (مادیوّن) زۆر لەبەرزیو ترقی دان؛ چونکە ئەو ئیمان و دینی ئەوان هەیانبوو، نە تەنها مانعی ترقی یە (ماحي) کوژێنەرەوەی فیطرەتی بشری‌یە ﴿وَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةٗ وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾﴾ چاکەی دنیا و قیامەت لە خودا ئەخوازن و، سەلامەتی‌ی لە عەذاب طلب ئەکەن، بناءً علیه تەفسیری (حسنه) بە ژن زۆر ناشیرینە، خصوصاً خودا ئەفەرموێ (لا رفث)، بەڵام هەر تەماشای نەفعی خۆیان ئەکەن، باکیان بە میللەت و وەتەن نی‌یە، حەقیان بەسەر خەڵقەوە نی‌یە

چیان بە سەردێ، پەکیان بە بەر ناکەوێ، معظمی صلحای ئوممەت ئەمڕۆ لەو فیرقەن، هەتا تەماشای صلاح و مستقبلی اولادیشیان ناکەن ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّمَّا كَسَبُواْ﴾ ئەوانە بەشێکیان هەیە لە ئەمەی ئەیکەن، طبیعی بێ سەعی و عمل، هیچ ناکرێ، ئەگەر هەر دوعا بێ «خسر الدنیا والآخرة» ئەبن، بەڵام ئەوانە نظر بە ئەحواڵی مقصرن، مسؤولن، حسابیان لەگەڵ ئەکرێ ﴿وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٠٢﴾﴾ ئەبینن ئەوانی لە حساب ماهرن، بە لێکدانەوە زۆر خەریک نابن، بە گورجی حساب ئەکەن، نەتیجەیان لێ معلوم ئەبێ و غەڵەتی ورد وردیان لێ بزر نابێ، ئەوی (بطیء) بێ لە حساب، هەتا قەڵەمێک لێک ئەداتەوە، تووشی غەڵەتی گەورە گەورە ئەبێ و، حس ناکاو بەدیهی‌یە سرعەتی حسابی باری قیاسی لە سرعەتی حسابی «حساب کەرە» ماهرەکان ناکرێ و، بالطبع هەتا محاسب سەریع‌تر بێ، زەمانی حساب کەمتر ئەبێ.

(اکثر)ی حجاج لەو دوو گرۆهە بەدەرنین، بەعضێک محضاً بۆ ناو و ناوبانگ حەج ئەکا.. بەعضێکیش هەم زیارەت هەم تجارەت، لای خودایش ملاحظە ئەکا و لای دنیایش تەماشا ئەکا!! ئێمە هێشتا لە حەج دەرنەچووین، بۆیێ ئەفەرموێ: ﴿وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ فِىٓ أَيَّامٍ مَّعْدُودَٰتٍ﴾ کە «ایام التشریفە» لاشک ئەو موسڵمانانە لە حەسرەت و ئەندۆهی خۆیان، لەبەر تەماشا کردنی (عظمت) و شکۆهی دوشمن ئەوەندە دڵتەنگ بوون، خوا خوایان بووە ئەو دووسێ ڕۆژە زوو بڕوا و بگەڕێنەوە، لەبەر دڵتەنگی ئەو ڕۆژانەیان لا«ایام معدودات» بووە، ﴿فَمَن تَعَجَّلَ فِى يَوْمَيْنِ﴾ بقیەی اعمال بە دوو ڕۆژ بەجێ بگەیێنێ، تالووکە بکا، ﴿فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ﴾ گوناهی لەسەر نی‌یە ﴿وَمَن تَأَخَّرَ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ﴾ ئەویش وایە ئەمما ﴿لِمَنِ ٱتَّقَىٰ﴾ بۆ ئەو کەسەی خۆی بپارێزێ، ئاگای لە خۆی بێ لە شەڕی ئەو دوشمنانەی بێ

عەهد و پەیمان ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ لە هەموو ئیش و کاران ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ٢٠٣﴾ و حەجیش وێنەیەکی قیامەتە، (خاصةً) بۆ ئەو کەسەی محزون و دڵتەنگ بێ و، لەگەڵ ئەهلی کفر و ضلال، شعائری حەج بەجێ بهێنێ ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعۡجِبُكَ قَوۡلُهُۥ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾ قسەو گوفتاری ئەو[1] دائر بە احوالاتی عمومی، حربی، سلمی، ارشادی، تعلیمی پەسند ئەکەی، وەقعێکی گەورەی هەیە لە دڵتا، لەبەر غایەتی استحسان ئەتخانە حیرەت. ﴿وَيُشۡهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِي قَلۡبِهِۦ﴾ خودا بە شاهد ئەگرێ لەسەر ئەوەی، کە لە دڵی دایە، خودا ئەزانێ باطن و ظاهری طیبو طاهرە، دڵ و زوبانی یەکە، خێر خواهی میللەتو دین و وەتەنە، و الحال منافق و مفتنە، غدّارە، مکّارە، سحّارە، زوبانی ئەڵێ ﴿وَهُوَ أَلَدُّ ٱلۡخِصَامِ ٢٠٤﴾ بەخیلو شەحیحێکی وایە، هیچ مەیلی حەقی نی‌یە، بەدخواهە، یاخود لە جدال و مناظرە زۆر بە قووەتە، ئەتوانێ اسکاتی معارض بکات، هەر کەسێکی مخالفی بێ، ئەتوانێ بە حجەت مغلوبی بکات، خولاصە پیاوی مرشحە بۆ ڕیاسەتو امارەت، مولکو میللەت خێری لێ‌نەبینێ

﴿ وَإِذَا تَوَلَّىٰ ﴾ کە غالب بوو، بووە صاحب ئەمر چ لە وظائفی دینی، چ لە وظائفی دونیا، ﴿سَعَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُفۡسِدَ فِيهَا﴾ ئەوەندی لە قووەتی دابێ قصور ناکا لە فسادی بلاد و عباد. ﴿وَيُهۡلِكَ ٱلۡحَرۡثَ وَٱلنَّسۡلَۚ﴾ بە ظلمو زەلالەت، یا بە ئەفسون و سحّاری، ئەمر ئەکاتە خەلق بە تەرکی دونیا، عەقڵیان لێ تێک ئەدا، بۆیێ لە ماڵو دەوڵەت ئەچنە دەر، فلاحەت و زراعەتیان نامینێ، ماڵومنداڵیان بەهیلاک ئەچێ ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡفَسَادَ ٢٠٥﴾ پێی ڕازی نی‌یە، کەوابێ حەذەر بکەن باشە، وە ئەو بەعضە بەدەرەجەیەک

---

(١) ئەمە قسمی سی‌یەمە.

عنادو متکبرن ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُ ٱتَّقِ ٱللَّهَ ﴾ ڕقی هەڵ ئەستێ، تاثری عظمەتی دێتە جۆش.

﴿أَخَذَتْهُ ٱلْعِزَّةُ بِٱلْإِثْمِ ﴾ لووت بڵندی سەرفرازی و افتخار بە گوناه ئەیگرێ، دەوری لێ ئەدا —العیاذُ باللە— (خاصةً) ئەوانەی، کە مرشدی کامڵن، حافظی دینن، کەسێک وایان پێ بڵێ: «ئەی ماڵ خراپ کافر بووی، تۆ بەو حەضرەتە ئەڵێی-اتق‌اللە-؟ ئەمە ظل اللەیە، مظهری تجلایە، وەکیلی ڕوح اللەیە، پەشیمان ببەوە. استغفار بکە!!»

﴿فَحَسْبُهُۥ جَهَنَّمُ وَلَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿٢٠٦﴾ ﴾ کافیە (جهنم) بۆ ئەوان، (جهنم)یش فەرشێک، یا پاڵپشتێکی زۆر خراپە، ئەو نەوعە پیاوە گەورانە ئەبێ ڕایەخێ، یا بالیف و پاڵپشتێکی لایقی خۆیان بۆ دابندرێ.

﴿(١) وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْرِى (٢)﴾ ئەڵێن ئەی فرۆشێ، من عەرض ئەکەم ئەکرێ ﴿نَفْسَهُ ﴾ لەکێی ئەکرێ؟ لە خودا نەفسی خۆی بە ماڵی خۆی نازانێ فەضڵ لەماڵی ﴿ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ ﴾ (کانە) بەچی ئەدا، بەطلبی ڕەمەزامەندی خودا، هەر کارێ بێ دینی و دنیەوی، خصوصی و عمومی صەرف ئەکا، چونکە ئەزانێ بە یەقینی ئیمانی هەیە ﴿وَٱللَّهُ رَءُوفٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٢٠٧﴾ ﴾ خودای تعالی لە نیهایەتی ڕەحمەتە، لە دەرحەق عیبادی خۆی، ئەویش بە متابعەی خودا بۆ منافعی عیبادی خودا تێ‌ئەکۆشێ، ئەو فیرقەیە (حقیقةً) زۆر نایاب و نادرە، خاصة ئەمڕۆ، ئەگەر نەڵێن سوء ظنی هەیە، ئەتوانم بڵێم لەسەر کوڕەی ئەرضی کەسێکی وا نییە، ئەو تەقسیماتە لە اثنای مباحثی حەج ذکر ئەفەرموێ تا وەکو حاجی پاش

---

(١) ئەمە قسمي چوارەمە.

(٢) يشري بە مەعناي كڕينو فرۆشتن هاتوە، خاوەندي تەفسير لێرەدا بە (كڕين) معناي لي داوەتەوە.. واتە هەندێ كەس نەفسي خۆيان لەخوا ئەكرن و ×ەرفي دەكەنەوە بۆ ڕەزامەندي خوا.

ئەدای فریضەی حەج نەگۆڕرێ، حەجەکەی بۆ خودا بێ، حاصڵی وەکو (شێخ ڕەزا) ئەفەرموێ وانەبیێ:

حاجی کە ز مروه و صفا بر گشته
گر مار بود او چو اژدها بر گشته
تنها نه ز خانەی خدا بر گشته
آن خانه خراب از خدا بر گشته

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱدْخُلُواْ فِى ٱلسِّلْمِ كَآفَّةً ﴾ بڕۆنە ناو دائرەی انقیاد واطاعە، مخالفە و عداوەت لەگەڵ یەکتر مەکەن ﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾ دوای شوێنی شەیتان مەکەون، شوێنی شەیتانی تمرّد و عصیان و عداوەت و تفرقەیە.

﴿إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٠٨﴾﴾ ئەو بۆ ئێوە دوشمنێکە عداوەتی ظاهرە، حاصڵی ئەمر ئەکاتە موسڵمانان، هەموو ببن بە یەک بۆ منافعی عمومی سەعی بکەن، وەکوو فرقەی چوارەم طالب ڕەزای خودایبن.

﴿ فَإِن زَلَلْتُم ﴾ ئەگەر سقوط بکەن، مەیلبکەن لەوشەڕەفە ﴿مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْكُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ﴾ ئەو ئایاتی ئاشکرا دائر بە فاسقەکانی، خارج لە دائرەی اطاعە ﴿فَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٠٩﴾﴾ ناگۆڕێ لە گەورەیی و غالبی ناشۆرێ، دەست لە حیکمەتی خۆی هەڵناگرێ، مقتضای حیکمەتی ئەو (انتظامه)، دانانی هەرچشتە لە موقعی مناسبی خۆی بۆ حاڵی ئێوە بە غەیری ئایاتی نظریە، انقیادی عاقڵانەو حەکیمانە هیچیتر دەست نادا، عجبا پاشی ئایاتی بیّنات لە متابعە لا ئەدەن و، احکامی حەکیمانە بە جێ ناهێنن چی یان ئەوێ؟ ئایا وەکو جوولەکان ئەبن؟ ئیمانی جهریان ئەوێ؟ ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأْتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِى ظُلَلٍ مِّنَ ٱلْغَمَامِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ﴾ ئایا انتظاری ئەوە

ئەکەن، کە خودای تعالی حەضرەتی کبریائی، لە ژێر سەراپەردە و (سرادق) و سایەبان هەورێ بێتە لایان، مەلائکەتی لە خزمەتدابن، ئەوجا ئەوانە تەماشای خودا بکەن، عجبا ئەوەیان ئەوێ؟ زەهی خەیاڵی باطل، ئەو خەیاڵە لە ئێوە ناوشێتەوە؟ دەوری ئەو جەهلە نەما، تێپەڕی.

﴿وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُۚ﴾ ئەو شەئنە بڕایەوە، قووەی اوهام و خەیاڵی بە قووەی فکر ضعیف بوو، نەما، ئەوی حەزئەکا خودا ببینێ، بە چاوی هۆش و ئیدراک، تەماشای ئایاتی بیناتی خەلق و ئیجادی بکا، گوێ لە ئایاتی قورئان ڕابگرێ، ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ٢١٠﴾ ئەوی عاقڵ بێ تێئەگا هەموو ئیش و کار لە ئەوەوەیە، مرجعی هەموو امور ئەوە، ئەوجا هەر حوکمێکی خودا بیفەرموێ بە قووەی ئیمان قبووڵی ئەکەن، (کانە) ئەوانی تووشی ئەو زەللە بوون و سقوطیان کرد، لە شەرەفی بەشەری ئاگایان لە ئایاتی سابقە نەمابوو، بۆیێ (خطاب ) لەگەڵ ڕەسوول ئەفەرموێ: ﴿سَلۡ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ كَمۡ ءَاتَيۡنَٰهُم مِّنۡ ءَايَةِۭ بَيِّنَةٖۗ﴾ تۆ سؤال بکە لە بنی اسرائیلی یان، چەند ئایەتی ئاشکرامان دانێ، خوارق و معجزاتی ئەو ئایەتانە بۆ بنی اسرائیلی یان فائدەی چەبوو؟ جەهالەت و قەساوەتی دڵ بوو.. نیهایەت عەرضی حەضرەتی (موسی)یان کرد «لن نؤمن لک حتّی نری الله جهرة».

﴿وَمَن يُبَدِّلۡ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ﴾ ئەوی نیعمەتی خودا بگۆڕێ، حکیمەت بە جەهل، ڕەشاد بە ضلال، ئایاتی مستمرە بە شواذ ﴿مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُ﴾ لە پاش ئەوەی نیعمەتەکەی بۆ هاتووە، نیعمەت بۆ ئەو هاتووە، ئەو بۆی ماندوو نەبووە. (حقیقةً) ئایاتی حکیمەت و ڕەشاد، دائماً پێشچاوە، تۆزێ بە خەبەری ئەوێ.

﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ٢١١﴾ لە دەرحەق ئەوانە: ئەی موسڵمانینە! نەکەن ببنە هەم حەشری بنی اسرائیلی یان! حریص ببن لەسەر دونیا، ئاخری

سەوقتان بکا بۆ عداوەتی خودا و ملائکەت.

﴿ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا (١)﴾ ئـەممـا تـزیینـاتێکـی مزخرفـە، وەک (پاقری) ڕووکەشە وایان بۆ مزین کراوە، کە اصلا ڕوو لە ئـاخـرەت نـاکـەن، ئەوی زۆر زۆر بۆ دونیا و کۆکردنەوەی ثروەت و سامان هەوڵ نـەدا، بـە بـێ عەقڵ و شێتی ئـەزانـن ﴿وَيَسْخَرُونَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ گـەمـەیـان پـێ‌ئـەکـەن(٢) سەیری ئەمانە چەند گێژن! تەرکی لذائذی دونیا ئەکەن! بە خشونـەتـی ژیـن ڕازی ئەبن، هەتا حەیاتی خۆیان صەرف ئەکەن!! بەڵام ئێوە متـاثـر مـەبـن، مەڵێن «ربنا آتنا فی الدنیا» و بەس..

﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ فَوْقَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ ئەوانی خۆ ئەپـارێـزن لـە مـزخرفـاتی دونیا، لە هەوراز ئەوانن ڕۆژی قیامەت، لە ئایەت ئیشارە ئـەکـا، کـە خـودای تعالی داوا ناکا لە موسڵمانان بـەجـارێ دەسـت لـە دونـیـا هـەڵگـرن، مقـصد ئەوەیە پابەندی نەبن، لە محبەتی دا نەسووتێن، با بـۆ خۆیـان بـە گـوێـرەی مصالح سەعی بکەن، دەوڵەمەند ببن، بەڕێ و جێ صەرفی بکەن، خوڵاصە موسڵمان (مکلفه) بە مصالحی دین و دونیا.

﴿وَٱللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٢١٢﴾﴾ غەڵەتە دەڵێن ئەوی دونیای هەبێ، نابێ قیامەتی هەبێ، ئەوی قیامەتی هەبێ، نابێ دونیای هەبێ! کەسێ بە زەریفی سەعی بکا، سعادەتی دونیا و قیامەتی بۆ ئەبێ، خودای تعالی ڕزقی ئەدا بێ حدّ و حساب، یا بە نەوعێ نەیێتە خاطر و خەیاڵ ، چەندی لەمەو دوا دەرئەکەوێ، کەجەنابی حەق چ عنایەتێک ئەکا بۆ حفظی ماڵ.

حەضرەتی رب العالمین بۆ استسلام و اطاعەی موسڵمانان و، حەذەریان لە اختلاط دین‌و دنیەوی مجملاً، بەیانی فیطرەتی بەشەری وسەبەبی ناردنی پێغەمبەران ئەفەرموێ، تا بەهیچ ڕروو وەجهێک نەمێنی بۆبەهانەی اختلاف.

---

(١) ئەوانەی کافر بوون ژیانی دنیا آرایش دراوە بۆیان، یاخود بەجوانی دەبینن.

(٢) واتە کافرەکان گاڵتە بە ایماندارەکان دەکەن.

﴿ كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً ﴾ لە ئەوەڵەوە بەشەر کەم بوون، معیشەتیان بسیط بوو، (علی الاکثر) بێ لباس و خانوو بوون، لە مغارە و ئەشکەوت و کۆخ و زنجاندا دائەنیشتن، ڕەگی گیاو بەری دارانیان ئەخوارد، کەم کەمە حەیوانیان نێچیر ئەکرد، لە دەوری (حجری و حدیدی)، کە ئێستا ئەثەریان بە دەرئەکەوێ.. دوایی وردە وردە بۆ (مدنیەت) هەڵچوون، لباسیان دروست کرد، خانوویان بنا کرد، خواردنی بە لەزەتیان چێشت، ئەوسا ئەسبابی اختلاف زۆر بوو.. عداوەتیان کەوتە بەین: بۆ هیدایەت و ئیرشاد و انتظام معیشەت لە فضل[1] و کەرەم، بەڵکوو (معتزلی) ئەڵێن «بالوجوب» هادی حقیقی بلا تاخیر ﴿فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴾ پێغەمبەرانی هەنارد ﴿مُبَشِّرِينَ ﴾ بۆ ئەهلی ئیمان ﴿وَمُنذِرِينَ ﴾ بو ئەوانی خودایان نە ئەناسی ﴿وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ ﴾ کتێبی لەگەڵ هەناردن بۆ بەیانی ئەحکامی عباداتو معاملات و سیاسەت، هەریەک لەو کتێبانە بۆ هیدایەتی ئەهلی ئەو عصرە کافی بوو. ﴿لِيَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ﴾ تا کتێبەکە فەصلی قەضا بکا، اظهاری حەق بکا ﴿فِيمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ ﴾ هەرچی هەبێ دینی، دنیەوی جیهەتی نزاعیان بەتاڵ بکا، لەپاش تقرّری نبووەت گەلێک لە عبادی خودا هیدایەتیان بە دەست کەوت لە منازعاتی فیطری نەجاتیان بوو، بەڵام مصیبەتی گەورە، بەلاییێک کە چارەی لە غایەتی گرانیدا بێ، اختلافی مەلایەکان[2] بوو، ئەو گرۆهەی ئیمانیان بە پێغەمبەرەکان هێنا، مەلایان لێ هەڵ کەوت، نبووەتیان کردە قەومییەت، اختلافی ئەوان گەیشتە دەرەجەیەک، کە اختلافی ئوممەتەکانی پێش نبووەت، بە نظری ئەو هیچ نەبوو ﴿وَمَا ٱخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ أُوتُوهُ ﴾

---

(١) خاوەندی تەفسیر دەفەرموێ: خوا لە فضلو کەرەمەوە بێ تاخیر پێغەمبەرانی هەنارد دوای پەیدابونی هوی خلاف. معتزلی دەلێن: ئەم هەناردنەی پێغەمبەران واجب بوو لەسەر خوا.
(٢) زانیاری لە ئایین ، هەر ئایینێک بێ نەک ئیسلام بە تەنها.

اختلافیان نەبوو لە حەق، الاّ ئەو کەسانەی کتبیـان درایـێ، بـوون بـە مـەلا، اختلافەکەیشیان زۆر نابـەجـێ بـوو، چوونکـە: ﴿مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ﴾ بوو، ئەبوایە ئەوان سەعی بکەن بۆ زیادە اتفاق و صلاح و ڕێکـی، لازم بـوو «الاهیون» بە سایەی ارشاد و نەصیحەتی ئەوان، هـەمـوو ببنـە یـەک کتلـە مقابلی ئەوانەی، انکاری الوهییەت و نبووەت ئەکەن، بەڵام اختلاف و عناد و شقاقیان زیاتر بوو، بوونە سەبەبی اُم الفساد و ابـو الفـساد، کـانی فیتنـە، مصدری دوژمنی و عداوەت، دڵ منافق، بە زوبان زانا، ئـەو اختلافـەیـشیان ﴿بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۖ﴾ محضاً لەبەر حەسەد و عناد، تەجاوز لە حـەق یـەک، هـەمـوو دین و ئاینێ، کە سەری گرتبێ، زۆر نەچووە لە تەرەف ڕۆسایەکـانی دین، بە فساد چووە، خۆبە خۆیی دوژمنایەتیان کـردووە، ئـوممـەتیـشیان لـەگـەڵ یەک کردوون بە دوژمن،ئەو نەوعە مەلا و ڕۆسـای دینـیـیە بـۆ ئـوممـەت بـە مەقامی دڵن، کە دڵ بە فساد چوو، هەموو اعـضا بـە فـساد ئـەچـێ و، تـا ئەمڕۆ حسد و بغض و عداوەت، لەبەینی ڕۆسـای دین لـە شـددەت و زیـادی دایە و، ئوممەتیش تا دێ پارچە پارچە ئەبن، لەگەڵ یەک ئەبن بـە دوژمنـی دنیا و دین، ئەوجا پاش ئەو اختلافە عظیمە، ئەهلی خلاف احتیاجیـان بـوو بە پێغەمبەرێکی عظیم الشان، سـاطـع البرهـان، صـاحـب شمـشێر، عـالم بـە اسراری کائنات، خۆش بیان، فصیح زوبان، سینە پاک، دڵخاوێن، دەماغ پڕ لە عـەقـڵو ئیـدراک، صـاحب صـبر و ثبـات و متانـەت، ڕەونـەق دەهـەنـدەی نبـووەت و ڕسـالەت، (مـاحی) شـەریعـەتـی خـوارق العـادة ... خـودا ئـەو پێغەمبەرەی نارد ﴿فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بە سەعی و ارشاد و تبلیغی ئـەو پێغەمبەرە ..

﴿لِمَا ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ مِنَ ٱلۡحَقِّ بِإِذۡنِهِۦۗ﴾ مـەنـشەئـی اخـتلاف و شـقاقی بـۆ بـە دەرخستن، بە زەریفی، بـە تـسهیل و تیـسیری خـودا، پـاش ئـەو هیدایـەتـە تێگەیشتن، مەنشەئی خـلاف تـەمییـز و تـەفـریقـی حـەقو بـاطلـە، علـم بـە

فائدەی ئایاتی (شاذ و معتادە)، ئەتانەوێ وەکو جوولەکە و دیان بکەونە عناد و دوای شواذ بکەون، ئەوە چشتێکی دوورە لە ئێوە، زۆر بێ مەعنایە ﴿وَٱللَّهُ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٢١٣﴾﴾ خودا ئەوی حەزبکا هیدایەتی ئەدا بۆ ڕێی ڕاست. عینایەت و هیدایەتی ئیلاهی خاص نییە بۆ قەومێک، بەڵکوو بۆ هەموو اقوام و میلەل، بەشەر عامةً، ذاتەن ئێوە لە صدری کتاب، طلبی ڕێی ڕاستتان کرد لە خودا، ڕێی ڕاست ئەوەیە، کە پێتان نیشان دراو ئەدرێ ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ ﴾ ئایا واتێ ئەگەن ئێوە ئەچنە بەهەشت، بە مجرّد ئەوەندەی بڵێن: ئێمە موسڵمانین ئیمانمان بەخودا و پێغەمبەر هێناوە، وەکو جوو و دیان، بێ سەعی و عمل، بێ تێکۆشین ئەمە دوورە، نابێ، خەیاڵی خاوە ﴿وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُم﴾ ئەوی بەسەر ئوممەتەکانی پێش ئێوەدا هاتووە، هێشتا بە سەر ئێوەدا نەهاتووە.. ئەبێ ئەوەی بەسەر ئەواندا هاتووە، بە سەر ئێوەیش دا بێ، ئەوجا بچن بۆ بەهەشت ﴿مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُوا۟﴾ باس و شیددەت و ناخۆشی وایان بە سەر هاتووە و لەرزیون، کە گەیشتوونە دەرەجەیێک نزیک لە یەئس ﴿حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ﴾ پێغەمبەری ئەوان و ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ﴾ ئەوانی، کە طولی صحبەتیان لە خرمەتدا بووە و، طولی صحبەتیش گەلێک مؤثرە، ئیمانی پێ مەحکەم ئەبێ، لەبەر شیددەت و سام و دەهشەتێ، کە بە سەریاندا هاتووە، ئەیان گوت: ﴿مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ﴾ کەی نەصرەتی خودامان بۆ دێ؟ لەو شیددەتەدا خودا بە فریادمان نەگا، کەی بە فریادمان ئەگا؟ کەسێک بۆ خۆی ئەو نەوعە شدائدەی بە سەردا نەهاتبێ.. تاوی ڕوحی نەچێشتبێ، وەکو مەلایەکانی سەر کاغەز، قوتەکە دەست ئەکا بە تاویلات: ئەمە چۆن ئەبێ؟ حەز ئەکەی بزانی! خۆت باوێ ناو ئەو نەوعە اهوال و شدائدە، ئەوجا تێئەگەی. مەسەلی کوردییە «تاوی یەکانە و قسەی

بەرنـاگردانـێ لێـکدوورن»،﴿أَلَآ إِنَّ نَصۡرَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ ﴿٢١٤﴾﴾ نـەصـرەتـی خـودای تبارک و تعالی نزیکە، ئەمە با وابێ، ئەمما لازمە ئینسان تەماشای قواعیدی ئیلاهی بکا.. ئەوی بووە چۆن بوو؟ بە سووکـی عیبـارەت ئیشی لاسـووک نەبێ، کەسێک مەردی مەیدان بێ، ئەهلی تەجارب بێ، ئەزانـێ هـەر نـەوعـە ئیشە، بە گوێرەی گەورەیی و گچکەیی بۆ بـوونی چ لازمـە، وەعـدی ئیلاهـی ناکاتە سەبەب عطالـەت و کسالەت، ئـەیکاتـە مایـەی قـووەتـی ئیمـان.. بـە کمالی احضارات ئـەچێتـە مـەیدان،ئـەگـەر عقبـەیێکـی هاتـە پـێش، تووشـی شیددەت و گێژاو بوو، مەئیوس نابێ، بەڵکو دەها زیـاتر بـە وەعـدی خـودا قووەتی سعی و تێکوشینی زیاد ئـەبـێ، تـاکو بـە حـەوڵ و قـووەتـی خـودا نائلی مطلب ئەبێ، خولاصە شرائطی انجازی وەعدی خودا، بۆتان بەیانکـرا، امتحانی خوداتان بیست، ئەحواڵی موسڵمانی صادقتـان لـە آیـة الـصدق بـۆ معلوم بوو، ئیتر (جنگلە و فنگلە) و ئەو بەر و ئەم بەر، لزومی نیـیە، وقتـاً کە موسڵمانان گوێدێران لە حاڵی خۆیان گەیشتن.. دەوڵەمەنـدان بـەمـاڵ.. مەردانی مەیدانی بەسەر هاتنە پێشەوە «ئەوە ماڵ ئەوە سەر».

﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَۖ ﴾ ئەمر بکە چ صەرف بکەین[1]، ئەفەرمووی لە هەموو ماڵ بچینە دەر، بەدەستی خۆمـان، خۆمـان نـاخـەینـە هیلاکـەت، بـە حبی حەیات پابەند نین.

﴿قُلۡ مَآ أَنفَقۡتُم مِّنۡ خَيۡرٖ ﴾ [2] نظر بە ئایەتی «وصیەت» ئەبێ ئەوەندە ببێ، پـێی بڵـێن خێـر، طبیعـی ئـەوی کـەم بـێ، جـێی سـؤالو جوابـان نـیـیە، ئەگـەرچـی وا ئەبێ خێری کـەم، جێی خـێری زۆر ئەگـرێ، ئـەوی صەرفی بکەن.

(١) مسڵمانان دەپرسن لە پێغمبر چ ×ەرف بکەین؟ اگر دەفەرموێ تا لە هەمو ماڵی خومان دەر بچین!

(٢) ئەمە جوابی پرسیارەکەیە: تەو×یح دەدا کەوا مال یاخود (خیر) ×ەرف بکەن بو باوکو دایکو خزمو هەتیوو مسکینو ابنالسبیل، بێ گومان ئەمە بۆ حالی سلمە لیرە قسە لە آمادە بون نیـیە بۆ جەنگ.

﴿فَلِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ مـاڵ لـە نظـر دینـی ئیسلام خۆشەویستە، حورمەتی زۆرە، حفظی لـە ضـروریاتی دینـە، ئـەگـەر صەرف بکرێ، ئەبێ لە چشتێک صەرف بکرێ، لە ماڵ چاکتر و بە نەفـعتـر بێ بۆ خۆتان و بۆ ئوممەت، مهمترین مقاصد لـە شـەریعـەتـی ئیسلامیـیـە، پێنجە وەکو علمای اصول تـەفـصیلیان فـەرمـووە: (حفظـی دیـن، حفظـی نەفس، حفظی عەقڵ، حفظی ماڵ، حفظی نەسلی پاک).

﴿وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢١٥﴾﴾ ئەوی بیکەن لە خێر بیدەن بە خێر! خودا ئەیزانێ ڕوحی خێرات اخلاصە.. ئەوی بیکەن لەچاکە لـە خـودا بزر نابێ.. (ما فی الضمیر)یشتان لای ئەو، عەیانە و جزایش هەر لە تەرەف ئەو تقدیر ئەکرێ.

﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ﴾ حاجەت نیـیە بـە سـؤال، خۆتـان طلب بـوون، بۆجەنگ و مجبوریەتیش هەیە: بەڵام هەڵ مەخەڵەتێن بـە لاف وگـەزاف، لـە شێنەیی دا مەردی مەیدان زۆرن هەر کەس ئەڵێ:

آتـش بجـان افـروختن		از بــــهر جانـــان سوختن
بایـــد زمـــن آمـوختن		کار من اسـت ایـن کارها

بەڵام کەم لە امتحـان دەرئـەچـن، ﴿وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ﴾ زەحمـەتـە، مـشقتە بـۆ ئێوە، ئەبێ کلفەتی حەرب بهێننە پێش نظر، وا فەرض بکەن، ئـەوا تووشـی گەرداوێ بوون، ئەو تصویر و تصوراتە بۆتـان تمثـل بکـا، ئـەوجا تـەماشـا بکەن خۆ ئەگرن، یان نا و، ئەبێ لێک بدەنەوە تحملی ئـەو مـشقتە عظیمـە، ئەو بارە گرانە بۆ چی یە، ئەبێ بۆ چشتێک بێ، کە ئـەو بـارەگرانـەتـان لـە سەرشان سووک بکا، ئەو ناخۆشیو تاڵەتان بـۆ خـۆش و شـیرین بکـا، ئـەو غایەتە بکەن بە (مثلی اعلی)، بۆ پێگەیشتنی بە شەوق و زەوق، تێکۆشن.

﴿وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ نابینن انسانێکی نەخۆش، حسب

الذوق دەرمانی تاڵی زۆر پێ ناخۆشە، ئەمما ئیمان بە منفعتی، کە لە دەرد ڕزگار بوونە، اعادەی صحەت و عافیەت و حفظی حەیاتە، ڕەغبەتی لەسەر نەفرەت زیاد ئەکا، مەیلێکی زۆر بە قووەتی بۆ خواردنەوە پەیدا ئەبێ، ئەوجا (لاجرمە)، حتی ئەوەی انتحار ئەکا، مەیلێکی وا شدیدی بۆ پەیدا ئەبێ، کە تەرجیحی مردن بە سەر حەیات ئەدا، قدام ئەکاتە سەر خۆکوشتن ﴿وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ﴾ کەلێ جاروا ئەبێ انسان نەفسی خۆی بەرە ڵلا ئەکا، زۆر ئەخوا.. پێی ئەگیرێ، نەخۆش ئەبێ، یا بەسەد مشقەت نەجاتی ئەبێ، یا ئەمرێ، حاصلی گەلێک چشت هەیە، لای خێریشی هەیە و لای شەرریشی هەیە، تەفریقی زەحمەتە تقویەی لای خێربەسەر لای شەرر، نظرو دقەتێکی زۆری ئەوێ، زۆر غامضە﴿وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢١٦﴾﴾ لازمە جەنابی حەق لە ڕووی مەرحەمەتەوە، بۆتان بەیان بفەرموێ، غەلو غەش لای خودا نی‌یە، حەقو حەقیقەتتان بە ڕاستی بۆ بە دەر ئەخا، پێغەمبەریش لە طبیعەتی شاعرانە دوورە، تا خراپ بە چاک، چاک بە خراپتان لێ بگۆڕێ، ئەو حەقیقەتە لە بەحثی (طالوت) توضیح ئەکا، سابقاً فەرمووی: «الشهر الحرام بالشهر الحرام» ممکنە حسب المقام حمل بکرێتە سەر اشهری حەج و بەس، مانگێکی تریش هەبوو، ئەویش لە (اشهر الحرام) بوو وەکو مانگی (رجب) و ئەهاتە خاطریش کە ڕمضان لە جێگای ئەو دابندرێ، لازم بوو استفسار لە ئەویش بکرێ بۆیێ تکرار ئەفەرموێ..

﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ﴾ ضمناً اشارە ئەکا، اشهری حرم لە جێی خۆیەتی، بناءً علیه حقیقة سؤال لەئەوە نی‌یە، سؤال لە شەرر کردنە لە (اشهری حرام)، ﴿قُلْ﴾ بلێ لە جوابیاندا ﴿قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ﴾ شەرر لە شهری حرام، کە (رجب)یش یەکێکە لە ئەوان گەورەیە ﴿وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ مەنعکردنە لە ڕێی خودا، امن وامان و ئەمەلی چاکە لای خوا خۆشە، بە هەر تەرزێ بێ ئەو جاهلانە لەسەر حاڵی خۆیان، چوار مانگ تەرکی قتالو

جدالو سلب و نهب بکەن، خوا تێکی ئەدا؟ نعوذ بالله لەم خەیاڵە ﴿وَكُفۡرُۢ بِهِۦ﴾ ئەم تجویزە کافری بە خودا.. جەنابی حەق پێغەمبەرانی، کە ناردووە، بۆ انتظامی ناردوون، ڕێی چاك و چاکی نیشان بدەن.

لە ئایەتی (کان الناس امة واحدة) بۆتان بەیانکرا ﴿وَٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ﴾(١) کەعبەش مەنعە، یان کفرە(٢) بەو مزگەوتە بە حورمەتە، سابقاً بەیانی فەرموو (واذ جعلنا البيت مثابة للناس وامناً) خودا ئەو امنیەتە چۆن تێك ئەدا؟ حورمەتی ئەو مزگەوتە گەورە، چۆن ئەبا بە جارێك بێ ئەهمیەت ببێ لای عەرەب، هەر کەسێکی هەوەسێکی بوو هەڵ بکوتێتە سەری، وەکو موسڵمانانی پاش زەمانی ڕەسول و ابوبکر وعمر، حورمەتیان نەهێشت، هەتا دایانە بەر مەنجەنیق، ئەمە هەمووی وایە، ئەمما ﴿وَإِخۡرَاجُ أَهۡلِهِۦ مِنۡهُ أَكۡبَرُ عِندَ ٱللَّهِۚ﴾ دەرکردنی ئەهلی ئەو مزگەوتە لەو مزگەوتە، لای خودا گەورەترە، فضل لەوە بەوندەیش ڕازی نین، مەنعی عیبادی خودا ئەکەن، بەفیتنە بازی دڵی خەلق پرر ئەکەن لە بغضی ئیسلام، ناهێڵن دینی حەق بڵاو ببێتەوە ﴿وَٱلۡفِتۡنَةُ أَكۡبَرُ مِنَ ٱلۡقَتۡلِۗ﴾ فەساد گەورەتر و خراپترە لە کوشتن، هەر کەسێکی صاحب ویجدان بێ، اعتراف بە ئەوە ئەکا، ڕێی توجیە و تاویل نیيە، بۆیێ لێرە یەعنی لەم جملە نافەرموێ (عندالله).

مختاری من لە عیلمی اصول ئەوەیە، قەیدێك او جملەیێکی فائدەیێکی خاصی هەبێ، جملەیێکی تر با زۆریش مناسب بێ، بەو قەیدە بەند ناکرێ، مطلق لەسەر اطلاقی ئەمینێ، مقدّم بێ، یا مؤخر ﴿وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ﴾ ئەوان فەرقی بلد الحرام و شهر الحرام ناکەن، لە کۆڵتان ناگەڕێن و دائماً شەڕتان

---

(١) واوی عطف لە جملەی (والمسجد الحرام) اگر بگەڕێتەوە بۆ (صد عن سبيل الله) ئەوا (المسجدالحرام) مجرور دەبي بە (عن) و صدّیش مەعنای مەنعە.

(٢) اما اگر واوەکە عطف بی لەسەر جملەی (وکفر به)، ئەو دەمە (المسجد) بە حرفی (ب) مجرور دەبی و عبارتەکە دەبێتە (وکفر به وبالمسجد الحرام).

لەگەڵ ئەکەن ﴿حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ﴾ هەتا ئێوە وەرئەگێررن لەدینی خۆتان، ئەو دینە پاک و خاوێنە، کە لایق بوو ڕوحی لە ڕێ بەخت بکەن ﴿إِنِ ٱسْتَطَٰعُوا۟﴾ ئەگەر بتوانن، نافەرموێ (اذا) ئیشارە بۆ ئەوە ئەم استطاعەو تمکنەی ئەوان لە (ئەگەر)دایە، ئەمما (بحول الله وقوتە) نایێتەجێ، بەڵام محاڵ نی‌یە وەکو (سیدی آلوس ) توهمی بردووە، وە الاّ ئەی فەرموو (لو)، خۆتان ئەزانن ئەو دوژمناتەی ئێوە زۆر بە قووەتن، ڕقیان لە ئێوە بە شیددەتە، ئەوی لە دەستیان بێ بۆ وەرگێررانی ئێوە، قصور ناکەن، ئێوەیش زۆر بەر حەزەر و ئاگادار بن ﴿وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ﴾ کەسێکی بگەڕێتەوە لەدینی خۆی لەئێوە، (والعیاذ بالله) بەفیتنە بازی ئەوان، یا بەترس لەئەوان ﴿فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ﴾ تکرار نەگەڕێتەوە بۆ دینی خۆی و لەسەرکفر بمرێ ﴿فَأُو۟لَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ﴾ هەر عەمەلێکی کردبیتیان باطل ئەبێ، بێ فائدە و ئەمەرە ئەڕوا ﴿فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ﴾ نە لەلای خودا مکافات ئەبینێ، نە لەلای عەبد حورمەت، وەکو حوشترێکیان بە سەر دێت کە لە مێرگ و مێرغوزاری خۆش لەوەرر زۆر بخوا و لە زگیدا بمینێ، زگی بئاوسێ و بمرێ، هەر مەعنایەک لە (لغت)دا لە - حبط - دراوەتەوە زۆر مناسبەی لەگەڵ حاڵی ئەو نەوعە کەسانە هەیە.

﴿وَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢١٧﴾﴾ ئەوانەی لەسەر کفر مردوون، ئیمان و عەمەلی پێشوویان هەدەرە، بێ ئەمەرە، لە جەزای ئەو کفرە (مخلد فی النار)ن و نەجاتیان نی‌یە.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئیمانێکی صحیح، بەشاشەتی چووبێتە ناو دڵیان، بووبێتە (ملکة) و کیفیەتێکی ڕاسخ ﴿وَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ نەوەک لەڕێی عداوەتو حبی انتقام ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ ٱللَّهِ ۚ﴾ ئەمەلی

ئەوان بە ڕەحمەتی خودایە، تعالی متانەتێکی داونی، کە وەرگەرران لە ئەوان بە محاڵ حسابە، فیتنەو فەساد تاثیر لە ئەوان ناکا، لە دریای لەشکری دوژمنو قووەتو مکنەتیان ناترسن، دیارە کە ئەمەلی غالب بوو، سەوقی صاحبی ئەکا بۆ خزمەت ئەوی خۆی بە ڕەحمەتی خودا هەڵ بخەڵەتێنێ، درۆ ئەکا اصلاً اومێدی ڕەحمەتی نی‌یە، ئەمە پێی ئە ڵێن «خەیاڵی خاو»، ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢١٨﴾﴾ ئەگەر نظر بە عزی مقام الوهییەت قصورێکیان ببێ، خودا دای ئەپۆشێ، تەجاوزیان لێ‌ئەکا، سبحان‌الله! لێرە باسی ترسیان لە خودا ناکا باوجودی ئەبێ ئیماندار لە بەینی (خوف و ڕجا)دا بێ، چونکە ئێرە جێی نەهێشتنی ترسە، لایق وایە، کە ترس بەدڵیان دانەیێ، لەم ئایەتە بە دەرئەکەوێ ئەمر بە قتال بۆ حفظی دینە، بۆ دەفعی فیتنەو فەسادە، حفظی عەقڵیش زۆرمهمە، خصوص بۆ (حفاظ)ی دین، ئەبێ دائماً ئاگادار بن، ئەوی ئەسبابی تێکدانی عەقڵ بێ، لێدوور کەون، فیتنە ئەنگێزەکان، خاصةً ئەهلی کتاب، سیاسی‌یەکان، مقدرەتی خۆیان صەرف ئەکەن لە ازالەی عەقڵی خەلق، لە عەقڵ و عیلمیان ئەکەن، تاکوو خەلق وەکو حیواناتی اهلیە بۆیان مسخر ببن و، شەراب و عارەقو سائری موادی ڕوحیە افسادی عەقڵ ئەکا، طبعاً ئەهلی هۆش و گۆش لەو مەقامە سؤال لە مزیلاتی عەقڵ ئەکەن.

﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ﴾ شەراب خۆرەوە، (لاشک) تووشی اضاعەی ماڵ ئەبێ، حفظی ماڵ وەکو عەرضم کردن لە ضروریاتی دینە، بۆیێ پێکەوە سؤالیان دەربارە ئەکرێ ﴿قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ﴾ عەرضم کردن پێغەمبەر شاعر نی‌یە، کەوابێ قورئان کتێبێکی شاعرانە نی‌یە، اصلاً اخفای حقائق ناکا.. ئەوەی بەیانی بکا، حەق و حەقیقەتی جهەتی (مضرّەت) و منفعتی بە دەر ئەخا، بێ‌تلبیس و بێ تزویر، بۆیێ ئەفەرمووێ: شەرابو قومار گوناهیشیان زۆرە، منافعیشیان گەلێکە،

ئەگەرچی لە نظر عەقلّ ئەوی منفعەت و مضرّەتی مساوی بێ، تەرکی (اولی)یە، ئەمما شەراب وقومار، مضرّەت ومنفعەتیان مساوی نی‌یە، بەڵکو ﴿وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا﴾ هەموو عقلاً و علماً اتفاقیان هەیە، چشتێکی کە زەرەری لە منفعەتی زۆرتر بوو، تەرکی واجبە، کەوابێ واجب ناکا جەنابی کبریائی، تصریح بە (حرمتیان)بکا خاصةً لە زەمانی قتال.

یەکێکی (موثوق بە) بۆی گێررامەوە لە وەقتی حەربی عمومی، مجبوری هیجرەت بوبوو لە ئێران بۆ ئێرە، گوتی: «پێش اعلانی حەرب آمرێک لە امرای عسکریەی (رووس) لە سابڵاغ دەعوەتێکی عمومی کرد هەموو لایێک لەسەر سفرە گرد بووینەوە، انواعی طعام و مشروباتی ڕوحی لەسەر سفرە بوو، لە ئانی دەس پێکردن بە خواردن، تەلغرافێکیان دایێ خەبەری اعلانی حەربی ڕووسی تێدابوو، دەرحاڵ گوتی: ئەو مشروباتە هەڵ بگرن، ئیتر حەرامبوو لە ئێمە، تا زەمانی حەرب خەلاص ئەبێ، نابێ کەس لە ئێمە مسکرات بخواتەوە.. ».

یا للعجب! ئەوەندەی ئەمڕۆ اجانب خەریکن مەنعی شەرابو قومار بکەن، موسڵمانان زیاتر خەریکن تعمیمیان بکەن، ئەمڕۆ لە ناو کوردانیش ئەوا سرایەت ئەکا! ئەمینم ئەوجا کورد نابن بە هیچ! ئەوەندی بوون لە ئەوەندیش ئەبن.. خودا ئەزانێ ڕفاقەتی ڕۆسای دینی ئەو عصرە، گەلێک لە شەرابو قومار خراپترە بۆ عەقلّ و ماڵ بردن، و لە زیادە خراپیش ناموس بەرباد ئەکا، بۆ سامعین دەرئەکەوێ جوابی ئەم سؤالە زۆر تەواوە، ئەمما ئەوانی سؤالیان لە انفاقی ماڵ ئەکرد، حەزیان لێبوو بەیانی مەصرەفیان بۆ بکا، چ صەرفبکەن؟ بیدەن بەکێ؟ خصوص ئەوسؤالە لەزەمانی حەرب بوو، ئارەزوویان وابوو، کە بۆ مجاهدان بێ، بۆیێ تکرار سؤال ئەکەنەوە ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ﴾ بە ئومێدی ئەوەی، جوابێکی موافقی مەیلی خۆیان بدرێتەوە، ئەوجارە جوابێکی مختصر و مفیدیان ئەداتەوە ﴿قُلِ

﴿ٱلۡعَفۡوَ﴾ ئەوی سووک و ئاسان و خۆشبێ لاتان، انفاقی بکەن چ لە دایکو باوکو اقارب، چ لە عەسکەری ئیسلام، تەعیینی مقداری چاک نییە، نەوەکو ببێتە دستور العمل و قاعدەی مستمرەی الی الابد، شایەدا لە زەمانێکی تر احتیاجی بە زیاتر بوو، حاصلی موسڵمانان لەسەریان لازمە بەگوێرەی زەمینو زەمان صەرف بکەن و مقداریان بۆ تەعین نەکرێ و هەم دانانی ماڵ بۆ ئەهلی قتال زۆر خراپە، بالخاصە الآن نەوەکو سەربکێشێتە طمع، لە وجهەی خودا لابدا، گەلێک (مزخرف) بێن خۆیان بە مجاهد قەید بکەن، مقصودیان خودا نەبێ، ماڵ بێ، ئەوجا ئیش تێک ئەچێ، قەلب و قلابێکی زۆر، داخلی سلکی مجاهدان ئەبن..

﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَتَفَكَّرُونَ ٢١٩﴾ تا تێ بفکرن بۆ خاطری بزانن خۆررایی نییە، بەم نەوعە جوابتان ئەداتەوە، ئوممەت ئەگەر ئوممەت بێ خۆی بە خواهشی خۆی ماڵ لە مصالحی دەوڵەتو وطن صەرف ئەکا، حاجەت نییە لەسەریان تەعین بکرێ و، تفکرو تأملی ئیوەیش ﴿فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۗ﴾ لە أمور و مصاڵحی دونیا و ئاخرەت بێ، وەکوو (ببغا) مەبن ئەوی پێتان فێرکەن، هەر ئەوە بڵێنەوە، بە تێفکرینی خۆتان، رێ بۆ مصاڵحی ورد ورد ببەن، چ دنیەوی چ اخروی، ذاتا اول و آخر ئێمە مقصودمان ئەوەیە، کە ببنە قەومێکی متفکر لە جملە و ئایاتی کورتەلە کورتەلە، حکمیاتی زۆر بە دەر بخەن.

﴿وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡيَتَٰمَىٰۖ﴾ ئەم سؤالە عائدی حفظی نفسە، خاصةً لە زەمانی حەرب (یتیم) زۆر ئەبن، لازمە سؤالیان لە حەق بکرێ، لەئایاتی سابقە دەرەجەی انفاقی ایتام معلوم بوو، کە چەند خێرە، لێرە مقصد تربییە ﴿قُلۡ إِصۡلَاحٞ لَّهُمۡ خَيۡرٞۖ﴾ اصلاح و تربیەی ئەوان خێری گەورەیە بۆ ئێوەو هەیئەتی اجتماعی. هەتیو زۆر چاک اصلاح نەکرێ، ئەبێتە مایەی شەرر و

فەساد ﴿وَإِن تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ﴾ ئەگەر لەگەڵیان تێکەڵاو ببن، ئەوانە برای ئێوەن، بە چاوی سووک تەماشایان مەکەن، و عاجز مەبن بەبێ عاری و چەقاوە سوویەتیان.. ئەبێ زۆر بە تحمل ورفق بن لەگەڵیان، خلاصە ظاهر و باطن خەریک لە اصلاحیان، تا ببنە پیاوێکی ڕەشیدو بەکار و بە کەڵک..

﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ الْمُفْسِدَ مِنَ الْمُصْلِحِ﴾ فێڵی لێ ناکرێ، ئەگەر بە ظاهریش خۆتان بنوێنن بە مصلح، بەڵام (مافی الضمیر)تان لە خەلق بزر بکەن، لە خودا بزر نابێ ﴿وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَأَعْنَتَكُمْ﴾ ئەگەر خودا حەزی بکردبوایە ئێوەی ئەخستە عەذاب و مشقەت، ئەی کردنە هەتیو، تووشی هەتیوباری ئەکردن.. لە شوکرانە ئەوەی، کە خودا اولادی ئێوەی نەکردە هەتیو، ئێوەیش ببنە بابی هەتیوانو اصلاحیان بکەن ﴿إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٢٠﴾﴾ حەز ئەکا ئێوەیش میللەتێکی عەزیز و بە شەرەف بن، فێری عەقڵ و حیکمەتی وردە وردە بن، نەفستان لە جەهل دەرچێ بۆ کمالاتی علمی و عملی لە قووەی نظری و عملی تەواو بن، مەقام و موقعی چشت بزانن، ئەگەر ئارەزووی صلاحتان هەیە، لە ئەوەڵەوە تەماشای مصور بکەن، کە ژنە.

ئێوە کە قەومێکی محاربن نفوستان پێ ئەوێ، بەڵام نە زۆر و بۆر، بەڵکو نەسلی بەهێز و صاغلام، دوور لە ناساغی دڵی و بەدەنی ﴿وَلَا تَنكِحُوا الْمُشْرِكَاتِ﴾ با لەگەڵیشتان محارب نەبن، مشرکی عەرەب، یا ئەهلی کتاب، فەرقیان نییە، مشرکی اسرائیلی خراپترە، منداڵ اخلاقی فطری لە وەقتی (تکوّن) وەرئەگرێ، ئەو (توارثە) طبیعیی یە، ذەررەی حەیات ئەگەرچی لە پیاو پەیدا ئە بێ، ئەمما تطوراتی لە ناو ڕەحمی دایکی دایە.. نۆ مانگ لەوێدا ئەمێنێ، کیفیاتی ڕوحی و بدنی، لە ڕوحو بدنی دایک وەرئەگرێ و، تا گەورە ئەبێ لە باوەشی دایکیەتی، دیسان تەربیە لە ئەو وەرئەگرێ، ئێوە مارەیان مەکەن ﴿حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ﴾ هەتا ئیمان نەهێنن بە ئیمانی صحیح و پاک،

نەوەک بەهەوای مێرد کردنو تجسسی، ئەو نەوعە لە زمان سیاسەتدا زۆرە.. ئەبوایە ملوکی ئیسلام خۆیان بپارێزن! ئەوجا کە بەو نەوعە ئیمانیان هێنا، تەئسیری فیطری ضعیف ئەبێ، تربیەی ئیمانی قووەت ئەستێنێ ﴿وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ﴾ ئەوی ئیمانداربێ، هەتا جاریە چاکترە لە بێ ئیمان، (ولو) لە ئەشرافان بێ «ماڵی بابم کوردی پەکی لەسەر مؤمن و مؤمنەو مشرک و مشرکە نەکەوتووە!!» اصلاحی دین، کە بەڕاستی بێ فەسادی خوێن ناهێڵێ ﴿وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ﴾ با زۆر لاتان جوان بن.. بە حسنو جەمالی خۆیان ئێوە بخەنە حیرەت.. خۆبپارێزن، پێ لە نەفسی خۆتان بێنن، بۆ پێک هێنانی لذەتی نەفس، اولادی خۆتان بە فەساد مەدەن و، شرائطی مارەکردنی جاریان لە قورئان بەیان ئەکرێ.

﴿وَلَا تُنكِحُوا الْمُشْرِكِينَ﴾ کچی خۆتان مەدەن بە مشرکان، با زۆر پیاوی گەورە و خانەدان بن ﴿حَتَّىٰ يُؤْمِنُوا﴾ هەتا ئیمان ئەهێنن بە ئیمانی ڕاست بێ حیلە و خدشە، ئەو وەختە ئەگەر خواهشتان بوو قەیدی نییە ﴿وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ﴾ بەندەیێکی ئیماندار نظر بە تربیە ﴿خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ﴾ با وجودی ئازادە لە عەبد مارەیی نابێ ابداً، هەتا جاریەیێکی لە عەبدێک مارەکرابێ بوویێتە ژنی، ئەگەر جاریەکە ئازادکرا، مێردەکەی بە عەبد مایەوە، نکاحەکە نامێنێ بەتاڵ ئەبێ، بناءً علیە ئەمە بۆ زیادە تنفیرە لە ئەهلی شرک ﴿وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ﴾ بە ماڵو جەماڵیو عزوجاە ﴿أُولَٰئِكَ يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ﴾ ئەوانە طبیعەتیان وایە، مطلقاً لە افسادی عقیدەتی خەلق تێئەکۆشن، دەعوەت ئەکەن بۆ ئاگر، ئەگەر ئاگر پەرست بن بۆ عەینی عیبادەتی ئاگر، ئینسان دەعوەت ئەکەن ﴿وَاللَّهُ يَدْعُو إِلَى الْجَنَّةِ﴾ وحدانیەتی باری، کە ڕاسخبوو لە دڵ، چ لە دڵی نێر، چ لە دڵیمێ، یەعنی ئیمان بە خودا بەو نەوعە سەر

ئەکێشێتە بەهەشت ﴿وَٱلۡمَغۡفِرَةِ﴾ ستری عەیب، ئە گەر فطرةً نەوعە خەباثەتێکیشی هەبێ، ئیمانی صحیح بزری ئەکا، ناهێڵێ ئەثەری بە دەربکەوێ،ئەم دەعوتە فیطریی یە ﴿بِإِذۡنِهِۦ﴾ بەرەضای خودایە، ئەوجا تەربیەی کەسبی لەگەڵ تەربیەی وەهبی توافق ئەکا، یەعنی حەق وایە وابێ، وە الاّ وەکوو (معرّی) ئەڵێ:

واذا تساوت فی القبیح فعالنا
فمــن التــقــی وأيّنا الفجـــارُ

«ئەگەر لە خراپەدا افعالمان وەکو یەک بێ، کێمان مؤمنین؟ کێمان کافرین لەیەک جودا نابینەوە؟» ئیمانی بێ عمل، نابێ بە علامەتی خێر ﴿وَيُبَيِّنُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ٢٢١﴾ تەئسیری (ارثی) هەموو کەس نایزانێ، زۆر بزرە، خودا بەیانی نەفەرمویێ نازاندرێ، بەڵکو اکثر لە علمای (ملیّون) انکاری ئەکەن، ئەڵێن ئەو تەئسیرە طبیعی یە، منافی خەلقو ئیجادی ئیلاهی‌یە، با وجودی خالق خۆی ئەزانێ و، بەو نەوعە بۆ ئێمە بەیانی فەرمووە، ئێمە نابێ بە نظریەی ئەوان هەڵ بخەڵەتێین.

لە پاش ئەوەی، کە بەیانی فەرموو تەئسیری وراثیمان زاناند، ضمناً ئەمر ئەکا بە دەوام تذکر و تفکر الی الأبد، موسڵمانان مراعاتی ئەو قواعدی فیطری‌یە بکەن، ئەمما مع الاسف لە فیکرا کرا، (خاصةً) ئەمڕۆ! عەرضمان کردن لە نەسل، زۆری و بۆری مقصد نی‌یە.. ذریّتێکی طاهر القلب بُنیە بە قووەت تەربیە چاک. ڕەحمی ژن ئەگەر بە قووەت و خاوێن بێ، تۆوێکی بە قووەتی تێدا شین ئەبێ، وە الاّ یا نابێ، یا ضعیف ئەبێ، ثەمەرەکەی ئەبێ بە بارگرانی، نە خۆی استفادە لە حەیات ئەکا، نە قەوم لە ئەو، بۆیێ ئەفەرموێ: ﴿وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡمَحِيضِۖ﴾ تقرّب لە زەمانی حیض لە مکانی حیض چۆنە؟ ﴿قُلۡ هُوَ أَذٗى﴾ ناساغی‌یەکی طبیعی‌یە، ڕەحم بێ قەرارە،

خەریکی (قەيّ)و افرازە، لەو وەقتە تقرّب زۆر خراپە ﴿فَٱعۡتَزِلُواْ ٱلنِّسَآءَ فِي ٱلۡمَحِيضِ﴾ لە مکانی حیضیان لادەن، معاشرەیان لەگەڵ مەکەن، باقی پێکەوە نوستن‌و لە هۆدەیێکدا بوون و دەست لە ملانێ و بۆس‌و کەنارو چشتی وا قەید ناکا، خولاصەی ئەو قیوداتو تضیقاتی لە تەوراتدا هەیە، لە قورئاندا نی‌یە ﴿وَلَا تَقۡرَبُوهُنَّ﴾ بە معاشرەی زواج ﴿حَتَّىٰ يَطۡهُرۡنَ﴾ هەتا پاک ئەبنەوە بە پاکی‌یەکی طبیعی ﴿فَإِذَا تَطَهَّرۡنَ﴾ کە خۆیان پاک کردەوە بە شووشتن ﴿فَأۡتُوهُنَّ مِنۡ حَيۡثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُۚ﴾ بە ئەمرێکی تکوینی و تشریعی، شەرع مداخلەی فیطرەت ناکا، الاّ لە جهەت تعدیل نەبێ، هەردوو ئەمری آمرێکن تباین لە بەینیاندا نی‌یە، ئەوی شەرع بکاتە مخالفی طبع، مقصدی مەحوی شەرعە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلۡمُتَطَهِّرِينَ ٢٢٢﴾ خودای تبارک و تعالی ئەوانی (توّاب) بن، زۆر تۆبە بکەن بەو مەعنایە، ئەگەر گوناهێکیان لێ‌صادر بوو، زۆر بە گەورەی بزانن، گەلێک متاثر ببن، زۆر زۆر پەشیمان ببنەوە و، ئەو کەسانەی پاکو خاوێن بن بە خاوێنی طبیعی و بە خاوێنی شرعی ، خودا خۆشی ئەوێن، کەوابێ ئەوانی لە ئەساسەوە پاک بن، تووشی گوناهان نەبووبن، گەلێک خۆشەویستن.

﴿نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ﴾ ژنی ئێوە مەزرەعەن بۆ ئێوە، وەقتی (تۆ)و وەقتی (شۆ) لەیەک جودان، ممکن نی‌یە (زراع)بە هیچ زەمانێک (بالكلية) ڕوو لە مەزرەعەی خۆی وەربگێرێ، بە هیچ نەوعێک تەماشای نەکا، ئەگەر لە غضب نەبێ، ئەو نەوعە تضییقاتەی، کە لە تەورات دا هەیە، قابل نی‌یە حوکمی ئیلاهی بێ و مقصد عظمی ولدە.. تۆوی چاک بە ئەرزی خاوێن وەر بکەن، محصولاتی چاکی لێ پەیدا نەبێ، ﴿فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡ﴾ لەسەر جێ‌شیان دابنیشین دەست لەملی یەکیش بخەون، دەستاویش بخۆن‌و بخۆنەوە، الاّ لە زەمانی حیض لە مکانی حیض خۆتان بپارێزن.. لە حینی

معاشرە بە هەر کیفیەتو وەضعیەتێک ببێ، شرع مداخلەی نی‌یە، هەرچۆنی پێتان خۆشو بەلذّەتە بەو نەوعە بکەن، ئەو مکانی کەجێی (حراثت) نەبێ، موضوعی بەحث نی‌یە قسەی لێ ناکرێ، ئەگەر بە تسویلات نەبێ طبیعەت لێی متنفرە، ئینسان بە انسانیەتی خۆی، نابێ لە حیوانات کەمتر بێ.

﴿وَقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُمْ﴾ چی چاکە بۆ نەفسی خۆتانو بۆ نەسلتان ئەوە پێشبخەن، هەتا جاریە لەسەر (حرّ) تقدیم بکەن، ئەگەر مصلحەتی تێدابێ. حاصلّی (اختاروا لنطفکم الارحام) ارحام پاکو پاکیزە، بە گوێرەی قانون زەواج بۆ خۆتان اختیار بکەن. ئەلّێن لە قانونی افلاطونی دا ئەلّێ: «منداڵێک کە بە وەلد بوبوایە، دەرحاڵ چەند اطبا ئەچون منداڵەکەیان کەشف ئەکرد، ئەگەر لایق بوایە اعتنایان بە محافظەی ئەکرد، ئینسانێکی بە قووەتی لێ‌پەیدا ئەبوو، وە الاّ منداڵەکەیان ئەکوشت و دایک و باوکی زۆریان پێ‌خوش‌بوو.». ئەوە لە قانوونی ئیلاهی دا نی‌یە بێ‌روحمی یە، قانونی ئیلاهی ئەمر ئەکا بە سەعی بۆ اصلاح ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ لە هەموو ئیش تەقوای خودا بکەن، عەدالەت بکەنە پیشەی خۆتان، خۆتان لە افراط و تفریط بپارێزن، بە ئیمانی خۆتان هەڵ مەخەڵەتێن.

﴿وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّكُم مُّلَٰقُوهُ﴾ لە رۆژی جەزا ﴿وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٢٣﴾﴾ بە پێ‌گەیشتنی ئەجر و ثواب لە پاداشی اطاعەی اوامر و نواهی، خودا جزای چاک وەر ئەگرن ﴿وَلَا تَجْعَلُواْ ٱللَّهَ عُرْضَةً لِّأَيْمَٰنِكُمْ﴾ خودای تعالی مەکەنە حاجزو مانع لەبەینی خۆتانو اموری خیریە، خصوص کارێک، کە عائدی ژن بێ لەبەر سوێندتان.. بڵێن: «سوێندمان خواردووە ئەو ئیشە چاکە ناکەین» خودا بۆ ئەم نەهی‌یە ئەکا؟ بۆ خاطری ﴿أَن تَبَرُّواْ وَتَتَّقُواْ وَتُصْلِحُواْ بَيْنَ ٱلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٢٤﴾﴾ ئیمان بە خودا، حفظی

شەرەفی مەقامی الوهییەت، بۆیێیە ئینسان چاک بێ پەرهێز کاربێ لە بەینی مخلوقات اصلاح بکا، ڕێکتان بخا، بۆێ نیـیە بیکەنە سدّ و بەند لەبەینی خۆتان و ئەو کارە چاکانە، بالخاصة سوێند خواردن لەسەر معاشرە نەکردنی ژن، لای خودا زۆر ناخۆشە، چونکە ئەمە عصیانێکی ئیلاهیـیە، هەم لەجهەت خالقی هەم لە جهەت شارعی.(١)

﴿لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِيٓ أَيْمَٰنِكُمْ﴾ خودای تعالی ناتانگرێ بە گوناهێ، کە لە نەفسی خواردنتاندا هەیە ﴿وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ﴾ بەڵان ئەتانگرێ بە ئەوەی، کە دڵی ئێوە کەسبی کردووە، کە مەیلو ڕەغبەت و نەفرەتە لە چاکە، ئێوە ئەبێ دڵی خۆتان اصلاح بکەن، مائلی بکەن بۆ چاکە، متنفرّی بکەن لە خراپە خاصة خراپە، لەگەڵ ئەهلوعەیال، کەسێکی دڵی بە میولی فاسدە بە فەساد چووبی، خودا عەذابێکی ئەدا، کە تەئسیر لە دڵی بکا، ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿٢٢٥﴾﴾ خودا (ستار العیوب)ە، ئێوەیش اغماض بکەن لەعەیبی یەک، چاو بپۆشن، خودا بە حیلمە، تاڵووکە لە عەزاب و عقاب دان ناکا، ئەبێ ئێوەیش بە کاوەخۆ بن، خۆ بگرن، تێک نەچن.

﴿لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ﴾ بۆ ئەوانەی کە (ایلا) ئەکەن، یەعنی بە سوێندێکی نقیصە، ساقط لە اعتبار خۆ دوور ئەخەنەوە، لە قریبو یۆڵداشی حەیات و، هەم آغوشی خۆیان ﴿تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ﴾ خۆ بگرن لە سەر ئەوەی سۆیندیان خواردووە، مدەی چوار مانگ لە ئەوەندە زیاتر نا، ئەوەیش لەحلمە، حیلمیش حەددێکی هەیە، ئەگەر تجاوزی لێبکا خراپە، ئەگۆڕرێ ئەبێتە خمولو کوژانەوە، ئەوجا ﴿فَإِن فَآءُو﴾ ئەگەر گەڕرانەوە بۆ معاشرە ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢٦﴾﴾ لە گوناهی نەفسی سوێندەکە، عەفوتان ئەکا

---

(١) (والله سميع) بۆ ايمانو سائر اقوال (عليم) بما في الصدور، ئەوئایەتە هیچ دەخلي بەسوێندي ابوبکر نیيە ، باسي سوێندي (صديق) لە سورەي (نور)دا دێ.

﴿ وَإِنْ عَزَمُواْ ٱلطَّلَٰقَ ﴾ جەزمیان هێنا بە سەر طەلاقدان ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٢٧﴾﴾ خودای تعالی ئاگادارە بە هەموو نەوعان، پاشدان (جنگلە و فنگلە) مەکەن، بڵێن (مقصودمان ئەوە بووەو ئەوە نەبووە و، وامان گوتووە و وامان نەگوتووە) بەو فاکوفیکە لە خودا نەجاتتان نابێ.

ئەی ئەگەر کەسێک بێ، سوێند خۆی مەنع بکا، حوکمی شرعی چیە؟ شرع لەو نەوعە چشتە هیچ حوکمی نییە، غەیری نەصیحەت، ئەمما کە سوێندی خواردو خۆی هاویشتە ژێر پەنجەی شرع، ئەوسا ئەتوانێ حوکم بکا.

ئەی ئەگەر هیچ لایێکی نەکرد حوکمی چیە؟ خۆ نابێ هەروا بمێنێتەوە؟! لێرە قورئان التفاتی پێناکا، (کانە) مۆمن نابێ بگاتە دەرەجەیێکی، کە یەک لەو دووانە بەجێ نەهێنێ، حوکمی ئەوە لە باسی (نشوز) بە دەر ئەکەوێ.

ئەوە حوکمی سوێند خۆرەکان، ئەی ژنەکان ئەگەر تەڵاق دران، حوکمیان چییە؟ ئایا (عدّە)یان هەیە یان نییە؟ ظاهر وا دێتە خەیاڵ، کە (عدّە)ی نەبێ، چونکە چوار مانگە نزیکی نەکەوتووە، ئەفەرموێ: ﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ ﴾ بە (ایلا) کەوابێ (الف لام) لێرەدا بۆ عەهدە، عەهدێکی زۆر نزیکە، عەجایبە (اصولی)یەکان لەو عەهدە غافڵ بوون و ئەڵێن عامە، ﴿يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ﴾ با زەحمەتیش بێ لایان، چونکە ئەوە دوو (عدّە)یە معنی، ئەمما ئەبێ تحملی بکەن، چونکە عدّة دوای طلاقە، پێش طلاق هەر ژنیەتی، گەلێک وا دەبێ طلاقی ژنومێرد بێ عاجزی، زەمانێک معاشرە لەگەڵ یەک ناکەن ﴿ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ﴾ صحابەی کرامو مجتهدین نزاعیانە لەسەر (قرء) زەمانی پاکی مرادە، یا زەمانی خوێن، بەڵام حەملی لەسەر (طهر) باشە خاصة، لێرە چونکە طولی مدە هەیە وەکو عەرضمان کردن، وەهەم معلومبوو وەقتی

حیض دووره لە معاشره، زەمانی پاکی مەیلی طبیعی زیاد ئەکا و، ئەمری شرع لەسەر خۆگرتنو انتظاره بۆ زەمانی پاکی. ئەگەر تاملیان لەو مەقامە بفەرمووبوایە، ئەبوایە هەموو لێره اتفاق بکەن، تا وەکو ئەو طهری تێیدا طلاق ئەدرێ، (ولو) زۆر کەمیش بێ بۆی حساب بکرێ، زەمانی انتظاری گەلێک درێژ نەبێ.

﴿وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِيٓ أَرْحَامِهِنَّ﴾ اختلافیان هەیە لە (ما خلق الله)-ابن عباس- ئەفەرموێ: (ولد)، چونکە خەلق بۆ ئەو ظاهره،- ابنعمر- حمل و حیض، ئەوەیش مختاری جعفری صادقه، عکرمه ئەفەرموێ (دم حیض)ه، (حقیقةً) ئەوه لە هەموویان نزیکتره، لێره ئەوی بلێ خوێنی حیض لە ڕەحمدا خەلق ناکرێ، زۆر سەهوه تا (وڵ وڵەی)ی ناو ڕەحم شەق نەبێ، ئەو خوێنە پەیدا نابێ، ئەو مطلقەیە چوارمانگ پێش طلاقی ڕابردووه لەو چوارمانگە، حمل ئاشکرا ئەبێ، جێی (کتم) نامێنێ، بەڵێ ئەگەر نظر بکەنە پێش طلاق، حملی لەسەر حمل جوانە، لازمە ئەو ژنە بۆ مێردی اظهار بکا، کە زگی پڕه، ئەو مێرده مەگەر زۆر دڵڕەق بێ، وە الاّ طلاقی نادا، ڕجوعی ئەکاتەوه بۆ معاشره، خودا ئەوەی لەلا خۆشتره، کەوابێ بۆ ئەو طلاق دراوانە دروست نییە (کتمی حیض) بکەن، بۆ لە (عدّه) دەرچوون، با خۆیان تووشی (زنا) نەکەن، ئەگەر بە ظاهر شرعیش لێی قبووڵ بکرێ، لە لایخودا بزر نابێ..

﴿إِن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ﴾ ئافرەتێ ئەوکتمانە بکا، دیاره ئیمانی بە خودا و بە ڕۆژی قیامەت نییە ﴿وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ﴾ مێردیان احقترن بە گێررانەوەیان لە زەمانی (عدّه) بە ڕجعه، لە بێنونەتی صغری بە تجدیدی نکاح. تەعبیر بە (بعل)، دەلیلە لەسەر بەقای ڕابطەی زەوجیەت، کە (بالکلیة) قطع نەکراوه، (کانه) الآنیش مێردیەتی ﴿فِي ذَٰلِكَ﴾ لە زەمانی عدّه

حاجەت بە تجدید نی‌یە ﴿إِنْ أَرَادُوٓاْ إِصْلَٰحًا﴾ مقصدیان ڕێک کەوتن بێ، نەک بۆ لهەوەسی ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ﴾ بۆ ئەوان هەیە مثلی ئەو شتەی، کە لەسەریانە ﴿بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ معروف معروفە، حاجەت بە بەیان نی‌یە، یەعنی ئەوانیش حقووقیان لەسەر مێرد هەیە، وەک مێرد حقوقی لەسەر ژن هەیە.

غایة ما فی الباب ﴿وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ﴾ دەرەجەی شەرەفو فضیلەت، کە ژنی پێ حمایەت بکا، نەک دەرەجەی سیادەت و سلطنەت و قەهرو غەلەبە، ذاتەن ژن وەک شوشەیە، ئەبێ پیاو حفظی بکا لە شکان، قاعدەی شرعی ئیسلامیە، ئەوی زیادی‌یەکی فطری هەبێ صەرفیی بکا بۆ لە خۆ بەرە ژێرتر، نەک وەک طبیعەت قوی ضعیف بخوا ﴿وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٢٨﴾﴾ لەسەر ئەو عیززەت و حیکمەتە، چۆن لطف بە ضعفای عبادی خۆی ئەکا، ئێوەیش بەو نەوعە پەیڕەوی فەضڵی باری بکەن. ﴿ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِ﴾ دەستوری عدالەت وا لە قضا ئەخوازێ، و عاقبەت ئەندێش و ایجاب ئەکا، کە ئینسان لە طلاق دانی ژن تالووکە نەکا، بە تانی بێ، بەجارێ ژن (بالکلیة) لە خۆی حەرام نەکا، ئەگەر ایجابی دیت طەلاقیکی بخوا، دوایی بزانێ پەژێوان ئەبێتەوە، یان نا؟ وە ژنەکەیشی دێتەسەر ڕێی صلاح، یان نا؟ ئەگەر منداڵی بچووکیان هەبوو بۆی بەخێو ئەکرێ، چۆن ئەکرێ؟ تدارکی حەقی حضانە چۆن ئەکا؟ بالطبع ئەم مشاقەتە هەمووی تحمل ناکرێ، با لە زەمانی (عدە)دا ڕەجعەتی بکاتەوە، ئەگەر ڕێکوپێک بن، مبارەک بێ وە الا با طەلاقێکی تریشی بدات، دیسان خواستی، ڕەجعەی بکا. پاش ئەمە چ چارەی تر نی‌یە ﴿فَإِمْسَاكٌۢ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌۢ بِإِحْسَٰنٍ﴾ یا بە معاشرەیێکی خۆش ڕابیوێرن، ژنەکەی خۆی ڕابگرێ، یاخود بەرەڵلای بکا، بە چاکەی نەی بەستێتەوە ﴿وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُواْ﴾ حەلاڵ نی‌یە، دروست

نی‌یە بۆ ئێوە (بوجە من الوجوە) وەربگرن ﴿مِمَّآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ﴾ لەوی پێتان داون مارەیی و غەیری مارەیی ﴿شَيْـًٔا﴾ کەم و زۆر﴿إِلَّآ أَن يَخَافَآ﴾ مێردو ژن بترسن ﴿أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ﴾ ئەو حدود و ئەحکامی خودا بۆی داناون، پێیان ڕاست نەکرێ، پیاوەکە دڵی برروا نەدا بە خۆررایی طەلاقی بدا، خاصةً کە لەسەر شتێکی (نفیس) مارەکرابێ و، ژنەکەیش مەیلی معاشرەی لەگەر پیاوەکە نەبێ، لەگەڵی هەڵنەکا ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ﴾ ئەگەر ئێوە ترسان، یەعنی (حکام)و دەورو پشتو تعلقاتی ژن و مێردەکە و مەعلوومیان بوو، ﴿أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ﴾ کەوابێ تەنها بە (خوفی) ژن و مێردەکە، اکتفا ناکرێ، ئەو وەقتە ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا ٱفْتَدَتْ بِهِۦ﴾ گوناهیان لەسەر نی‌یە لەو (فدیە)ی بخات، کە ژن ئەیدا بە مێردەکە، نەئەم گوناهی ئەگاتێ بە عطاکردن، وە نە ئەویش گوناهی ئەگاتێ بەوەرگرتن، ئەو (فدیە)یەش عیبارەتە لە بەری عوضی خلع ﴿تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا﴾ ئەوی ذکر کرا لە مسائلی طلاق و شروطی، ڕسوم ناوانی خوایە، (حقیقةً) ئەم شرائط و قیودەی، کە لەو ئایەتی کریمە هەیە، موسڵمانان تەجاوزیان لێنەکرد، ئەمما هەر اعتباریان پێنەدا..

﴿وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴿٢٢٩﴾﴾ تجاوز لە قانونی عدالەت عەینی ظلمە و قوانینی ئیلاهی (حقیقةً) عەینی عدالەتە.

لە ڕوایەتی صحیح ثابتە، ژنێ هاتە خزمەت پێغەمبەر، گوتی: یا رسول الله! سەری من و سەری مێردم لە سەر هیچ شتێ گرد نابێتەوە ابداً.. تەماشام کرد مێردم لە ناو جەماعەتێک ئەهات، لە هەموویان ڕەشتر بوو، لە هەموویان کورت تر بوو، لە هەموویان ڕوو ناشیرین تر بوو! مێردەکەی عەرضی کرد: یا رسول‌الله! من چاکترینماڵی خۆم داوەتێ، کە باغچەیێکە، ئەگەر باغچەکەم بۆ ڕەد بکاتەوە باشە.

جەنابی رەسول بە ژنەکەی فـەرمـوو: چ ئـەڵـێی؟ ژنـەکـە گـوتی: باشـە، ئەگەر حەز ئەکا زیاتر، ئەوجا جەنابی ڕسالەت پـەنـاه بـە خلـع، تفریقـی لـە بەیندا کردن.

خۆزیا ئەو دەستورە ڕعایەتکرابا، اصحابە و تابعین و مجتهدین اتفاقیـان لەسەر بکردایە، ئەو وەقتـە طـلاق دانـی ژن بـەو نـەوعـە، کـە ئـەمـڕۆ هـەیـە نەدەبوو، مخلوقات لە اضطراب و قیل و قال و کەشماکـەش دانـەدەما،هـەزار ڕەحمەتی خودا لـەو مجتهدانـە بـێ، کـە کفائـەتـی عومروجـەمـالو ماڵیـان لا معتبرە.

﴿ فَإِن طَلَّقَهَا ﴾ پـاش ئـەم دوو نۆبـەتـە، ئـەگـەر طـلاقـی‌دا ئـافـرەتـەکـە لێی (بائنە) ئەبێ بە (بائنەی کبـری) ﴿ فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ ﴾ لـە پـاش طـلاقـی سێیەم بۆ پیاوەکە حەڵاڵ نابێ، نە بە ڕەجعەت، نە بە تجدیدی نکـاح ﴿ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا غَيۡرَهُۥ ﴾ هەتا مێردیکـی تـر نـەکـا و، معاشرەی مێـردو ژنـاتیـان لـە بەین‌دا جاری نەبێ حەڵاڵ نابێ.. ئەمە لە بۆ ئەصحابی مـروّەت کـافـیـیـە بـۆ طلاق نەدانی ژن. مقـصـد ئـەوە نـیـیـە ڕێی مـارە بـەجـاش بکـاتـەوە، مـارە بەجاشی، بالکلیة لەگەڵ شەرەفـی بـەشـەری دوورە مـارە بـەجـاش بـە هـیـچ مذهبێک دروست نابێ، هەتا لای ئیمامی (حنفـی) ئـەم نـەوعـە نکاحـە، بـێ ئیذن و ڕەزای (وەلی) دروست نابێ، مەلایانیش لـەوە غـافڵن، نکـاحیـان بـە حنفی ئەکەن بێ ئیذن و ڕەزای وەلی. ﴿ فَإِن طَلَّقَهَا ﴾ ئـەگـەر ئـەو مێردەیـش طلاقی دا ﴿ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يَتَرَاجَعَآ ﴾ جمهور ئەفەرموون: گوناه نیـیە لەسـەر ژنەکەو مێردەکەی، کە بۆ یـەک بگـەڕێنـەوە بـە نکـاحی جدید، پـاش عـدّە تەواو بوون. (مجدّدی میصری ) ئەفەرمووێ: گوناه نـیـیـە لـەسـەر ژنـەکـەو مێردەکەی (ثانی) ، کە طلاقی داوە بۆ یەکتر بگەڕێنەوە، لام وایە مقصدی بالکلیة، سدّی مارە بەجاشییە، وە الاّ قسەکەی زۆر بە جێ نیـیە.

نەبوونی جُناح بە شەرتی ﴿إِن ظَنَّآ﴾ بەعضی تەفسیریان کردوە بە صلّح، (بیضاوی) ئەڵێ: خۆی نی‌یە.... عاقبەت معلووم نی‌یە، اما ممکنە بڵێن: (ظن)ی قوی لەبەر نەدامەت.

﴿أَن يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ﴾ حقوقی زوجیەی ئەو لەسەر ئەم، ئەم لەسەر ئەو ﴿وَتِلْكَ﴾ ئەو احکامەی باسکرا ﴿حُدُودُ ٱللَّهِ يُبَيِّنُهَا﴾ بەیانی ئەکا لەسەر زمانی پێغەمبەری ﴿لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ٢٣٠﴾ بۆ قەومێک بە ادراکو هۆش و فهمی عمل، احکامی فرعیە بۆ عمل پێ کردن واجرایە ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ ئەگەر ژنتان طلاقدا بە (ایلا)، یا بە غەیرە ایلا. بۆیێ بە ضمیر نافەرموێ.

﴿فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ﴾ نزیکی‌آخری بوونەوە ﴿فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ﴾ ئەگەر ڕەجعەتان کردن، بیانگرن بەخۆشی معاشرەیێکی باش و ژن و مێردایەتی‌یەکی چاک ﴿أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ﴾ یا لێیان بگەڕێن، تا عدّەیان تەواو ئەبێ ﴿وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا﴾ ڕوایەت کراوە (ثابت کوڕی یسار الانصاری ) ژنی خۆی طلاق دا، یەک دوو ڕۆژی مابوو لە (عدّة)ڕەجعەی کرد، دیسان طەلاقی دایەوە، نزیکی عدە چوون ڕەجعەی کردەوە، عدّەی زۆر دوور و درێژ بوو، لەم ڕەجعەت و گرتنەوەی، مقصدی ئەم اضرارە بوو، لەو ئایەتی کەریمەدا سەبەبی نزولو نظمی قورئان زۆر موافقە. ئەو امساکە مەکەن ﴿لِّتَعْتَدُوا۟﴾ تاکو ظلمو تجاوز بکەن، ژنەکان لە ترسی (عدة) دوور بوون مجبووربین بە (فدیە) دان ﴿وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ﴾ ئەوی ئەو امساکە بکا، دوورە لە موسڵمانان ﴿فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ﴾ بە حەققەت ظلمی لە نەفسی خۆی کردووە، بەبێ انصافی و بێ مروەتی، کە نەفسی خۆی بە لەئامەت پیسکردووە ﴿وَلَا تَتَّخِذُوٓا۟ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًا﴾ ئایاتی خودا- ئەحکامی ئیلاهی-

مەکەنە قەشمەرجاری خۆتان، گەمەی پێمەکەن، لە ڕێی خۆی لامەدەن، خودا بۆ حسنی معاشرە و ڕعایەتی حقوقی زوجیەّت، ڕێی مارەکرانەوەی بۆ مێردی پێشووی دا، ئێوە دەرگەی مارە بەجاشتان کردەوە، خودا ڕێی طەلاقی بەو نەوعە عەدالەتە دانا، ئێوە مەیّ گێررن بە وەسیلەی زەرەر و ظلم، عنانی پیاو بەرەڵلا مەکەن بە هەر نەوعێ هەوەس هێنای ژن طەلاق بدات.

﴿وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ﴾ مقابلەی نعمەتی خودا، کە لە اعظم (نعمی) وی، ناردنی ئەو پێغەمبەرە هادیی یەیە، شوکر گوزاری بکەن.

﴿وَمَآ أَنزَلَ عَلَيۡكُم مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡحِكۡمَةِ﴾ هەم تشکرّی خودا بکەن لەسەر ئەوە، کە بۆ ئێوەی ناردووە قورئانی عظیم الشان، کە مشتملە لەسەر حیکمەت تزکیەی نەفس، تدبیری منزل، حسنی معاشرە، اظهاری حقوقی ژن، کە جزئی متممی بەشەرە.. معدنی ئینسانە، بالطبع تا بە شەرەف تر بێ، ئینسانی بە شەرەفتری لێ پاش ئەکەوێ.

﴿يَعِظُكُم بِهِۦ﴾ بەو قورئانە حکیمە، نصیحەتی ئێوە ئەکا، ئێوە نصیحەت لە گوێ بگرن، وەکو جولەکان مەڵێن «سمعنا وعصینا» خودا بەو حکیمەت و کتێبە، ئێوەی گەورە کردووە، وەک بنیاسرائیل تێکی مەدەن، شوکرانەی ئەو نیعمەتە بەقبوڵ کرد،وە تباعیەتی نەک بە زوبان بڵێی (چۆق شکر)،

﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ خۆتان بپارێزن، لە خودا بترسن، کتێب و حیکمەتی ئەوی مەگۆررن، تاویل و تحریفی مەکەن، ڕوحی آیاتی اجتماعی بە فەساد مەدەن

﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ٢٣١﴾ بزانن خودای تبارک و تعالی علمی بە هەموو شتێک هەیە بە علمێکی تەواو، هیچشت لەو بزر نابی (سرّ و خفی و اخفی)، کە خۆتان تووشی عقابی ئەو مەکەن..

﴿وَإِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ﴾ عدّەیان تەواو بوو، ئارەزوویان بوو

تجدیدی نکاح بکەن. ﴿فَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ﴾ ئێوە مەنعیان مەکەن بە ظلم ﴿أَن يَنكِحۡنَ أَزۡوَٰجَهُنَّ﴾ خۆیان لە مێردەکانیان مارە بکەنەوە بە نکاحێکی تازە، ئەو دوو گەیشتنە وەک امامی شافعی ئەفەرموێ، هەریەک مەعنایەکی سەربەخۆی هەیە، بۆیێ ئەو حوکمی لەسەریان (تَرَتُّبْ) ئەکا، لەیەک جوایزن. صاحبی قاموس ئەڵێ: (بلغ المكان بلوغاً وصل اليه ام شارف عليه) دیارە پێ گەیشتو و لە یەک نزیک بوونەوە بوو (بلغ) مەعنای لغوی ثابت بووە. لە (معقل کوڕی یسار) کە فەرموویەتی: خوشکێکم هەبوو ئامۆزایەکم هات لێم مارە کرد، مدەیەک بە یەکەوە بوون، پاشان طەلاقێکی داو ڕەجعەی نەکرد، تا عەدەی چوو، دوایی مەیلیان لەگەڵ یەک بوو، ئامۆزایەکەم داخوازی لێکردم، گوتم: احمق، حورمەتی تۆم گرت خوشکم لێ مارە کردی، طەلاقت دا دوایی دێی داخوازی ئەکەی واللە نایێتەوە لای تۆ ابداً، ئامۆزایەکەم پیاوێکی خراپ نەبوو، ئافرەتەکە مقصودی بوو بگەڕێتەوە لای مێردی و، لای خودا حاجەتی پیاوەکە بۆ ژنە و، حاجەتی ژنەکە بۆ پیاوە، معلوم بوو یەعنی مەیلەکەیان ڕاست بوو، ئەوجا ئەو ئایەتە دەرحەق من وارد بوو، کفارەتی سوێندم دا ولێم مارەکرد. ئێوە مەنعیان مەکەن..

﴿إِذَا تَرَٰضَوۡاْ بَيۡنَهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِۗ﴾ کە لەبەینی خۆیان بەیەک ڕازی بن، بە زەریفی و بەجوانی و بێ غلّ و غەش ﴿ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ مِنكُمۡ يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۗ﴾ ئەوی لە ئێوە ئیمانی بە خودا و ڕۆژی دوایی هەبێ، نصیحەت ئەکرێ بەو حوکمە پرر حیکمەتە و، قبوولّی (نصح) ئەکا بە قووەتی ئیمان و پاکی لە مزخرفات ﴿ذَٰلِكُمۡ أَزۡكَىٰ لَكُمۡ وَأَطۡهَرُۚ﴾ حاصلّی ئەوی ذکر کرا دائر بە ئەحواڵی زەواجو ناردنی، لە تەرەف خودا و پێگەیاندنی لە تەرەف ڕسالەت، (تلقی بالقبول) بە کمالی احترام، لە تەرەف لێقەوماوان،

یەعنی ئەوانی عنوانی مەسئەلەیان بالفعل بەسەرا هاتووە و، لە گوێگرتنی بۆ تۆش نەبوون، لە تەرەف امثالیان تا تووشی ئەو کەشماکەش و هەرایە نەبن، زێدە ترەقی و پاکی‌یە لەسەر دەرەجاتی کمال، قووەی علمی و عملی بۆ هەیئەتی عمومی، ئەمەش سرّی (ذلک) بە مفردی (ذلکم)بە جمع، (حقیقةً) جەماعەت لە عائلە، عائلە لە افراد پێک دێ، تا افراد پاک بێ، عائلە پاکتر ئەبێ و، کە عائلە پاکبوو، بالطبع هەیئەتی اجتماعی پاک ئەبێ، ئەو جا لەسەر تربیەیێکی چاک، سەعی بۆ زێدە چاککردنی اقوامی تر ئەکەن، بالطبع سیادەتی عالم ئەبێتە ئی وان

﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٢٣٢﴾﴾ فی‌الحقیقة ئینسان دائماً دوای هەواو هەوەسی خۆی ئەکەوێ، خصوص طمعی مال بۆ هەموو نەوع (لآمەتێکی) ئەبا، ئاگای لە مصالّحی خۆی و عائلە و عمومی نامێنی، ئەگەر بشزانێ قووەتی علیم و عەقڵی ئەمەندە نی‌یە، بەرابەری لەگەڵ هەواو هەوەسی بکا لەفەساد بیگێڕرێتەوە بۆ صلاح، بۆیێ لە ڕووی بەندەنەوازی، خوداوەندی (علام) فێرتان ئەکا و لەسەر زوبان پێغەمبەر پێتان ئەگەیێنێ، ڕووی خۆشو ناخۆشتان پێ‌نیشان ئەدا، ئەوجا دێنەوە سەرخۆ، ڕێی چاکە ئەگرن بە شەرتی قووەتی ئیمان بەخودا و بە ڕۆژی جەزا، کە (یوم لا تجزی نفس عن نفس شیئاً) قاعدەی فاطری سماوات و ئەرض، ئەگەرچی بە ئەمری (کنْ) خەلق و ایجاد ئەکا وایە، کە بە تدریج یەعنی وردە وردە، سەبرە سەبرە، ئینسان و سائری حیوانات و نباتات بۆ تکامل ترەقی‌یان پێ‌ئەدا، هەتا تکاملی دین، تکاملی دەوڵەت لەسەر ئەو قاعدەیە ئەبینن، تۆو، کە چاندرا، شین ئەبێ، چەندی پێ ئەچێ، تا بەر ئەدا، سابقاً فەرمووی «نساؤکم حرث لکم..الآیة» (انە) ئەوە ئەوەڵی تۆدانە، نابێ ئەوی تۆو ئەدا هەر بە تۆو دانو کێڵان خەریک بێ، ئەبێ، هەوڵ بدا بەری تۆوەکە پێ‌بگەیێنێ و بە خەسار نەچێ، بۆیێ ئەفەرموێ: ﴿وَٱلۡوَٰلِدَٰتُ﴾ با مطلقەش بن ﴿يُرۡضِعۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ﴾

خۆیان شیر ئەدەنە اولادی حاجەت بە ئەمر ناکا، ذاتەن لە مدەی حمل، هەر ئەو بە خێوی کردووە، لەوردە وردە دوگمەلۆکەی (مفرزە) موادی زوڵاڵی داوە بە جەسەدی (ولد)، ئەوەیش بە (غدد)ی ماصە هەڵی مژیوە، وانەزانن خوێن و خوزاوکی حەیضی دەرخوار دراوە، لەو عملیاتی ماکینەیی و کیمیایی طرفین، اصلاً شعوریان نەبووە محضاً بە تدبیری ئیلاهییە، هەر بەو نەوعە شیردانی دایک بۆ مەمک خۆر، ئەبێ بە طریقێکی فیطری بێ بە ئەمرێکی تکوینی بێ. بۆیێ بە طریقەی اخبار ئەفەرموێ (یرضعن) نە بە صورەتی ئەمری تکلیفی، (حقیقةً) حملی ئەو مشاقە، لە پاش گرانیی حمل و عەزابی منداڵ بوون، بێ ئەمری فیطری ناکرێ، وە معلومیشە ئەمری تکوینی قیاسی، لە ئەمری تکلیفی ناکرێ، وە لەبەر ئەم فیطرەتە شیردان و بەخێوکردنی دایک، قیاسی لە اجنبی ناکرێ، مەیلدانیان بە اکثری، مەیلێکی درۆیە (حنوّ) و مەرحەمەتی دایکی، وا لە قضا ئەخوازێ (ولو) قطعی علاقەی لەگەڵ باوکیشی بووبێ، علاقەی لەگەڵ جگەر گۆشەی خۆی (وهنی) پێ نەکا. ﴿حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ﴾ بێ کەم و بیش ﴿لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ﴾ دوو ساڵی تەواو بۆ کەسێکە، کە مقصدی اکمال و اتمامی شیردانی ولدەکەی بێ، تا تەنومەند و چاک دارژا بێ، کەمتر لەو مدّەیە بە خواردن و خواردنەوە، دەردەدار نەبێ منداڵەکەی نەکەنە سیسە مردۆخە و ورگ هاتی سیخورە ﴿وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ﴾ (ولو) دایکی منداڵەکەشی طەلاق نەدابێ ﴿رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ﴾ لای (شافعی) بۆ دایک هەیە طلبی ڕضاع لە مێردی خۆی بکات و، لەسەر بابیش اجابەی لازمە، (ولو) لە (اجرة المثل)یش زیاد بێ، بنا بە فەرموودەی (باپیرە مەلا عبدالله)م ئەوی طەلاق درابێ بالاتفاق حەقی حضانەی هەیە، تاکو ژنەکە بە قوەت بێ و لە برسان، یا لە سەرمان تووشی نەخۆشی بێشیری نەبێ، ئەوەیش دیسان لە مەرحەمەتی باوکییە، باوکیش لە قضا ئەخوازێ بۆ خاتری جگەرگۆشەی خۆی،بە زەریفی

تەماشای دایکی بکا، نەنوارێتە نەفرەتو قطعی علاقەی خۆیان. ﴿بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ ﴾ چۆنی لێئەوەشێتەوە، نەئەم بخیلی بکا، نەئەو طمع ﴿لَا تُكَلَّفُ نَفۡسٌ إِلَّا وُسۡعَهَاۚ ﴾ ڕوحی شریعەتی ئیسلامی ئەوەیە، هەر کەسە بە گوێرەی خۆی تکلیفی لێ ئەکا، نەک لە ئەحکامی ڕضاع، بەڵکو لە هەموو تکالیفێکی وایە، حتی اموری فطرییە بۆ فطرەت بە جێ ئەهێڵێ. لێرانە ئەگەر لەبەرمنافرەی طەلاق نەبوایە، تعرضی نفقەش نائەکرد، بنوارە اتمامی ڕضاعی حواڵەی ارادەی علاقە داران کردووە،والحاصل مقصود لێرە بەخێو کردنی منداڵە بە چاکی ﴿لَا تُضَآرَّ وَٰلِدَةُۢ بِوَلَدِهَا ﴾ هیچ دایکێک زەرەر بە ولدی خۆی نەگەیێنێ، لە خزمەتی قصور نەکا، بە نەفرەتی باوکی، دڵی لە حەق جگەر گۆشەی خۆی مکدر نەبێ. ﴿وَلَا مَوۡلُودٞ لَّهُۥ بِوَلَدِهِۦۚ ﴾ بخیلی نەنگەویستی دایک غلبە نەکا لەسەر ڕەحمی باوکی، ولد،ولدی خۆیەتی، ئەمەرەی حەیاتی‌یەتی، بە هەدەری نەدا. ﴿وَعَلَى ٱلۡوَارِثِ ﴾ ئەوی صدقی ئەو عنوانەی لێ بێ هەتا منداڵەکە ئەگەر ماڵی هەبێ ﴿مِثۡلُ ذَٰلِكَۗ ﴾ ارضاع وانفاقی لەسەرە، ئەگەر کەس نەبێ، لەسەر وارثی دینی‌یە بەخێوی بکا و تربیەی بدات، میللەتێک مبالات نەکا بە خزمەتی منداڵ زۆر نابی وەک میللەتی کورد، ئەگەرچی منداڵیان زۆر ئەبێ، ئەمما سەبەب بە جەهلی دایکیان و بخیلی باوکیان، کەمیان پێئەگەن، اکثر بە دایانیان ئەدەن، خانم، افندی ناتوانێ بەخێوی بکا، (مع انه)وەک باپیرە مەلا عبداللهم ئەفەرموێ: بۆنی بەر و باوەشی دایکی، گەلێ چاکترە بۆ ڕوحو فیطرەتی منداڵ، لە خزمەتو شیردانی اجنبی و، بۆ اخلاقیش گەلێ تەئسیری هەیە، ڕضاعی طبیعەت ئەگۆڕێ، طبیعەتێکی ثانیەی تێدا پەیدا ئەکا، زۆر ئەبێ لەسەر طبیعەتی اولیة غلبە ئەکا ﴿فَإِنۡ أَرَادَا ﴾ دایک و باوک ﴿فِصَالًا ﴾ منداڵەکە لە شیر بکەنەوە، تەماشای قووەتو بنیەی منداڵەکە نەکەن ایجابی کرد، کەمتر

لە دووساڵ لە قضای خواست زیاتر ئەو قصد و تصمیمەش ﴿عَن تَرَاضٍ﴾ صادر بێ لە ڕەزای قلبی، سەرزوبانی نەبێ بێ (اکراه و اجبار) ﴿مِّنْهُمَا﴾ لە هەردووکیان ﴿وَتَشَاوُرٍ﴾ مشوەرەت کردن،تدبیر و (مدانشه) بۆ حسن و حاڵی ولد، ئەمجا ئەم (تراضی و تشاوره) ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا﴾ گوناهیان لەسەرنیـیە لەو لە شیرکردنەوە. سبحان الله تەماشای اعتنای حەضرەتی کبریائی بکەن، بۆ بەخێو کردنی منداڵ و متحیر بن لە بێمبالاتی موسڵمانان، کە لە (قبر)دا لێیان ئەپرسن: امامت چییە، یەعنی پەیرەوی چیت کردووە؟ ئەویش ئەبێ بڵێ: (قورئان).

﴿وَإِنْ أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُمْ﴾ ئەگەر ئارەزووتان کرد منداڵی شیرەخۆرەی خۆتان بدەن بە دایان ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾ بۆ شیردانی دایک، بۆ لە شیر کردنەوەی منداڵ لە مەمکی دایک،ڕەزا ومدانشەی دایک و باوک کافیبوو، ئەمما بۆ شیردانی اجنبی (عقلای) طرفینی پێ ئەوێ، کە قەرار بدەن لەسەر بەشیردانی منداڵ لە غەیری دایکی خۆی، کەوابێ ئەو خطابە (ان اردتم) تەنها بۆ باوکەکان نییە، گۆیا کە هەوەسیان هێنای منداڵەکان لە دایکیان بستێننەوە بیدەن بە دایان، (حاشا ثم حاشا) لەو مقامە، چۆن ئەمە بە دڵ دا دێ، ئەوە بە جارێ ئایاتی سابقە بە با ئەدا. ڕەحمەت لە باپیرە مەلا عبداللەم بێ: ڕازی نییە بەوقسە، کە ئەگەر دایک طلبی اجرەتی زیاتر لە (اجرة المثل)ی کرد و، اجنبییەک ڕازی بوو بە کەمتر منداڵەکە بدرێتە دایان و، تعجب ئەکا لەو علمایانەی، کە بەو نەوعە فتوایان داوە، کە ڕعایەتی صرفی ماڵ ئەکەن، ئەمما ڕعایەتی احوالاتی ڕوحی و بدنی منداڵەکە ناکەن، وە عیلمی (طب)ی ئەمڕۆ زۆر اهتمام ئەدا بە شیردانی دایک، مادام الامکان، ڕێ نادا بۆ شیردانێ اجنبی، ئەمما بەو شەرتە گوناهتان لەسەرنییە، کە ﴿إِذَا سَلَّمْتُم مَّآ ءَاتَيْتُم بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ کە تەسلیمیان

بکەن ئەوی بۆتان داناون بە مناسبی حاڵ، بەڵکو لە خزمەتی منداڵـەکە بـە نشاط و بـێ قـصور ئـەبـێ، ئـەگـەر معاشـیان بـە زەریفـی نـەدرێتـێ طبعـاً (رخاوەت ) ئەکەن و، نزیکە سەربکێشیتە سەر هەلاکەتی منداڵەکە، ئەمەیش بەوشەرتە، کە ژنەکە موسڵمان و انصاف و بە مەرحەمەت بێ، ئەمما دایانی ایامی ئێمە علاوەی مانگانە، ئەبێ زۆر خزمەت بکرێ و منداڵەکەیش دائماً لە ژێر نظارەتی دایک و باوکی بێ.

موسڵمانێکی باش، دراوسێی ئێمە، کچێکی دا بە دایان، ژنـەکـە لادێیـی بوو، هەموو آخری مانگان ئەینارد بۆ (جیرە) بـەشـارەتـی بـۆ ئـەناردن، کـە منداڵەکە الحمد لله زۆر چاکە، صحەتو عافیـەتـی مکملـە، ماشـاءالله لانکـی پڕرکردووە!.. وبعضاً خۆی ئەهات، زۆر خزمەتیان ئەکرد صـابـون و چیـت و شەکر و خورمایان ئەدایێ، ئەیان گوت: ئەو منداڵە چۆن صبر ئەکـا، تـا تـۆ ئەچیەوە؟ چونکە دێیەکە نزیک پێنج ساعەت لە شار دووربـوو، ئـەیگـوت سپاردوومە بـە ژنێکـی بـاش و، منداڵـەکـەیـش ئولفـەتـی پێـوە گرتـووە، تـا ئەچمەوە ئاگاداری ئەکا، ئامان! با خیرا بڕۆم، نەوەک کچەکـە عـاجز ببـێ و بیرمبکا. بەونەوعە تـا نزیکـی سـاڵێک، دەفعـەیـەک چـەنـد ژنێـک لـە اهـالی دێیەکە دێنە شار، تصادف دەچنە دوکانی باوکی کچەکـە، تـا بـەعـضــێک چشتی لێبکڕن، ئەحواڵی ڕۆڵەی خۆی لێیان ئەپرسی، ئەڵـێن: کچـی چـی؟ بۆ تۆ هێشتا نەت زانیوە، نزیکی حـەوت مانگـە ئـەو بـەسـتەزبانـە مـردووە؟ بێچارە دەست ئەکا بە گریان.

ئەوجا چۆن دڵ بڕوا ئەدا، ئینـسان منـداڵی خـۆی تـەسلیم اجنبـی بکـا؟ ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ هەموتان لەخودا بترسێن، بالخاصة لـە تـەربیـەتـی اولاد قـصور مەکەن، بەبخیلیو خیانەت مەیان فەوتێنن ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٣٣﴾﴾ ئەمما ئەو ئیمانە لە کەم دڵان دا حاضرە، خاصةً دڵی دایانانی ئەم زەمانە.

بەیانی (عدّة)ی ژنی سەرو، عوزر شۆرمان کرد، ئـەدی ئـاخرەتـێ مێـردی

بمرێ و، ئاوس نەبێ، (عدّە)ی چیە و چەندە؟ ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوۡنَ مِنكُمۡ﴾ ئەوانى ڕوحیان قبض ئەکرێ بە مردن، یا بە (قتل) شەهید و غەیرە شەهید لەئێوە، ئەی موسڵمانینە ﴿وَيَذَرُونَ أَزۡوَٰجٗا﴾ ژنیان تەرک ئەکەن، لەپاشیان بەجێ ئەمێنێ ﴿يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرۡبَعَةَ أَشۡهُرٖ وَعَشۡرٗاۖ﴾ خۆیان بگرن چوارمانگ و دە شەو، بەعضێک ئەفەرموون، ڕۆژی دەیەمین تابعی (عدّە) نیە، ئەمما قسەکەیان ئەگەرچی نظر بە قاعدەی (تذکیرو تانیث)ی عدد دێ، بەڵام نظر بە نکتەی قسەکەیان خۆی نیە، بۆیێ اشارە بۆ (تربص) شەو ئەفەرموێ، چونکە خۆگرتنی ژن، اثری لەشەو دەرئەکەوێ، لەشەو یادی مونس ئەکا، ئەمما بە ڕۆژ ئەخافڵێ، لەگەڵ ئەم و ئەوهە لئەستێ، دائەنیشێ، گفتوگۆ ئەکا.

﴿فَإِذَا بَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ﴾ کە گەیشتنە نهایەتی عدّەی خۆیان ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ﴾ وەبال نیە لە سەرئێوە، ئەی علاقەداران﴿فِيمَا فَعَلۡنَ فِيٓ أَنفُسِهِنَّ﴾ لەوی عائد بە نفسی خۆیان، (کانە) لە نەفسی خۆیاندا ئەیکەن، مادام ئەوی ئەیکەن ﴿بِٱلۡمَعۡرُوفِۗ﴾ بێ چ خلاف ئاداب و شرعی تێدا نەبێ، حەقی هیچ کەستانی بە سەرەوە نیە، لێی مەکەن بە هە لڵا و هۆریا: «بۆ وائەکا؟ دیارە هەوەسی لە مێردییە! عەییە.. ئەمە قبووڵ ناکەین!» حەقتان نیە ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ٢٣٤﴾ خودای تعالی ئاگادارە بە ئەوەی ئەیکەن، هەمووتان نێرومێ، وە ئەزانێ لەو اعتراضو (تنقیدە) غەرضتان چیە.. مەیلی نەفس بۆ ژنی (عدّة) چوو، کە لە ئاداب دەرنەچێ، خودا بە گوناهی نازانێ، (جلّ الله) بۆییش ئەفەرموێ ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ﴾ ئەی موسڵمانینە! ﴿فِيمَا عَرَّضۡتُم بِهِۦ مِنۡ خِطۡبَةِ ٱلنِّسَآءِ﴾ بە ئەوە، کە تعریضی پێ بکەن، بێنوێنن لە داخوازی ژنانی مێرد مردوو بە ڕێی کنایەت:

( (ئارەزوومە ژن بێنم.. حەزم لە ژنێکی واو وایە، من زۆر باشم لەگەڵ ژن.. ئەوی مێردم پێ بکا، لە خۆشی ئەبێ..)) بەوگوێرە نە وەک بە تصریح.. ﴿أَوۡ أَكۡنَنتُمۡ فِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ﴾ یاخود لە نەفسی خۆتاندا بزر کردووە، مەیلتان هەیە پاش (عدّة) ئەو ژنە مێرد مردووە مارە بکەن، لەسەر ئەو مەیلە چ گوناهتان لەسەر نی‌یە ﴿عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمۡ سَتَذۡكُرُونَهُنَّ﴾ خودا ئەزانێ ئێوە بەحتیان ئەکەن، ئەو نەفسی‌یە سەوقتان ئەکا بۆیێ ڕوخصەتی دان بەو نەوعە باس کردنە ﴿وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا﴾ معاهدەیان لەگەڵ مەکەن بە دزی، ئەوەگوناهە، خودا لەسەر ئەوە ئەگەر بیکەن عتابتان ئەکا، ئەگەرچی ژنەکە بۆ زەمانی عدّة هیچی پێ ناکرێ، ئەمما قابلە لەسەر ئەو وەعدەیە، زمامی ئیرادەی لە دەست دەرچێ، بەعضێ حرکاتی وا بکا، کە اهلو اقاربی مێردە مردووەکەی پێیان ناخۆش بێ... موجبی دڵ شکستەگیان بێ ﴿إِلَّآ أَن تَقُولُواْ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗاۚ﴾ قسەیێک بکەن قسەیێکی جوان، مناسبی حاڵو وەقت، موجبی تهیجی دڵو مەیلی ئافرەتەکە نەبی، ئەوە دروستە گوناهی نی‌یە، ﴿وَلَا تَعۡزِمُواْ عُقۡدَةَ ٱلنِّكَاحِ﴾ عەزم و جزم مەنێن لەسەر گرێی مارە کردن ﴿حَتَّىٰ يَبۡلُغَ ٱلۡكِتَٰبُ أَجَلَهُۥۚ﴾ لێگەڕێن، تا ئەوەی نووسراوە، ثابت کراوە، ئەگاتە ئاخری خۆی، ئەو وەقتە (بلا اثم و لا حرج) ئارەزووتان هەیە مارەیان بکەن..

﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ﴾ هەرچی هەبێ چاک و خراپ ﴿فَٱحۡذَرُوهُۚ﴾ لە خودا حەزەر بکەن، چشتی خراپ لەدڵی خۆتان قەرارگیر مەکەن. ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٞ ٢٣٥﴾ بۆیێ بە مەیلی نەفس، کە خاڵی بێ لە اثری خراپ ناتان گرێ، ئەو کەسەی قانون دائەنێ، مراعاتی احواڵی نفسیە بۆ ئەو، لە هەموو چشت لازم ترە ئەوەیش لە حەقیقەتدا هەر بە

خودا ئەکریٚ، هەم شارعەو هەم فاطر.

﴿لَّا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ چتان لەسەر نییە ئەگەر ژنانتان طلاق دا ﴿مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أَوْ تَفْرِضُوا۟ لَهُنَّ فَرِيضَةً﴾ مادام دەستتان لیٚ نەدابن، یا چیتان بۆ تەعین نەکردبن ﴿وَمَتِّعُوهُنَّ﴾ چشتیٚکیان بدەنیٚ نفعی لیٚببینن ﴿عَلَى ٱلْمُوسِعِ قَدَرُهُۥ وَعَلَى ٱلْمُقْتِرِ قَدَرُهُۥ﴾ دەوڵەمەند بە گوێرەی دەوڵەمەندی، فقیر بەگوێرەی فقیری ﴿مَتَٰعًۢا بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ متاعیٚکی (بین الناس مقبول) بیٚ،بە گوێرەی اصناف ﴿حَقًّا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٢٣٦﴾﴾ ئەو متاعەی بالمعروفە ثابتە لەسەر ئەهلی احسان. زۆرترین ئەهلی عیلم ئەفەرموون: ئەوە واجبە. (ئیمامی مالک) لای وایە (مستحبە) —انە— ئەوە خێریٚکە و احسانیٚکە ئەیکا، ئەگەر واجب بوایە ئەی فەرموو: (حق علیکم)، ئەمما فەرمایشی ئیمامی مالکیان ڕەد کردۆتەوە، ئەڵێن: (محسن) خاص (متطوع) نییە و، حکمەتی شارعی بۆ دەفعی وەحشەتو ناخۆشی، ئیجاب ئەکا ئەو حەقە واجب بیٚ، خودا ئەفەرمویٚ: من محسنم خۆش ئەویٚ بۆ ئەوەندە ماڵە، کەس نەتوانیٚ خۆی محروم بکا لە محبەتی خودا؟ (مجددی میصری) تحقیقاتی لطیفی هەیە شایان مطالعەیە.

﴿وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ﴾ ئەگەر طەلاقتان دان لە پیٚش دەست لیٚدانیان حاڵیش وابوو ﴿وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً﴾ مارەییتان بۆ تەعین کردبوون ﴿فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ﴾ نیوەیان ئەکەویٚ ﴿إِلَّآ أَن يَعْفُونَ﴾ الاّ مەگەر ئافرەتەکان مسامحە بکەن، دەست لە نیوەکەیش هەڵ بگرن، ئەو وەقتە چەتان لەسەر نابیٚ ﴿أَوْ يَعْفُوَا۟ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ عُقْدَةُ ٱلنِّكَاحِ﴾ یا عەفو بکا ئەوی گریٚی نکاحی بەدەستەوەیە، هەوەسی بیٚ ئەیکاتەوە، هەوەسی بیٚ حفظی ئەکا دیارە ئەوەیش میٚردە، ئەو وەقتە مارەیی‌یەکەی ئەدریٚتیٚ ﴿وَأَن تَعْفُوٓا۟﴾

ئەی پیاوینە ﴿أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰۚ﴾ نزیکترە لە خۆپاراستن لە شک و (رَیب) و توهمەت،کە ئەو طەڵاقە لەبەر لەککەیەک نییە لە تەرەفی ژنەکە، بەڵکو ئەگەر معذرەتێک هەبێ لە تەرەف پیاوەکەیە، بۆیێ هەموو حەقەکەی داوەتێ، ئەو مەعنایە لە تەرەف (مجددی میصری)یە ﴿وَلَا تَنسَوُاْ ٱلۡفَضۡلَ بَيۡنَكُمۡۚ﴾ کمال وحسنی آداب، بە واسطەی ئەم طەڵاقە لەبەینی خۆتان فەرامۆش مەکەن، ڕابطەی پێشوو تێکمەدەن، یاخود زێدەیی و شەرەفی پیاو لەسەر ژن، بۆ طمعی نیوە مارەییەک لە فکرمەکەن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ ٢٣٧﴾ هەرچی بیکەن لەخودا بزر نابێ، ئەوی مارەکرابێ دەستی تێ نەدرابێ، طەڵاق درابێ، بە اعتباری (مهر) ئەوقسمەیە.

سابقاً پاش ئەمر بە (توجە) بۆ تەرەف مسجد الحرام، وەعدەی اتمامی نیعمەتیدا و، پێش (ولا تقولوا لمن یقتل فی سبیل اللە اموات بل احیاء عندربهم یرزقون) فەرمووی (واستعینوا بالصبر والصلواة) ، لێرەیش لەمیانەی باسی طەڵاق و عدّة ئەفەرموێ:

﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلۡوُسۡطَىٰ﴾ بۆ ایقاضی موسڵمانان مقصود، لە فکر نەکەن متوجە الی البیت الحرام بن. خۆیان بە تەڵاق و (رجعە) و ئەمانە مشغوڵ نەکەن! مواظبە بکەن لەسەر نوێژان و تەواوی بە جێیان بهێنن. نوێژ ڕابطەیەکی بە قووەتە لە بەینی ئێوە و خوداو، خۆبەخۆیتیان حەیفە بە تەڵاق قطعی علاقە لەگەڵ یەک بکەن.. کەسێ مەئمور بێ، دائماً (متوجە الی اللە) بێ، چۆن لەگەڵ ئیمان، چ نێر چەمێ قطعی صلە ئەکا، خصوص ڕەفیقەی حەیات و مەمات؟ و مصدری اولاد، کە ئەمەرەی حەیاتن؟ نوێژ لەگەڵ دەورەیەکی شەو و ڕۆژی، پێنج جار بە سەر ئێمە دادێ و ئە ڕوا، (کانە) لەسەر دائرەیێک داندراوە (عدد)ی تاق، هەر کامی لێی بگری، ئەو وسطە مختارە لەلای.

(صلاتی وسطی) نوێژی معین نی‌یە، بە اعتباری اصنافی مکلفین، هەر یەکێ لە ئەمانە قابلە ببێ بە (وسطی)ی اصل. بۆ محارب اکثر سەعی ئەکەن، تێئەکۆشن گەرمەی شەڕر ئەخەنە پاش نیوەڕۆ، تا پێش مغرب احرازی ظفر بکەن، نیوەڕۆ بۆ ئەهلی کەسابەت و موظفین ماندوو ئەبن، ئارەزووی ئیسراحەت ئەکەن، هەنگامی قاوەڵتیە.. اعتنا بۆ ئەوان بە نوێژی نیوەڕۆ لازمە، نوێژی مغرب، حسب العادة پێش نان خواردنە، کورد پێی ئەڵێ: «نوێژی شێوان»، نظر بە برسیان ئەو (وسطی)یە عشا بۆ ئەهلی (لهو و لعب) ، وە ئەوانی حەزیان لە خەوە یەعنی زوو بخەون، کورد «نوێژی خەوتنان»ی پێ ئەڵێ. نوێژی سبەینە بۆ خەو خۆشان، تەمبەڵ و بەدەن گرانان، خاصة زستانان لە وڵاتە ساردەکان، ئەم قسە لام وایە ئەهلی ئینصاف قبووڵی ئەکا.

﴿وَقُومُواْ لِلَّهِ قَـٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾﴾ ڕاوەستن بۆ خودا لە نوێژ، بە دوعا و خضوع و خشوع «ئەمە لە وەقتی ئەمینی و هێمنایی». ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا﴾ ئەگەر ترستان بووبە پیادەیی،یان بە سواری،چۆنی ڕێک کەوت نوێژەکە بکەن، مقصود حضوری دڵە، غافل نەبوونە لە خودا، بەو هەیئەتەی، کە داندراوە، بۆیێیە، کە ڕوو لە هەموو چشت وەربگێرری، ڕووبکەیە مسجد الحرام، تا (خاطر جمع)بی ؛ ئەگەر بەو هەیئەتە ممکن نەبوو، بەجێهێنانی ڕوحی نوێژ کافی یە ﴿فَإِذَآ أَمِنتُمْ﴾ کە ئەمین بوون و ترستان نەما ﴿فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٣٩﴾﴾ ذکری خودا بکەن، نوێژی بەجێ بهێنن، وەکوو فێری کردوون؛ ئەوی پێشان نەتان ئەزانی چۆنی داناوە، وای (ادا) بکەن، ئەدای مقصود بەو عیبارەتە، بۆ مننەت دانانە لەسەر عیباد بە نیعمەت فێر کردن..

بۆ اتمامی بەحثی ژنی‌مێرد مردوو، پاش ئەمر بە محافظەی نوێژان

ئـەفـەرمـوێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا ﴾، بـەڵام اهماليـان نەکردوون ﴿وَصِيَّةً لِّأَزْوَاجِهِم ﴾ بەڵکوو وەصيەتيان کردبێ لە حەق ژنانيـان بـەتأکيـد و اهتمـام ﴿مَّتَـٰعًا إِلَى ٱلْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ ﴾ نفقـە، مـەسکەن هـەتـا ساڵێک بێ دەرکـردن، ئێـوە ئـەو وەصـيەتـە بـەجـێ بهێـنن، مـەڵـێن: ئـەو وەصيەتە لە (وارثان) نابێ، ئەو مشقەتە بە ئێمە ناکێشرێ و باری گرانە!!

بۆ حرمەت مردووەکەتـان تحملـی بکـەن ﴿فَإِنْ خَرَجْنَ﴾ بـە طيبـی نـەفسی خۆيان بێ قەباحەت لە تەرەف ئێوە چوونـە دەرەوە ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِيٓ أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعْرُوفٍ ﴾ چ گونـاه لـەسـەر ئێـوە نـیـيـە، وە مەسئەلەی پێشوو،اموری نفسيە،کە لە ئەدەب دەرنـەچـێ نـابێتـە سـەبـەبـی (لەومە) ، کەوابێ ئەم دوو حوکمە يەعنی خـۆگرتن چـوار مانـگ و دە ڕۆژو، دەرنەکردن تا ساڵێک، هيچ تەنافيان لە بەيندا نیيە، تا بڵێين لێرە (نـسخ) هەيە وەکوو جمهور ئەفەرموون: ئايەتی سابقە لە نـەظمـی (قـرآن)دا ناسـخە بۆ ئەم ئايەتە؛ چونکی لە نەظمی نزول ئـەم ئايـەتـە (مقدمـە) لـە (اولـە).. علمای سەلەف (مجاهد) ، ئينکاری ئەو نەسخەی کردووە، پـاش ئـەو، (ابـو مسلمی اصفهانی) ، کە لای وايە نەسـخ لـە قورئـان دا نـیـيـە، بـە قاعيـدەی خۆی مەعنايەک لە (ئايەت) ئەداتەوە، کە هيچ تەنافيان لـە بـەيـندا نـەبـێ. (فخری ڕازی)يش لێرە زۆر تقويەی فەرمايشی ئەو ذاتەی کـردووە، وەهـەروە ها (مجدی مصری و تلميذی عصری) ، حقيقةً تا ممکن بـێ ڕێی نـەسـخ نەدرێ، خصوص ئەو نەوعە نەسخە بێ نەظمە، (مع انـه) وەک ئيـشارەمـان بۆ کرد، موضوعی قضيەکان لـەيـەک جـودان، وە هـەم لـە ئايـەتـی پێـشوو «وصية لازواجهم» قەيدی نەبوو، وە هيچ دەليليش نیيە، کە ئەم وەصيەتە لـە تـەرەف خـوداوە بـێ، بـەڵکـوو ظـاهـر وايـە وەصيەتـەکـە لـە تـەرەف مێردەکانەوە بێ.

﴿وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٤٠﴾﴾ ئەو حوکمەی ئەو دای بنێ، بنای لەسەر حیکمەتە، ئەوی ئینصاف و شعوری هەبێ، ئەزانێ جێی اعتراض نییە، کەسێکی زۆر (غالب) نەبێ لە عیلم، ناتوانێ ئەو حوکمە بۆ گوێرەی احوالآتی متناسبە دابنێ، از جملە لە مقتضای حیکمەتی حەکیم (علی الاطلاق). ﴿وَلِلْمُطَلَّقَٰتِ﴾ (ولو) دەستی لێ نەدرابێ، وە یا خود مارەیی تەواو وەرگرتبێ، مادامەکو شکستی تەڵاق ڕووی داوە بۆ لەحیم کردنەوەی ﴿مَتَٰعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ یان هەیە ئەویش ﴿حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٤١﴾﴾ ثابتە لەسەر ئەو کەسانەی خۆ بپارێزن، خاصةً بە قطعی ڕابطە لەگەڵ کەسێکی، کە هەمدەمی حەیاتی ئەوبێ، لەسەر ئەوانە حەقە لە هەنگامی فصلیش وەصلێک بکەن. ﴿كَذَٰلِكَ﴾ بەو گوێرە پڕر حیکمەت و مصلحەتە ﴿يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ﴾ خودای تعالی ئایاتو ئەحکامی بۆ ئێوە بەیان ئەکا، ئێوە تێ بفکرن چۆن لە هەر حوکمێک، حیکمەتێک بەیان ئەفەرموێ، کە ئینسان گەردن دادەی اطاعەت بێ ئەو بەیانەیش ئەفەرموێ ﴿لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٤٢﴾﴾.

لە جملەی مواعظ و (عبر)ی جەنابی ئەمەتان دەهێنێتەوە بەر چاو کە ئەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ﴾ ئەی عاقڵمەندینە! ئایا ئێوە نەتان دیوە، عیلمتان نەگەیشتوەتێ ﴿إِلَى ٱلَّذِينَ خَرَجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ﴾ خەبەری ئەوانەی، کە لە وڵاتی خۆیان چوونە دەر، ئەوانیش هەزاران بوون لە ترسی مردن؛ کوژران بە چنگ دوژمن، نەوەک لە ترسی تاعونو شتیتر؛ لە ترسی مردن هەڵاتن کەچی تووشی مردنێک بوون، کە هەزار دەرەجە لە مردن خراپتر بوو ﴿فَقَالَ لَهُمُ ٱللَّهُ مُوتُوا۟﴾ خودا دەربارەی ئەوان فەرمووی: (بمرن!) هەر بمرێ ئەو نەوعە قەومە پەڕاگەندە! لە حەیاتی اجتماعی بێ بەهرە! لە

ژێر دەستی دوژمن ڕەزیل! بێ حەیات و حریەت!! دەک ئەو ژینە هەزار جار بە قوربانی مردن بێ ﴿ثُمَّ أَحۡيَٰهُمۡۚ﴾ دوایی پاش چەندێک، خودا زندووی کردنەوە، لە حاڵی خۆیان گەیشتن و ڕوحێکی اجتماعیان لەناو پەیدابوو، نەسلێکی بە قووەتیان پێگەیاند.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾ خودای تبارک و تعالی، صاحبی فەضل و کەرەمە لە حەق ناسان.. گەلێ میللەتی زندوو کردۆتەوە، کە نەدەهاتە خاترو خەیاڵ:

زۆر بـــووە بـــەرخـــەکـــی لـــەرر و لاواز
بویتـــە خرتێکـــی دونـــگ زەلام و قـــە ڵـــەو!
یـــان منـــاڵێکی سیـــسە مردۆخـــە
بویتـــە مـــەردێکـــی گـــورج و گـــۆڵ و پتـــەو!
گـــەلـــێ میللـــەت وە هـــا بـــەســـەر کـــەوتـــن
کـــە نـــەبێتـــە خـــەیـــاڵ و وەهـــم و خـــەو
بـــۆیێ ئومێـــد ئـــەکـــەم لـــە لـــوتفی خـــودا
خـــالقی مانـــگ و ڕۆژ و ڕۆژ و شـــەو
کـــوردەکـــانیش بکاتـــە صـــاحـــب جـــاە
«ســـنة اللـــە فـــی الـــذین خلـــوا»

فەرقی موسڵمان و غەیرە نییە، چون لە حیاتی دنیەوی شریکن، ڕێ، یەک ڕێیە، (فاطر) امتیازی کەسی نەداوە، هەروە ها حەیاتی اجتماعی و استقلالیش فەرقی نییە، ئەوی تێبکۆشێ؛ پێئەگا.

﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ٢٤٣﴾ شوکرانەی خودا ناکەن، یا «محضاً» لە قووەتی خۆیان ئەزانن، ئەوانە مغرور ئەبن.. ئاخری تێئەگلێن، یا ئەیدەنە کرامات و هیمەتی مشایخان، ئەوانە (بالمرة) ئەمرن و قابلی زندوو بوونەوە نین. تەفسیری مردن و زندوو بوونەوە بەو نەوعە، لە

تەرەف (مجددی مصری) (حقیقةً) زۆر جوانە، چونکە ئەو ئایەتە بەو اعتبارە بۆ وەعظە؛ ممکنە ئەوی گوێدێرە ئەم حیکمەتە لە گوێ بگرێ، خاصةً ترسێکی زۆری تێدا هەیە بۆ (انصاران)؛ نەکەن لە ترسی دوژمن دار، دیاری خۆیان بەجێبهێڵن، و ضمناً بەشارەتیکێشی تێدا هەیە بۆ (مهاجر)ینان، کە لە دار ودیاری خۆیان دەرکراون، کە جەنابی حەق زندوویان ئەکاتەوە.. بە دارو دیاری خۆیان شادئەبن، کە تتمەی ئەو بەحثە (عن قریب) دێ، بەڵام، ئەوانەی (عشاقی خوارقن)، فریفتەی شواذ و نوادرن، گوێ نادەنە ئایاتی (عبر)، چاوی (نظر)یان نییە، خۆزیا نیسبەتی (احیا و اماتە)یان بدابوایە بۆ خودا و، بەس مەلائکەت و عەمر و زەید و ئەمانەیان داخل نەکردایە، (سبحان اللە) مردوو زندوو کردنەوە و فوو لە هەمبانەی چەقووگەریان لا وەکوو یەکە.. ئەی موسڵمانینە! عیبرەت بگرن، مەترسن، استحقاری (مردن) بکەن، تاکوو بگەن بە حەیات.

﴿وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ بۆ اعلای کلمەی حەق، بێ شائبەی عداوەتی قلبی، رێ بکەنەوە، دەرگەی حەج گوشادی کەن، بەیتی خودا لە (لوث اصنام) پاک بکەنەوە ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ٢٤٤﴾ خودا ئەبیێ، ئەزانێ، مثقالە ذەرەیێک «ما فی الضمیر »ی عبد لەو بزر نابێ!.

﴿مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقۡرِضُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا﴾ کێیە ئەو کەسەی، کە قەرض لەگەڵ خودا بکا بە قەرضێکی چاک؛ لە رێی خودا ماڵ و رۆح (بذل) بکا؟ کێ بێ مەرد بێ و لە مەردانی عالەم نیشانی هەبێ، خۆی بگەیێنێتە ئەو دەرەجە، خوداییکی، کە (غنی عن العالمین)ە قەرضدار بکا.. خەیاڵ نەکا، کە ماڵی بە ضایع ئەڕوا، حەیاتی بە هەدەر ئەچێ؟! ئەوی ئەو قرضە لەگەڵ خودا بکا ﴿فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضۡعَافٗا كَثِيرَةٗ﴾ خودای تعالی قەرزەکەی بۆ دووچەندانە بکا، نەک بە (حصر) لە دوو چەندانە بێ، بەڵکوو بگاتە دەرەجەیەک بە غەیری خودا، کەس نەتوانێ حصری بکا.. ئەوجا ئەوی

حەزی لە ڕیایە، با ڕیا لەگەڵ خودا بکا_ ئێوە ئەوە حەمل مەکەنە سەر مبالغە، ﴿وَٱللَّهُ يَقۡبِضُ وَيَبۡصُۜطُ﴾ ئەزانن کێ قەرزەکە وەرئەگرێ؟ خودا، ئەزانن کێ بەو نەوعە زیادیە قەرز ئەداتەوە؟ خودا، کەوابێ توّقف مەکەن. دوایی ڕوایەتم لە (قتادە) و (اصم)و (زجاج) دیت، کە فەرموویانە: «یقبض الصدقات ویبسط الجزاء علیها» زۆرم پێخۆش بوو، چونکی ئەو قبضە لێرە، ئەبێ بە مەعنای عطا نەکردن نەبێ و، «قبض» بەو مەعنایەیش لە جێی مناسبی خۆی دێ، ﴿وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ٢٤٥﴾ ئەو ڕۆژە بە مکملی قەرضی خۆتان وەرئەگرن، عجبا بۆ چ کەس جواب نادا بڵێ:

(آتش بجان افروختن، از بهر جانان سوختن

باید زمن آموختن، کار من است این کارها)

لای من وایە جەواب لە آخری سورەت بە دەرئەکەوێ، بەڵام بەعضی چشتی پێ ئەویست بۆ تثبیتی موسڵمانان، تا جوابەکە نەبێ بە ادعا و، هەم مدخولی «الم تر»ی ئێرە مناسبی حاڵی انصارانە، کە لەسەر ماڵ و موڵکی خۆیانن ترسیان ئەداتێ: نەکەن لە دار و دیاری خۆیان دەربچن، نەوەک معاذ الله تووشی مردنێک بێن، کە زندوو بوونەوەی پاشووی نەبێ و، ئەو قتالەی، کە ئەیکەن (محضاً) لە ڕێی خودایە، عداوەتیان لەگەڵ کەس نەبووە، دەرنەکراون لە موقعی خۆیان، و ئەو ماڵەی صەرفی ئەکەن بۆ انتقام لەدوژمن نی‌یە، محضاً بۆ خودایە، (کانە) قەرزێکە لەگەڵ خودا ئەیکەن، ئەمما ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلۡمَلَإِ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ زیادە مناسبەی لەگەڵ حاڵی مهاجرین هەیە،ئەوجاتاکومناسبەی حاڵی هە ردوو فرقە تەواو ببێ، جوابە کە تاخیر کرا.

﴿مِنۢ بَعۡدِ مُوسَىٰٓ﴾ وجوه و اشرافی بنی‌اسرائیلی، لە پاش وەفاتی حەضرەتی موسی، ناشوکری نەبێ لە زەمانی حەضرەتی موسی، چیان نەکرد پێیان بڵێین اشراف.

بزانن جەنابی حەق لەو مقامە، چۆن بە عنوانی شەرەف یادیان ئەکا، ئەو اشرافە کرامە لەبەینی خۆیان تدبیریان کرد: « چۆن بکەین خۆمان نەجات بدەین، لە ظلمی ئەسارەت خۆمان قورتار بکەین؟».

﴿إِذْ قَالُوا۟ لِنَبِىٍّ لَّهُمُ﴾ کە بە پێغەمبەرێکی خۆیان گوت: هەر کەسێ ببێ لە قورئان تەعیین نەکراوە، و لە تەعیینیش چ فائدەی نییە، عەرضیان کرد ﴿ٱبْعَثْ لَنَا مَلِكًا﴾ بۆ ئێمە بنێرە پادشاهێک، لە ژێر رئاسەتی ئەو، بە ئەمری ئەو ﴿نُّقَـٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ﴾ (انە) تۆ انتخابی بکە کەسێکی ئەوها، کە هەموومان پێی رازی ببین ﴿قَالَ﴾ نبی یەکە فەرمووی: ﴿هَلْ عَسَيْتُمْ﴾ ئایا نزیک ئەبن ﴿إِن كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ﴾ ئەگەر شەررکردنتان لەسەر نووسرا ﴿أَلَّا تُقَـٰتِلُوا۟ ۖ﴾ لە شەرر نەکردن ﴿قَالُوا۟ وَمَا لَنَآ أَلَّا نُقَـٰتِلَ﴾ ئەشرافەکان گوتیان سەبەب بۆ ئێمە چییە، کە شەرر نەکەین ﴿فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ لە راهی خودا، بەڵکوو موجبێکی بە قووەت هەیە بۆ ئەربابی حمیەت.

﴿وَقَدْ أُخْرِجْنَا مِن دِيَـٰرِنَا وَأَبْنَآئِنَا ۖ﴾ دەرکراوین لە دیاری خۆمان، دوور کراوین لە ابنای خۆمان، ئەوانی ضعیف نەیان توانیوە هەڵبێن، یا خود ئەهمیەتیان نەداوێ دەریان بکەن، لە بەر دەستی دوژمنەکان ماونەوە﴿فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ﴾ کە شەرریان لەسەر نووسرا ﴿تَوَلَّوْا۟﴾ اعتراضیان کرد، روویان وەرگێررا ﴿إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ۗ﴾ الاّ کەمێک نەبێ لەئەوان ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٢٤٦﴾﴾ ظاهری ئایەت وایە هەر، کە شەرریان لەسەر نووسرا پێش ئەوی کە، بالفعل تووشی شەرر ببن پەشیمان بوونەوە، بۆپێش جەنابی کبریائي، جوابی (نبی)یەکە و جوابی ئەوانی بێ (فا)ی فەرموو،

ئەمما نازانم (سیدی آلوسی) ، بۆچی حەملی کردوەتە سەر ڕوو وەرگێران لە حەرب وەقتێ، کە چاویان بە دوژمن کەوت.

﴿ وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا ﴾

پێغەمبەرەکەیان پێی گوتن: جەنابی کبریائی، (طالوت)ی بۆ ئێوە ناردووە بە پادشاه، زۆر نزیکە ئەو ذاتە (شاؤول) بێ، کە لە (تەورات) بەحثی ئەکا لەسەر (السنه)ی عەرەب، کە بە طالوت دەورانی کردوە. ﴿قَالُوٓا۟ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ ٱلْمُلْكُ عَلَيْنَا﴾ مەلەئی بنی اسرائیلی گوتیان: لە کوێ ئەبێ مولک و سەڵتەنەتی ئەو لەسەر ئێمە، ئەوە دوورە ﴿وَنَحْنُ أَحَقُّ بِٱلْمُلْكِ مِنْهُ﴾ ئێمە حەقمان زیاترە بە پادشاهی لە ئەو، تا ئێمە هەبین، ئەو چۆن ئەبێ بە پادشاه؟ ﴿وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ ٱلْمَالِ﴾ هیچ وسعەتێکی لە ماڵ نەدراوەتێ، فقیرە، فکری مشوّشە، ڕەئیو تدبیری اصابە ناکا، دیارە مقصدیان وابوو، کە لە ڕووی ڕاو و تدبیرەوە پێغەمبەرەکەیان یەکێک لەو وجوەو ئەشرافانە انتخاب بکا، حاجەت نەبێ بە مراجعەی حەضرەتی کبریائی، (کانە) لە نەفسی خۆیان ئەمین نەبوون، کە خودا کەسێک لە ئەوان بکا بە پادشاه.

﴿قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰهُ عَلَيْكُمْ﴾ خۆتان ئەزانن و ئەیناسن، کە فطرةً خودا ئەوی لەسەر ئێوە تەرجیح داوە:

«بالای سرش ز هوشمندی		میتافت ستاره بلندی»

﴿وَزَادَهُۥ بَسْطَةً فِى ٱلْعِلْمِ وَٱلْجِسْمِ﴾ قووەتی بەدەنی، عیلم، تدبیر و سیاسەتی زیاد کردوە، مشهور (علمی صحیح لە بەدەنی صحیح) دایە، خاصةً اعصاب و دەماغ، تا دەماغ ساغ تر بێ، نەسیجو تەرکیبی منتظم تر بێ، ئینسان عاقڵتر ئەبێ. عیلمی لسانی: «کل فاعل مرفوع» و «قال» ئەصلی «قول»یە بۆ تدبیری مولکو سیاسەت، سلطنت پارەیێک ناهێنێ.

(کمال بەگی) شاعیر و کاتبی تورک، لە وەقتی سلطان عبدالعزیز پادشاهی آلی عثمان، گەلێک طعنی لە حکومەت ئەدا و، ذەمی ئیدارەی ئەکرد، بۆ تجربە پادشاه کردی بە متصرفی لیوایێک، مانگێک نەچوو، تلغرافی بۆ مابینی همایون لێدا، تەڵەبی قبووڵی استعفای کرد، پادشاه قبووڵی کرد، فەرمووی: کە هاتەوە بیهێننە حضور، کە هاتە حضوری شاهانە فەرمووی: بۆ استعفات کرد؟ گوتی: قەومێکی خراپ بوون، ناراحەت بوون، ئیدارەیان زەحمەت بوو، پادشاش فەرمووی:« عزیزم، شاعر لگ بشقه اداره ملک بشقه».

زۆر مەلای متبحر هەن، کە بە نووکی قەڵەم ئەرز و ئاسمان ژێر بەرە ژور ئەکەن، ئەمما لە ئیدارەی عائلەی خۆیان عاجزن. ﴿وَٱللَّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُۥ مَن يَشَآءُ﴾ خودای تعالی، موڵکی خۆی ئەداتە هەر کەسێکی حەز بکا، موڵکداری لای حەضرەتی باری، تخصیص نەکراوە بە خانەدانێک ﴿وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ٢٤٧﴾ خودای تعالی فەضلو کەرەمی فراوانە، عیلمی بە هەموو چشت ڕائەگا، کێ لایق پادشاهی‌یە لەو بزر نابێ، وا مەزانن هەر کەسێکی لەسەر تەختێکی مرصع دانیشت و، تاجێکی لەسەر دانا، پادشاهە، تەئریخی عالەم شاهیدە، بەعضێ، ملوک بە سجایا و مزایای خۆیان ڕەونەقیان داوەتە ئەورەنگی پادشاهی، بەعضێکیش لە بێ قیمەتی خۆیان سەریر و دەیهیمی پادشاهیان سووک کردوە، خودا ئەزانێ نبووەتیش بە ذوات ئەگورێ؛ با حەضرەتی محمد نەبوایە، ئەوجا ئەتان زانی قەدر و قیمەتی نبووەت و ڕسالەت لە ناو بەشەر چەند بووە! مەلەئی بنی‌اسرائیلی پاش ئەو فرمایشەیش قەناعەتیان نەکرد، بە پادشاهی‌ی (طالوت) ڕازی نەبوون، ذاتاً عیناد و لجوجی شیمەیان بووە، بۆیێ طلبی ئایەت و علامەتێکیان کرد، کە دەلالەت بکا لە بعث و انتخابی ئیلاهی بۆ ( طالوت).

﴿ وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ ءَايَةَ مُلْكِهِۦٓ ﴾ عەلامەتی پادشاهی طالوت ئەوەیە ﴿أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلتَّابُوتُ ﴾ ئەو صندوقەی، کە ئەیناسن معهودتانە ﴿فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ ﴾ «ئالوسی» ئەفەرموێ: لە هاتنی صندوقەکەدا هەیە، اطمئنان و دڵ ڕاوەستان بۆ ئێوە، ئەمما ئەوە لەگەڵ ﴿وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا تَرَكَ ءَالُ مُوسَىٰ وَءَالُ هَٰرُونَ ﴾ ڕێک ناکەوێ، چونکە دیارە ئەو بقیە لە تەرەکەی ئالی موسی وئالی هارون لە ناو صندوقەکەدا بووە، لە هاتنیدا نەبووە، ئەم تابووتە چیيە؟ ئەو سەکینەیە چیيە؟ ئەو بقیەیە چیيە؟ ڕوایاتی مختلف و دوور، بەڵکوو بەعضێکی محاڵ هەیە، لەبەر ئەم اختلافاتە «سید ئالوسی» ئەفەرموێ: حدیثێکی صحیحم نەدیتووە، کە قفڵی ئەو صندوقە بکاتەوە، بەعضێک ئەڵێن: ئەو صندوقەبوو، کە حضرەتی موسی بە منداڵی هاوشیترا بووە ناوی، ئاو بردی لە ماڵی فیرعون گرتیانەوە، ئەم قصە حقیقةً زۆر خۆشە، یادگارێکی زۆر گەورەیە، ئەمما ڕوایەت لەسەر ئەو قصە نیيە، ئەوی لە تەورات ئەیڵێ ئەوەیە: «کە خودا ئەمری کردە حەضرەتی موسی، صندوقێک دروست بکا لە داری «سنط» درێژی دوو گەزونیو، بڵندی گەز و نیوێک، پانی گەز و نیوێک، دەروونو بیرونی ئەو صندوقە بە زێڕێکی پاک طلا بکەن و، ئە و صندوقەیش چوار پێچکی هەبێ، هەر پێچکەی حەلقەیێکی زێڕی تێ بکەن و، داری سنطی تێهەڵ بکێشن، بۆ هەڵ گرتن و لەو طرف و لەم طرفی صندوقەکە، لە زێڕ دوو هەیکەل ملائکەت تعبیە بکەن، بەو نەوعە، کە باڵیان بەسەر صندوقەکەدا هەڵ بکێشن و، بنیاسرائیلی اعتقادی زۆریان بەو تابووتە هەبوو، کە بچووبونایە شەڕ ئەیان بردە پێش لەشکر، لایان وابوو ئەو لەشکرە قابل نیيە بشکێ، وەک درەفشی کاویانی بۆ ئێرانیان!.

یا خودا بمرێ ئەو لەشکرەی، کە قووەتی قەلبی بە تابووت بێ، لە شەڕێکی، کە فلسطینی بەسەریاندا غالب بوون، صندوقەکەیان برد، دوایی

لەناو فلسطینیان عیللەتی مایەسیری زۆربوو، مشکیش غەلەبەی کرد، مزروعاتی بە فەساد دان، ئەوەیان کردە عەلامەتی غەزەبی «یەهوە»، خودای بنی اسرائیلی لەسەر ئەو صندوقە، هاتن صندوقەکەیان لە ئارابەیێک دانا، چوار چێڵی بە گۆلکی شیرە خۆرەیان لە ئارابەکە خست و، چەند دوگمەییێکیان لە زێرر داڕژاند، ئیشارەت بۆ مەمکەی مایەسیری و چەند هەیکەلێکی مشک، ئەویش لە زێرری دایان ڕژاند، هاویشتیانە ناو صندوقەکە، کە بنی اسرائلی دڵیان ساکن ببیّ، کە (فلسطینی) ترساون. فلسطینیەکان ڕووی چێڵەکانیان کردە طەرەف مملەکەتی بنی اسرائیلی و لیّیان خوررین، چێڵەکانیش ڕوویان کردە مەملەکەتی بنیاسرائیلی، (مع انه) مەیلی فیطریّ وای ئیجاب ئەکرد، کە چێڵەکان بگەرێنەوە سەر گۆلکی خۆیان، ئەوەیش دیارە بە سایقێکی معنوی بۆ تەرەفی بنیاسرائیلی سەوقکراون، بۆییّ خودا ئەفەرمویّ: ﴿تَحۡمِلُهُ ٱلۡمَلَـٰٓئِكَةُۚ﴾ کەوابی تاویلی مەلائکە بەو دوو هەیکەلەی، کە لەو طەرەف لەم طەرەفی صندوقەکە چەسپاندراون، وەک (مجددی میصری) ئەیکا زۆر دوورە، نە حەمل هەڵی ئەگریّ، نە مەلائکەت، کە وابیّ سەکینەکە ئەم دوگمەیەی، کە شکلی مایەسیری و مشک بوو، کە بوو بە سەبەبی سکونەتی دڵی اسرائیلیان، ترسی فلسطینی یانیان لە دڵدا نەما و، بقیەیش قابلە بەعضیّ اشیای حەضرەتی موسی و حەضرەتی هارونیان لە ناو صندوقەکە دانابیّ و، فلسطینییەکانیش دەستیان لیّ نەدابن، بەعضێکیش ئەڵێن عیبارەتە لە کتێبی (عهد).

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةً لَّكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ٢٤٨﴾ لە هاتنی تابووت بەو صورەتە، ئایەتێکی گەورە هەیە بۆ ئێوە ئەی مەلەئی بنی اسرائیلی، ئەگەر ئەهلی ئیمان بووین.

یاخود ئەو ماجەرایە ئایەتە بۆ ئێوە ئەی موسڵمانینە! عیبرەت بگرن بۆ

(حربو ضرب) ، خۆتان بە تابووت و مابووت هەڵمەخەڵەتێنن، قووەتی دڵتان بە خودا بێ، ئیمدادی معنوی لە خودا بخوازن، بە تابووت و بەیداغ زەمانێکی خەلق هەڵ ئەخە ڵەتێن، دوایی پووچی بە دەرئەکەوێ، زەرەر ئەدا بە قووەت و مەتانەت. ئێمە خۆمان دیتمان لەو (اواخره)،چەندجار پادشاهی ئالی عثمان سنجاقی، شریفیان هێنایە دەرەوە، ئەمما مع‌الاسف کەس ئەهمیەتی نەدایێ.

پاش ئەو ئایەتە عظیمە مەلەئی بنی‌اسرائیل، پادشاهی طالوتیان قبوڵ کرد، ئەویش تنظیمی عسکری دا بو طرف دوژمن، لەگەڵ عەسکەر ڕەوانەبوو ﴿فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِٱلْجُنُودِ﴾ بە لەشکرێکی زۆر﴿قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ مُبْتَلِيكُم بِنَهَرٍ﴾ خودای تعالی ئێوە امتحان ئەکا بە ئاوێک، لەسەر ڕێتان تووش ئەبن. ﴿فَمَن شَرِبَ مِنْهُ فَلَيْسَ مِنِّي﴾ ئەوی لێی بخواتەوە لە من نی‌یە..﴿وَمَن لَّمْ يَطْعَمْهُ﴾ ئەوی تامی نەکا ﴿فَإِنَّهُۥ مِنِّيٓ﴾ بە ڕاستی ئەو لەمنە، ڕاستە صابرە، خۆی پێ ئەگیرێ و حەربی پێ‌ئەکرێ ﴿إِلَّا مَنِ ٱغْتَرَفَ غُرْفَةًۢ بِيَدِهِۦ﴾ لوێچێک لە ئاوەکە هەڵ بگرێ بۆ لە دەم وەرکردن، ئەوە قەید ناکا ﴿فَشَرِبُوا۟ مِنْهُ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ﴾ لەامتحان دەرنەچوون، اکثریان لە ئاوەکەیان خواردەوە، کەمێکیان نەیان‌خواردەوە ﴿فَلَمَّا جَاوَزَهُۥ هُوَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ﴾ وەقتێ، کە عبووری کرد طالوت و ئەوانەی، کە لە ئاوەکەیان نەخواردبووەوە ﴿قَالُوا۟﴾ ئەوانی عبووریان کرد ﴿لَا طَاقَةَ لَنَا ٱلْيَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ﴾ تاقەت و قووەت بۆ ئێمە نی‌یە، ئەمڕۆ بە جالوت و لەشکری جالوت.

ئەم قسە مقبوڵە لە مقابلی ئەو جماعتە، البتە شکستێکیان لە دڵدا پەیدا بووە، ئەمان کەم.. دوژمن زۆر، بێ‌گومان لە بەینی خۆیاندا ئەم

گفتوگۆیەیان کردووە..

﴿قَالَ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ ٱللَّهِ﴾ ئەوانەی، کە بە قووەت بوون و ئیمانیان محکم بوو، ئەیان زانی ڕجوعو ایاب بۆلای خودایە، بەلاّم تعبیری بە (ظن) داوەتەوە، کە تەنها گومان بردن بە ملاقاتی حەضرەتی کبریائی، کافی‌یە بۆ اقدام لەسەر شەرر، صبر و ثبات لە مقابلەی دوژمن بە قووەتو بێ ژمار خالّی نی‌یە لە (احدی الحسنیین) یا «ظفر» یا «شهادەت»، وەقتێ اوروپایی لە مقابلەی موسلّمانان بە دوو کلمە زۆر عاجز بوون، نەیان ئەزانی بە چی مقابلە بکەن، قوماندانەکان بە عسکریان ئەگوت شەرر بکەن، ئەگەر کوژران شەهیدن، ئەگەر مان غازین، ئەوانە فەرموویان: ﴿كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةَۢ بِإِذْنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٢٤٩﴾﴾ زۆر بووە جەماعەتێکی کەم، غالب بوون بەسەر جەماعەتێکی زۆر، بە ئیذن و ڕضای خودا، ذاتاً لەشکری زۆر و بۆر بێکە لّکە، کەمو پوخت خۆیەتی، وەکوو ئەلّێن اعتباریە کمیەت نی‌یە بە کیفیەتە.

«سیاهی لشکر نیاید بەکار
که یک مرد جنگی به از صد هزار»

وەقایعی تاریخیە شاهدە لەسەر صدقی ئەم دەعوایە ﴿وَلَمَّا بَرَزُواْ﴾ کە خۆیان لە ساندا، خۆیان ئاشکار کرد، طالوت و بقیەی خالص ﴿لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ﴾ وا دەرئەکەوێ ئەوان (شطارتیان) نوواندوە، سبقیان کردووە بۆ مەیدانی مبارزە.. ﴿قَالُواْ رَبَّنَآ﴾ گوتیان ئەی خودای ئێمە ﴿أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا﴾ سەبرمان بەسەردا برژێنی، کە دلّمان پرر ببێ لە ثباتو متانەت ﴿وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا﴾ لاقمان ڕاگری، قووەتێکمان پێ‌کەرەمبکەی، کە لەمەیدانی حەرب ڕابوەستین، خۆ بگرین ﴿وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ

ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٢٥٠﴾﴾ دیارە ئەوانە ئەهمیەتیان نەدابووە تابوتەکە؛ چونکە لێیان معلوم بووبوو، کە دڵ بە تابوت بەستن سستە، کە ڵکی نیە ئەپسێ ﴿فَهَزَمُوهُم بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ دوژمنیان شکاند. ئەصلی «هزم» غمزە، یەعنی شتی نەرم وەکوو هەویر بە ئەنگوست ڕوو بچێ و ئەثەری تێدا بمینێ.

﴿وَقَتَلَ دَاوُۥدُ جَالُوتَ﴾ داود ، جالوتی کوشت. داود کێیە؟ مشهور و معلومە لە بنیاسرائیلیانە، بە چی کوشت؟ چۆنی شەرر لەگەڵ کرد ؟ بە بەردەقانی مێشکی پرژاند، یا بە شمشێری ئابدار؟ یا بە نێزەی جان ستان؟ ئەوە لە قورئان دا نیە و بەیانیشی بێ لزومە، مقصد ئەمەندەیە داود جالوتی کوشت..

﴿وَءَاتَـٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ وَٱلْحِكْمَةَ﴾ خودای تعالی پادشاهی و حیکمەتی پێ کەرەم کرد، ئاگاداری کرد بە اسرار و دقایقی حوکمڕانی ﴿وَعَلَّمَهُۥ مِمَّا يَشَآءُ﴾ لەوی ئارەزووی بکردایە، یا خودا حەزی بکردابوایە فێری ئەکرد، یەعنی خودا عیلمی اختراعی پێکەرەم کرد، کە چشتی وا دروست بکا لای دوژمن نەبێ، ذاتاً اورووپایی بەسەر ئێمەدا غالب بوون، بە اختراعی آلات و ادواتی حەرب.

ئێمە بە کۆنە شیرو کوتەکی قیر و ڕمب و تیر، ئەوانیش بە تۆپی سریعئاتەش و مترەلیۆز و بۆمبا و تەیارە، لای گەلێکمان وابوو واجبە، هەر بەو ئالات و ادواتی، کە لە زەمانی پێغەمبەر شەرری پێ کرابوو، ئیمە پاش سێزدە، چواردە قەرن شەرری پێ بکەین، بە بدعەتیان ئەزانی بۆیێ تێشکاین وشکاین.

حەضرەتی کبریائی، پێغەمبەرانی کرامی بۆ اصلاحی بەشەر ناردووە، بالطبع ئەم پێغەمبەرانە حەزیان لە شەررو شۆر و ئاشوب نەبووە، ئەگەر (مضطر) و مجبور نەبووبن، شەرریان نەکردووە، هەتا مصڵحەتێکی کلیان

نەدیتبێ لە دەفعی ئەهلی فەساد، شەرریان نەکردووە، بۆیێ ئەفەرموێ: ﴿وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعۡضَهُم بِبَعۡضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلۡأَرۡضُ﴾ ئەگەر خودای تعالی دەفعی بەعضە خەلق کە ئەهلی فەسادن بە بەعضێک کە ئەهلی صلاحن نەکردابوایە، بە جارێک ئەرض بە فەساد ئەچوو، بۆیێ ئەگەر خودا شوناسەکان بوونە ئەهلی فەساد، خودای تعالی بە کافرەکان خودا نەشوناس دەفعیان ئەکا.

قسەیەک لە حەضرەتی موسی نەقل ئەکەن، ئەگەر ڕاست، ئەگەر درۆ زۆر خۆشە، ئەڵێن، عەرضی کبریائی کرد: بۆ فرعون نافەوتێنی؟ خۆ دەعوای خودایەتی ئەکا؟ فەرمووی: بە عەدالەتە، بۆ خەلق باشە، با هەر ناماقوڵی بکا، بڵێ من خوام، پاش ئەوە، کە دەستی کرد بە ظلم کردن، ئەوجا خودا فەرمووی، جێیەتی انتقامی لێبکەمەوە.

﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢٥١﴾ جەنابی کبریائی، صاحب فەضل وکەرەم ومە رحەمەتە لەسەر هەموو کەس، بۆیێ کافری بە عەدالەتو انتقام، لەسەر موسڵمانی بە ظلم و بێ انتظام غالب ئەکا، ئیمان ئەوەیە، کە ئینسان لە خراپە بگێڕێتەوە، چاکەی پێبکا، ئیمان و عملی خراپ، نازانم چۆن گرد ئەبنەوە؟ ئیمانی سەر زوبانی، چ نییە! زۆر وا ئەبێ کافر بە سیاسەت چاک ئەبێ، ئەمما موسڵمانەکانی بێناوک، بە سیاسەتیش ڕوو لە چاکە ناکەن.

﴿تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتۡلُوهَا عَلَيۡكَ بِٱلۡحَقِّۚ﴾ ئەوی ذکرکرا ئایات و (عبر)ی خودایە، بە سەر تۆی دا ئەخوێنینەوە، بێ درۆ و دەلەسەیە.. ثابت و مقررە حکایات نییە.. هەمووی بێ (عبر)و نصایحە ئەوجا ئەی موسڵمانینە، ئەی مهاجر و انصار! بە گوێی اعتبار ببیێن، بە چاوی اعتبار تەماشا بکەن، لە ڕۆژی امتحان سەرئەفرازی بنوێنن، سەرکەشی مەکەن، تابعی ئەمر و قواعدی مقررەی ئیلاهی بن، بە خوارق و شواذ، بە تابووت و

عەلەم، هەڵمەخەڵەتێن، دڵ بە خودا مەحکەم بکەن و، محقق بزانن دین بێ تەشکیلی سلطنەت نامینێ. هەر مذهبێک حەق و باطل، تا ئەمڕۆ مابێ، بە تەشکیلی سلطنتەوە بووە. ﴿وَإِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٢٥٢﴾﴾ بە حەققەت و بە ڕاستی تۆ لە زومرەی پێغەمبەرانی، الحق محمد المصطفى (ﷺ) بحقّ پێغەمبەرە، پێغەمبەری خودایە، پێغەمبەری عەقڵە، پێغەمبەری عیلمە، پێغەمبەری طبیعتە، مەقامی ڕسالەتی بڵند کردووە، شەرەفی بشریەتی بەدەرخستووە (جزاه الله عن الرسالة والبشرية خير الجزاء).

* * * *

تەواو بوو تەفسیری جزئی ثانی، بەئیذنی ڕەحمانی، ڕۆژی سێ شەنبە، (١٠) دەی محرم‌الحرام، یازدەی نیسانی ڕۆمی سنەی ١٣٥٣ هیجری قمری. تەمیزی کرا ڕۆژی دووشەنبە (٢٠) بیستی مانگی ڕەجب یا (١٩)نۆزدەی ڕەجب، ١٦ای تشرینی اولی ڕۆمی سنەی ١٩٣٤ میلادی.

﴿تِلْكَ ٱلرُّسُلُ﴾ ئەو پێغەمبەرانەی، کە تۆ لە زمرەی ئەوانی ، هەموویان لە طبقەی علیای گەورەیینە، ئەمما لەو مقامەیشدا بەعضێک لە بەعضێک زیاترن ﴿فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾ خودای تەعالی بەعضێکی لە سەر بەعضێک تفضیل داوە، زیادەییێکی پەی احسان فەرمووە، ئەمما ئەو فضلە خەلەل بە علوّی هیچیان نادا ﴿مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ ٱللَّهُ﴾ گەرچی لە عیبارەت دا مبهمە، ئەمما معلوومی ئەنامە، بە اتفاقی فریقین حەضرەتی موسی (کلیم اللە)یە ﴿وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَٰتٍ﴾ بەعضێکی لە ئەوان بڵند کردووە بە نەوعێک، کە نایێتە تعداد لە جملەی ئەوانە، حەضرەتی ابراهیمە، بڵندیی مقامی خلیل‌اللە، مسلمی هەموو خەڵکە.

﴿وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ نافەرمویّ و (منهم من آتینا البینات)، هەرچەند بە تبادری ذهنی ئێمەو مەسیحیان ئەچێ بۆ حەضرەتی عیسی، ئەمما جولەکە، کە ئیمانیان پێ نییە، ئەتوانن حەملی بکەنە سەر شەخصێکی تر ﴿وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ﴾ مەعنای ئەو ئایەتە سابقاً تەفسیر کراوە، ئەو پێغەمبەرانە بۆچی ناردراون، خودای تعالی، ئەو علمو فضلەی بۆ پێ کەرەم کردوون، ئایاتی پێ داونو قسەی بالذات لەگەڵ کردوون؟ بۆ هیدایەت.. یەکایەتی، لابردنی شقاقو خلاف، وەکو سابقاً زاناندرا. ئەمما ئەتباعی ئەو پێغەمبەرانە، خۆ بەخۆیی اختلافیان بووە بە اختلافێکی کلی.. بوون بە دوشمنی یەک، غەیرە قابلی اصلاح، هەتا تەبەعەی یەک پێغەمبەر ئەوەندە اختلافیان بووە، کە نایێتە خەیاڵ. ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلَ ٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِم﴾ اختلافیان بەو نەوعەیە، کە یەکتر ئەکوژن، فیتنە و شەرر و شۆڕی (الملیون)، هەموو صفحاتی تاریخی ملوّث کردوە، ئەگەر خودا حەزی بکردایە، یەکتریان نائەکوشت پاش پێغەمبەرەکان ﴿مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ

ٱلْبَيِّنَٰتُ ﴾ لە پاش ئەوەی، كە ئەو بیّناتەیان بۆ هات، ئایاتی ئەمەندە ئاشكرا، كە لە پاش ئەوە بە خاطر و خەیاڵدا نەئەهات ئەوانی، كە ئیمانیان پێ هێناون، اختلاف بكەن، ﴿وَلَٰكِنِ ٱخْتَلَفُوا۟﴾ بالفعل اختلافیان بوو، گەرچی حەق وابوو نەبێ ﴿فَمِنْهُم مَّنْ ءَامَنَ وَمِنْهُم مَّن كَفَرَ ﴾ هەر لە زومرەی یەك پێغەمبەر. بەعضێك ئیمانی بە ڕاستیان هێنا، بەعضێكیش لە حەقیقەتدا كافر بوون، بۆ هەدمی دین، بۆ تحریف و تبدیل و تغییری ئایاتی بیّنات، گەلێك لە كافر حەربی خراپتر بووە.. یا للعجب!

ئەوانی، كە بە ڕاستیش ئیمانیان هێنابوو لەسەر بەعضێك مسائلی فرعیە، بەڵكو لە حەقیقەتدا لە سەر بەعضێ مطامعی دنیوی، دوژمنایەتێكی وایان كەوتە بەین، كە بە لافاو خونیان لە بەینا ڕژا. ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلُوا۟﴾ ئەگەر خودا ئیرادەی بكردایە، یەكتریان نائەكوشت ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ ﴿٢٥٣﴾﴾ لاشك واردی خاطر ئەبێ، وەكوو ملائكەتەكان فەرموویان: «اتجعل فیها من یفسد فیها ویسفك الدماء» مادام ئەتباعی ڕسل ئەو هەموو شەڕەیان لەگەڵ یەكتر كرد، بە نەوعێك بوونە دوژمنی یەك، كە دوژمنی اصلی، یەعنی ئەوانی انكاری خودا و وحدانیەّتی ئیلاهی و، ئەصلی نبووەت ئەكەن لە فكریان چووەوە. بناء علیە ئەبوایە خودای تعالی ئەو پێغەمبەرانە نەنێرێ، خودایش جواب ئەداتەوە، بە وێنەی جوابی ملائكەتان، بە ئەوانی فەرموو:.. من ئەیزانم ئێوە نایزانن.. لێرەیش ئەفەرموێ: خودای تعالی ئەوی ئیرادە بكا، ئەیكا. لاشك جەنابی كبریائی، لە ناردنی پێغەمبەران مقصدی خێر بووە.

اولا: ئەگەر خودا ئەو پیاوە عظمایانەی نەناردبوایە، ئەو گرۆهە ممتازە نەبوایە، ئیجابی ئەكرد بەشەر خەلق نەكرێ.. (ارقی)ی یەعنی بڵندترین عالەمی حیوانی، هەر مەیموون بێ! دیققەت بكەن، هەر قەومێك باسو

خەبەری پێغەمبەرانی پێگەیشتبێ، ئەگەرچی ئیمانیشیان پێ نەهێنابن، ئیمتیازێکی چاکەی هەیە لەو قەومەی، کە خەبەریان لە (بعث و نبووەت) نیە و ، ئەزانن، تا بەشەر لە نبووەت نزیکتر بن؛ چاکترن، تا دوورتر بن خرابتر بن.

ثانیا: وەکوو حکماء ئەڵێن لە عالەمی (کون و فساد)، خێری محض نیە، کلی چشت دوو جهەتینە، ڕووی خێریش هەیە و لای شەڕریش هەیە، ئەوجا علی التساوی، یا علی التفاوت (اله والهیون) حقیقی تەماشای جیهەتی خێر ئەکەن، مثلا: (مساوات فی الحقوق) چەند چشتێکی باشە، نظر بە ملوک واعاظم، هەتا ڕۆسای دین، چەند خراپە، چ مجادلەیێکن پێ ئەوێ لەگەڵ نەفس، تا نەرمی ئەکاو ئەیگەنێتە ئەم دەرەجە، کە حقوقی شخصی خۆیی و عامیی یەک لای مساوی بێ، ئایەتی «ان الله بکل شيء علیم» چ حەقو حەقیقەتێکی شایانە بۆ صلاحی ئینسان، لە ظاهرو باطنو سرّو خفی و اخفی، ئەمما ئەوانەی مەیلی فەسادیان هەیە، ئەزانن چۆنیان گۆڕریوە «ان الله علی کل شيءقدیر» «ان الله یفعل ما یشاء» بۆ صاحب هیممەت و غیرەت، چ قەدر و قیمەتێکی هەیە، ڕوحێکی وای پێ ئەدا، کە ڕوو بکاتە چیایان وەه لێان بکەنێ، ئەمما ئەوانەی تەنبە ڵ و بێ نشاط بن، لە عمل چۆنیان وەرگێڕراون.

ثالثاً: عیلم و عەقڵ قووەی انتباهی، قیمەتیان تەقدیرونینکارناکرێ، حەکیمێک بە هەزار مشەققەت، بیستوچوار ساڵ عومری خۆی صەرف ئەکا، تا بۆ نەفعی بەشەر ئالەتێک اختراع ئەکا، شەخصێکی غدّار، طماع، دوژمنی بشریەت.. صەرفی ئەکا لە شەڕر و، تخریبی دار و دیاری عبادی خودای پێ ئەکا. ئایا ئەوە ئەبێتە شەڕر و سیئاتی عەقڵ و عیلم و اختراع؟ ئەو حەکیمە لۆمەی ئەکرێ لەسەر اختراعی ئەو ئالەتە؟ حاشا ثم حاشا، حاصلی، ئەگەر نەوعە شوبهە ببێتە مانع بۆ ناردنی پێغەمبەران، ئەتوانین بیکەینە مانعی خەلقو ئیجاد.. بزانین سەبەبی اختلاف و شقاقی ئەو

ئوممەتانە چی یە؟ وەک سابقاً تصریحی پێکراوە، لێرەیش ئیشارەتی بۆ ئەکا.. حبّ و حرصی دنیایە، ضعفی ئیمانە بە قیامەت، اعتمادە لەسەر شفاعەت، بۆ مەنعی ئەصحابی گزین، لەو خصالە خراپانە ئەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقْنَٰكُم ﴾ لە ڕێی خودا صەرفی بکەن.. بە حبی ماڵ پابەند مەبن.. بە دەستی خۆتان، خۆتان هیلاک مەکەن.. پێش خۆتان زەخیرەیەک بۆ قیامەت بنێرن. وەکو (سعدی) ئەڵێ:

«کس نیارد زپس تو پیش فرست»

﴿مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ﴾ معاملەی بدل فدیە، خۆکڕینەوە نییە، لەو ڕۆژە ﴿وَلَا خُلَّةٌ﴾ محبەت، دۆستی، صداقەت لەو ڕۆژەدا نییە. اعتماد مەدەنە سەر محبەتی خۆتان، یا محبەتی خودا بۆ عەبدێک، ئەگەرچی خلیل الرحمان و حبیب‌الله بێ ﴿وَلَا شَفَٰعَةٌ﴾ شەفاعەت، تکا، ڕجا نییە.. لەو ڕۆژەدا جەنابی حەق، بەو نەوعە دەربارەی سائر ئوممەی فەرمووە: چ جای ئەمەلی شەفاعەت، بەعضێکیان گەیاندە مقام القدس، تا بڵێن خودایە، یا کوڕی خودایە!! ئایا بۆ دلالەتی نارد، یا بۆ ضلالەت؟ خۆی بکا بە فدیەی گوناهکاران، ئەوجا عالەم ببێتە سەگی هار، هەرچی بیکا بیکا؟ ذاتێکی وەکو (کلیم الله) و (خلیل الله) لە عەزاب دابن، بە فدیەی (عیسی) نەجاتیان بێ؟! وای لەو حەماقەتە! حقاً ﴿وَٱلْكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٥٤﴾﴾ ادنی ظلمێک لە تەرەف کبریائیەوە نییە، ئەو کافرانەی، کە ئایاتی هیدایەتیان کردوەتە سەبەبی ضلالەت، (حقیقةً)هەرئەوان ظالمن، تجاوز لە خودا ئەکەن. ئەو نەوعە ظلمە (وثنی ثنوی) ، هەتا (دهری) نەیانکردووە، کەوابێ ئەی ئیماندارینە، خۆتان (بالمرە) لە شائبەی (شرک) دوور بکەن.. غەیری خودا، ئومێد بە کەس مەکەن.

﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾ ذاتێکی واجب الوجودە، بێ‌شریکە، غەیری ئەو، چ

ئیلاهێکی تر نی‌یە.. (موجد و منجی) هەرئەوە، هیچ موجودێک اثرێکی لە ئاثاری الوهیەت نی‌یە، ئەوەی هەیە، یا لە ئێوە بەرەژێرترە، وەکوو جمادات، یا وەکوو ئێوەیە لە احتیاجی، وەکو سائری حیوانات ﴿ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ﴾ حقیقة حەیاتی حقیقی خاص ئەوە، زندووێکە حاجەتی بە موادی حیویە نی‌یە، موادی حیوی‌و غیرە حیوی، وجوودی لە ئەوە زندووێکە بێ توالد، بێ‌لە چشت بوون قائم بالذاتە، حاجەتی بە هیچ نی‌یە، قوامی هەموو چشت لە تەرەف ئەوە، زندووێکە ﴿لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ﴾. ئەوی (معدە) سست بێ، طعام چاک هضم ناکا، بخاری بە قووەت نابێ، وەکو زەمانی پیری ئەو نەوعە کەسە ئەبۆرژێ ئەمما ناخەوێ، ئەوی معدەی بە قووەت بێ، بخارەکە بە قووەت ئەبێ، زوو تاثیری لە دەماغ ئەکا، بێ بۆرژان خەوی لێ‌ئەکەوێ، حاصلی بە هیچ وەجە، غەفڵەت و سستی ڕوو لە خودا ناکا. قیّومێکە ﴿مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ بۆ ئەوە، ئەوی لە ئاسمان‌و ئەرز دابێ.

﴿مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ﴾ کێ‌یە بتوانێ شەفاعەت بکا لە خزمەت ئەو؟ بە پاڕرانەوە کەس لە دەست ئەو نەجاتی بدا،فەضل لە (غلبە)و حیلەکاری حاشا ثم حاشا، کەس نی‌یە تکا کاربێ ﴿إِلَّا بِإِذْنِهِۦ﴾ ئەوی شفیع باذن اللە بێ، لە تەرەف خودا ئیلهام ئەکرێ، خودا بۆکێ ڕاضیی تکا بکا، ڕاضی نی‌یە. کەوابێ خەریکی تحصیلی ڕەضای خودا بن، ئەگەر لای خوداتان هەبێ، تکا کاریشتان ئەبێ و، لای پێغەمبەران و ملائکەتان، بە حورمەت ئەبن، وە الاّ هەموویان ئەباو لەعنەتتان لێ ئەکەن.

خوداوەندی حی و قیوم ﴿يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ﴾ ئەزانی ئەوی لە مابەینی دەستی ما فی السماوات و ئەرضە، ئە زانێ چی ئەکەن.. ڕوویان لە چی یە، ئەوی لە پشتیانەوەیە ڕوویان لێی نی‌یە، نایکەن سەبەبو معذرەتی بە کردنیان چی یە، هیچ لەو بزر نابێ، کەوابێ ئەوی تکا کار بێ

چی عەرض ئەکا؟بۆ گوناهکارەکە ئەپارێتەوە، چ معلوماتێکی بزر بوو، خودا ئاشکرای ئەکا، (مع انه) ﴿وَلَا يُحِيطُونَ﴾ سکانی سماوات و ارض دەورە نادەن ﴿بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ﴾ بە زەررەیەک لە معلوماتی خودا ﴿إِلَّا بِمَا شَآءَۚ﴾ الاّ بە چشتێک نەبێ، کە خودا حەزبکا فێریان بکا. ئەو ملائکەتانەی لەبەر (قدسیەت) بە بنات اللەی مجرّدیان ئەزانن، بیستتان لە مناظرەی ئادەم چۆن جەهلیان بە دەرکەوت، چۆن اعترافیان کرد؟ «سبحانک لا علم لنا الاّ ما علمتنا» ئەوجا عیسایەک، کە مؤیدی (بروح القدس) بێ ئەبێ چۆن بێ؟

﴿وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۖ﴾ کورسی خودا ئەرز و ئاسمان ئەگرێ، عالەمی علوی وسفلی جێیان تێدا ئەبێتەوە. ئەفەرموون کورسی جسمێکی بەرینە نزیکی عەرشە، هەموو ئاسمان و ئەرز لە مقابلەی ئەو، وەکوو حلقەیەکە لە بەرابەری سەحرایەکی پان و بەرین. لە قاموس ئەفەرموێ «الكرسي بالكسر السرير والعلم» دەرئەکەوێ، کە کورسی لە لغەتدا اطلاق ئەکرێتە سەر عیلم، ئەوە زۆر خۆشە، موافقی مقامە.

اولا فەرمووی بۆ ئەوە، ئەوەی لە ئاسمان و ئەرز دایە.

ثانیاً ئەفەرموێ: عیلمی ئەو، احاطەی بە ئاسمان و ارضی داوە، کەوابێ حاصلی مەعنای وایە: ئاسمان و ئەرز و ما فیهما مملوکی خودایە، حقائقو اسراریان بۆ خودا معلومە، هیچی لێ بزر نابێ.

هەم لە قاموس ئەفەرموێ: کورسی ناوی دێیەکە لە (طبریە)، حەضرەتی (عیسی) لە ئەوێ، (حواری ) خۆی گرد کردوەوە و ناردنی بۆ نەواحی.

کورسی لە قورئاندا هەر لێرە ذکر کراوە ئەمە زۆر مناسبە، یەعنی تەماشای نسبەت بکەن لە بەینی کورسی خودا بە هەر مەعنایێک، کە لێی بگرن لەگەڵ کورسی عیسی، کە دێیێکە کردیە (مقر)ی جمعو بعثی حواری

یەکانی خۆی، بە گوێرەی ئەم نسبەتەیش، فەرق لە بەینی جەنابی کبریائی وعیسی بزانن، کە اصلا نسبەت قبوولْ ناکا، «والکافرون هم الظالمون» ﴿وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَاۚ﴾ لای خودا گران نییە حفظی (سماوات وارض) ، یا حفظی محیط و محاط، وامەزانن (مکان) حفظی خودا ئەکا، خودا حفظی مکان و مافی المکان ئەکا، مادامەکو حفظی علویی سفلی لەسەر خودا گران نەبێ، شەریکی بۆچی‌یە؟

کەسێک لە خە ڵقی عالەم عاجز نەبێ، لە حفظی چۆن عاجز ئەبێ؟ معاذ الله، ئەگەر خودا لە حفظی ئەرزو ئاسمان عاجزبێ، غەیری ئەو کە لە نەفسی خویاندا عاجزن، چی‌یان پێ‌ئە کرێ؟﴿وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٢٥٥﴾﴾ هەر ئەوە بڵند، لە شریک و اشباه، لە معاون و معاند، لە عجز لە هەرچی شائبەی امکانی تێدا بێ، گەورەییێکی وایە عالەم بە نظر عظمت و کبریائی ئەو، ذەررەێیکی محقرە وەک (نالی ئەڵێ:

ذەرراتی عکوسی کەششی مهری جلالن
وا دێن و دەچن سەر زەدە سلطانو شەهەنشاه

لەو ئایەتی کریمە بۆ ئەهلی ئینصاف، حەقو حەقیقەت دەرئەکەوێ، ناچار اعتراف ئەکا ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ﴾ چ اکراه و تۆبزی لەم دینەدا نی‌یە چشتێک، کە لە عەقڵ دوور بێ بە تۆبزی تکلیفی بڕوا پێ‌کردنی تێدا نی‌یە، وەکوو لە عقائدی ضروریەی دیانان دا هەیە، لای ئەوان ئەبێ قبووڵی بکەی، عەقڵ هەظمی بکا، یان نا. ﴿قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ﴾ بە حەققەت، بەڕاستی تمییزی بوو، ئاشکرا بوو، جودا بووەوە بە (رای العین) ، هدایەت لە ضلالەت، وەک تمییزی مرشدو هادی، لە (مضلّ ومغوی ) ، ﴿فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ﴾ هەر کەسێکی انکاری طاغوت، لات و عزی ، کاهنو شیطان، رئیسی رێ لێ گۆررین، اصنام، هەرچی عبادەت بکرێ، غیری

خودا، مردەی ئەهلی کتاب بکا، بڕواییان پێ نەکا ﴿وَيُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ﴾ باوڕی بە خودا بکا ﴿فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ﴾ بە حەققەت دەستی گرتوە بە قوڵپی مەحکەم، (عروە) لە لغت دا بەو جێیە ئەڵێن، کە دەستی پێوە ئەگیرێ لە دۆلکە، لە گۆزە، کە پێی ئەڵێن (قوڵپ، هەنگڵ) قوڵپێکی وامەحکەم، کە ﴿لَا ٱنفِصَامَ لَهَا﴾ تییک و دەرزیشی نییە، فەضل لە قەلشت و لێک بوونەوە ﴿وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥٦﴾﴾ هەموو چشت ئەبیێ، واسطەی پێ ناوێ، هەموو چشت ئەزانێ، عیلمی ئەوە محیطی غیرە محدود، عیلمی هەموو عالەم کەمە. لای بەعضێ حکماء، عیلم بە حقائقی اشیا بۆ غەیری خودا نییە، ئەگەر چشتێک بزانن ظاهری یە، شەبەحە، ئەوی بەشەر بێ، کەمێک ببیسێ و گۆشو هۆشی هەبێ، چشتێ بزانێ، چۆن ئیمان بە طاغوت ئەهێنێ، چ بتو اصنام! چ شەیتان و عفریت؟! ئەهلی کتاب چۆن بە قسەی ئەهلی ضلال هە لئەخە ڵەتێ، اعتماد ئەکاتەسەر شەفاعەتو فدیە؟ خۆی لە سەعی و عەمەل ئەکا، ئایا ئەو طاغوتانە تامینی نانێکیان پێ ئەکرێ، تا تامینی نەجاتی اخروی بدەن؟

﴿ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ خودا نصیرە، معینە بۆ ئەوانەی ئیمانیان هێناوە بە الوهیەتی ، بە ڕبوبیەتی ، بە وحدانیەتی ، بە مالکییەتی یوم الدینی ﴿يُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾ لە ئەنواعی تاریکی ئەیان هێنێتە دەرەوە. تاریکی انواعی هەیە، لە اعتقاد بە خودا.. بە افعالی خودا.. بە صفاتی خودا، لە اعتقاد بە ملائکەت، لە اعتقاد بە کتب، لە اعتقاد بە ڕۆژی جەزا، لە هەر مەقامێک، ئینسان احتیاجی هەیە بە معاونەی خودا، و الا ئەکەوێتە تاریکی، بۆیێ حەضرەتی ڕەسولی کبریا، لە دوعادا عەرضی بارەگاهی کبریا ئەکا «ولاتکلنی الی نفسی طرفة عین» بە سایەی ئایاتی بێنات، خودا ڕێیەکی ڕاستو فراوان، ئەوی مۆمن بێ ناکەوێتە تاریکی، ئەگەر

غەفڵەتێکیشی بە سەرداهات، زوو ئاگادار ئەبێتەوە.

﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾ کە ئیمانیان بە خودا نەبێ ﴿أَوۡلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ﴾ معین و نصیری ئەوان ظالمانەی طاغی و باغی، متجاوز لە حدّن ﴿يُخۡرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِۗ﴾ دەریان ئەکەن لە ڕوناکی بۆ گەلێ تاریکی. هەتا ئەمڕۆش، کە دە ڵێن عەصری عیلم و عرفانە، طاغوتی دیانان خەریکن موسڵمانان بکەنە دیان، لە ڕوناکی توحید، بیان کەن بە شکل و صورەت پەرست ﴿أُوْلَٰٓئِكَ﴾ ئەو ائمەی کفر و ضلال ﴿أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ﴾ خاوەندی ئاگری جەهەننەمن ﴿هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٢٥٧﴾ ئەوان لە ناوی دا ابداً ئەمینین، دەر ناچن. مادام خەلق لە (نور) بهێننە دەرەوە، ئەبێ ئەوان بچنە ناو ئاگر، (مع انه) وەکو لە حدیث معلوم بووە، جەهەننەم ڕەشە، ڕوناکی نیە، ئەوانی تابعیشیان بن طبعاً ملازمی خزمەتیان ئەبن، اربابو ئالهەی خۆیان چۆن بە جێ ئەهێڵن، هەروەکو لە دنیا تابعیان بوون، لە عەزابیشدا تابعیان ئەبن، ئەگەر کەسێک شوبهەیێکی ببێ لە (اغوا)و ڕێ لێگۆڕینی طاغیان، چ طغیانیان بە سەبەبی سلطنەتی دینی بێ، چەسبب بە سلطنەتی دنیا بێ.. ذاتاً لە (لغت)دا طاغوت اطلاقیش ئەکرێتە سەر مەلیکی ظالمی مستبد، بۆ دەفعی اشتباه، با تامل بکا لە ئەو ماجەرایە، کە بۆتان ذکر ئەکرێ.

﴿أَلَمۡ تَرَ﴾ ئەی ڕەسول، یا هەر کەسێکی صاحب ڕۆیەتو علم بێ ﴿إِلَى ٱلَّذِي حَآجَّ إِبۡرَٰهِـۧمَ فِي رَبِّهِۦٓ﴾ گۆیا خۆی وا ئەنواند، کە بە مناظرە غالبە لەسەر حەضرەتی ئیبراهیم، ئەو مجادلەیەش دەربارەی خودا بوو، (انە) طلبی لە حەضرەتی ئیبراهیم ئەکرد، کە بە دەلیلی اثباتی وجود و وحدانیەتی خودا بکا سەبەب چیبوو؟ ﴿أَنۡ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلۡمُلۡكَ﴾ سەبەب بە ئەوە، کە خودا موڵکو سەلطەنەتی پیدابوو، مغرور بووبوو، دەعوای خودایەتی ئەکرد،

گەرچی ئەمە ادعایەکی زۆر باطلە، ئەمما نظر بە چڵکنە پڵکنەکانی ئێمە، فەقیرو بێ دەسەڵات بە واسطەی ئەوەی، کە یەک دوو گەررو گورریان بە دوا ئەکەوێ، لوتیان ئەچێتە ئاسمان و دەعوای خوایەتی ئەکەن، ئەو طاغوتە بە (مەلەک) حسابە، کەسێکی بۆ خۆی چاوی اعتباری هەبێ، لەسەر صفحاتی کائنات، ئەبینێ چەند هەزار ئایاتی بیّنات لەسەر وجود و وحدانیەتی خودا ئەدرەوشێتەوە. ئەمما تکبر و تجبر و جەهل، چاوی بصیرەتی ئینسان ناهێڵی، ئەو (محاجە)یە کەی بوو؟

﴿إِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ﴾ ئەو وەقتە بوو، کە حەضرەتی ئیبراهیم فەرمووی: ﴿رَبِّيَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ﴾ مردوو زندوو ئەکا، زندوو ئەمرێنێ، موادی جامدە لەگەڵ عناصری حیە تێکەڵاو ئەکا، انسانێکی زندووی لێ پەیدا ئەکا، موادی حیویە لە هەیکەلی زندوو ئەخاتە دەرەوە، ئەیمرێنێ. (سعدی) ئەڵێ:

(ز ابر آورد قطرە سوی یم

ز صلب آورد نطفە در رحم

ز آن قطرە لؤلـوی لالا کند

و زین قامت سـرو بالا کند)

﴿قَالَ﴾ ئەو شخصە گوتی ﴿أَنَا۠ أُحۡيِۦ وَأُمِيتُۖ﴾ حقیقةً، مقابەلەیەکی نابەجا، ئایا تەماشای خۆی نەکردوە، چۆن هاتۆتە وجود، و آباء و اجدادی ئەو لە کێ حەیاتیان وەرگرتووە؟!

حاصلی، قسەیەکی ئەوەندە بێ معنایە قورئان جوابی نادا، ئەگەر ادعا بکا ئەو عالەمە لە نباتات و حیوانات و ئینسان، من ئەیان ژیێنم و،من ئەیان مرێنم، ئەمە عەینی شێتی یە، لە ئینسانێکی ادنی شعورێکی هەبێ صدور ناکا، ئەگەر بەم ڕوایەتە بێ، کە ڕوایەت کراوە، گۆیا دووکەسی لە حەپس هێناوەتە دەرەوە یەکێکیانی کوشتوە و یەکیانی بە ڕەڵـلا کردووە، گوایا ئەمە (احیا و اماتە)یە، حقاً ئەوە زۆر حماقەتە.

لە ڕووی ئەرزی، صەد پادشای لەو زیاتر هەبووە، محبوسێکی اعدام کردووە و محبوسێکیشی بەرە لڵا کردووە، بەڵام طغیان ڕێی محاکمەی عەقڵ ناهێڵێ، لای خۆی حیلە ئەکا، مغالطە ئەنوێنێ، هەم لە احیا و اماتە، هەم لە مقصدی حەضرەتی ئیبراهیم، مقصدی حەضرەتی ئیبراهیم لەم دەلیلە (برهانی تمانعه) ، یەعنی کەسێکی ئەمڕۆ دەعوای خوایەتی بکا، ئیجاب ئەکا ترتیباتو نظاماتێک دابنێ، کە دەلالەت لە الوهیەتی بکا، ئەو ترتیب و احوالاتی سابقە، دیارە ئی ئەو نیە، بەڵام ئەو شەخصە گۆڕریو هێنایە معارضە، یەعنی مادامەکو منیش احیا و اماتە ئەکەم، احیا و اماتە نابێتە دەلیل لەسەر وجودی خودا.

بۆیێ حەضرەتی ئیبراهیم اغماضی لە حیلەکاری ئەو کرد، کە نەتوانێ حیلەکاری تێدا بکا، بۆیێ ئەفەرموێ: ﴿قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأْتِى بِٱلشَّمْسِ مِنَ ٱلْمَشْرِقِ﴾ خودای تبارک وتعالی بەو نظمو ترتیبی، کە ئەیبینین ڕۆژ ئەهێنێ لە لای مشرقەوە، ئەوی اربابی نظربێ ئەزانێ، احیا و اماتە گە لێک لە فوقی هێنانی ڕۆژە لە مشرق، کە (الی یومنا هذا) هەرچەندی حکما و ئەهلی دانش هەیە، لە سرری حەیات ناگەن. (احیا) زندوو کردن، قیاس ناکرێ لە هێنانی جسمێکی گەورە لە لایێک بۆ لایێک، هەرچی علمای هیئەت بێ، سەبەبی حەرەکە ئەزانێ، بەڵام ئەوە نظر بە (دروست بینان) ظاهر زاترە، ظاهر وایە حەضرەتی ئیبراهیم، ئەو شەخصەی نەختێک بە ئەهلی علم زانی بێ. ﴿فَأْتِ بِهَا مِنَ ٱلْمَغْرِبِ﴾ ئەگەر ڕاست ئەکەی، لە دەعوای خۆت مقابلە بکە و، ئەو نظمە تێک بدە ﴿فَبُهِتَ ٱلَّذِى كَفَرَ﴾ زاناندی ئەو مقابلەیە بەو ناکرێ، مات و مبهوت بوو، وەکو خودا پەرستەکان نەیگوت: من ئەیکەم!.

گەلێک لەخودا پەرستەکان لەو نەوعە قسە شەرم ناکا، ئەڵێن: «فلان شەخص چەندساڵ جڵەوی ڕۆژی ڕاکێشاوە، یەعنی ئەو ڕۆژەی هێناوە لە

مشرق بۆ مغرب»، بعضـێکیان ئەڵێن: ئەرز ئەرزی منە.. ئاسمان ئاسمانی منە! تاویلی مەلایەکانیش بۆ ئەو نەوعە کەسانە، لە قەبیلەی عوزر لە قباحەت خراپترەیە، گەلێک لە مسیحیان بێ پەردە و حجاب ئەڵێن: (عیسی) خالّقی ئەرز و ئاسمانە!

حاصلی، ئەو طاغوتی لە (ملیّون)ەکان پەیدابوون، لەکافرەکان پەیدا نەبووە. پاش ئەم (بهتە)، ئیجابی ئەکرد لە دەعوای باطلی خۆی بگەرێتەوە،لە تاریکی بێ بۆ ڕوناکی، اهتدا بە حەضرەتی ئیبراهیم بکا. ئەمما حبی جاه وسلطنەت، مەیلی ڕیاسەت، لێ ناگەڕێ ئەو نەوعەکەسە ئیمان بهێنێ ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٢٥٨﴾ قەومێک ڕووچووبن لە تجاوز و تصرّف بە غیری حەق،خودای تعالی هیدایەتیان نادا، ذاتاً تازە فەرمووی (لا اكراه في الدين) ئەو نەوعە مەیلە، ڕاسخە، بە قووەتە، مانعە، تا مانع نەڕوا (مقتضی) تاثیر ناکا. (طاغوت) دوو قسمن، قسمێک طاغوتن بۆ خۆیان، اضلالی خەلق ئەکەن بۆ خۆیان، قسمێک طاغوتی غەیرن بۆ غەیر، خەلق (اغوا) ئەکەن، ڕێیان لێ ئەگۆڕن، ماجرای ئەو شخصە لەگەڵ حەضرەتی ئیبراهیم بۆ ئەوانەیە، کە خۆیان طاغوتی خۆیان بن.

﴿ أَوۡ كَٱلَّذِي مَرَّ عَلَىٰ قَرۡيَةٖ ﴾ مثلە بۆ ئەوانەی، کە بەناوی غەیر، خەلقی اغوا ئەکەن، ئەو زاتەی کە بە سەر دێیەکیدا تێپەڕی، کێیە؟چ دێیەکە؟ بەیاننەکراوە لە قورئان،وە في‌الحقيقة پەکیشمان لەسەر بە یانی نەکەوتووە، ئەمما ئەو شەخصە ئەبێ (عوزێر) بووبێ، چونکە بعضـێک لە طاغوتەکانی بنی‌اسرائیل اضلالیان بە ناوی ئەو ئەکرد و، ئەوەیش ڕوایەت کراوە لە حەضرەتی علی، ابن‌عباس، عبدالله بن سلام «وعند جهينة الخبر اليقين» عتادە،عکرمە،ربیع ضحاك سدی،زۆر لە علمایان تەفسیری ئەوەیان اختیار کردووە ﴿وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا ﴾ ئەو دێیە وا وێران بووبو، کە بانەکانی ڕووچووبوون، کە دیواری خانوەکان بە سەر دارەکاندا کەوتبوون و اغلب

جێ، قبرستانی لێ نزیکە وڕێی بە قبرستان‌دا ئە ڕوا، ئەو ذاتە، کە مروری کرد بە مقبرەی دێیەکە، ظاهراً ئەبێ وەکوو مقبرەی (کۆیە) ، اغلب ئێسکوپروسکی مردووەکان بە دەرکەوتبێ، ئەوجا بە خاطری داهات ﴿قَالَ﴾ گوتی لە دڵی خۆیدا و قابلە بە زوبانیش لەگەڵ خۆی گۆتبی ﴿أَنَّىٰ يُحْيِۦ هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا﴾ لە کوێ خودای تعالی زندووی ئەکاتەوە ئەو دێیە، یەعنی ئەهلەکەی لە پاش مردن.

﴿فَأَمَاتَهُ ٱللَّهُ مِاْئَةَ عَامٍ﴾ خودای تعالی صەد ساڵی مراند، یەعنی خودای تعالی مراندی و صەد ساڵ لەو حاڵەیدا مایەوە، و الاّ نەفس مراندن چشتێک نی‌یە دەوام بکا، ئەو مردنە لای جمهور مردنێکی حقیقی بوو، بە لام (مجددی مصری) ئەو اماتە تفسیر ناکا بە مردنێکی، کە بالکلیە ڕوح لە بەدەن دەرچوون بێ، ئەفەرموێ: ئەوە نەوعە بێهۆشی‌یە، کە حیوانی بێ حس و حەرەکە ئەکا (داء النوم)، کە ئێستا معروفە مردنی (اصحاب الکهف)یش بەو نەوعە تەفسیر ئەکا، ئەوەیش باشە، ذاتاً معظم حیواناتی بێ بەرگ وەکو مار، هەتا کیسەل لە ڕۆژانی ساردی سرر ئەبێ لە حس و حرکە ئەکەوێ، خواردن و خواردنەوەی نامینێ، دەورانی خوێن و دقاتی قلبی سست ئەبێ، (معدە) بە حرکاتێکی ضعیف چەوراپی بەدەن صەرف ئەکا، تا دنیا گەرم ئەبی بە هۆش دێتەوە،بەلام لەگەڵ دوایی بە تکلفاتێکی زۆر نەبێ، ڕێک ناکەوێ ﴿ثُمَّ بَعَثَهُۥ﴾ پاش صەدساڵ جەنابی حەق زندووی کردەوە ﴿قَالَ﴾ خودا سؤالی لێکرد ﴿كَمْ لَبِثْتَ﴾ جەنابی حەق ئەیزانی، مقصودی ئەوەبوو بۆی بەیان بکا ﴿قَالَ﴾ لە جوابی کبریائی‌دا ﴿لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ﴾ ڕۆژێ، یا بعضێک لە ڕۆژێک ﴿قَالَ﴾ خودا فەرمووی:

﴿بَل لَّبِثْتَ مِاْئَةَ عَامٍ﴾ تۆ سەدساڵ لەو حاڵەدا مای ﴿فَٱنظُرْ إِلَىٰ

طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ ﴾ تەماشای طعام و شەرابت، کە ئازووقەی سەفەرتە،بکە بە بێنکردنو تامکردن﴿لَمْ يَتَسَنَّهْ ﴾ تغییری نەبووە، تامی، بۆنی نەگۆرراوە ﴿وَانظُرْ إِلَىٰ حِمَارِكَ ﴾ تەماشای کەرەکەت بکە چی بەسەر هاتووە، رزیوە، ئێسک و پروسکی نەماوە، تۆمان زندوو کردەوە، اولاً ببی بە ئایەت بۆخۆت، چونکی خۆت ئاگات لەحالی خۆت نەبووە، وثانیاً ﴿وَلِنَجْعَلَكَ ءَايَةً لِّلنَّاسِ ﴾ بۆ ئەوانەی کە ئەتناسن دوایی، ئەوا کەرەکەت زندوو ئەکەینەوە ﴿وَانظُرْ إِلَى الْعِظَامِ ﴾ تەماشای پارچە پارچەی ئێسکی کەرەکەت کە﴿كَيْفَ نُنشِزُهَا ﴾ چۆنی بۆ لایەک بڵند ئەکەین و تەرکیبی ئەدەین ﴿ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا ﴾ دوایی گۆشتی بە سەردا ئەهێنین ﴿فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ ﴾ کە بۆی معلومو ئاشکرابوو، خۆی لەتاریکی شکو شوبهە نەجاتی بوو ﴿قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٥٩﴾ ﴾ ئەزانم خودای تبارک و تعالی لەسەر هەموو چشتێک قودرەتی هەیە، مادامەکو لە دائرەی امکاندا بێ لە قودرەتی ئەو عاصی نابێ، نەگۆررانی طعام و شراب لە مدەی سەد ساڵ (حقیقةً) بە قودرەتێکی زۆر کامڵ نەبێ نابێ، بەڵام طاغوتی اهلی کتاب، ئەو ئایەتەشیان گۆرری کردیانە «ابن اللە»، کە خەلقی پێ لە روناکی ببەنە تاریکی. لەو ماجرایە هەیکەلی اموات لە موادی اصلیە گرد ئەکرێتەوە، روحی دێتەوە بەر.

جەنابی حەق ماجرایێکی تریشمان بۆ بەیان ئەکا، کە ئەجزای بەدەنی مردووەکان لەگەڵ یەک تێکە ڵاو ببن، ذاتاً ئەم اعادەیە لە نظر عەقڵ گرانترە و، ممکنیشە بڵێین ئەم وەقتە، کە حەضرەتی ابراهیم فەرموی: خودای من ئەژیێنێ و ئەمرێنێ، واردی خاطری بووبێ، کە لە کیفیەتی اعادەی سؤال لە حەضرتی کبریائی بکا، لەبەر زیادە مناسبەی ماجرای

(کالذی مرّ علی قریة)ی هاویشتە ناو. وەهەم ڕێیەکە بۆ ئەهلی توحید، کە فکریان حرّ بێ بۆ تێگەیشتن لە مسائلی صعبە سؤالبکەن، تا ممکنیان بێ لە ئەسراری عالەمی (کونو فساد)بگەن، ئەمە هیچ منافی اسلامو استسلام نییە، خودای تعالی، کە ئەمری کرد بە حەضرەتی ابراهیم (أَسْلِمْ) دەرحال فەرمووی: (أَسْلَمْتُ) معانە ئەو نەوعە سؤالەیش لە خودا ئەکا، کە وابێ حەضرەتی خلیل استسلامی علی العمیای نەبووە، بەڵام عفاریتی طاغوتی ئەهلی کتاب، تکلیف لە عبادی خودا ئەکەن، کە بێ (لِمَ) «بۆچی» تەسلیمیان ببن و شعبەیێکیش لە موسڵمانان ئەم ڕێگەیان اختیار کردووە.

جەنابی حەق (علی وجە التذکار) ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ﴾ ابراهیم سەلامی خودای لێ بێ گوتی: ﴿رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ﴾ خودایە نیشانم بدە چۆن مردوان زیندو ئەکەیەوە؟ حەضرەتی ابراهیم لەوە مەلاتر بوو، کە لە سرێ حەیات سؤال بکا، ئەوە سرڕێکە سەربەمۆر بۆ کەس کەشف نەبووە و، لایشم وایە بۆ کەشف نابێ. علمای طبیعەت زۆر خەریکن، چییان بە چ نەکردوە، مبادا کەسێک توهم بکا، کە ئەو سؤالە لەسەر شک و شوبهەیە لە قودرەتی کبریائی ﴿قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن﴾ خودا فەرمووی ئایا ئیمانت نەهێناوە بە ئەوە کە، من مردوان زندوو ئەکەمەوە؟ ﴿قَالَ بَلَىٰ﴾ گوتی ئیمانم هەیە ﴿وَلَٰكِن﴾ سؤالم کرد ﴿لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي﴾ کە مشاهدە بکەم، چۆن مردوان زندوو ئەکەیەوە.

پێش زەمانی سعادەت، جەنابی حەق ئەو نەوعە امورەی بە کردەوە بەیان ئەکرد، یا بە علائم تفهیمی ئەفەرموو، کە ئەوە نابێ کەسێک، ئەگەرچی وەکو حەضرەتی کلیم و حەضرەتی خلیل، بێ نەشئەتی لە زەمانی غلبەی حس و خەیاڵ دا بووبێ، دەرگەی فکر بەتەواوی نەکرابێتەوە و، ئەو نەوعە نەشئەتە نوعاً ما تاثیرێک و دەغدەغەیەک ئەدا، لام وایە ئەمە ضرورییە

وجوداً نی‌یە، جێی انکار نی‌یە، بەڵام ئەو خرتەخرتە، زوو لە دڵیاندا ئەڕوا و جاگیر نابێ. ﴿قَالَ﴾ جەنابی حەق فەرمووی سؤالەکەت بەجێیە ﴿فَخُذۡ أَرۡبَعَةً مِّنَ ٱلطَّيۡرِ﴾ لەهەر نەوعە تەیرێک بێ، چوار تەیر بگرە ﴿فَصُرۡهُنَّ إِلَيۡكَ﴾ هۆگری خۆتیان بکە، ئەوەیش بنا بە اختیاری مجددی مصری، بە موافقەی ابو مسلمی اصفهانی، یەعنی بەخۆتیان مالوف بکە، مەیلیان بدەرێ،مەیلت بدەنێ ﴿ثُمَّ ٱجۡعَلۡ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٖ مِّنۡهُنَّ جُزۡءٗا﴾ هەریەکەیان لەسەر چیایەک دابنێ، کانە لە بەر ئولفەت بەیەک، بوون بە یەک، بۆیێ یەک یەکی تەعبیردا بەجزۆ ﴿ثُمَّ ٱدۡعُهُنَّ يَأۡتِينَكَ سَعۡيٗاۚ﴾ پاشان بانگیان بکە دێن بۆ لای تۆ، خێرا بە باڵە فررەو نووکی پەنجە لەسەر ئەرز بۆت دێن.

تلمیذی عصریش زۆر قووەتی داوەتە ئەم معنایە، بنا لەو (قولە) حەضرەتی ابراهیم تێگەیشت، کە جەنابی حەق بە ئەمری تکوینی، اعادەی اموات ئەکاتەوە، چۆن لە اوەلەوە بە ئەمری تکوینی خلقی کردووە، ئەمما بەو وەجهە، کە ئێمە ئیشارەمان بۆ کرد. قولی جمهور اوقفە، کە حەضرەتی ابراهیم چوار تەیری هێنا سەری بررین، کوتانی، هەموو اجزایان تێکە ڵاو بوو، دوایی کردی بە چوار لەت،هەر لەتەی لەسەر چیایەک دانا، بە امری خودا بانگی کردن،هەر یەک لە اجزای خۆی گرد بوونەوە،حەیاتیان هاتەوە بەر، لەسەر هۆشو گۆشی پێشوو بە باڵە فررکە هاتنەوە لای حەضرەتی ابراهیم، ئەمەیش دەلیلێکی ئاشکرایە لەسەر کیفیەتی اعادە، چۆن لە اجزای ئەصلی خەلق کراون، هەر لەو اجزایەیش اعادە ئەکەنەوە، با عنصری مردووەکەیش لەگەڵ عناصری چشتی تر تێکەڵاو بووبێ. ﴿وَٱعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ٢٦٠﴾ خوداوەندی انام، غالبە عجز بۆ ئەو نی‌یە، ئەوی لە دائرەی امکان دابێ، ئەتوانێ بیکا، حکیمە.. حکمەتی ئەو وا لە قضا ئەخوازێ، کە حەیاتی بشری بە ضایع نە ڕوا، کەسێکی وەکو ابراهیمی خلیل،وەکو

موسـی کلـیم، وەکـو خـاتم الانبیـاء بمـرێ و ببرێتـەوە، حاشـا.. ئـەوە لـە حیکمەتی حکیم علی الاطلاق ناوەشێتەوە. لەو ئایەتە کریمە دەرئەکەوێ، کە احیـای امـوات بـە اعـادەی معـدوم صـرف نـی‌یـە، چونکـە ئـەوە اعـادە نی‌یە،خەلقیکی سەریەخۆیە، لاشک جەنابی حەق،بەشەری نـائلی حـەیـاتێکی ابدی ئەکا، ئەمڕۆ نا سبەی (وکل آت قریب).

ابو مسلم مەلایەک بووە، بە فکر با وجودێ ئیمانی بـە ئـەصـڵـی معجـزە هەیە، ئەمما زۆر کەیفی لەگەڵ خوارق نایێ، تا ممکنی ببێ ئەوی مفسرەکان بە خوارقیان تەفسیر کردووە، چ نظری چ عملی ئەو بە صـورەتێکـی موافـق لەگەڵ قواعدی عقڵو طبیعەت تصویری فەرمووە. ئێمەیش لەلامان وایـە ئـەو فکرە، فکرێکی باشە و بۆ ئوممەتی خاتم‌الانبیـا زۆر نافعـە،بۆیێ مجـددەکـان ئەو (مسلکە)یان پەسند کردووە و پێ‌ی‌دا ڕۆیشتوون.. منیش ئەگـەر عبـارە تی قورئانی موافقە بکا قبوڵی معانی ابو مسلم ئەکەم.

لەلای من زەمانی پێش حەضرەتـی ڕسـالـەت، لـەگـەڵ زەمـانـی دوای ئـەو پێغەمبـەرە عظـیم الـشانە، قیـاس نـاکرێ.. زەمـانـی علـم و عـەقـڵ لـەکـوێ، زەمانی حسو خەیاڵ لەکوێ؟ فکری ابو مسلم بۆ (ما بعد النبوە)، (حقیقةً) حـەقـە و (واجـب القبـول)ە، حـەزئـەکـەم کـەمێـک لـە افکـاری ئـەو نـەوعـە مصـڵحانەتان عەرض بکەم.

ئەساسی اسلامیەت لـەسـەر ئیمـانی صـحیحو عملـی صـالـح دامـەزرا، لـە زەمـانـی ڕسـالـەت و هـەر دوو عومـەر (عمـرین)، ئـەو ئـەساسـە بـەتـەواوی محافظەکرا و اثریشی دیترا، دوایی دەرگـەی فتنـەو فـساد کرایـەوە، فـسق و فجور زۆربوو،شەوقو نشاطی صلاح نەما،سەبەبی چـەبـوو؟ ئـەریـابـی فکـری مشغول کرد؟ دوایی بۆیـان معلـومبـوو، ئـەسـبابی فـسادی ئـومـەم، خـاصـة افکاری اسرائیلی بە سەر دەماغی موسڵمانان وەک سەیـل خرۆشـان طغیـانی کردووە، کە نزیکە بنیانی اسلامەتی بـە بـادا، ئـەو اسـبابانە اعتمـاد لـەسـەر خوارق،اغترار بە نەسەب پشت بەستن بە شفاعەت،بێ اهتمـامی بـە عـەقـڵ،

عەقڵ بکەن بە حەکەم.. بیکەنە تەرازووی تفریق لە بەینی حەق و باطل چاکە و خراپە، هەتا وایان نواند، کە عەقڵ ئەتوانێ بێ وەحیی ئیلاهی، اکثری اموری چاکو خراپ لای خودا دەرک بکا،وەحیی نبووەتیان کردە مؤیدی عەقڵ، (انه) وای لێهات عەقڵ اصله، نبووەت فەرعە. لام وایە لێرە تەرازووی عەقڵیان لە دەست چوو، ڕێگای طعنی خصمیان گوشاد کرد، پاش تحکیمی عەقڵ (بالمرة) دەرگەی خوارق و شواذ و غروری بە نەسەب و شفاعەتیان گرت ئەوەیش لای (آل نبی) گرانهات.. مقصودی ئەوان وابوو، کە موسڵمانان بلا تفریق لەبەینی (قریشی) و (حبشی)، بێ شائبەی اسرائیلی ڕووبکەنە خودا، بۆ دین و دنیا سەعی بکەن، بۆ تقویەی چاکە عملی چاکیان کردە جزئی حقیقی لە ئیمان، هەتا کەسێک گوناهێک بکا، بێتۆبە بمری، لایان لە زومرەی ئەهلی ئیمان حساب نییە، وەکوو کافران مخلدە، ئەویش لای سوادی أعظم لە ئوممەت زۆر گران هات، خصمایان لە ئەمە استفادەیان کرد، فەشەلیان بوو اوّلاً افراط پەروەرەکان لە نتیجەی حاکمیەتی عەقڵ، نوعاً ما حەضرەتی کبریائیان کردە محکومی عەقڵ، عەقڵ ئەڵێ ئەمە واجبە لەسەر خودا ئەبێ بیکا، ئەمە ممتنعە نابێ بیکا! ثانیاً مداخلەی سیاسەتی عباسیان وا مەزانن یەکێک لە خلفای عباسی مذهبی، ئەمانەیان قبووڵ کردبێ، فکری ئەو مصلحانە لەگەڵ مەیلو مشربی ملوکی عباسیان بەینیان، بەینی ئاسمان و ئەرزە، بەڵام کردیانە بەهانە بۆ دەفعی ئەو مەلایانەی، کە لە علیهیان بوون، لێیان ئەترسان، گەلێ مەلای گەورە گەورەیان کوشت. ئەمەیش سیاسەتێکی گەورە بوو لە تەرەف عباسیان، هەم دوشمنانی خۆیان دەفع کرد، هەم سوادی اعظمیان زیادە متنفر کرد لەو مذهبە.. گرۆهی مخالف بۆ محوی ئەو مذهبە، گەلێ تفریطیان کرد، قسماً عەقڵیان پامال کرد بە انواعی (قدح)، عەقڵیان شکاند.. لەبەر چاوی ئوممەت خست. قسمێکیتر نوعاً ما، قیمەتێکیان دا بە عەقڵ، بەڵام لە تشریعی احکام، لە تفریقی ڕاستو درۆ، چاکەو خراپەی عنداللە بێ حوکمو

ادراکیان هێشتەوە، دەرگەی کەرامەتیان بە نەوعێک واسع کرد، کە حوشتر بەبارەوە بە کونی دەرزیدا بڕروا، خۆی لەم تەرەفو لەو تەرەفی نەدا، شفاعەت باسی ناکرێ، جیران بۆ جیران، مەلاو و شێخ بۆ تبعەی خۆیان، وەکو پێغەمبەران شفاعەت ئەکەن! انتساب بۆ حەضرەتی رسالەت، بەڵکوو بۆ علماء اولیا اکسیرە،کافیيە! بۆ سعادەتی قیامەت، هەر ئیمان حسابە، لەگەڵ ئیمان خراپە بێ ئەثەرە، ولی محفوظن بنا لە قسەی «نابلسی» مەعنای ئەوەیە، وەلێ هەزار گوناە بکا، ذەررەییێک تاثیر لە معنویاتی ناکا، نشست بە مقامی معلای نادا، نفسی مقدسی قدس سررە پیس نابێ.. دەک چاوی سەرم بی! حاصڵی، لە بەینی افراط و تفریط، تضییق و توسیع ئوممەت اصلاح نەکرا، ڕۆژ بە ڕۆژ شقاق و نفاق، عناد و فەساد زیاد ئەکا، تا آخری لە عصری ئێمە بۆمبایەکیان تەقاند، کە بە جارێک عناصری موسڵمانانی پارچە پارچە کرد، ئەمەش چییە؟ فکری قومیەتە، کە لە تەرەف (ولسن) ڕەئیس جمهوریەتی امریکا هاویشتیە ناو موسڵمانان و، فکری مصلحی گۆررا بوو بە فکری طاغوتی، تاکو بە دینیش فیرقەکانی موسڵمانان لە یەک جودا بن، هەوای ڕسالەت کەوتە دەماغی مصلحەکان، قەومی تازە، دینی تازە. بعضێ علما لەسەر فکری اصلاحماون، بەڵام مەیلی مەذهەبی پابەندی بە سوننەت، هەتا لە اموری سیاسەتو ادارەو حەرب بووەتە زنجیریان. نە بەفیکر نە بە عمل، شەقاوێکی فراوانیان پێناهاویشترێ،ئەو ئوممەتە، تا وەکو بە ئایەتی (تلک امة قد خلت لها ما کسبت ولکم ما کسبتم ولا تسئلون عما کانوا یعملون) دڵی خۆیان مصقل نەدەن، ڕێ بە قانوونی صلاحی ئوممەت نابەن، لێرە لەبەر درێژیی، بە ئەوەندە اکتفامان کرد، انشاءالله لە موقعی مناسب، منیش فکری خۆمتان عەرض ئەکەم.

لە پێش آیة الکرسی ئەمریکرد بە انفاق و تفصیلەکەی ذکرکرا، هەمووی بە مناسبەتی شفاعەت بوو، لێرە مثلیک ذکر ئەکا بۆ زیادە ترغیبو تشویق،

لەسەر انفاق لە رێگەی، خودا (خالصاً مخلصاً لوجەالله الکریم) ﴿مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ ئەوی بذلی ڕوح، یا جگەر گۆشە بکا، ئەوە هەر تمثیل ناکرێ ﴿كَمَثَلِ حَبَّةٍ﴾ کە مادەی حیاتی تێدا هەبێ، بچەندرێ لە ئەرضێکی خاوێن و بە قووەت'شین بووبێ، بنجی کردبێ، (پیکە بررە)ی لێ نەدا بێ و (کورکی) نەبێ ﴿أَنۢبَتَتۡ سَبۡعَ سَنَابِلَ﴾ حەوت گوڵ دەربکا، لە هەر گوڵەی گوڵێک ﴿فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٖ مِّاْئَةُ حَبَّةٖۗ﴾ لە هەر گوڵێک سەد دانەی تێدابێ، کە ئەکا یەک بە حەوت سەد، لەولاتی بە بەرەکەت لە ساڵی هاتی زۆر، وا ئەبێ دانەیێک بنجێکی گەورە ئەکا، دە پازدە گوڵ ، دەرئەکا، غیری سنبلە و چەیشی لێ پەیدا ئەبێ، لە یەک و هەزاریش تێ ئەپەرڕێنێ ﴿وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُۗ﴾ بەو قەدەرە و زیاد لەو قەدەرە، لە فنی زراعەت معلوم بووە، تا (تۆ) ساغ و بێ عیللەت بێ،طبیعەتی ئەرزەکە لەگەڵ طبیعەتی دانەکە موافق بێ،ئەرزەکە زبڵ بکرێ، چاک بکێڵدرێ، تۆو بدرێ، نە پرر، نە شاش،بێ دەخیلەو ئافات، بێ بارانی لە وەقت بێ،لە وەقتی زاد گرتن، بای بە شددەت و بارانی بە قووەتی نەبێ، هەوای سان بێ (الی ماشاءالله) بەرەکەتی ئەبێ، هەروەها ئەوی ماڵێکی چاک بە مەلێکی خۆش بە اخلاصێکی تەواو، بداتە ئەهلی استحقاق، جەنابی حەق جەزا خێری زیاتر ئەکا .﴿وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ٢٦١﴾ کەرەمی قودرەتی، ڕەحمەتی فراوانە، احاطەی بە هەموو چشت داوە،عیلمی ئەو ذاتیيە هەموو چشت ئەزانێ، نە تەنها علمی تجلی و انکشاف، علمی عملیش، کە مبدئی خەلق و ئیجادە، ذاتاً مقصد لە علمی صانع علمی عملیيە، نافەرموێ (کمثل ذی حبة)، یا (مثل ما ینفقون کمثل حبة) اشارە بۆ ئەوە، کە ئەوانە نەفسی خۆیان مەبدەئی خێرات و حسناتن (کانە) نەفسی (حبە)کەن و بە (انفاق فی سبیل اللە) خۆیان نوما ئەکەن، لە مدارجی ترقی ئەکەن. نوما و ترقی یان، لە کیفیاتی

نفسیەیە، تمثیلیان بۆ ئەکا بە نماو زیادەیی (فيالكم). انسان لە انفاقدا سێ قسمە:

قسمێک جود و احسان ئەکا بێ ئەمەل بەکەس، وانەبێ ئەوی احسانی لەگەڵ کردووە، ئەبێ بە دوشمن گەلێک خراپەی ئەکا، قطعیاً بە چاوی داناداتەوە و لەلای کەس باسی ناکا، بەڕاستی لە ایامی ئێمە (حماغای غفوری زادە) لەو گرۆهە بوو، هەزار لیرەی بدابوایە کەسێک، کەس لێی نائەبیست بەهیچ وەجە، باسی نائەکرد. ئەوانە ﴿ ٱلَّذِينَ ﴾ ئەوانەن، کە ﴿يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ هیچ مەیلێکی تریان لە دڵ دا نییە ﴿ثُمَّ﴾ لە پاش بەخشیش لەڕێی خوا بۆ خوا ﴿لَا يُتْبِعُونَ مَآ أَنفَقُواْ﴾ بەدوای بەخشینەکەیان نانێرن ﴿مَنًّا﴾ منەت ﴿وَلَآ أَذًى﴾ لە فوقی منەت بەرەوژوور، ئەگەرچی ئەو کەسە بەدنمەکی و نانکۆریش بکا. ئەوانە ﴿لَّهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ اجری خۆیان،حەقی خۆیان لای خودای خۆیانە ﴿وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٦٢﴾﴾ چونکی ئەزانن خودا صادق الوعدە، واسع الكرمە.

﴿قَوْلٌ مَّعْرُوفٌ﴾ قسەیێکی خۆشوچاک بە تواضع ﴿وَمَغْفِرَةٌ﴾ و داپۆشینی عەیبی خۆی،یا عەیبی کەسێک کە غەیبی بزانێ ﴿خَيْرٌ﴾ لای خودا چاکترە لە ﴿مِّن صَدَقَةٍ يَتْبَعُهَآ أَذًى﴾ لە صدقەیەک، کە (اذی)ی لە دوواوە بێ، ئەگەرچی پاشان ئەو نەوعە کەسە، دیارە نەفسی پاک نەبووە، وە الاّ چاکەی خۆی لە فکر ئەکرد، چ جای ئەوەی اذای بەدوادا نێرێ، با اجریشی هەبێ، ئەمما حورمەتی خاصی لای خودا نییە ﴿وَٱللَّهُ غَنِيٌّ حَلِيمٌ ﴿٢٦٣﴾﴾ خودای تعالی دەوڵەمەندە، حاجەتی بە کەس نییە، حلیمە ئێوەش اقتدا بەو بکەن، حلیم بن.. قیسکە تەنگی مەنوێنن، با ئەوەی چاکەتان لەگەڵ، کردووە، سوئی ادبیشتان لەگەڵ بکا، جنێوی پێ مەدەن، لئامەتی بە دەر

مەخەن.. ئەمانە قسمی دووەمن لە ئانی انفاق (منّ و اذی) ناکەن، بەلاّم بە دوای ئەنێرن.

قسمی سێیەم: لە ئانی انفاق قسەی ناخۆش ئەکەن، منەت لەسەر شانی عالەم دائەنێن، ئەلێن: من نەبم خەلقی لە برسان ئەمرێ. چەند جارم انعام لەگەڵ کردن،ورگ درراینە، ئەوە چی یە هەر تێر نابن!! جەنابی حەق بالکلیة نەهی موسڵمانان ئەکا، کە بەو نەوعە خێری خۆیان نەبەن، خۆیان داخلی ئەو گرۆهە نەکەن.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُبْطِلُوا۟ صَدَقَـٰتِكُم بِٱلْمَنِّ وَٱلْأَذَىٰ ﴾ چاکە و حەسناتی خۆتان بەتاڵ مەکەن بە منەت دانان و جنێوو قسەی ناشیرین لە وەقتی انفاقدا،دیارە ئەو نەوعە انفاقە لە پاکی نفسەوە نی‌یە، مقصد خۆ هەلکێشانە، دڵ شکاندنی فقیرانە.. شەرری لە خێری زیاترە، ئەو قسمەیش دوو بەشن: یەکێک صەرف ئەکا بۆ فخرو مباهات،یەکێک صەرف ئەکا بۆ ڕوو و ڕیا، (ریاء) صدقە ناهێڵێ، لە ڕەگو ڕیشەوە هەڵی ئەکەنێ، بۆیێ بووەتە (مشبه بهِ) بۆ ئەوانەی، کە صدقەی خۆیان بطال ئەکەنەوە، بە منەت و اذی.

﴿كَٱلَّذِى يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ﴾ ریا علامەتە لەسەر ئیمان نەبوون بە خوا و بە ڕۆژی جزا، وە الاّ بۆ ڕیاکاری لەبەر خەلق ئەکا؟ فی سبیل‌الله بۆ نەجاتی قیامەت صەرفی ناکا؟ بۆیێ ئەفەرموێ: ﴿وَلَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ۖ فَمَثَلُهُۥ﴾ مثالی ئەو نەوعە منفقە منافقە ڕیاکارانە، لە بێ فائدەیی و خەسارەتمەندی ﴿كَمَثَلِ صَفْوَانٍ﴾ وەکو حاڵی بەردێکی گەورەی ڕەق، چی لێ‌شین نەبێ ﴿عَلَيْهِ تُرَابٌ﴾ کەمێ خۆڵی لەسەر بێ، قابل بێ ئەگەر نەرمە بارانێکی لێ بدا، چشتێکی لێ شین ببێ ﴿فَأَصَابَهُۥ وَابِلٌ﴾ بارانێکی ڕێژنەی لێ‌بدا لەبەردەکە، یان لە خۆڵەکە ﴿فَتَرَكَهُۥ صَلْدًا﴾ بەردەکەی ڕەق و تەق

جێهێشتبێ، ئەمانە وەکوو بەردە ڕەقەکە ئەمێننەوە و، ماڵەکەیان وەکو خۆڵەکە ئەڕروا ﴿لَّا يَقۡدِرُونَ عَلَىٰ شَيۡءٖ مِّمَّا كَسَبُواْۗ﴾ ثمرەی انفاقیان چەنگ ناکەوێ، ذاتەن بۆ خوایان نەکردووە، کە خوا جەزایان بداتەوە و، ئەوی ڕیاییشی لەگەڵ ئەکا چ پاداشی ناداتێ، چونکی ئەزانێ ئەمە ڕیاکارییە، لئامەتە، هەتا ئەگەر فقیریش ببێ، کەس بە پارچە نانێک بە سەری ناکاتەوە ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٢٦٤﴾ خودا هیدایەتیان نادا بۆ چشتێک، کە نفعیان بداتێ، ظاهر وایە لەم کفرە کفرانی نعمەت مقصود بێ، یەعنی ئەوی بێ ئەمەگی بکا لەگەڵ خودا، نیعمەتی خودا لەڕێی غیری خودا صەرف بکا، خودا ئەوە ناکا خێر لە صرفیاتی خۆی ببینێ ﴿وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمُ﴾ هەر نەوعە ماڵێک ببێ ﴿ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِ﴾ مقصودی محضاً استحصالی ڕەزای خوابێ ﴿وَتَثۡبِيتٗا مِّنۡ أَنفُسِهِمۡ﴾ ثبت و قرار پێدان لە نەفسی خۆیان، بۆ تحصیلی ڕەزامەندی خودا، (أنّهُ) بیکەنە مەیلێکی ڕاسخ وەکوو مەیلی فطری، کە مطلبیان لە هەر کارێک هەبێ، خۆشنوودی خودایە ﴿كَمَثَلِ جَنَّةِۭ بِرَبۡوَةٍ﴾ وەکوو باغێکە لە جێیەکی بەرز و بڵند و هەوا گیر بێ، یا جێیەکی نەرمان و گۆرر ﴿أَصَابَهَا وَابِلٞ﴾ بارانێکی ڕێژنەی لێدابێ، ئەمما نە ڕێژنەیەک، کە تخریبات بکا، بەڵکوو ڕێژنەیێک تاوە بارانێکی خۆش، کە ئاوی بە تەواوی بە ئەرزەکەدا بچێتە خوارەوە و، ڕەگی دارەکان تەرر و تێراو بکا ﴿فَـَٔاتَتۡ أُكُلَهَا﴾ میوەجاتی خۆی ببەخشێ بۆ هەر کەسێک، هەتا حیوانات و طیور ﴿ضِعۡفَيۡنِ﴾ چین لە پاش چین (وەکوو مێوی مەلا احمد اغای سمایل اغا، کە هەشت نۆ دە بەر ئەدا) تێکرراو بە تەرتیب ﴿فَإِن لَّمۡ يُصِبۡهَا وَابِلٞ فَطَلّٞۗ﴾ ئەگەر بارانی بە تاوی لێنەدابێ، بارانێکی نەرمە نەرمە،وردە وردە، سەبرە وەکوو (خوناو)، ئەو

نەوعە بارانە، ئەگەر دەوام بکا چاکترە لە ڕێژنە، چونکە ئەو داروبارە، بەو نەوعە بارانە، میوەیێکی زۆر زۆر چاک ئەدا ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ ٢٦٥﴾ خودای تعالی ئاگای لە هەموو ئیشوکاری ئێوە هەیە سرر و علن، چاکە و خراپە، خالص و بە غەش.

ئەی گوێدێرەکان، ئێوە انسانن، سلطانی دەوڵەتی حەیاتن، ئەو دەوڵەتە لە نباتان و اشجار و حیوانات پێکهاتووە، ئێوە علاوەی نەفسی انسانی، نەفسی نباتی و شجری و نەفسی حیوانیتان هەیە، هەر یەک لە هەیکەلی ئێوە موجودە، ئەثەری دیارە، تەماشای انسانیەتی خۆتان ئەکەن، غەیری خودا، کەس لە فوقی ئێوە نییە، کە بی پەرستن، لە ڕێی ئەو، ماڵی خۆتان ببەخشن، حەیاتی خۆتان صەرف بکەن، ئەگەر تەماشای نەفسی حیوانی ئەکەن، تەماشای حیوانات بکەن، هەتا حیواناتی درندە لە حەق کەسێکی بە خێوی بکا، زۆر بە مەیل و ئولفەتە، هەر وەقتێ بانگی بکا، بەدوا قسەی دادێ بە غاردان بۆلای ئەچێ، خودایەکی، کەرب العالمینە ئێوەی بەو نەوعە تربیە داوە، چۆن بە ئەمرو ارادەو بە فەرمایشاتی حەرکە ناکەن، ئەگەر تەماشای نەفسی نباتی و شجریتان ئەکەن، چ نەبێ تەماشای دانەیێک بکەن، کە ئەم هەموو دانەیە ئەداتو ئەبێتە باعث و سەبەبی ژیانی حیوانات، و تەماشای دارو درەخت بکەن، چ میوەیەک ئەدات! چەند خۆشە! چەند بە لەزەتە! ئێوەیش بەو نەوعە، بە خێرو بەر بن بۆ عبادی خودا، لەبەرخودا. جمالالدینی افغانی ئەفەرموێ: «ئینسان دارێکی متحرکە، دار ئینسانێکی ساکنە،حەق وایە ئینسان وەکوو دارێک بێ، بە بەر و بە سێبەر، کە خەلق لە سایەی ئەوەوە، نفع ببینێ و استراحەت بکا».

﴿أَيَوَدُّ أَحَدُكُمۡ﴾ ئایا کەس لە ئێوە پێی خۆشە ﴿أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٌ﴾ باغێکی هەبێ ﴿مِّن نَّخِيلٖ وَأَعۡنَابٖ﴾ لە دارخورماو مێو. ئەساسی ئەو باغە، کە لەو دوو دارەبێ، کە انفعی داری دونیان، هەردووکیان انواعیان زۆرە،

هەم بە لەزەتن، هەم ئەبن بە قووەت... لاهوایە قەسپیش وەکوو ترێ هەموو ذی روح ئەیخوا.. ئێمە خاوەن ڕەزین، ئەبینین هەموو حیواناتێکی، کە لە وڵاتی ئێمە دا هەیە لە بەراز، تا کیسەڵ، هەموو حشرات ترێ ئەخوا، الاّ پشیلە نەبێ، قەت ئەم دیوە ترێبخوا، ئەو باغەیش ﴿تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ جۆگە و جوباری بە ژێر دارەکاندا ئەڕروا، هەم زستان استفادە لە باران ڕێژنە و نەرمە نەرمە ئەکا، هەم هاوین بەو ئاوانە ئاو ئەدرێن، کە وابێ قەت تینوو نابن، ﴿لَهُۥ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ﴾ بۆ ئەو هەبێ لە باغەکەدا لە انواعی میوە، سێو، هەرمێ ، هەنجیر، خۆخ، قەیسی، ئاڵوباڵوو، هە ڵوژە، هەنار، لیمۆ، پرتقال، هەتا گێوژ و سوربلەتی ﴿وَأَصَابَهُ ٱلۡكِبَرُ﴾ پیری تاثیری تێ کردبێ، قووەتی کەسبو ڕەنجبەری نەمابێ ﴿وَلَهُۥ ذُرِّيَّةٞ ضُعَفَآءُ﴾ فەرخۆڵەی بێهێز و تاقەتی هەبێ، ئیش و کاریان پێ نەکرێ، ئەو کەسەیش بە خێری میوەجاتی ئەوباغە، بۆ زەخیرە و خواردنی خۆی و اولادی، چیتری نەبێ، ﴿فَأَصَابَهَآ إِعۡصَارٞ﴾ گەردەلوولەیێکی لێدا، کە ئەو گەردەلولە، کە ﴿فِيهِ نَارٞ﴾ کە موادی سمەیە ﴿فَٱحۡتَرَقَتۡۗ﴾ دەر عقب ساعەت بسووتێ،ئەوە بۆ بلادی گەرم، وە لە وڵاتە ساردەکان، وا ئەبێ پایزێکی زوو ساردییەکی بە شیددەت ئەبێ و، وەیشومەیێک لە دار و درەخت و سەبزە ئەدات، ئەیانسوتێنێ، بعضێ میوەی وەکوو: هەنار ناوی وەکوو پەلاسی ڕەشی لێدێ، یا لە دەرە بەهار وەقتی ئاو تێگەرران، وەیشومەی لێئەدا ڕەق هە ڵئەگەررێ، بە جارێک دارەکە وشک ئەبێ. لەوڵاتە ساردەکان قابلە هەردوو نەوع ببێ، حاشا کەس ئەوەی پێخۆش نییە، کەوابێ ئێوەش بە بای سمومی (منّ)و ئەذای بە وەیشومەی ڕیا، باغی خێرات و حسناتی خۆتان مەسووتێنن!! ﴿كَذَٰلِكَ﴾ بەو تەرزە، کە تەرزە ﴿يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ﴾ معنویاتتان بۆ بە صورەتی حسیات ئەنوێنێ، هەتا ئێوە بیهێننە بەر حسی

خۆتان، زەریف تەماشای بکەن ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٦٦﴾﴾ بۆ خاطری ئێوە تێ بفکرن، وسعەتێکی ذهنتان پەیدا ببێ، لە هەموو کارێک تامل و تدّبر بکەن، تا بە تەواوی لە احوالّی نەفسی حسی دنیەوی و اخروی، صلاح و فساد بگەن و، مصلّح و مفسد باش فەرق و تمییز بکەن، اتفاقێکی، کە لەلای خودا مقبولّ بێ، اولاً بۆ خودای بێ، ثانیاً لە پاکی نەفسەوە، ثالثاً لە مالّێکی چاک و پاک بێ، تا ئێستا دوو شەرط بەیان کرا ئەمە شەرتی سێیە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبْتُمْ ﴾ انفاق لە مالّێکی چاکو پاک، کە بە کەسبو تجارەت پەیداتان کردبێ ﴿وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ ﴾ لەومالّەی، کە بۆمان هێناوەتە دەرەوە لە ئەرزی، واقعاً ئەویش بە خۆرایی بە چەنگ ناکەوێ،سەعی پێئەوێ کشتو کێل و مصرەفی جووت و جووتیار، بررین بە پێمەررە، پاس لە دز و بەراز. ئەمما نەفسی مالّەکە صەرف بە خەلقی خودایە، احتیاجی نییە بە (شدّی رحال) بۆ ئەم شار و ئەو شار.. کەشماکەش و چەندو چوونی معامله..

﴿وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ ﴾ قصدی مالّێکی پیس نەکەن، کەلەئەو انفاق بکەن ﴿وَلَسْتُم بِـَٔاخِذِيهِ ﴾ ئەو نەوعە مالّە ئێوە وەرناگرن. ﴿إِلَّآ أَن تُغْمِضُواْ فِيهِ ﴾ الاّ مەگەر چاوتانی لێ بپۆشن، تەماشای چی نەکەن لە بەر احتیاجی،کەوابێ لەو نەوعە مالّە صەرفمەکەن، لە نەوعێک صەرف بکەن، کە ئەگەر کەسێک بتانداتێ پێ کەیف خۆش ببن. ﴿وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿٢٦٧﴾﴾ ئێوەیش خۆتان بکەنە مظهری صفاتی کبریائی، بە بەخشینی مالّی چاک، کەسبی استحقاقی حەمد بکەن، لای خودا و لای عبادی خودا.

﴿ ٱلشَّيْطَٰنُ ﴾ ئەویش کەلە جملەی طاغوتانە ﴿يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ﴾ بە وەسوەسە ئەلّێ مالّ ادخار بکەن لازمتان ئەبێ، بێهودە مالّی خۆتان بۆچی ئەدەنە ئەم

و ئەو، ئەو مێوژە چاکە بۆ ضایع ئەکەن؟ ئەو خورما شیرینو نازدارە چۆن ئەدەنە ئەم جرروجاموشتانە؟ سبەی ئێوە محتاج بوون، کێ پسیارتان لێ ئەکا؟ ئەمە بۆ جهەتی چاکە،ئەمما بۆ لای سفاهەت ترغیبتان ئەدا، ئەڵێ: ناو و ناوبانگ پەیدا بکەن، پارەی زۆر بدەنە چاوەشان، مەدحتان ئەکەن، گوێ مەدەنە عائلە، خوا ڕزاقیانە، با خۆیان کەسببکەن! چەند کەس چیان بۆ منداڵیان بە جێنەهێشت! اولادەکانیان زۆر دەوڵەمەند بوون، گەلێک کەس میراتی زۆریان تەرک کرد، منداڵەکانیان لەبرسان مردن، حاصڵی ﴿وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ﴾ ئەوی خراپ بێ، ئەمرتان پێ ئەدا، بە تزییناتێکی شاعرانە،شتی چاکە تصویر ئەکا بە خراپ، چشتی خراپ تلبیس ئەکا بە صورەتی چاکە و، علی الاکثریش ئینسان بە تسویلات و تلبیساتی هە ڵئەخەڵەتێ.

﴿وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا﴾ جەنابی حەق، چاکەو خراپەتان لەسەر صورەتی حقیقی بۆ اظهار ئەکا، وەعدەتان لەگەڵ ئەدا. بەڵێ خۆش بوون لە گوناە بە زێدەیی لە دنیا و قیامەت، جەنابی حەق ڕێ نادا فلسێک بێهوودە صەرف بکەن. ماڵی دونیا زۆر محترەمە لای خودا، هیچشت نییە پاداشی ماڵی دنیابێ، الاّ حەیاتی شخصی، حەیاتی ئوممەتی، حەیاتی ابدی مسعودانە، کەسێک ماڵ لە ڕێی حەیات صەرف بکا، حەیاتی زیادئەبێ و عالەمێک لە سایەی ئەو ئەژێ. کەسێک ئیمانی بە وەعدەی خودا هەبێ، ئەوەندەی کافی‌یە حاجەت ناکا بە تووڵ و تفصیڵ و، ئەڵبەتە بەتسویلاتی طاغوتان هەڵ ناخەڵەتێ.

﴿وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦٨﴾﴾ فەضل و کەرەمی احاطەی هەموو چشتی داوە، هیچ چشت لە ئەو بزر نابێ، ئێوەیش بە احسان و عیلم، تابعی خودای خۆتان بن لە سیعەتی عیلم و کەرەمی ئەوە.

﴿يُؤْتِي ٱلْحِكْمَةَ مَن يَشَآءُ﴾ ئەوی حەزبکا خودای تعالی، کەمالی قووەی

نظر و عملی پێکەرەم ئەکا، چاکەو خراپە لە یەک تفریق ئەکا، بە مشاغبات و مغالطات و خیاڵاتی شاعرانە هەڵ ناخە ڵەتێ،بە حجەت و بورهان حقائق کەشف ئەکا، چشتی بە جێ ئەکا.. (حقیقةً) ئەو حکیمەتە، بە تەواوی لەقورئان بە چەنگ ئەکەوێ... حقیقەتی چشت بە دەر ئەخا، انکاری حقی تێدانییە، نابینن لە باسی (خمر ومیسر) انکاری منافعیانی نەکرد و، لە (ربا) لەمەودوا باسی لێ ئەکرێ، انکاری فائدەی نافەرموێ..ئەو حکمەت و عدالەتە بحق لە مزایای قورئانە.

﴿وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا﴾ وەک لە حدیث ئەفەرموێ: «حکمەت چشتێکی بزر بووە بۆ مؤمن، لە هەر جێیەک بیبینیتەوە ئەیگرێتەوە» بە ڵێ، ئەوی (توشنە لەبی) حیکمەت و عرفان بێ، ئەگەر حیکمەت لە گاوانێک وەریگری، پێی عار نییە..(لە سەرەتای تحصیلم باوکم فەرموویی: ڕۆڵە وەصیەت بێ تحقیری نووسراو مەکە، هەرچی دەستت کەوت موتاڵای بکە، خاڵی نابێ لە فائدە)، فی الحقیقة فەرموودەی باوکم زۆر نفعی بۆ من بوو، از جملە ڕۆژێک دەرسی (تحفە)م ئەگوت لە باسی (قصاص)، تووشی مەسئەلەیەک بووم: کەسێک زەهرێکی کەم لە ڕێی دەم بداتە کەسێک و بمرێ، قصاصی لەسەر نییە.. ئەمما ئەگەر لە أعضای خارجی، بە دەرزییەک زەهری کەم باوێتە ناو بەدەنی کەسێک و بمرێ، قصاصی لەسەرە..من جهەتی فەرقم بۆ معلووم نەبوو، تاکو پاش بەینێک تەماشای جریدەی (ثروت فنون)م ئەکرد، مباحەثەیێکی لە بەینی دوو جرّاح ذکر ئەکرد، یەکێک ئەیگوت: لە زەردێنەی هێلکە زەهر هەیە، بۆیە گەلێ جار برینێک، کە مەرهەمی هێلکەی لەسەر دابندرێ، تەشەنا ئەبێ کێمی لێ پەیدا ئەکا.. ئەوی تر ئەیگوت: ئەگەر وابێ ئەبوایە ئەهلی (پارس) هەموو بمرن؛ چونکی بێ حەد و حیساب ساڵێ هێلکە ئەخۆن، مع انە هیچ قدید ناکەن. دختۆری یەکەم جوابی دا، گوتی: زەهر لە هێلکە کەمە، بە خواردن حەرارەتی معدە و جگەر، قووەی هاضمە مەنعی تاثیری ئەکەن، بەڵام لە

خارجەوە قووەتێکی وا نیيە، کە مدافعەی ئەو زەهرە کەمە بکا، بۆیێ تاثیر ئەکا، ئەوجا لەو ماجرایە حیکمەتی مەسئەلەکەی شەرعیم لێ معلومبوو و، زۆر مسرور بووم، کە وا بێ تحقیری حیکمەتی ئەرستۆ و ئەفلاتون بۆ موسڵمانان نەهاتووە. تەماشا بکەن ئەوی چاکە قبوڵی بکەن، ئەوی خراپە ڕەدی بکەن، تنفیری عباد لە حیکمەتی حکمای ئیلاهیون، بێ شک لای خودا و پێغەمبەر خۆشنیيە..

﴿وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٦٩﴾﴾ تذکرو تفکر ناکا لە چشت، پەند پەزیر نابێ لە نصیحەت، الاّ ئەوانەی کە صاحب کاکڵن، بە ناو و ناوکن، ئەوی دڵی هەبێو تێی بگا، لە هەموو چشت عیبرەتێ وەرئەگرێ. ئەڵێن، لە ایامی (خسرو)، ماسیگرێک هەبوو، ڕۆژێک ئەچوو بۆ ماسی گرتن، گوێی لێبوو ئەهلی عیلم قسەیان لە (خنثی مشکل) ئەکرد، کابرا بە دوای کاری خوێدا ڕۆیی، اتفاقاً ماسیيەکی زۆر جوانی گرت، هاویشتیە ناو تەشتێ پڕ ئاو و بردی بۆ خزمەت (خسروی پروین)، خسرو زۆری پە سندکرد، گوتی: (زە) قاعدەی وابوو دەربارەی شخصێکی ئەم کلمەی بگوتایە چوار هەزار دەرهەمیان ئەدایێ، ڕاوکەرەکە پارەکەی وەرگرت، حەرەمی خسرو گوتی: ئەمە اسرافە مقابلی ماسیيەک چوار هەزار درهەم چۆن ئەدرێ، گوتی چیبکەم؟

عەرضی کرد: بیگێڕەوە و پێی بڵێ ئەگەر نێرە، مێیەی بهێنە، ئەگەر مێیە نێرەی پەیدا بکەوە، الاّ نامەوێ! شەخصەکەیان گێررایەوە. ڕاوکەر لە جوابدا عەرضی کرد: ئەو ماسیيە (خنثی)یە، نەنێرە، نەمێیە، (خسرو) جوابەکەی پێخۆشبوو، گوتی: (زە) چوار هزار درهەمی تریشی وەرگرت و ڕۆیی، درهەمێکی لێکەوت،هە ڵیگرتەوە ماچی کرد، نایە سەرسەری، پاشان خستیە گیرفانی، دیسان حەرەمی (خسرو) فەرمووی، بنوارره ئەو صیادە چەند لئیم و نامەردە، لە هەشت هەزار درهەم درهەمێکی لێکەوت هەڵیگرتەوە و ماچی کرد و نایە سەر سەر و، ئەوجا لە گیرفانی نا، چاک

وایە بێگێرریەوە و پارەكەی لێ بستێنیەوە. گێررایانەوە. (خسرو) فەرمووی: بۆ ئەو لئامەتەت كرد، با ئەو درهەمە فقیرێک هەڵی بگرتابوایەوە! صیاد گوتی: قوربان ئەمەم لە لئامەت نەبوو، چونكی درهەمەكە صورەتی شای تێدا بوو، نەمتوانی صورەتی شاه ببینم بە زەلیلی بكەوێتە سەرخۆڵ و ژێر پای آیندە و ڕەوەندە، بۆیێ بە كمالی حورمەت هەڵم گرتەوە، ئەم جارەیش (خسرو) فەرمووی: (زە) چوار هەزار درهەمی تریشان دایێ، گوتی: ئەوجابرۆ بەسیە!. نووسی: «كەسێک بە قسەی ژنی بكا، لە جیاتی چوار هەزار درهەم، دوازدە هەزار درهەم ئەدا».

﴿وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ﴾كەم یا زۆر، سرر، یا علن لەڕێی خودا، یا بۆ سمعەو ڕیا بە هەوەسی خۆتان ﴿أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ﴾ یا لەسەر خۆتان لازم بگێررن، چ ماڵ، چ عبادەت ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُهُۥ﴾ خودا ئەیزانێ بە هەر وەجهی بێ، یا هەر كامیان بێ و مجازاتو مكافاتی مقررە ﴿وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿٢٧٠﴾﴾ ئەوانی شتی بێ جێ ئەكەن، كەس نیيە یاوەریيان بدات، نە بە پاررانەوە، نە بەمدافعە ﴿إِن تُبْدُوا۟ ٱلصَّدَقَٰتِ فَنِعِمَّا هِىَ﴾ ئەگەر ئێوە خێرات بە ئاشكرایی بكەن، شتێكی چاكە ﴿وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا ٱلْفُقَرَآءَ﴾ ئەگەر بە دزی خێرات بكەنو بیدەنە فقیران ﴿فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ ئەوە چاكترە لە خێری بە ئاشكرایی، ئەمما بعضێک ئەفەرموون: ئەوە خێرێكە بۆ خۆتان ئەیكەن، منیش لە لام وایە لە گەلێک جێ، خێری بە ئاشكرا چاكترە و، ئەو معنای كە لە (نعماهي) دێتە ذهن، انسان وەقفی زیاترە لە معنای (خير لكم).

﴿وَيُكَفِّرُ عَنكُم مِّن سَيِّـَٔاتِكُمْ﴾ ئەو نەوعە خێرە ئەبێتە كفارەتی بعضێک لە سیئاتی ئێوە، انە ئەو اخفایە بعضێک لە گوناهی ئێوە عەفوو

ئەکا ئەوەیش لە علمی بلاغەت پێی ئەڵێن: (مجازی عقلّی)، ئەگەر ضمیری غائب بۆ خودا بێ، حقیقەتە و مجازی تێدانییە.

﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٌ ٢٧١﴾ احتیاج ناکا کەس خەبەری بداتێ. اظهار و اخفای صدقات لای خودا یەکە.

وقتاً کە شەرح و ایضاحی حاڵی منفقی مخلص و منافق، گەیشتە ئەم دەرەجە، دێتە دڵی حەضرەتی رسالەت پەناه، لا شک ئەوانە اهتدا بەو ئایاتە بیناتە ئەکەن، (من بعد) ماڵی خۆیان بە ریا صەرف ناکەن، صدقاتی خۆیان بە (مَنّ وأذی) ابطال ناکەن. ئەو ظالمانەی بێ أنصار انتباهیان ئەبێ بۆ دەفعی ئەو خاطرە ئەفەرموێ: ﴿لَّيۡسَ عَلَيۡكَ هُدَىٰهُمۡ﴾ ئەی رەسولی هادی! هدایەتی ئەوانە لەسەر تۆ نییە، وەظیفەی رەسول و تبلیغ و پێگەیاندنە.

﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُۗ﴾ اخلاص و غش لە اموری نفسیەیە تحویلی دڵ، تزکیەی نفس عائدی جەنابی بارییە، ئەوی بزانێ قابلیەتێکی هەیە، بە جارێک لە سیئاتی معنوی دڵی راسخ نەبووە، هیدایەتیان ئەدا، پاکیان ئەکاتەوە، ئەوی دڵ رەق بێ، خباثەتی نەفسی گەیشتبێتە دەرەجەی مەلەکە، ئەمە قابلی هیدایەت نییە، قاعدەیێکی مقررە، فەیض بە گوێرەی استعدادە، پاش دەفعی ئەم خەیاڵە، دیسان توجهی خطاب ئەکاتەوە ئەهلی ئیمان، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا تُنفِقُواْ مِنۡ خَيۡرٖ فَلِأَنفُسِكُمۡۚ﴾ بۆ خۆتانە، کەسێک هۆشی هەبێ کارێکی بۆ خۆی بکا، ئەڵبەتە زۆر چاکی ئەکا، وەک لە (مثلی) کوردی دا ئەڵێ: (دۆم بێ و کڵاش بۆخۆی بکا).

﴿وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ ٱللَّهِۚ﴾ حاڵی مؤمن وایە، خێرێ بکا بۆ خوایە، ئەوی بۆ خوای بکا، بۆ خۆیەتی، ئەوی بۆ غەیری بکا، خێری لێ نابینێ.

﴿وَمَا تُنفِقُواْ مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ﴾ جزای خێر بە ئێوە ئەگا بە تەواوی ﴿وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٢﴾﴾ ئێوە ظلمتان لێ ناکرێ، بە نقصی جزا ئەو نفقەی ئەیکەن. ﴿لِلْفُقَرَاءِ الَّذِينَ أُحْصِرُواْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ بۆ ئەو فقیرانەی، کە حەبس کراون لە ڕێی خودا، وەک اصحابی (صُفّة) دەرکرابوون لە وڵاتی خۆیان، هیچیان نەبوو، لەسەر ئەو حاڵەیش خەریکی حفظی قورئان و احادیثی پێغەمبەر بوون وەک ئەوانەی، کە لە ڕێگای خودا بریندار کرابوون، لە عمل کەوتبوون ﴿لَا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِي الْأَرْضِ﴾ نەیان ئەتوانی بەسەر ئەرزدا بڕۆن، بۆ بە دەست هێنانی قووت. قەومێک ئەو نەوعە فقیرانەی هەبێ، چۆن خودا ئەمریان ئەکاتێ، ماڵ صەرف بکەن لە فقیران ئەگەرچی کافریش بن؟! بەڵێ، محاسنی اسلامیە وا ایجاب ئەکا، اما بعد الغلبە پاش چارەسازی، ئەو نەوعە بێنەوایانە، نازانم ئەوانی پێشوو، چۆن ئەو معنایەیان لە (لیس علیک هدیهم) داوەتەوە.

عبارەتی ئەو ئایەتە لەگەڵ سببی نزولی، کە ئەیڵێن هیچ مناسبەی نییە.

﴿يَحْسَبُهُمُ الْجَاهِلُ﴾ ئەوی نەیان ناسێ و فەراسەتیشی نەبێ، وایان حساب ئەکا، کە ﴿أَغْنِيَاءَ مِنَ التَّعَفُّفِ﴾ بە دەوڵەمەندیان تێ ئەگا لە بەر عفەت نواندن و اعراض لە چشتنان.

﴿تَعْرِفُهُم بِسِيمَاهُمْ﴾ ئەوی سەرنج بدا، لە علاماتو نیشانەی چشت بە نیشانە ئەیان ناسێ. تۆ ئەی صاحب فەراسەت! ئەزانی ئەوانە فقیرن ﴿لَا يَسْأَلُونَ النَّاسَ إِلْحَافًا﴾ سؤال ناکەن لە کەس بە الحاح و اصرار، بە چەقە سووەتی وەک (پاوەیی)یان، ئەمما ئەو قەیدە مفهومی مخالفە نییە، یەعنی سؤالی بێ الحاح ئەکەن؛ چونکە ئەو قەیدە لەبەر موافقەتی حاڵی سائلانە، چونکە علی الاکثر بە الحاحن.

﴿وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ﴾ بۆئەوانەیا علی الاطلاق ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢٧٣﴾﴾ خودای تعالی بە تەواوی عیلمی پێ هەیە، ئەیزانێ ئەوانەی لە (انفاق فی سبیل‌الله) احتیاط ئەکەن، لە ترسی سمعەو ڕیا بزری ئەکەن، نوعاً ما دەغدەغەیەک و خرتو پرتێکیان لە دڵدا هەیە، نەفسیان بۆ انفاق بە تەواوی صاف نەبووە، ئەمما ئەوانەی ثباتی نفسیان بووبێ، لەسەر طلبی ڕەزای خودا ئەو خیاڵاتەنەیان بە دڵدا نایە، ئەوانە بەڕاستی انفاقیان لای خودا مقبولە﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ سِرًّا وَعَلَانِيَةً ﴾ ئەوانی ماڵی خۆیان صەرف ئەکەن، شەوو ڕۆژ سرر و عەلەن، یەعنی دزی و ئاشکرا، بێ فیکرو ئەندێشەی سمعەو ڕیا، هەر بە دڵیان دانایێ ﴿فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ﴾ بۆ ئەوانە ئەجری خۆیان ﴿عِندَ رَبِّهِمْ﴾ لای خودای خۆیان، ئەم ئەجرەیش بە خودا نەبێ تقدیر ناکرێ ﴿وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ﴾ هەتا لە ڕیاو سمعە ﴿وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٧٤﴾﴾ هەتا لە بذلی ڕوح. دینی مبین اسلام شیرازە بەندی انتظامە، ئەیەوێ هەموو فەردێک لە افرادی ئوممەت عضوی عامل بێ بۆ هەیئەتی اجتماعی، کەس خۆی نەکاتە (چەل مەل) بە ملی کەس، نابێ عاطل لە ناویاندا بمینێ، مەگەر سەقەتو شەلو کتوکۆر ئەوانە ئەبێ خزمەت بکرێن، دوو طائفەش لەسەر ئوممەت واجبە بە خێویان بکا.

یەکەم، ئەهلی علم، کە حصری عمری خۆیان دەکەن بۆ حفظی قورئانو قواعدو اصولی دین، خاڵی لەغەش تبلیغی موسڵمانانی بکەن.

دووەم، حکومەت کە بە ماموری اداری و عسکری حفظی ئوممەت و وەتەن ئەکەن، لازمە ئوممەت علی العموم ئەهلی ثروەت بن، ئەگەرچی (علی اختلاف الدرجات)، چونکە حصری ثروەت لە بعضە کەس و، مانەوەی سوادی أعظم لەسەر (فقر) ، مایەی فەسادە، بۆیێ لەدینی مبین (ربا)، کەبە کوردی (ربیدە)ی پێ ئەڵێن حەرامە بە شیددەت، لێرە بە مناسبەی انفاق

بە خلوصی، یا بە نفاق بە صورەتی (مستکره) ابرازی ڕبا خواردن ئەکا بۆ انذاری خە لک ﴿ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ﴾ ئەوانەی ڕبا ئەخۆن، لازم نی‌یە بە ڕێگەی (اکل) بێ، لە کوردیش ئەگوترێ: فلانکەس ڕبا خۆرە، فلان مالی فلانی خوارد، مالی منی لە قوڕگی دایە، بە هەر نەوعێک مالی (بلا حق)ی تصرف کردبێ ئەلێن خواردی. ﴿لَا يَقُومُونَ﴾ لە دنیاو قیامەت ﴿إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِي يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مِنَ ٱلۡمَسِّۚ﴾ الاّ وەکی ئەو کەسە، کە شیطان لێی دابێ لە هەموو لا لە شێتی، ئەوانی (مصروعن) گەلێکیان وا ئەبینن، کە یەکێ یا دوو لە اشباحی خبیثە بە سەریاندا دێ، هەلیان ئەگلۆفێ، دلیان ئەگوشێ، عەزابیان ئەدا.. کە لە کۆلیان بووەوە قسەیان نا منتظم.. متفرق ئەبێ، ئەڕۆن وەک حوشتری شەوکۆر، دەست و پا ئەهاوێن، بۆ کوێ ئەچن نازانن، ئەوانی ڕبا خۆریش ئەیان بینن، دائماً مشوەش ئەخولێتەوە بە دەست و سەر ئیشارە ئەکا، لەگەل خۆی ئەلێ، قسەی تفرقە و ناو دروا ئەکا و، ئەو حالەی دنیایەی، نموونەی حالی قیامەتیەتی. ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡبَيۡعُ مِثۡلُ ٱلرِّبَوٰاْۗ﴾ ئەو بێ مبالاتی لە خواردنی ڕبا لەبەر ئەوەیە، کە ئەوان ئەلێن: شت کڕین بەپارە وەک پارە بە پارەیە، وا ئەبێ مالێ قیمەتی قرانێکە، بە دە قرانانی ئەدەن، ئەگەر ضرری زیاتر نەبێ کەمتر نی‌یە لە ڕبا. گەلێ ڕبا خۆر هەن، گەلێ اهونترن لە معاملەچیان، خاصة ئەوانەی سەلەم ئەکەن.

﴿وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلۡبَيۡعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْۚ﴾ کوو (بیع و ڕبا) وەک یەک ئەبن؟ خوای تعالان بیعی حەلال کردیە و، ڕبای حەرام کردیە، ئەگەر وەکیەک بان حوکمیشیان وەک یەک ئەبوو. ئەساسی (بیع) لەضرورتی‌یان خمسە نی‌یە، ئەمما مکملە، بێ فرۆشتن و بازار قوامی عالەم مشکلە، اجارەش قبوول کرایە، ٠٠مووکەس بۆی نابێ، صاحب دوکانو خان و قەیسەری بێ، بۆ

تەواوی فائدەی گشتی، یەکێ صاحبی چەند دوکانە ئەیدا بە اجارە هەردوو لا استفادە ئەکەن.

ربا بۆ عالەمی اسلامیەت اصلاً توافق ناکا، ڕابطەی اخوەتی دینی، مەیلی اسلامی بۆ تعاون ایجاب ئەکا، صاحبی پارە بلا مقابلە دەستی محتاج بگرێ، ئەویش (عن طیب نفس) بۆ ئەدای شوکرانە، زیادەێیکی مناسب لەگەڵ ئەصڵی پارە لە موعدی خۆی تقدیمی صاحب پارە بکا. فرۆشتن و بازار ئەمرێکی لازمە بۆ بەشەر، حاجەت ناکا بە تشریعی ئیلاهی، بەس تعدیلات عائدی شەرعە، او بیعی عادلانەش لە تەرەف شرع واجب نەکراوە، بەڵکوو هەر ئەوەندەیە (احل الله البیع)، ذاتاً هەر وەکوو (ناهی طبیعی) مغنییە لە ناهی شرعی.. داعی طبیعیش، لە داعی شرعی مغنییە. ئەمما چونکی ڕبا فەسادەی عامی تیایە، خوا حەرامی کردووە، ئەگەرچی هەردوو مبادەلەن، ئەمما مەنشەئو غایەتیان فەرقی زۆرە ﴿فَمَن جَآءَهُۥ مَوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ﴾ هەرکەسێ پەندێکی پێگەیی لە تەرەف جەنابی خواوە ﴿فَٱنتَهَىٰ﴾ مەنعی خۆی کرد لەوەی حەرامی کرد ﴿فَلَهُۥ مَا سَلَفَ﴾ ئەوی پێش بلوغی موعظەت وەری گرتبوو بۆ ئەوە. ﴿وَأَمۡرُهُۥٓ﴾ شەئن و حاڵی وی بۆ قیامەت ﴿إِلَى ٱللَّهِۖ﴾ عەفووی ئەکا عذابی ئەو، ڕاجعی خودایە. ئەوە لە صدری اسلامە، کە ڕبا حەرام کرا، ﴿وَمَنۡ عَادَ﴾ بۆلای ڕبا پاش انتها﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٢٧٥﴾ ئەوی انتهای نەبێ بە ڕێگەی یەکەم، ئەوی عەودەت بکا بۆ ڕبا، دیارە وەعظی الهی تەئسیری لێ نەکردیە، مەیلی نفسانی مانعیەتی لە اطاعەی خوا. فکری فەسادی نظام لە دڵیدا ڕاسخە. بێشک ئەوانە ئەگەر بە زار بڵێن موسڵمانین، بە دڵیان نییە.

﴿يَمۡحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ﴾ خوای تعالان بەرەکەتی ڕبا ئەبا، ماڵی ڕبا بێفائدە ئەچێ، وەک مانگێ بکەوێتە محاق،_ ڕووی بێ نووری لە عالەمە_کەس

فائدەی لێنابینێ﴿وَيُرۡبِي ٱلصَّدَقَٰتِۗ﴾ بەرەکەتی صدقە و خێر و زەکات گەورە ئەکاو زیادی ئەکا ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ ٢٧٦﴾ خوای تعالان کەسێ لەوانەی ڕووچووبن لە کفرو گوناە، خۆش ناوێ.. ئەوی خوا خۆشی نەوێ، دیارە استعدادی خێری نەمایە.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەوانەی ئیمانیان هیناوە بە دڵ بێ وەهن ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ ئەوەی چاک بێ بۆ عبادی خودا ئەکەن ﴿وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ کە ڕابطەی اسلامیەتە ﴿وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ زەکات بەحەق بدرێتە ئەهلی استحقاق بە انتظام، (فقر) لەناو موسڵمانان نامێنێ.. دەرگەی ڕبا پێوە ئەدرێ.

﴿لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ٢٧٧﴾ لە دنیاو قیامەت ترس و خەمیان نییە، لای عالەم خۆشەویست، لای خودا ماجور.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بە ڕاستی، ظاهر و باطن، طیب وطاهر ﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ خۆبپارێزن لە عقابی خودا، ئیمان مەکەنە مبنای ئەمان، مقصد ثمرەیە، داری بێبەر بۆبرین چاکە﴿وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ﴾ لای خەڵکی ﴿إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ٢٧٨﴾ بە ئیمانی قوی، مثمر، بتوانێ بتانگێرریتەوە لەسەر مەیلی نەفس ﴿فَإِن لَّمۡ تَفۡعَلُواْ﴾ ئەگەر نەتان کرد پاش تحریم و اوامر ﴿فَأۡذَنُواْ﴾ یقینتان بێ ﴿بِحَرۡبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ﴾ خواو پێغەمبەری خوا شەڕتان لەگەڵ ئەکەن ﴿وَإِن تُبۡتُمۡ﴾ ئەگەر تۆبەتان کرد لە نەکردنی ئەوەی ئەمرتان پێکرا ﴿فَلَكُمۡ رُءُوسُ أَمۡوَٰلِكُمۡ﴾ مایەکەتان بۆ خۆتان قانزاج بڕروا ﴿لَا تَظۡلِمُونَ﴾ لە قەرداران ﴿وَلَا تُظۡلَمُونَ ٢٧٩﴾ لە تەرەف قەرداران، ئەوانیش ئەبێ بە خۆشی ﴿وَإِن كَانَ ذُو عُسۡرَةٍ﴾ بێ قیرەقیرو تاخیر، مایەکەتان بدەنەوە،

ئەگەر لە قەرداران کەسێ ناخۆش حاڵ بوو، یەعنی فەقیر بوو ﴿فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ﴾ مهلەتدانی لازمە، تاکو وەختی ئاسانی، یا تا ئاسانی، یەعنی ممکن ئەبێ بیدا ﴿وَأَن تَصَدَّقُوا﴾ ئەگەر احسانیان پێبکەن، لێیان خۆش ببن ﴿خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ چاترە بۆ ئێوە، دڵتان ڕاحەت ئەبێ، مەراقی تیا نامینێ... «کەی ئەیبێ و کەی نایبێ!! درۆ دەکا! شکاتی لێ ئەکەم!» لەو عەزابەش نەجاتتان ئەبێ ﴿إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٨٠﴾﴾ ئەگەر بە تەواوی بزانن، کە لێخۆشبوون لە وان خێرە بۆ ئێوە ئەیکەن. ﴿وَاتَّقُوا يَوْمًا﴾ کە ڕۆژی قیامەتە. ﴿تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللَّهِ﴾ کەسی تر نییە مرجع «لا تجزی نفس عن نفس شیئا» ﴿ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ﴾ هەر کەسێ بە تەواوی جزای کردەوی خۆی ئەدرێتێ.

﴿وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٨١﴾﴾ کەس ظولمی لێ ناکرێ، ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی موسڵمانینە! ئێوە قطعاً ڕوو لە (ربا) مەکەن، جەزای زۆر شدیدە، هەتا فرقەیێ عظیم لە ئەهلی عیلم و تەقوا ئەڵێن: ڕیباخۆر ئەگەر تۆبە نەکا، وەک کافر لە عەزابی جهنم ئەبەدییە، بەهەشت بۆ نان نییە، خوای تعالی معاملەی عادلانەی بۆ حلاڵ کردن، ئێوە بە مجاملە معاملە بکەن، ئەمما دائرەی تجارەت تەنگ مەکەن، هەر بە حاضری بدەن، بە حاضر و قەرد چۆنی ڕێککەوت، بێع و بازاربکەن.. لە قاموس (دَیْن) ئەوەیە بە (اجل)، وە (قرض) ئەوەیە بەبێ اجل. ﴿إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ﴾ کە معاملەتان کرد بە قەرد (سواءً)ماڵی حاضر و پارە قەرد، یا بە عەکسەوە وەک سەلەم. سەلەم ئەگەر منصفانە بێ، قانزاجیشی ئەبێ، فەقیریش حاجەتی پێک دێ، ئەبێتە نعم البدلي (ربا) ﴿إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ سەلەم بێ ئەجەل نابێ، قەردی تریش

کە مؤجل بێ، بە ئەجەلى معلوم وەک سێمانگ، چوار مانگ. ﴿فَٱكۡتُبُوهُۚ﴾ بینووسن، وا دەرئەکەوێ، کە معاملەکە بە وقع بێ، قەردى کەم ظاهرا ئەو چەندو چوونەى پێ ناوێ، بەڵام حاڵى موسڵمانان زۆر تێک چووە، بە حەق لە خواردنى یەک قصور ناکەن، ئەگەر نەنووسرێ و شاهیدى لێ نەگیرێ، بە سۆێندێ ئەیخوا و ئەرروا، هەزار سوێند بە پوولێ!! ئەى هاوار بۆ حاڵى موسڵمانان!.

﴿وَلۡيَكۡتُب بَّيۡنَكُمۡ كَاتِبُۢ بِٱلۡعَدۡلِۚ﴾ کاتبى عدل بۆتان بنووسێ، کاتبى چاک لە دیانەت، لە کتابەت هۆشى حسابى هەبێ، سەهوو نەکا، ئاگادارى شەرع بێ، فەرقى شرائطى صحیح و فاسد بکا، خاصة لەسەلەم و بە ئاگادارى طرفین.

﴿وَلَا يَأۡبَ كَاتِبٌ﴾ طبیعى ئەو بەو جۆرە کاتب بێ، خراپ وەیە تنزل بکا، هەتا بە اجرەتیش بنووسێ، مەگەر برسى بێ، بۆ ئەفەرموێ (افندى) ابا و امتناع نەکا ﴿أَن يَكۡتُبَ﴾ لە نووسین و دەفتەر تنظیم کردن بۆیان. با احسان بکا لەگەڵ موسڵمانان ﴿كَمَا عَلَّمَهُ ٱللَّهُۚ﴾ کوو خوا چاکەى لەگەڵ کردیە، مەیلێکى شدیدى داوەتێ بۆ تعلیمى کتابەت توفیقى داوە، پێگەیشتووە، (خاصة) لە صدرى ئیسلام ڕەغبەتى کتابەت کەم بوو. با کاتبى محترم پێ لە نەفسى خۆى بنێ ﴿فَلۡيَكۡتُبۡ﴾ بنووسێ، امتثالاً لامر الله ﴿وَلۡيُمۡلِلِ ٱلَّذِي عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ﴾ ئەوى حەقى لە سەرە بڵێ و کاتب بنووسێ ﴿وَلۡيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ﴾ ئەوى مدیونە لەخوا بترسێ ﴿وَلَا يَبۡخَسۡ مِنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ﴾ ادنى شتەکى لە حەقەکە کەم نەکاتەوە، کەتمى نەکا، تا بتوانێ ئەوى لەسەریەتى بیڵێ بە اعتراف، سبەینێ ڕێى انکارى نامینێ.

﴿فَإِن كَانَ ٱلَّذِي عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ سَفِيهًا أَوۡ ضَعِيفًا﴾ ئەگەر ئەوەى حەقى لەسەرە،

بێ عەقڵو شعور بوو، منداڵ بوو، یا پیری خەرفاو بوو، نەساغ بوو ﴿أَوْ لَا يَسْتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ﴾ خۆی لە توانایدا نەبوو، لاڵ بوو، یا زوبانی نەدەزانی ﴿فَلْيُمْلِلْ وَلِيُّهُۥ بِٱلْعَدْلِ﴾ بە ولایەتی ئەصلی، یا بە تولیە ئەوی لەسەر(من علیه الحق)ە بێڵێ بو کاتب بێ غەدر، نە لێ (ئەوە سەفیهە)بێ هێزو تاقەتە. ئەگەر شتێ گوم کەم قەی ناکا، (یحتمل) بعضێک ئەوە بە خێر بزانن. ﴿وَٱسْتَشْهِدُوا۟ شَهِيدَيْنِ﴾، بە تاسوخی طلبی دوو کەس‌بکەن، ئاگا لەخۆ، بە هۆش و حافظە و ئەمین. ئاگایان لەو ماجەرایە بێ، تحملی شهادەت بکەن، تا (لدی الانکار) بەکار بێن﴿مِن رِّجَالِكُمْ﴾ لە پیاوانی خۆتان. ﴿فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ﴾ ئەگەر دوو مێرد نەبێ ﴿فَرَجُلٌ وَٱمْرَأَتَانِ﴾ احضاری پیاوێک و دوو ژنان بکەن ﴿مِمَّن﴾ ئەو پیاو و دوو ژنە لەوانە بن کە ﴿تَرْضَوْنَ﴾خۆتان پێیان ڕاضی بن ﴿مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ﴾ جەمعی شهیدە، مەتەڵی کوردییە «دوو کداح بە چەرمێ حسابە» دوو ژنان احضار بکەن کە ڕازی بن..

﴿أَن تَضِلَّ إِحْدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَىٰهُمَا ٱلْأُخْرَىٰ﴾ هەر کامیان بێ و شەهادە نەوایا شتێکیان لەبیر چوو ئەوی دی هەر کامیان بێ، کە لە یادی مابێ بە یادی بینیتەوە. یاخود دوو ژن‌بن حریەت و استقلال لەیەک بە دەرەجەیەک بێ، کە هەر کامیان لە فکری چوو، یا شاهدی گۆرری بتوانێ ئەوی دی بەیادی بهێنیتەوە، یا ئیرشادی بکا، بیترسێنی بە عەزابو عقابی خودا، اعتراض نەکەن، وە الاّ احضاری دوو ژن کەڵک ناگرێ. ڕەحمت وایە ژن لەو نەوعە حسابە، کە لە وظائفی معتادی وی نییە بە تەواوەتی‌لە خاطری بمینێ.. لە جێیەک دوو پیاوی قەوی حافظەتان چەنگ نەکەوێ، دوو ژنی بەوحاڵە چۆن چەنگ ئەکەوێ؟.

﴿وَلَا يَأْبَ ٱلشُّهَدَآءُ إِذَا مَا دُعُوا۟ ﴾ ئەوانی قابل و تێگەیشتوون و ئەمینن ابانەکەن، کە بانگیان کردن بۆ حضوری مجلسی املالو املا، ﴿وَلَا تَسْـَٔمُوٓا۟ ﴾ ماندی مەبن، یا پێتان ناخوش نەبێ﴿أَن تَكْتُبُوهُ ﴾ حەقە بنووسێ ﴿صَغِيرًا أَوْ كَبِيرًا ﴾ کەم یازۆر، ئێستا ئەگەر بلێی بەقەردار «بینووسین» تووڕە ئەبن.

- ئایا بڕواییت بەمن نیە؟!

گەلێ کەس شەرم ئەکا طلبی نووسین بکا، لەبەر ئەوە گەلێ حەق بە خۆڕایی ئەڕوا، هەرچۆنی بووە بە تفصیل بینووسن، مفردات بە مفردات، ﴿إِلَىٰٓ أَجَلِهِۦ ﴾ هەتا مدەی قەردەکە بنووسن، تاریخ لازمە بۆ زەمانی دەعوا، یا زەمانی معینی نووسینی کتابەکە، تاریخی سندیش زۆر لازمە، دوور ئەبێ لەتزویر.

﴿ذَٰلِكُمْ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ﴾ ئەوی ذکر کرا اعدلە، دوورترە لە تەشقەڵە ﴿وَأَقْوَمُ لِلشَّهَٰدَةِ ﴾ ڕاستتر، مەحکەمترە بۆ ئەدای شاهدی ﴿وَأَدْنَىٰٓ أَلَّا تَرْتَابُوٓا۟ ﴾ نزیکترە لە نەبوونی (ریب) نابڕوایی بە یەک‌مە لێن ئەوان بڕوایان بەیەک نیە، بۆیە ئەو حەقو حسابە ئەکەن، بەڵکوو ئەمە بۆ دەفعی ڕیبەو تۆمەتە، وەک کوردی ئەڵێ: «شەڕر لەشۆو، نەک لەتوو».

سابقاً عەرض کرا ئەو اهتمامە بەمعاملەیێ ئەکرێ، کە زۆر بێ وەک معاملەی تجاران لەگەڵ چەرچیان، ئەو وەقتی ئەو نووسینو شایەد گرتنەی پێ ئەوێ، ﴿إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً حَاضِرَةً تُدِيرُونَهَا بَيْنَكُمْ ﴾ وەک معاملەی تجاران یەک لەگەڵ یەک، بۆ هە ڵسوڕاندنی تجارەت بە معاملە لەبەینی خۆیان، کەبە جومعانە بزاز لە تجاری وەرئەگری، یا الآن بعضێ پارەی پێ ئەوێ، یا دووسێ تۆپ (لانکە) یا (بللوری) لازمە بیدەن بەیەک دەستی یەک

ئەگرن. ﴿فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَلَّا تَكْتُبُوهَا﴾ چ وەباڵ نی‌یە لەسەر ئێوە، کە ئەو معاملەیە و تجارەتە نەنووسن، فەصڵ لە شاهدگرتن، زێرا، ئەوە بە (دین)و قەرد حساب نی‌یەو، لەو جزئیاتە اشهاد و کتابەت زەحمەتە و، ترسی نزاع و زیان نی‌یە، زێرا ئەوەی بەو جۆرە معاملە ئەکا، اعتباری خۆی نابا، بەمنتظمی حەق ئەدا. وە هەم ئەمڕۆ ئەو حاجەتی بەتۆیە، سبەی تۆیش حاجەتت بەو ئەکەوێ، ئەگەر وانەبێ تجارەتەکە هەڵنا‌سووڕێ، بەڵام بۆ احتیاط بینووسی باشە. ئەمما ﴿وَأَشْهِدُوٓاْ إِذَا تَبَايَعْتُمْ﴾ شاهد بگرن، کە شتومەکتان بەیەکدی فرۆشت، ئەوە کە اموری جزئیشە، ئاسانە ﴿وَلَا يُضَآرَّ كَاتِبٌ وَلَا شَهِيدٌ﴾ ئەگەر نووسیتان بە کاتبی عدل، شاهدتان گرت لەسەر ئەو معاملاتی هامە، یاغیری عامە ضەرەر نەگاتە کاتب و شاهد. لە کارو کاسبیان مەکەن مقابلەی ئەو خزمەتە ﴿وَإِن تَفْعَلُواْ﴾ ئەگەر خلافی ئەوی بۆتان داندرا بکەن ﴿فَإِنَّهُۥ﴾ ئەو فعلە مخالفە ﴿فُسُوقٌۢ بِكُمْ﴾ خروجە لە ڕێی ڕاستو باشو بێ نزاعو تەشقەلە بەسەبەبی خۆتان ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ خۆ لەخوا بپارێزن، مخالفەی مەکەن ﴿وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُ﴾ خوا تعلیمتان ئەدا ئەوەی چاکەی تێدایە، بەئێوەی نیشان ئەدا ﴿وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٨٢﴾﴾ عاقبەتی کار لای ئەو معلومە، ئەمڕۆ هەڵدەستن، اعتبار بە یەک ئەکەن، سبەی ئەگۆڕێن، ئەبن بە منازع لەگەڵ یەک، هەقی‌یەک انکار ئەکەن. شاهد نەبێ، نەنوسرابێ چەدەکەن؟.

ئەو اوامری ئیلاهی‌یە، ئەگەرچی بۆ ئیرشادە، ئەو نەوعە شتەئینسان خۆی ڕێی پێ‌ئەبا، بەڵام بۆ ئوممەتی امی، وەک عەرەب و کورد، واجبە بەجێی بێنن، عادتاً اشهاد بەعار ئەزانن، کتابەت بە لایەوە ناچن، الآن لە کورد و عەرەب بە اعتباری نفوس باورر مەکە، لە هەزار یەک کاتب بێ،

هەتا لە مکاتبی ڕەسمیەش اعتنا بە کتابەت ناکەن، منداڵ خۆی شکل نووسە، بێ (مربی) شتێک ئەنووسێ، ئە لێی بە جنجڕۆکی پشیلە کێشراوە.

لە ئەوە، مجددی عصری اختیاری ئەوەیە،کە بۆ وجوبە ﴿وَإِن كُنتُمْ عَلَىٰ سَفَرٍ﴾ لە سەفەربوون، یا لەسەر سەفەربوون ﴿وَلَمْ تَجِدُوا كَاتِبًا﴾ خاصة لە دەرەوە، لەو زەمانی کاتب چەنگ نەدەکەوت ﴿فَرِهَٰنٌ مَّقْبُوضَةٌ﴾ رەهنی قبض کراو، ئەگەر قبض نەکرێ، ئەویش وەک قەردەکەی لێ دێ، لەبەر مفهومی شرط«مجاهد» ئەفەرموێ: ڕەهن لە سەفەردا نەبێ نابێ، نظر بە شرط و قید«ضحاك» ئەفەرموێ: لەسەفەردا بیو کاتب چەنگ نەکەوت، ئەوجا ڕەهن ئەبێ، وە الاّ نا. ئەبێ ئاگایان لەفعلی (رسالەت پەناه) نەبووبێ، کە لە حضر (مع وجدان الكاتب) زرێی خۆی کردە ڕەهنی جووێ، مقابل سێ صاع لە جۆ. تەماشای هیمەتی ڕەسول وصولەتی فقر و ضەرورەتکەن، زرێ بە پێغەمبەر ئەکاتە ڕەهنی (جوو)ێ مقابل بە جۆ، ئەوجا بزانن ماڵی دنیا چەند بەقیمەتە، خودا چەند اهتمام ئەدا بە حفظی.

﴿فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا﴾ ئەگەر بڕواییتان پێککرد، نە ڕەهن و نە شاهد و نەسەنەد نە ثبت. ئەوی امنیتی پێئەکرێ، ئەبێ موسڵمان بێ، پیاو بێ، خیانەت لەگەڵ ئەو نەوعە کەسە نەکا.

﴿فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ﴾ (کانە) ئەو قەردە ئەمانەتە کەلای ﴿وَلْيَتَّقِ اللَّهَ رَبَّهُ﴾ چیتر نییە، الاّ وەعظو نصیحەت ﴿وَلَا تَكْتُمُوا الشَّهَادَةَ﴾ شاهدی بزرمەکەن..

﴿وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ﴾ هەر کەسێ شاهیدی بزربکا، ئەدای نەکا، بەڕاستی ئەو کەسە، دڵی خۆی گوناهبار ئەکا.

کەتمی شەهادەت لە اعمالی نەفسە، نەفس ئەگەر مدنس نەبێ بە خولقی پیس وەک نفاق، ڕیا، حبی زەرەری موسڵمانان، خیانەت... اصلا کەتمی

حەق ناکا و دڵ کە آثم بوو، دەردەدار بوو، بە فەسادچوو، سائری بەدەن بە فەساد ئەچێ، ئەگەر دڵچاکبوو، بێ غلّ و غەش بوو، هەموو بەدەن چاک ئەبێ، وەک لە حدیثی شریف ئەفەرموێ.

﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ ٢٨٣﴾ لە سرر و علن، قلبیو قالبی ﴿لِّلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ﴾ چۆن شتی لێ بزرئەبێ؟ کێ کێ نەجات ئەدا. کێ کێ اثابە نەکا؟ ﴿وَإِن تُبۡدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ﴾ ئەگەر ئاشکرا بکەن کیفیاتی نفسیەّی، کە قەراری گرتووە بە اظهاری ئاثاری وەک کفر، حەسەد، نفاق، حبو مەیلی فەساد ﴿أَوۡ تُخۡفُوهُ﴾ نەیێڵن اثری دەرکەوێ، ظاهر خۆ بە چاک بنوێنن، وەک گورگ بچنە پیستی مەرر ﴿يُحَاسِبۡكُم بِهِ ٱللَّهُۖ﴾ خودا بە«ما فی الضمیر»تان مجازاتان ئەدا، ذاتا مداری ثوابو عقاب لەسەر «ما فی القلب»ە، هەتا کەسێ جەزم بکا بە گوناهی لەسەر جەزمەکە مؤاخذە ئەکرێ، با گوناهەکە نەکا. حاصلی، وەک علمای کلام ئەفەرموون: صفاتی نفسیە موجود خارجین اصلین، شجاعەت، سخا، خیانەت، بخل هەموو نفسی پێ متصفە، با قەت تصوّری نەکا، لە قبیلی تصورات نین.

موسڵمانێ تصورّی کفر بکا، کافر نابێ، کافر تصوری ئیمان بکا نابێتە مؤمن، موجوداتی ذهنیە حوکمی محققاتی خارجیەی نییە، خەیاڵات و (خرتو پرتی) نەفس هیچ نییە، کە ئینسانی پێ مؤاخذە بکرێ، (معانی) تا نەفس پێی متصف نەبێ، حوکم تا عەزم و جەزم نەبێ، بێ ئەثەرە.

لە دڵ، لە خارجی دڵ، نوێژ، ڕۆژی، زەکات، حەج، جهاد، ئەگەر اخلاصی تیا نەبێ، قالبی بەتاڵە، ڕیا، سمعە، حبی فخار، چۆن صدقات بەبائەدا!؟ بناء علیە مجازات لە اعمالو اوصافی قلبی، ئەمرێکە ثابتو مقرّر، نە طبیعەت، نە شریعەت ئەوی نەسخ ناکا.. ئەوی ادعای نەسخ بکا هەر کەسێک بێ، ئاگای لە نەفسی خۆی، لە ئەساسی شرعی نییە، خطرات و

وساوس و خەیاڵات و خرت و پرتی بێ ئەصل و، فعلی بە اموری محققەی مقررەی ثابتە لێ پەشوکاوە ﴿فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ﴾ خودا لەوانەی ئەڵێن ئەو ئایەتە بە ئایەتی «لا یکلف الله نفساً الا وسعها» نەسخ بووە عەفویان ئەکا، چونکی لە فکری خراپو کیفیاتی خراپی (ردیء) نفسیە نەبووە. ﴿وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ﴾ فەرقی تمییزی ما فی النفوس، درجاتی ڕسوخی منویاتی چاک وبەد خویی ئەزانێ، کرامالکاتبیش ئاگادار نین لە احواڵاتی نفسیە. ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٨٤﴾﴾ زیادەیی قودرەت، دەلیلە لەسەر زیادی عیلم، چونکە قودرەت لە ژێر ادارەی عیلمە، کەسێ عیلم محیطی نەبێ، مقداری کیفیاتی نفسیە، لە شددەت و ضعف و اشدّیت نازانێ و، تقدیری جەزای بە نیسبەت ئەو دەرەجاتە پێ نادرێ ئەو عیلمە شاملە، ئەو قودرەتە کاملە بۆ خودایە و بەس.

ئەگەر بە سەبەبی نزول توهمی نەسخ ببردرێ، نظر بە نظمی قورئانی حکیم، اصلا ڕێی ئەو توهمەی نییە، مقصدی عظمی لەو سورەتە، خۆپاراستنە لە نیفاق، لە قساوەتی قلب، کەتمی حەق؛ تزکیەی دڵ لە حسد، لە بغض. بناء علیە نەسخی ئەو ئایەتە، نەسخە بۆ ئەو هەموو سورەتە،ڕەفعی ئەو هەموو حوکمو حکمەتەیە، (معانە) ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ حەضرەتی ڕەسول ئیمانێکی هەیە بە (ما انزل علیە لا یفتر)، قووەت و متانەتێکی هەیە، هەر خوا خۆی بیزانێ، ئەو هەموو شددەتو باسو خراپەی بە سەرداهات، ابدا ذەررەیێ (وەهن) و فتور بەئیمانی نەگەیی، حوکمی ئیلاهی بە حەق هێنا جێ، طلبی لەخودا نەکرد، بە خوارق ئیشی بۆ بکا، کەمێ معاونەی بکا بۆ تخفیفی ئەو مشقتە عظیمەی، کە تێدابوو، کەتمی ئایەتێ لە ئایاتی نەکرد، لە اوەلی ڕسالەتی، تا ئاخر نەفەسی لە جدّ و جەهد و سەعیو نشاط و تێکوشین و غیرەت و

تحمل، کەمی‌ی نەهێنا. ئەو ڕۆژە وە، کە لە غاری (ثور) خۆی پەنهان کردبوو لەگەڵ ئەو ڕۆژە، کە بە عەسکەری جرّار چووە سەر (مکه)، جەنابی ڕەسول طبعاً میلا نەگۆررا، هەر (داعی الی الحق) امتیازو خصوصیەتێکی بۆ خۆی دانەنا. ئەوانەی کە متجاوز لە بیست تعویقی دەعوەتی محمدیان ئەکرد، خەریکی امحای خۆی و دینی بوون، چ معاملەیەکی لەگەڵ کردن؟ «اذهبوا فانتم الطلقاء» ئێمە، کە لە ئاثاری ئەو ئیمانەمان بە ڕسالەتی ئەو هەبێ، ئەو دەبێ چۆن بێ؟! نایێتە تحریر، اول و آخر(بین یدی مرسل الرسل) ئەڵێم: حقاً، شایانە، کە ڕسالەت فخر بە حەضرەتی ڕسولی اکرم بکا، ئەوانی ئەهلی ئیمانن، ئەوانیش ئیمانیان هەیە بەڕاستی و دروستی، بەو کتێبەی، کە نزولی کردیە بۆ خاتم الرسل.

﴿كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ﴾ کلی فرد لە ئەفرادی وان، ئەڵێن ئێمە ئیمانمان هەیە، بەڵام نافەرموێ«ئەڵێن»، بەڵکوو خۆی علام الغیوبە، مطلعی علی ما فی القلوبە، خەبەریان لێئەدا، کە کلەکیان ئیمانیان هەیە بە خودا، کە ربّ العالمینە، ڕەحمان و ڕەحیمە، مالکی ڕۆژی دینە، هەر ئەو معبودی بە هەقە،هادی‌یە، بێ شەریک و ضدّ و (ندّ)ە، حی و قیّومە، ادنی غفلەتێکی بەسەردا نایێ، بەو نەوعە کە لەودوو سورەتەی ڕابوورد. ﴿وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ﴾ ئیمانیان هەیە بەملائکەت هەن، خوا خەبەری داوە لە بوونیان عبادن، مطیعن، فەرمان بەردارن، زیندوون، بەڵام نەوەکو حی القیوم احتیاجیان بە امداد نەبێ بۆ ادامەی حەیات. اجسامن وەک (باری) (مجرّد)نین، منتظریان هەیە، علمیان بە تعلیمی ئیلاهی‌یە، بالذات عالم نین. حاصلی بەو نەوعە قورئان باسیان لێ ئەکا، ئیمانیان پێهەن. ﴿وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ﴾ بڕواییان هەیە بەو کتێبانەی خوا، کە بۆ پێغەمبەرانی ناردووە و، بڕواییان هەیە بە پێغەمبەرانی کرام، کە بەندەی خوان، ئەمینی وەحین، لەگەڵ خوا و خەلقی خوا خیانەتیان نی‌یە، مصلّحی خێر خواهی بەشەرن، صەرفی مقدرەتیان

کردووه بۆ هیدایەتی بەشەر، تعلیم و تفهیمی عباد، لە ظلماتی کفرو ضـلال، بیانخەنە دەر بۆ نووری ئیمان و ڕشد، ترسیان لە خوا زۆرە، مەیلی ڕاستیان هەیە، لە خـەیـاڵ و خولیـای ڕسالەت نـەبـووین، امتیـازی فیطـریـان هـەیـە، جەنابی حەق کتێبی بۆ هەناردوون، بۆ (مەسقەلی) دڵیـان، ئایـاتی بیینـاتی تیا ذکر فەرمووە، هەر قەومە، هەر میللـەتـە بـە گـوێرەی لیاقـەت، حـوکم و حیکمەتیان بۆ بەیانکراوە، وە ئەو مؤمنانە ئەفـەرمـوون: ﴿لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ﴾ وەک ئەمریان پـێکرایـە فـەرقیـان ناکـەن، لـە هـەر شـعبێ بـن، تصدیق ئەکەن. ( ابراهیم و اسماعیل و اسحاق و یعقوب و اسباط و موسیو عیسی)، لامان لە ئەصڵی ڕسالەت یەکن، بەیەک زوبان دەعوەتیان کردیە بۆ ئیلاهی، نبووەت ناکەنە قومیـەت. (اسـماعیلی)یـش بـن، فـەرقـی اسـماعیل و اسحاق بە دڵیاندا نـایێ و، پێغـەمبـەری تـورک و کـورد و فـارس و سـائری (اممی) دی فەرق ناکەین، لەگەڵ محمدی عەرەبی (ﷺ)، ئـەوەیـش هـەمـوو ثمرەی دەعوەتی احمدییە﴿وَقَالُوا۟﴾ هەموویان لـە صـغار و کبـار، مهـاجر و أنصار﴿سَمِعْنَا﴾ بیستمان بە سمعی قبووڵ، بە خواهشی خۆمان، بێ جبر و اکراه، بێ ڕەفعی (جبل)، چووب و فەلاقە وەرمان گرت.

﴿وَأَطَعْنَا﴾ سەروماڵ لە ئۆغرە، نەک بە قەرز، نەک بـە بـەهـا، محـضا بـۆ ڕضای خوا، ڕوح و اموال و اولاد فیدا ئەکەین. ﴿غُفْرَانَكَ رَبَّنَا﴾ بەس طلبـی غفران و سەتری عـەیـب ئـەکـەین، حـەیـات و جگـەر گۆشـەو مـاڵ، ئـەونـدە قیمەتەی نییە، پاداشی لە تۆ بخوازین..

﴿وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾﴾ گەڕانەوەمان بۆ تەرەفی تۆیە، ئەمـڕۆش هـەر ڕوو لە تۆ ئەکەین، هەزار بار ابتلامان بکەی بە ترس و بە برسیایەتی، بە نقصی اموال و نفوسو ثمرات، صبر ئەکەین، جزع و فزع بە دڵـی ئێمـەدا نایـە، بـە حرصی دنیا خۆمان لەلقای تۆ محروم ناکـەیـن، بـە دڵ و زوبـان، ئـەڵـێین:

«انا لله وانا اليه راجعون» بالمقابله حەضرەتی کبریائی، قوببەی تعظیم و احترام لەسەر وان هەڵ ئەدا، نە لە دونیا، نە لە (عقبی)، تووشی ڕەزالەت و خەزی نابن، بە عیززەت ئەژین، بە عیززەت ئەمرن، بە عیززەت حەشرئەکرێن.

﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴾ کێ ئەوە ئەفەرموێ؟ خوایا! ئەهلی ئیمان هەردووکی قابلە، بەڵام نظر بە ئایاتی سابقە لەو سورەتە، اعتراف بێ لە تەرەف ئەهلی ئیمان جوانترە، ئەوان اخبار بدەن لە حەق، کە جەنابی حەق تکلیف لە هیچ کەس ناکا، الاّ بە گوێرەی وسعو تاقەتو تحملی خۆی. ذاتاً تکلیف لە دائرەی امکانی استعدادی‌یە، تەماشای مجردی امکانی ذاتی ناکا، ئەم بۆ خەلقو ئیجادە، خوا لەجهەت شارعی هەرکەس، بە نیسبەت لیاقەت تکلیف ئەکا، پیر وەک جوان، ناساغ، وەک ساغ، ضەرورەت وەک وسعەت، بێ هێز وەک پاڵەوان، کوێر وەک چاو ساغ، کوێستان وەک گەرمیان نابێ. خودایێ، کە خالقی کائناتە، چۆن بە فیطرەت فەرقی کردووە، بە شرعەتیش ئەبێ فەرقیان بکا، کە لە هەموو شت گرانتر، بذلی ماڵە، بذلی ڕوحە، بۆ ئینسانی مەرد ئاسانە، بۆ کەسێ گران بێ، جەنابی حەق، حەقو حەقیقەت وا بەدەرئەخا، کە بۆی سە هل بێ.

سابقاً فەرمووی: قتالم لەسەر نووسین، ئەگەرچی بۆ ئێوە ناخۆشە، دوایی دیقەت، کە چۆنی خۆش کرد، چ لذەتێکی دا بە مردن، لە ئۆغری خوا، لە ئۆغری وەتەن، لە ئۆغری اولاد.. خاصە بۆ کەسێ دنیا پەرست نەبێ، حەزی لە عیززەتی نەفس بێ، ئیمانی بەلیقای خوا هەبێ.مردنی چەند لا شیرین کردن، کە وەقتە ڕوح خۆی لە خۆشیان بچێتە دەر لە قالبی بەدەن. قەومی نجیبی عەرەب، ترسی مردنیان نەبوو، دائماً خۆ بە خۆیی شەرریان ئەکرد، لە ڕێی سفاهەتی (لات و عزّی) نەفسو نەفیسیان خەرج ئەکرد، لەڕێی اتحادی میللی، لە ڕێی استقلالیەت، لەڕێی خوا ئەبێ چ بکەن؟.

ئەبێ خۆ مقصرّ بزانن، طلبی مغفرەت کەن لە خودا.

﴿لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ﴾ جێی شک و شوبهە نی‌یە، محسوسە، وجدانی‌یە، نەدەبا علماً نزاعیان ببێ لە عیلمی ئینسان، لە قودرەتی ئینسان، لە اختیارو ئیرادەی ئینسان، خلیفەی خوا لە صنعو اختراع، چۆن بێ عیلم، بێ قودرەت، بێ ئیرادە ئەبێ؟ معاذالله، ثم معاذالله، کەسێ خوا ئەمری پێ بکا بەقتال و جدال و حفظی دین، حفظی میللەت، حفظی وەتەن، ئەبێ چۆن بێ؟ بە کورتی سەلبی قودرەت و ئیرادە و تاثیری بۆ دینی ئیسلام، زۆر ضرەر بوو لە ذروەی مجدو شەرەف، خستیە چالّی ذلّ و حقارەت، بووە تۆقی ئەسارەت لە ملیان. بناء علیە ئەوی مکلف بیکا لە چاکە، لە خراپە عائدی خۆیەتی، خۆی مسؤولە لە کیفیاتی نەفس، لە اعمال بدەنی.

ئیمانی کامل، خاصة مقرون بە محبەت، لە قضا ئەخوازێ مؤمن دائما لە حضوربێ، شەهیدبێ، نسیان و خطأی بەسەردانەیێ، بۆئەهلی حضور لە فکر چوون، غلط کردنە ئەبێ نەبێ، بەلاّم ئینسان مشاغلی زۆرە هەم لە تەرەف طبیعەت مکلفە، هەم لەجهەت شەریعەت، بۆیێ ئەو مؤمنانە لە خوا ئەخوازن.

﴿رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا﴾ لەسەر نەفس، نسیانو خطأو عدمی اصابە، معاتبەمان مەکە، (حقیقةً) حەق وایە لە هیچ آن غفلّەتمان بەسەردا نەیێ، خوای ئێمە نابۆرژێ، لەسەر معاملە ئەمر ئەکا بە احضاری شاهدی بە حافظە، بێ نسیان؛ ئێمە کە شاهدین لەسەر وحدانیەت وعیلم و قودرەتی خوا، لەسەر حەقیەتی کتب و رسل، ئەبێ چۆن بین؟ ئەمما جەنابی حەق خۆی حالّمان ئەزانێ، لە نسیان و غەفلّەتمان ئەبوورێ، ئەوە مقتضای بشریتە، خاصة کە ئیش و کاری هەبێ و، مکلف بی ئیدارەی دنیا و دین. هەتا پێغەمبەرانی عظام لە سەهو و نسیان (مبرا) نەبووین. ئەمان! سەدئەمان بە لافو گەزافی ئەم و ئەو، هە لّمەخەلّەتێن:

«ولو خطرت لی فی سواک ارادة
علی خاطری سهوا حکمت بردتي»

ئەوە ممکن نی‌یە، دائماً لە خوا بخوازن، کە زێدە حضورتان پێ کەرەم بکا، تا نسیان و خطا، کەمتربێ، ئەمما ئەوانی بە (لا ابالی) ئیش ئەکەن، نسیان غلبەیان لێ‌ئەکا، کەم اصابەی حەق ئەکەن. بەڵکو وایان لێ‌دێ، کە اصابە ناکەن، بە نسیان و خطا مؤاخذن. ﴿رَبَّنَا وَلَا تَحۡمِلۡ عَلَيۡنَآ إِصۡرٗا﴾ خودای ئێمە، باری گران مەهاوێ سەرئێمە...

﴿كَمَا حَمَلۡتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِنَاۚ﴾ وەک باری‌گرانی، کە هاویشتتە سەر ئەوانی پێش ئێمە. گرانی تکلیف بە نظر شخص.. بە نظر قوم ئەگۆڕرێ، قەومێک، کە لە ڕووی ئیمان و اخلاص، ڕوح دانان و ماڵ صرف کردنی لا سە ل بێ، ئەبێ چی لەلا گران‌بێ؟ معلومە بارسوکی لە هەموو وەقت چاک نی‌یە! پاپۆڕ لە بحرباری سووک بێ، بە سووکی ئەخنکێ، بالنسبة تا گران بێ باشە. قەومێ مەیلی ذیللەت و ئەسارەتیان هەبێ، عیززەت و استقلالیتیان غایەت لەلا گرانە، خادمی‌ی نادەن بە مخدومی، ماموری ناگۆڕرنەوە بە آمری، گزیریان لە امیری پێ خۆشترە، قەومێ اجانب پەرست بێ، اطاعەی (خۆیی)یانی لا لە کێو هەڵگرتن گرانترە، کەوابێ دیارە موسڵمان لە سووکی ئەترسن، لە استیلای اجانب خۆفیان هەیە، لە تشریعی ئەترسن، کە بە ناوی تزکیە، سخریە و استعبادی تیابێ، وەک شرعی (عیسی): «کەسێ زللەکت لە ڕووبدا، ڕووەکەی تری بۆ ڕاگرە، زللەکیش لەوبدا! کەسێ فرسەخێ بە سفر بیت، دوو فرسەنگ لەگەڵی هەڕوو!»

ذاتەن من لە مێژە عەرضی موسڵمانان ئەکەم، هەرعقیدەیێ، هەر ئەمرێ سەوقی کردن بۆ حەیات، بۆ عمل، خفتی ڕوحی و بدنی دا، بزانن ئەوە لە احکامی اسلامیەیە، وە الاّ غشە، اساسا لە دینی اسلام نی‌یە، بۆ کوشتن

ئوممەت هاویشترابی، حاصڵی، طلب ئەکەن جەنابی حەق بارێکیان باوێتە سەر، خفەتێکی ڕوحی و نشاطی عملی بدا، نەک گرانیان‌کا بە کسالەت و عطالەت، ڕوحیان غلیظ بێ، ئەوی لەگەڵ فطرەتی خۆمان موافق بێ، نهایەت جرفمان کا لە خراپە بۆ چاکە. ﴿رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ﴾ وەک (جوو) بوونە ژێر دەست، خادمی هەیکەلی (ثوری اخرس)، محبەتی عمل چی بەسەرهێنان؟ وەهەم تەماشای مەیلی (مفرط)مان مەفەرموو، تۆ عاقبەت چاتر ئەزانی. بەینی سە هل و گران، دینی حنیف.. ئەمڕۆ ئەتوانین ئەو صدماتی باری زۆر گران هەڵگرین، سبەی نا.

گەلێ هەیە مەیلی طاعەت، ئەیخاتە ژێر باری زۆر قورس، ئاخری ئەوەستێ، وەک ڕهبانیەتی دیانان و زهدی ئێمە.

حاصڵی نەبە تکلیف، نەبە تکوین مەمان خەنەژێر بارێ، کە تحملی نەکەین، تاقەتمان پێی نەشکێ، سووک بێ، یا گران ﴿وَٱعْفُ عَنَّا﴾ لێمان خۆشبە بەسهولەت ﴿وَٱغْفِرْ لَنَا﴾ سترمان بکە، عەیبمان بە دەرمەخە ﴿وَٱرْحَمْنَآ﴾ لە دنیا و قیامەت ﴿أَنتَ مَوْلَىٰنَا﴾ مالکی ئێمە، سیدی ئێمە، متصرف لە ڕوح ومالی ئێمە تۆی... مالکی کەس، سیادەتی کەس، سلطەنەتی کەس قبووڵ ناکەین.. دخیلک یا ربنا، بەو جهەتە امتحانمان مەکە، زمامی ئیرادەی خۆمان داوتە دەست تۆ، وەک حەضرەتی ئیبراهیم تەسلیمین، تۆش بە گوێرەی مەیلو هیمەتی خۆمان، تشریعی احکامان بۆ بفەرموو..

﴿فَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٢٨٦﴾﴾، ئەوی کافرە، ستری حقی کردبێ، موفقمان کەی لەسەر ئەوان.. حەقیان بۆ دەربخەین، لە ظلمەت نجاتیان بدەین، بەنووری کتابو بورهان، یا بە بارقەی سیف و سنان..آمین.. یا رب العالمین.

ئەو سورەتە، سورەتێ زۆر عظیمە، پرر(حکمە).. هەتا لە (روح المعاني) ئەڵێ: (ئیمامی عمر) هەشت ساڵان خەریکی تعلمی ئەو سورەتە بوو. ئافەرینی خودا لە عمر. بەو نظمەی ئێمە نەختەکمان بەدەرخست، فەهمیگرانە بە نظری سەرسەری نابێ. تدبری زۆری ئەوێ.

بعضێ پێیان خۆش نەبووە پێی بڵێن سورەی (بقرة)، بەڵام ئەوەش لە بێ دیققەتی‌یە، ئەو بقرە سرری عظیمی دەرخست، کە بنی اسرائیل لە ظهوری ئەترسان، حذریان ئەکرد.

(خالد بن سعدان) پێی ئەوت (فسطاط)، (حقیقةً) وەک زانا نوری فسطاط و خیمەی عظمتە بۆ موسڵمانانی تام الایمان، ڕەشماڵی (ذل)ی تیا هە ڵدرایە لەسەر جوولەکان. وە پێشی ئەڵێن (سنام القرآن)، حقاً سورەتێ زۆر اعلایە، ئەو سورەتە مبارەکە لە مدینە نازل بووە، مجموعی (٢٨٧) ئایەتە، بعضێ ئەڵێن (٢٨٦). طبعی ڕشیدی ئەوەی اختیار کردیە، ئاخر ڕەقمی لەسەر (لا یکلف الله.... الخ)ی داناوە ٢٨٦.

عجایبی ئەو سورەتە لەسەر ئەو تفصیلە، گەلێک ئایاتی مجملە.. ئینسان ئەتوانێ بڵێ: خلاصەی ما سبق، یا ما یاتی تفصیلیەتی، لە بەرئەوە تاخیری نزولی نەبوویتە مانعی تصدیری لە سورەتی فاتحە. ئەهلی ئیمان طلبی هیدایەتیان بۆ ڕێی ڕاست کرد، جوابیان وەرگرت. لە تفصیلی احواڵات بۆیان معلووم بوو، کە سلوکی ئەو ڕێیە ڕاستە، عقبەی هەیە.

خصوص لە ڕێی حج محصور کران، علاوەی ئەو طلبە، لە خوایان ویست نصرەتیان بدا بۆ ڕەفعی ئەو عقبەیە..

* * * *

# «سورەتی آل عمران»

دیسان اجابەی دەعوەتی کردن، لەسەر نهجی پێشوو.. بعد از (بسم الله الرحمن الرحیم) فەرموی: ﴿الٓمٓ ﴿١﴾﴾ تا خۆ حاضرکەن بۆ جواب وەرگرتن و، ئیشارە بۆ کمالی اتصال، لەبەینی هەر دوو سورەت، چ ملەی زۆر پرر مەعنای لە آیة الکرسی وەرگرت، کردیی یە صدری سورەت، فەرمووی: ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ﴿٢﴾﴾ ذاتەن، خەصمی ئیسلام و ڕێی ڕاست، دوو گرۆهی فەسادن، غایەیان یەکە، ڕێی اغوایان جوایەزە، (یەکێ) لەڕێی حس خانەخشتەوەر بووین، (ئەوی دی) لە ڕێی عەقڵ گومڕاه بووین.

(کانە) لە مادیات ترقیان کردیە، بۆ ڕوحانیات بڵندبووین، با وجودی لەو بڵندیە کەوتینە دەرکی اسفل لە جەهل و بێ عەلی و، شتی واهیان بە دەستەوە ئەیکەنە سەبەبی ئەو گومڕاهی‌یە. ئەو سورەتە بۆ ازالەی ئەو شوبهە واهیانە ناردرا. خودا، زندووە بالذات، نەبە واسطەی ئەمرێکی غەیری ذات. واحدی ( حقیقةً ) شائبەی کثرەتی تیا نی‌یە، لەبەینی وی و غەیرە جهەتی وحدەت، غیرە ممکنە، چونکە خودا فوق الطبیعەتە، ئەوی لە احواڵی طبیعیات بێ، بۆ خوا محاڵە.

حی و قیومی ئەوتۆیە، کە ادنی غفڵەت، شتێ وەک بۆرژانی نی‌یە، فەضڵ لە تغیرات و تطوراتێ، کە بەسەر موالید دادێ. حاصڵی غیبی مطلقە، نەبەبەر قووای مدرکە ئەکەوێ، نەبەر قوای عاملە. وەستای معملی طبیعەتە، داخلی معمل نی‌یە.

﴿نَزَّلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ﴾ معهود و معلوم، که فهرموو ی: (ذلک الکتاب لا ریب فیه) له پێشهوه ڕهفعی (رهیب) کرا. لێره ﴿بِٱلْحَقِّ﴾ به حهق ناردراوه، چ اشتباه و تبدیل و تحریفی تیا نی‌یه، مدلولاتی ههموو حهق ثابت و مقرره، ﴿مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ ئهوی به حهق مابی تفریقی، ئهکا له (محرفات).

﴿وَأَنزَلَ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ﴿٣﴾ مِن قَبْلُ هُدًى لِّلنَّاسِ﴾ ئهو تهوراتو ئنجیله، که خوا بۆ موسیو بۆ عیسیی ناردبوو، بۆ هیدایهتی خهلق. ئهمما ئهوهی له تهرهف جوو، یا دیان پێی ئهڵێن (توراة) معظمی تواریخه، ملحقاته له تهرهف ئهم و ئهو نووسراپه، پێی ئهڵێن توراتی موسی. ئهمما وهحیێ منزل بێ، له تهرهف خواه، حاشا ثم حاشا، ادنی کاتبی تاریخ بنووسێ، به ههزار دهرهجه فوقی ئهوانه ئهنووسێ و انجیلیش ههروها، ههر کهسه شتێکی نووسی‌یه، ناوی لێ نایه (انجیل) ، دوایی خڕیان کردۆتهوه و، چواریان انتخاب کرد له ههموویان. ئهوی نزیکی حهق بێ، انجیلی (بهرنابا)یه ئهویان قبووڵ نهکرد، والآن، لهم ڕۆژانهدا ئهورووپایی لێی ئهگهڕێن له ههرجێیێ ببێ، ئهیبهن ئهیسووتێنن، ههتا بعضه حمقایان ئهڵێن: ئهوه له تهرهف موسڵمانان تالیف کرایه، خولاصه ئهویش له تهورات پووچتره، پێشیان ئهڵێن: (کتبی مقدس).

تهورات کلمهیێکی عبرانی‌یه، به معنی (شریعهت)ه، انجیل کلمهیێکی یۆنانی‌یه به معنی (بشارهت) یا تعلیمی نوێیه، عهرهبی نین، خۆڕرایی اشتقاقی‌یهکان خۆیان ماندی ئهکهن.

﴿وَأَنزَلَ ٱلْفُرْقَانَ﴾ یهعنی ئهوی خوا ناردبێتی بۆ فهرق وتهمییزی حهق له باطلی ناردووه، ئهوی (منزل من عندالله) بێ فرقانه، ئهوی باطلو اساطیرو چیرۆکه بێ، لهلای خوا نههاتووه، حیکایهت خوانان تێیان بردووه، بعضێ ئهفهرموون عبارهته له عقڵی. (مجددی میصری) ئهوهی اختیار کردیه. بهڵێ، عهقڵ فارقه، موهبهی ئیلاهی‌یه، تمییزی ئینسان له سائری حیوانات

بە عەقڵە، لە پاش تمکنی قوای حیوانی ئەنێردرێ، بەڵام عەقڵ زۆر سەیرە، بعضاً وا ئەسیری قوای (بهیمی) ئەبێ، خۆی دوایان ئەکەوێ بو هەوای نەفسی خۆی (قدح) لە خۆی ئەدا خۆی ئەشکێنێ، خۆ قەلەندەرە لە زەمانی معجزە و کرامات، بە جارێ سقوط ئەکا، فەرقی محاڵ و ممکنی ظاهری پێ ناکرێ، ئەگەر جەیشی علاوە بوو، لێی مەپرسە! ئەمڕۆش، کە ئەڵێن عەصری عیلمو نوورە، ضیای (رونتکین_ ما وراء البنفسجي) لە اعماقی بەدەن نفوذ ئەکا، عەقڵی جوولەکەیی ودیانی، هەروەک خۆیەتی لە (تیە)دایە.

هەرچەند کتبی ئیلاهی، بۆ تەفریق و تەمییزی حەق لە باطل نزولی کردووە، بەڵام مع الأسف، گەلێکەس کردیانە مایەی کفر وضلال ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ﴾ بەسەبەب ئایاتی خوای﴿لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ﴾ ئەو عذابە، کە لایقی وانە. هەر هەندە تعبیر ئەدرێتەوە. ﴿وَٱللَّهُ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ ۝٤﴾ غالبە، تۆڵەستێنە لەوەی، ئایاتی هیدایەتی کردبێتە مایەی ضلال ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَخْفَىٰ عَلَيْهِ شَىْءٌ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ ۝٥﴾ ئەگەر کتمی حەق لە خەلق بکەن، لە جەنابی حەقیان پێ ناکرێ، عیلمی محیط شەئنی ئیلاهی یە، کەس لەو شەئنە شرکەتی نییە، رسلی عظام، مەلەکی کرام، کروبین و صافین و حافین و مقربین و ارواحی مجردە، ئەگەر هەبن، لە شائبەی نەزانین خاڵینین، هەرکەس عیلمی محدودە..

﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُصَوِّرُكُمْ فِى ٱلْأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَآءُ ﴾ خۆی مصورە، نابێ بە مصور غەیری ئەو، ئەوی خەیاڵی لێ بکرێ، بڵێ مصوری قوای عاملی طبیعەتە، بەڵام طبیعەت جاهلە، ئەو حوکم و دقائقە لە دەست وی نابێ، ئەویش (مرتب)ی پێئەوێ.

ئەبینن معمل ئیش ئەکا بە عاملی عالمی اختراع کراوە و دامەزراوە،

کەسی عاقڵ امدادی نەدا بە نەوت و بەنزین، بۆ عەمەل ئەبێ ڕانەوەستێ، چی پێ ناکرێ، ئەوەی ئێوە ئەیکەن بە مصور، خۆیان (مصورن) لە محصولاتی معملن، زەلیلی دەستی طبیعەتن، غەیری خودا بە عیلمی تام کێ ئەزانێ، ئەوی لە (مندالْدان) دایە، طبیعەتو مزاجی چی‌یە؟ دەرەجەی قابلیەتو استعدادی چەندە؟ چی تێ ئەبێ و چۆنی تێ ئەبێ؟ مەلەکێ، کە اوەلی مغلوبی عیلمی بەشەربوو، چۆن پاشان تصویری هەیکەلی بەشەرو تەرتیبی (قوای عاملی و مدرکی بشری) پێ ئەکرێ؟ اساساً قاعدەی تناسل کێ دای مەزراندووە، ئەتوانێ خیلافی قاعدە بکا، هەروەکو ڕەحم مقری تشکلی بەدەنە، دەماغیش محلی تشکلی عیلمە، ئەگەر دەماغ پاک بوو، ئایاتی ئیلاهی بە پاکی تیا قەرار ئەگرێ، ئەگەر نسجی خراب بێ، موادی ڕدیئی تیکەڵاوبێ، تلویثی ئەکا.

خولاصە قالْبی مادیات و معنویات، ئەگەر جوان بێ تێیدا دادەڕژێندرێ جوان ئەبێ، وە الاّ پیس و ناشیرین و مشوّه ئەبێ، قالْبی ڕەحم قابلە اشکالی بگۆڕی، ئەمما قالْبی دەماغ کەشکڵێکی وەرگرت گۆڕرانی محاڵە، وەک (معدە) طعامی پاکی ئەکەوێتێ، دوایی بە پیسی لێی ئەچێتەدەر، چاکە معدە صفوەتێکی لێ وەر ئەگیرێ، بەڵام دەماغی فاسد، وەظیفەی پیس کردنە و بەس.

﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٦﴾ بە هەموو وەجە، جەنابی حەق غالبە بە قودرەت و قووەت، بە عیلم و حیکمەت، بە صنع و ابداع و اختراع، بە قەهر؛ بۆیێ (عزیز) مناسبەی هەیە لەگەڵ انتقام، تۆڵەساندن لەگەڵ حکمەت، دانانی هەرشتە لە موقعی مناسب لێرەش وەک سورەتی پێشوو قابلە سؤالێ بکرێ، ئەڵێن: کتابی ئیلاهی فارقە، مع انە چەند ئایاتی تیا هەیە کە دەلالەت ئەکا لەمە کە جەنابی حەق یەکێکە وەک سائری حیوانات حەیاتی هەیە، گوێی هەیە، چاوی هەیە، وەک: ئینسان قسە ئەکا، وەکو پادشاە لەسەر عەرش و کورسی دادەنیشی و (غیر ذلک)... ئەگەر ئەوە

فرقان با، نەدەبایە ئەو ئایەتەی تیا بێ؟! جواب ئەفەرموێ:

﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ ﴾ قورئانی کریم فاصڵی (بین الحق والباطل)ە ﴿مِنْهُ﴾ لە کتابەکەیە، یا لە تەرەف خوایە ﴿ءَايَـٰتٌ مُّحْكَمَـٰتٌ﴾ اتقان کراوە، مەحکەمە، فەساد ڕووی تێ ناکا، دەلالەتی واضحە، ئاشکرایە، ئەهلی فەساد، خوارەکە و پێچەکەی پێناکرێ﴿هُنَّ أُمُّ ٱلْكِتَـٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَـٰبِهَـٰتٌ﴾ ئەو ئایاتی بێنانە ئەصڵی کتابە، عمادە، لەبەر ئەو تجلی و ظهورە، بە فاتحە ئەڵێن«ام الکتاب». ئەو نەوعە ئایاتە دائر بە اعتقادیات و اعمال هەیە، وەک عەرض یا مضمونیان پێک ئەچن، یا مضمونیان لەگەڵ اشیای دی پێک ئەچن، ئەوی مقصودی ئێمەیە، مەنشەئی متشابهاتی قورئان، متشابهاتی اکوانە.

بعضێک بێ أصلە، بسیطە، ترکیباتی تیا نیيە (شبە) لە بەینی ئەوانە دانابێ، فەضل لە تەشابهی ئایاتی محکمات، وەک ئەو اصولە مضموناتیان، نە لەگەڵ یەک نە لەگەڵ شتی دی تشابهیان نیيە.

ئاو، ئاگر، هەوا، خۆڵ، ئوکسجین، ایدروجین، آزوت، کاربون، زێڕ، زیو، ئاسن، سائری بسائطێ، کە علمای عصر کەشفیان کردوە.. بە خواص و مزایای خۆیان ممتازن «ان الله غنی عن العالمین.. الحمد للە رب العالمین، مالک یوم الدین» و بعضێ، کە لە (مولداتە) لە ئەصڵی شەبەهی معادن، نباتات، حیوان و ئینسانە، گەلێ بە گەلێ تەشابهیان هەیە. بۆ ئەهلی خۆی نەبێ پێک ئەگۆڕرێن. ئەوی ئەهلی خەبەرە جهەتی فارقە ئەزانێ، خواصیان دەرک ئەکا تەفریق و تەمییزیان ئەنوێنێ.. کە ئەوی ئەهلی خەبەریش نەبێ و تێی بگا و بیزانێ ولێی نەگۆڕرێ و (لدی التحقیق) دەرئەکەوێ، ئەوانە جیهەتی تخالف و تباینیشیان هەیە، وەک جیهەتی (تشابە). ئەو تشابهە لە هەموو عیلمێ هەیە، بەڵام (ماهر)ی ئەوێ تفریقی بکا و تێنەکەوێ، دوڕری نەجەفی، بە ئەڵماس لێ نەگۆڕرێ، سکەی قەڵب لە جیاتی سکەی ساغ

وەرنەگرێ.

لە اوائلی انقلاب یەکێ لە ئەفرادی عائلە نەساغ بوو، دوو دوقتوری باش لێرەبوون، یەکێ تورک و موسڵمان (نصرت فؤاد)، یەکێ ئینگلیز (میللەر). ناردم لە دوویان هاتن پاش عصر بوو، معاینەیان کرد گوایا عیللەتەکەی (حمای مرزخیە) بەو گوێرە ترتیباتیان دانا. شەو زۆر بێ صحەتبوو، ئەو دەرمانەی استعمالی ئەکرد، زێدە ئەلەمی ئەدا، زێتر تەحریکی کۆکەی ئەکرد. سبەینێ زوو (نصرت) هات بە تالووکە، بە مشوەشی.. گوتم خێرە وازوو هاتی؟ بێ لە دوا ناردن؟ گوتی: لام وایە لە کەشفەکە بە غەلەط چووین، تشخیصی عیللەتەکەمان بۆ نەبووە. گوتم (حقیقةً) وا بەدەرئەکەوێ، ئەمشەو پاش ترتیباتی ئێوە زیادە بێ قەرار بوو، تکرار معاینەی کرد، گوتی بەڵێ غەلەط بووین ئەو نەساغییە (ذات الرئە)یە، لەو ئانەدا (میللەر)یش هات، نصرت بەلسانی طبی عەرضی کرد، ئەویش معاینەی کردەوە، بە دەنگی بڵند:«پاردون نصرت» تقدیری مقدرەتی نصرتی کرد. بالاتفاق تەرتیبێ، کە بۆ ذات الرئة موافقبێ، کردیان. شوکر نەساغەکە چا بووەوە.

﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ﴾ مەیلی باطلیان لە دڵدایە، لە ڕێی ڕاست لائەدەن ﴿فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنْهُ﴾ دوای ئایاتی متشابهە ئەکەون، لەجهات (تشابە) بۆی ئەچن تەماشای جهەتی افتراق ناکەن. ﴿ٱبْتِغَآءَ ٱلْفِتْنَةِ﴾ مقصدی اصلیان افسادی عالەمە ﴿وَٱبْتِغَآءَ تَأْوِيلِهِۦ﴾ بە ظاهری وا بنوێنن، کە تەفسیری کلامی خوا ئەکەن، لێرەش تشابهی ئەنوێنن، (انە) ئەمانە مفسری کلامی خودان، وەک علمای ڕاسخ طالبی ڕێی هیدایەتن، مەلەک صورەت ئیبلیس سیرەتن.

﴿وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ﴾ کەس تەفسیری متشابە نازانێ، بە حقیقەت زانین و بە تەمام کەشف، لەبەینی ئایاتی قورئان، خوا نەبێ، بۆیێ وەقف لێرە مطلقە، مەبادا تشابهێ بێتە خەیاڵ، لەبەینی عیلمی ئیلاهی و عیلمی ڕاسخی فی العلم.

﴿وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ﴾ ئەمانە بە قووەی عیلم و ئیمان و، مەیلی (الی الحق) و، ابرازی ئەسراری کائنات تەفسیری متشابە ئەزانن و بە کەمالی صفوەتی قلب بۆ ئیرشادی عباد ئەیکەن، بە فیکری نقادی خۆیان خالص ومغشوش لێک ئەکەنەوە، مەنعی فەساد و تەلبیسی (ابالسان) ئەفەرموون بە دڵ و زوبان ئەڵێن: ﴿يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ﴾ بە سەبەبی متشابە، یا بە متشابە ئیمانیان هێناوە، یا هەیە، ﴿كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ﴾ محکمو متشابە لە قورئانو لە اکوان لە تەرەف خوایە، مرجعی متشابە بو محکمە، بۆ اربابی نظر و کیمیا گەرانی هونەروەر هوێدایە، بەینی محکم ومتشابە، بین الارض والسمایە.

﴿وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٧﴾ (تذکرّ و تدبرّ) ناکا، الاّ ئەوانی، کە صاحبی حسنی نظرن، ذهنیان بە قووەتە، بۆ کەشفی حقائق نظریان نفوذ ئەکا، لە بەردی ڕەق بێ، شەقی ئەکا، ئەزانێ، کلۆرە، ئەوانی بێ لبّ و خلاصە بن، سەرسەری و سطحی بەسەر شتدا ئەڕۆن. چیتیایە ؟ هیچ!. گێل و گەوج لە ئەسراری نازانێ، کەسی بە ئینصاف بێ تقلیدی (سلف و خلف)، تەماشای سیرەتی علمای دین و طبیعەت بکا، ئەزانێ کە متشابە مەنشەئی ترقی عیلمە، احکامی ادیان و احکامی اکوان، ئەگەر لەسەر بساطەت برۆیشتایە دینی موجودات زۆر بسیط و سادە ئەبوو، عیلم بێ قیمەت، عالم بێ سعی، طبابەت و کیمیا، اصلا نەدەگەیشتە ئەو دەرەجەیە.

ئینسان شتێکەم لە فەوقی مەیموون ئەبوو، تا قووەتی لە عالەمدا زیادبێ، خفای طبیعەت زووتر فەهم ئەکا، (همس الخطابی) طبیعەتی چاتر گوێ لێ

ئەبێ و، تا تشابە لەبەینی اشیادا شدیدتر بێ، قووەی تەفریق زیاد ئەکا، قووەت لەبەینی علمای تشبیە، قووەیان گەیشتە دەرەجەیێ، گیایان هێنایە دەرەجەی ئاوریشم! ئەگەر قووەی فارقە نەبێ، عالم چی بەسەردێ؟.. دیمان بە ملیۆن خەسارەت لە نەزانان کەوت، تا لە ئەهلی عیلمەوە پێیان گەیشتن، فەرقی تلفون و ئاوریشمیان کرد. حەیفە علمای دین بە ناوی (سەلەفی)، لە حقائقی دین محروم بن و، عالەم لە گێژاوی تشابهدا بهێڵنەوە.

چۆن تصور ئەکرێ ئایەتێ لە تەرەف خوا بۆ پێغەمبەری خۆی بنێرێ و، عباد نەیزانێ و بڵێن: «استاثر الله بعلمە» و بعضاً بعضە أصفیای خۆی بە طریقی غەیرە مکتسب بۆ بەشەر اطلاعیان ئەداتێ؟ ذاتەن هەر بەو نەوعە بۆ کەشفی حقایقی موجوداتیان لە کیس خۆدا... بڵێ ئەمە ئیشی خوایە.. قسە لە طبیعەت مەکە کافر ئەبی.. هەر خوا مؤثرە.. هیچ (قوی) تاثیری نی‌یە.. ئاو و ئاگر بۆ تێراوی و سووتانی فەرقیان نییە، هەر خوا پاش خواردنەوەی ئاو، تێراوی خەلق ئەکا، پاش مماسەی ئاگر سووتان خەلق ئەکا.. نەساغی خەڵاتی خوایە!! هەتا بعضێک تداوی‌یان لا حرامە .. لایان وایە مقابلەی خوایە... ناڕەزایی‌یە بە خەڵاتی خوای.

تاکو بەجارێ هەموو اسراری دنیا و موجودات لە دەست چوو، خوا ئەیزانی، ئەگەر فرقەی حکمای ئیلاهیون نەبان، علمای ئیسلامیش فەرقێکیان لەگەڵ علمای جوو و دیانان نەدەبوو، هەر کەسێ ئەمین و عاقڵ بووبێ، لە علمای ئیسلام ازالەی پەردەی لە متاشبهات کردووە، بە وەجهی لایق ڕووی حەقی بەدەر خستووە، ئەگەر بە تفویضی عیلم لێبگەڕێین، لبّ و ڕسوخی فی العلمی چی پێ ئەوێ. بلاهەت و بساطەت کافیی یە، ئەگەر بە تفویض لێ گەڕابان، ئەو هەموو عیللەتانە چۆن تداوی ئەکران.. میکرۆب کوو کەشف ئەبوو؟ قووەتی کەهرەب، ضیای ڕونتکین، قووەتی ڕادیۆم، چۆن بەدەر ئەکەوت، کوو بۆ نەفعی عباد تەسخیر دەکرا؟ لە بەعضی

اشعاری کوردیی خۆم عەرضم کردبوون:

مەلای نادان بە عنوانی شریعەت
حەرامی کرد لە تۆ عیلمی طبیعەت
لە بۆیێ هەر لە ئەو عەردە بەدەرکەوت
لە زێرر و زیو و توج و پاقر و نەوت
بە کلی کەوتە ژێر دەستی فەرەنگان
چیاو چۆلان دەنۆررن وەک پلنگان
بیان نۆرریێ، چیایان چون ئەکۆڵن..
هەتا کەی ئێوە هەربەرماڵ بە کۆڵن؟

( حقیقةً ) ئەگەر ئیش لەبەر دەسی علمای (ملیـّــون) دابایـە، اصـلاً دینـی حیکمەت تـەررەقـی نـەدەکـرد ﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا ﴾ یـا الهـی. دڵـی ئێمە کول نەکە ی ، مەیلی باطلی پێ نەدەی لەپاشئـەوەی، کـە هیدایـەتـت داین. حقیقةً، مەیلی پاش ئیمان و هیدایەت، گەلێ خرابترە لە زەیفـی پـێش هیدایەت، ئەو نەوعە کەسە خۆی بە حامی دین، حـافظـی شـەرع ئـەزانـی ، سەددی سکندەرە لەبەینی حەق و باطڵ ، علاجیان ناکرێ، اصلاح نابن..

﴿وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ الْوَهَّابُ ﴿٨﴾﴾ رەحمەتەکمان پێ کـەرەم کـە لە تەرەف خۆت، دەرحەق عباد لە (زیـغ و ضـلال) نجاتیـان بـدەیـن، ئـەتـۆ بەڕاستی هەر ئەتۆ صاحبی عطای زۆری.

وەک عەرضمان کردن ئەوانەی دوای متشابە ئەکـەون، صـرفی ناکـەن لـە مەعنای لغوی، بەڵکوو حرفیاً لەسەر مەعنـای (لغـەت) تـەفـسیر و ایـضاحی ئـەکـەن. مـثلاً لـە ( آیةالکرسـی ) ئـەفـەرمـووێ: «وسـع کرسـیه الـسماوات والارض» کورسی وەک هەمووومان ئەیزانین، ئـەو جـسمە مخـصوصەیـە، کـە ئینسانێک، شەخـصێک لەسەری دانیشێ، جێی دووانی لـەسـەر نـەبێتـەوە..

جالس پڕری بکا، یا کەمی لە جالس زیادبێ، ئەڵێن جەنابی حەق لەسەر کورسی دائەنیشێ پڕری ئەکا، یا کورسی سێ چوار ئەنگوستی لەو زیاترە.. لەوانە عاقڵ تر، کە گوێی لە عەرش ئەبێ، ئەڵێ عەرش تەختی پادشاهە، واسعە.. کورسی حەقی وزرایە لەسەری دانیشێ، یا چاویان بە بعضە پیاوی گەورە کەوتووە، کورسی گچکەیان بۆ دادەنێن.. کە لەسەر تەخت دانیشت لاقی لەسەر دادەنێ!. ئیمامی مفسرین «نقال» گەلێ لەو نەوعە ڕوایاتی هەیە، کە بیستیان«علی العرش استوی» استواء مساواتە (علی) بۆ استعلایە، کەوابێ مەعنای خوای تعالی لەسەر عەرشە، مساوییە لەگەڵ عەرش، بعضێ بۆ زێدە علویەتی خوا ئەڵێ: لە عەرش بڵندترە بە (بعد)ی متناهی، یا غیرە متناهی!

سەیری ئەو جهالەتە!! بعدی غیر متناهی لە بەینی عەرش و خوا!؟ بێگومان ئەو نەوعە مەعنایانە لە مەیلی حسە، کەسێ بە عەقڵ تەماشا بکا، نەختێ لە ئایاتی محکم بفکرێ، ئەزانێ ئەو مەعنایانە اصلا ڕێی نییە. «غنی عن العالمین،رب العالمین» چۆن لەسەر شت دادەنیشێ، کە مخلوقی خۆیەتی؟ وجود و قوامی عەرشی و کورسی و سماواتو ئەرز لە خوایە، ئەو نەوعە ئایاتە، کەی مەلا ئەیزانێ؟ لەسەر تەخت و کورسی دانیشتن قەدر نادا بە مەلیک. مەلیک قەدر ئەدا بە عەرشو کورسی مەملەکەت. کەسێ عمری خۆی لەسەر حەسیر لە بن کوخ و زنج دانیشتبێ، تەختی نەختێ بە زینەت ببینێ، ئەوەی لەسەری دانیشتییە بە «أعظم من فی الارض» حساب ئەکا.

ئەڵێن: عەرەبێ هاتە حضوری هارون الرشید، بەو حیشمەت و جلالەی لەسەر تەختی عالی دیت، وتی: «السلام علیک یا الله» وتیان هەو نییە، بەرەژێر وتی: «السلام علیک یا رسول الله» وتیان هەونییە.. بەرە ژێر .. ئەوجا وتی: «السلام علیک یا امیر المؤمنین». دیققەت بکەن ئەوانی بوون بە ڕۆسای عقائد، اکثری لەو نەوعە (بدوی)یانە بوون.. ڕەشو ڕووتی قاووتو

جورج خۆر لە کلامی ملووکانە چۆن تێ‌ئەگا، هەر حەملی ئەکاتە سەر مفکور و مخیلاتی خۆی.

ئەڵێن: «فردەوسی» لە حەپس‌دا، بعضاً متاثرانە اشعاری ئەخوێندەوەو پیاوێکی پیر لە محبس بوو، تا فردەوسی ئەی خوێندەوە، ئەویش ئەگریا.. فردەوسی شەوق و زەوقی زیاد ئەبوو، ڕۆژێ لێی پرسی بۆ ئەگریێ؟ وتی: «وە صیەقەت بم، من نێریی باشم هەیە لە ناو پەت، کە تۆ ئەخوێنی ریشت ئەجوڵێتەوە، بیری نێری‌یەکەم ئەکەم.. لە وەقتی کاوێژ ئەویش ڕیشی وەک ڕیشی تۆ ئەجوڵێتەوە». خوا ئەیزانی لالۆ لە اشعار خوێندنەوەی فردەوسی چەند استفادەی کردووە، ئەوانیش لەو نەوعە ئایاتە هەر هەندە.

﴿ رَبَّنَآ إِنَّكَ جَامِعُ ٱلنَّاسِ لِيَوۡمٖ لَّا رَيۡبَ فِيهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ ٩ ﴾

یەکانە سەبەبی ئەو خزعبلاتە، ئیمان نەبوونە بە ڕۆژی قیامەت، ئەی خودای ئێمە تۆ ئینسانان خڕ ئەکەیەوە لە ڕۆژێکی، هیچ شکی تێدا نی‌یە، بەڕاستی جەنابی حەق خەڵقی میقات ناکا لە وەقتی خۆی ئەو ڕۆژە ئەهێنێ، ئەو وەقتە جەزای خێرو شەرر ئەدرێ. لە تحقیقاتی «سەلەف» زانیتان، کە متشابە لە قورئان وسائری کتبی فرقان، لە لوازمی تشابهی اکوانە، ئەویش باعثی تەررەقی عیلمو عرفانە بۆ خاوەنی عەقڵ، کەسێ (زیغ)ی دڵی هەبێ، خۆی بە داوی محسوسات بەند ئەکا، نە لە ئایاتی منزل، نە لە ئایاتی مکون، استفادە ناکا. قباحەتی خۆیەتی، نەقص لە قورئاندا نی‌یە. یەکێکیش لە اسبابی اهتدا نەبوون، حبی دنیایە.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بە خۆرِرایی بە حبی اموال و اولاد، خۆیان پابەند ئەکەن. ماڵو وەلەد، چ کەڵکی ئەوان ئەگرێ؟ ﴿لَن تُغۡنِيَ عَنۡهُمۡ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيۡـٔٗاۖ﴾ دائماً محتاجی خوان لە هەنگامی چوونە دەر لە دنیا، هیچت لەگەڵ نابێ، وەک (حاجی قادر) ئەڵێ:

دوو گەز زەمین و سێ گەز جاو و مستە خۆڵێکە
لباسرو پێخەفـو ڕایەخ هەتا دەگاتە سەرین

گەلێ کەس ئەوەشیان چەنگ ناکەوێ، لەسەر مزبلان سەگ ئەیان خوا. لە ڕۆژی قیامەت غەیری ئیمانی صحیح و عملی صالح، هیچت بە کە ڵک نایێ. ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ وَقُودُ ٱلنَّارِ ١٠﴾ لەگەڵ (حجارە) اختیاری ضلال لەسەر ڕشد بە پابەندی جاە بوویتە ڕەوشت، ڕەوشتێکە ﴿كَدَأۡبِ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ﴾ ئەوانیش لەبەر سەروەتو سامان و سلطنەتی، تکذیبی موسایان کرد، ئیمانیان پێ نەهێنا. لای ئێوە ئەی کافرانی ئەهلی کتاب! معذور نین بە ملعون و کافریان.. ئەزانن، مع انە موڵک و سلطەنەتەتی ئەو، لە کوێ و ئی ئێوە لەکوێ؟ بالخاصە (موسی) لە قەومێک بوو زەلیل و بەردەستی ئەوان، لقیطە هە ڵگیراوەی ئالی فرعۆن و بەخێوکراوی ئەوان..(مع هذا) بە خۆو دارەکاری هە ڵ کوتێتە سەر فرعون، بڵێ ئیمانم پێبهێنە، اتباعی من بکە.. ئەو معذور نەبێ، ئێوە معذورن؟

﴿وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ﴾ رؤسا و سلاطین، دەربارەی پێغەمبەری عەصری خۆیان، ئەوانیش ئەو دەئبەیان هەبوو، ئێوەش ئەگەر لە زەمانی واندا بان، وەکی ئەوان ئیمانتان بە موسی و سائری انبیای عەصر نەدەهێنا. ﴿كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ وەک ئێوە ﴿فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمۡۗ﴾ کە ثمرەی شجرەی کفریان بوو، لاشک ئێوەش ئەگرێ ﴿وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ١١﴾ بە ماڵ و وەلەد نەجاتتان نابێ و، بە قووەتی جسمی معارضە ناکرێ ﴿قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بە واسطەی غروری بە ثروەتی دنیا، قووەتی خۆتان، هە ڵ مەخە ڵەتێن. ماڵ بۆ حەرب معینی باشە، بەڵام ئەوەی پابەندییە، دڵی لەدوو بەرنادا لە موقعی خۆی صەرفی ناکا، قووەت و مکنەت پایەدار نییە، دنیا ئەگۆڕێ تقلباتی زۆرە،

وەک حاجی قادر ئەڵێ:

ئەمین مەبە لەسبەینێ ئەوەت بە سەردێنێ
حوادثــاتی زەمانــە کــە نایێتــە تــەخمــین..

﴿سَتُغۡلَبُونَ﴾ ژێر ئەکەون لە دوو مەیدانان، مەیدانی قتال و مەیدانی جدال.﴿وَتُحۡشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَۚ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ﴿١٢﴾﴾ فەرشی خراپە ﴿قَدۡ كَانَ﴾ لە سالفی زەمان﴿لَكُمۡ﴾ بۆ ئێوە ئەی ئەهلی کتاب﴿ءَايَةٞ﴾ ئەمما چ ئایەت؟! حقیقة پاش ئەو ئایەتە، نەدەبا ئێوە مغرور بن. ئایەت و عیبرەتەکە ﴿فِي فِئَتَيۡنِ ٱلۡتَقَتَاۖ﴾ تووشی یەک بوون، یەکێ ئەهلی ئیمان، یەکێ کافر﴿فِئَةٞ﴾ فەریقێ، جەماعەتێ ﴿تُقَٰتِلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ فئەتی (طالوت) لە ڕێی خوا شەڕی ئەکرد بۆ قورتار کردنی دیارو ابناء ﴿وَأُخۡرَىٰ كَافِرَةٞ يَرَوۡنَهُم مِّثۡلَيۡهِمۡ رَأۡيَ ٱلۡعَيۡنِۚ﴾ جەماعەتیکی تر کافر گوتیان: «لا طاقة لنا الیوم بجالوت وجنوده» ئەوانی ئەهلی ئیمان بوون، نەیانگوت، بەڵکوو گوتیان«کم من فئة قلیلة غلبت فئة کثیرة باذن الله».

داود جالوتی کوشت. ضعفای مؤمن بەسەر اقویای کافر غەلەبەیان کرد. ئایا ئەو ئایەتەتان لە فکر کرد؟ ئێمەش هەر چەند ظاهراً کەمین، ئەمما قووەتی ئیمان غالبمان ئەکا. وا دیارە ئێوە ئەو نەوعە ماجەرایە، کە لە کتبی مقدسەتاندا هەیە، بە حیکایەت تلقی ئەکەن لە ڕوحی خبردار نین. ﴿وَٱللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصۡرِهِۦ﴾ کە قووەتی ئیمانە صبر و ثباتە، تظافر و تضامنی قەومە ﴿مَن يَشَآءُۚ﴾ خوا، کە صاحبی اختیارو ئیرادەیە، ئەزانێ کێ لایقە بۆ ئەو تاییدە، سەبەبی حقیقی (ظفر) معنویە، ڕوحییە، ئەویش لە دەست خوایە، ئالات و ئەدەواتی حەرب لەگەڵ قووەتی معنوی نەبێ کەڵک ناگرێ و دوژمن بە تالآن ئەبیا.

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً﴾ عبرەت پردی معنویيە، لە حاڵێ بۆ حاڵێ پێی ئەپەڕریيەوە، وەک (عبرە) پردە لە سەرئاو، خەڵکی بەسەریا ئەڕروا و ئەپەڕێتەوە. کەسێ وقایعی تاریخیە نەکا بە عبیرەت و موعظە، لە حوادثێ بەسەر خۆی بێ خۆی قومار ناکا. لە حەربی ژاپۆن و ڕوسی تەماشایان کرد، یەکانە سەبەبی ظفری ژاپۆن لیباسی عەسکەری بوو، کە ڕەنگی خاکی بوو «نەختێ دوور ئەوی خاکی بێ نابیندرێ» لیباسی عەسکەری ڕووس وەک سائری دوەل ڕەش بوو، گەلێ لە دوور ئەبیندرا، لەبەرئەوە گەلێ ژاپۆن چاکی اصابە ئەکرد.. ئەی ئەوان خوو و طالع لەبەرئەوە هەموو دەوڵەت لیباسی عەسکەری حربیان کردە خاکی ڕەنگ. ﴿لِّأُولِي الْأَبْصَارِ ﴿١٣﴾﴾ ئەوی بصیرەت و هۆشی هەبێ، شت بەشت مقایسە ئەکا، پەندی لێوەرئەگرێ.. بێ هۆش ئاگای لێ نییە.

﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ﴾ ئارایش دراوە بۆ ناس، هەتا ئەوانی بەهۆش و ئیدراک ﴿حُبُّ الشَّهَوَاتِ﴾ مەیلی شدید، کە لە دڵ، جاگیر بێ، پابەندی بێ، مەنعی بکا لە هیدایەت ﴿مِنَ النِّسَاءِ وَالْبَنِينَ﴾ ئارایش سێ نەوعە:

١- ئارایشێ بە خەلق وئیجاد، ئەوە صرف عائدی خالقە، ئەو هەموو اشیای مزین و مفتخر و قیمەتدار، غەیری خوا کەس مداخلەی لە خلقیدا نییە.

٢- ئارایشی بەڕراستی، کەسێ نەفرەت لەشتی باش ئەکا، بە ڕاستی منافعی بۆ بەیان بکرێ، بە عیبارەتی جوان و ئەدبی خۆش بخرێتە ذهنی. ئەمەش زۆر باشە، عائدی جەنابی حەق ڕسل عظام و (راسخ فی العلم)ی ئەمین لەگەڵ عبادی خوایە.

٣- ئارایشی مزخرف بە وەسوەسە و تسویل و تلبیس شتی خراپ زینەت بدا، لەبەر نظری خەڵک جوانی بکا، ئەوە زۆرخراپە، عائدی ابلیس و طاغوت

و شاعرانی بەدنهاد و، خائن لەگەڵ عبادە و امثالی ئەوانە. بێگومان ئەو مشهیاتە و مستلذاتە خۆشن، ئینسان فطرةً مەیلیان بۆ ئەکا، بەڵام محبەت بە دەرەجەیێ بێ، کە ئینسان پێیان بە فیتنە بچێ ناشیرینە، خراپە، عاقبەتی بە هیلاک چوونە. محبەتی ژن و اولاد بە دەرەجەیێ، کە منعت بکا لە ئیمان زۆر خراپە، هەتا ئێستا گەلێک لە ڕجالی ئەورووپی حەز ئەکەن موسڵمان بن، چونکی ژنیان، یا اولادیان موافقەیان ناکا، موسڵمان نابن. محبەتی اولاد لە سەر فیطرەتی پاک، سەوقت بکا بۆ تربیەیان، فەرقی نێرومێ نەکا لە ئەصڵی محبەت، ظریفە، ئەمما حبی اولادی نێروبەس، خۆی نییە وەک قەومی عەرەب، کە کچیان زندە بەگۆرر ئەکرد. کوردیش زۆر کەیفیان بە کچان نایێ. ئەورووپایی بالعکس محبەتی کچانیان گەلێک پترە لە کوڕان، تورکیش لەو مەیلەدان، حاصلی افراطو تفریط، هیچیان باش نییە.

﴿وَ﴾ هەروها ﴿وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ﴾ قناطیر جمعی قنطارە، قنطار بەماڵی زۆر ئەڵێن، بێ تعیینی مقدار، ئەوە لە (ضحاك) ڕوایەتکراوە. (ابو هريرة) ئەفەرموێ: سؤال لە ڕسول الله کرا فەرمووی: قنطار دوازدە هەزار ئوقیەیە، بنا لە ڕوایەتی (انس) هەزار ئوقیەیە و، بە ڕوایەتێکی تر لە (انس) هەزار دینارە. بنا لەروایەتی (أُبی بن كعب) فەرمویەتی: هەزار ئوقیەو دووسەد دینارە، لە ڕوایەتی (معاذ) هەزارو دوو صەد ئوقیەیە. لە (ابن عباس) نەقڵ کراوە، دوازدە هەزار درهەم و هەزار دینارە. ڕوایەتێکی تری لێ نەقل کراوە، هەزارو دووسەد دینار یەعنی لە زێرر، لە زیو هەزار و دووسەد مثقالە. (ابو سعیدی خدری) ئەڵێ: پرر بە پێستی گاجوتێ زێرر. (مجاهد) هەفتا دینار، (ابن المسيب) هەشتا هەزار، (ابو صالح) سەد ڕەتل، (قتادە) سەد ڕەتل لە زێرر، یا هەشتا هەزار لە زیو، (ابو جعفر) پازدە هەزار مثقال، مثقالیش بیست وچوار قیراط، بعضێ ئەڵێن: مابەینی ئەرز و ئاسمان«ئەمە زۆر کەیفی لە قنطار بوو!!» حاصڵی اختلافیان بە قنطار!

صحابە دەوڵەمەندەکان، وەک ئیمامی عثمان و عبدالرحمن بن عوف

قسەیان لێ نەکردووە.. مقصد ئەمەیە بزانین لە لغەت، یا لە تجارەت بە چ قەدەرێ ئەڵێن قنطار. نظر بە (لغت)، قسەکەی (ضحاك) خۆیەتی و، لە تجارەت ئەگۆڕرێ، لە پارە ئێستا حساب لە ملیۆن و بلیون و ملیارە. ئەمەبوو قنطار، ئەمما مقنطر، یەکێ ئەڵێ: مضعف دوو چەندان کراو، بعضێ ئەڵێن تۆ قنطار مقنطرەیە (وتراوە)، مەحکەم و محض (انە) لە ناو سندووقی پۆڵا داندراو. (وتراوە) دەفنکراو یەعنی کۆکراوە لەسەریەک داندراو، نەخۆی و نەکەسی تر خێری لێ نەبینێ، هەر بیکا بە خزینە، ئەمەش بێ فائدەیە وەک ئەڵێ: (برای نهادن چ سنگ و چ زر).

﴿مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ﴾ لە زێرر و زیو، نە لە مازوو سیچکە و کەتیرە ﴿وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ﴾ ڕەوی ئەسپ ومااین، لە چراگاە بەرەڵلاکراو، کەس سواری نەبێ، بێهوودە بڕوا، بەس بۆ افتخار و خۆشی نەفس، ئەمما ئەگەر خۆی، یا خەڵکی بۆ حفظی دین و دەوڵەت سواری بن، خەیلێ چاکە بۆ ئەوانەیە..«الخیل معقود فی نواصیها الخیر الی یوم القیامة» ﴿وَٱلْأَنْعَٰمِ﴾ حوشتر، ڕەشەوڵاغ، مەرر و بزن ئەڵێن کابراییێک لە امریکا سەدو پەنجا هەزار سەری مەررو بزنی هەیە! بۆیە خوری و موو لە وڵاتی ئێمە قیمەتی نەما. ﴿وَٱلْحَرْثِ﴾ مەزرەعە لە گەنم، جۆ، برنج و ئەنواعی سەوزە. ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەو مزین کراوانە ﴿مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ ئەوی صەرفی نەکا لە (دارین)، هەردوو دار محرومە. گەلێ صاحب مێگەل هەن، دڵیان ئەکزێتەوە بۆ گۆشت، دڵیان نایە گیسکێک سەر بڕرن، مەگەر نەخۆش بێ بێتە مردن، ئەو وەقتە بە کەمالی ئەسەف ئەکوژێتەوە و، بە حەسرەت سندانی ئەکەن. ئەوی لە دنیا لەززەتیکی لێببینێ اهونە، ئەمما ئەویش چەند ڕۆژێکە ئەبڕێتەوە، ئەوی خۆشی لەززەتی لێ ببینێ و، بیشی بەخشێ لە ڕێی خودا صەرفی بکا، وەتەن و میللەتی پێنەجات بدا.. بەخ.. بەخ!. لەو

قانزاجە، لەو سعادەتە! ئەمەیە، کە حەضرەتی ڕسالەت ئەفەرموێ: «ذهب اهل الدثور بالاجور» فەقیری قەلەندەر چی لە مستدێ؟ خصوصی ئەمڕۆ. (ئەدەروف) ناوێکی یۆنانی وەصیەتی کرد، یەک ملیۆن و نیو لیرەی بۆ بدەن بە پاپۆری حەربی، ناوی خۆی لێنێن بۆ حکومەتی یۆنان، لە سایەی ئەوە غەلەبەی کرد لەسەر دەوڵەتی عثمانی، باوجودی لە پێشدا ژێر دەستی بوو، میللەتی دی وەصیەتیان بۆ حکومەتە ، حکومەتیش لە تعالی میللەت وەصیەتەکە بەجێ ئەهێنێ. حالاش میللەتی ئیسلام لەو فکرە دانیە.. بۆ تۆمەرمەندان، خاڵ خالان، پیرەمەگرون، پیری دابان، خانەگای شێخ.. لە سایەی ئەوان بوو مدرسەکان نەما. ﴿وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلۡمَـَٔابِ ١٤﴾ حوسنی مرجع و منقلب لای خوایە، ئەوەی کەیفی بە مرجعی ئیلاهی بێ، بەو شهواتە خۆی مەحروم ناکا. بەڵکوو بۆ ئەو منقلبە خۆشە دائمی یە، بێ حد و حسابە صەرفی ئەکا، ئەوکەسە بە مسراتی هەر دوو حەیات شادکام ئەبێ. ﴿قُلۡ﴾ ئەی ڕەسولی مبلغ ﴿أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيۡرٖ مِّن ذَٰلِكُمۡۚ﴾ ئایا خەبەرتان بدەمێ بە چاتر لەو ئەشیایە، کە ذکر کرا؟ بەڵێ، قوربان چی ئەفەرمووێ؟

﴿لِلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ عِندَ رَبِّهِمۡ جَنَّـٰتٞ﴾ خەبەرەکە ئەوەیە بۆ ئەوانەی خۆ پارێزن لە شهواتی نفسیە، لای خوای خۆیان هەیە باغات، دێمی نا، بەڵکو ﴿تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَا﴾ وەک مەتاعی دنیا نییە، ئەمڕۆ تێیدای و سبەی ئەڕۆی. باغێک هەیە بە سەد ڕەنج بەخێوی ئەکەی، فرتەنەک دێ باو و باران و تەرزە و ڕەعد و بروسکەی لێ ئەدا، بە جارێ بەربادی ئەکا، لە بەری دوو سالانی دەخا، ڕەنجەڕۆ دێیە دەرێ[1] ﴿وَأَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّـرَةٞ﴾ ج نیعمەتی ژنی پاک، اولادیش هەریەکە سەربەخۆ لە مەقامی خۆیانن.

(١) وەک ئەمشەو(٢٤)ی نیسانی ڕومی(٢٣)ی محرّم قیامەتێ بوو هائل.

﴿ وَرِضۡوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِۗ ﴾ ئەوە (فوق ما یتصور) خۆشی ئەوە نایێتە دەفتەر ﴿وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ١٥﴾ هەموو عباد محسن و مسيء، یا ئەو عبادە پەرهێزکارانە ﴿ٱلَّذِينَ﴾ ئەو عبادانەی ﴿يَقُولُونَ﴾ بە کەمالی اخلاص ﴿رَبَّنَآ إِنَّنَآ ءَامَنَّا﴾ بە ئیمانی ڕاست، ناڵێن عملی چاکمان هەیە، ئەو ئەمرەتمان بە جێ هێناوە، تەرکی نواهیتمان کردووە، شەرم ئەکەن، خەجاڵەت ئەیانگرێ، بەڵکو قصور ئەنوێنن، ئەڵێن: ﴿فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا﴾ سەتری گوناهمان بکە، عەیبمان داپۆشە ﴿وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ١٦﴾ ئەوەندە عەرض ئەکەن باقی ئەمری خۆتە ﴿ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾ لە (سراء وضراء)و (حین الباس) ﴿وَٱلصَّٰدِقِينَ ﴾ لە نیات و اقوال، سرر و فلن ڕاستگۆن ﴿وَٱلۡقَٰنِتِينَ﴾ مطیعو فەرمان بەردار علی الدوام﴿وَٱلۡمُنفِقِينَ ﴾ لە هەرچی بە صلاحیان زانی بۆ قەوم و وەتەن. ﴿وَٱلۡمُسۡتَغۡفِرِينَ بِٱلۡأَسۡحَارِ ١٧﴾ شەو بێدارتر لە اسحار، خاڵی لە اغیار، ڕوو ئەکەنە دەرگاهی بێنیاز، بە تضرع و زاری بە ئاهی جگەر سۆز، بە چەشمی ئەشکبار. (حقیقةً) ، شەو بێداری بۆ ئوممەتی ئیسلام، زۆر لازمە، لە اوەلی شەو بنوون، بە قومار و لهو وغەیبەت و نمیمی و تیاترۆ و سفاهەت مشغوڵ نابن، ئەنوون، تێر خەو ئەبن، پێشی بەیان هەڵئەستن بە دەست نوێژی خاوێن ڕوو ئەکەنە خوا، فریضەی خۆیان زوو بەجێ ئەهێنن، ئەوجا بە مصاڵحی دنیا خەریک ئەبن.

جەنابی حەق لە ئایاتی هەر دوو کتاب بۆ اولو الالباب، ئایاتی بیّناتی لەسەر وحدانیەتی خۆی داناوە بە نەوعێ، کە بزاندرێ ئەدنی شەبە نیە لە بەینی خواو موجودات، فەضل لە تشابە امتیازی ذاتیە، قابلی تلبس و اشتباە نیە، ئەمەش شهادەتێکی فوقی شهادەتی لسانیە. کەسێ تەماشای ئەو ئایاتە بکا، (زیغ)ی لەدڵا نەبێ، بە تصدیقی جازم و ثابت لە

عمقی دڵەوە ئەڵێ:

﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾ اصولی کائناتی محکمە مولداتی متشابهاتی ڕەبطی قاعدە کردوە، قواعدی لا یتغیرە، طبیعەتی مسخرە. حاصڵی خوا مدبرە، خوایتر نابێ، وە الاّ (الە) ئەبێ بە متعدد، داخلی طبیعیات ئەبێ بەغەیری ئەو، کەس (الە) نییە، هەرچی هەیە مخلوقە وەکی سائری مخلوقاتی تر ﴿وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ﴾ ئەوانیش شاهدن لەسەر وحدانیەتی ئیلاهی، هەر کەسێ هاتبێ وەحی بۆ ڕسلی بەشەر هێنابێ، لە تەرەف خوایەکی واحد هاتووە، ئەگەر خوای تر هەبا مەلەکیکی دەهەنارد بۆ دەعوەت، ئەلای خۆی نە کەس هەناردوویەتی نەکەس هاتووە ﴿وَأُوْلُواْ ٱلۡعِلۡمِ﴾ ئەوانی (راسخ فی العلم)ن لەو زومرەیەن، ڕسلی کرام مطلعن لەسەر ئەسراری کائنات جهەتی وەحدەتو تشابە لە جهەتی کثرەت و تخالف فەرق ئەکەن.. متشابهات ڕبط ئەکەن بە محکمات، جێی شکوک و شبهات نایێڵن. شەهادەتی هەر سێ لە یەک تەرزە، تحریریە.. تقریریە.. تصویریە.. ئیرشادە.. امتیازی شهادەتی ئیلاهی بە خەلقو ئیجادە، جەنابی حەق لە ئەدای شهادە بۆ شرح و ایضاحە ﴿قَآئِمَۢا بِٱلۡقِسۡطِۚ﴾ وەظیفەی عدالەت، کە حەقی وایە بەجێی ئەگەیێنێ. ئەوانی عاقڵ و متدبرن، قووەی انتباهیان هەیە، فەرق و تمییز ئەکەن بۆ خاتری تێگەیاندنی ناقص العقلان، ئەوانی مغلوبی (حب الشهوات)ن تێبگەن، کە جەبری ئەو نقصانەیان بۆ ببێ.

پەروەردگاری معدلەت کردار، بەو نەوعە ئەدای شهادەتیان بۆ ئەکا و، کذلک ملائکەی علمای ڕاسخ (اقتداءً بالالە العادل قائمین بالقسط بلا زیغ) و بێ مەیل ئەدای شەهادەت ئەکەن ، دیارە لەم شهادە، (قیام بالقسط) ئەبێ، بۆ ئەوانیش ببێ، نەک خاص بێ بە جەنابی حەق، بەڵکوو (قیام بالقسط)ی شاهدە لەسەر قیام بالقسطی ئەمان. ئەمەندە هەیە ئەو متبوعە، ئەمان تابعن، لێرە متبوع مغنایە لە تابع.

﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١٨﴾ ئەوە ئیشارەیە بۆ دەلیلی علی وجه الخلاصەیە، هەرئەوە قادری مطلق، غالب لەسەر طبیعەت. عالم بە ئەسراری خەلق و ئیجاد، واضعی هەر شتە لە موضعی لائق بە خۆی، تنظیم و ترتیبی کائنات بدا بەو وەجهە بدیعە، ملائکەی ذوی الاقتدار، علمای اولو الابصار، هەموویان عیلم و قودرەتیان محدودە، وەکو حکما ئەفەرموون: قووای جسمانی ئەگەرچی (فلک الافلاک) بێ، متناهی یە[1] .

﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ﴾ دینی فیطریی لای فاطر، بە دین حسابە، دینی عقڵیە، دینی معدل حکمتی طبیعیە، نظمی کائناتە، ئایاتی وەک ئایات، محکم متشابهاتە، دینی حریەتی فیکر و طهارەتی قلب و نظافەتی بەدەن و صلاحی عمل و تێکوشینە، دینی بێمەیل و محابایە، مایەی سعادەتی دنیا و عقبایە، ڕوحی حەیاتی مدنیەتە، اکسیری حماسەت و غیرەتە، دینی سلامە، بەڵام نە بە حیزی، دینی سیاسەتە، ئەمما نەوەک سیاسەتی ئینگلیزی، فیتنە ئەنگێزی.

من لە ئەحواڵی (امم) ئەفکرم.. گەلێ جار ئەڵێم، حەقی بەشەر وایە ببنە دوو قسم: موسڵمان و طبیعیون. باقی گشتی، فەن و فێڵە و حق الانصاف بە سەهلی ئەتوانێ ئینسان هەم طبیعی بێ، هەم موسڵمان بێ.. منافرە لە بەینی شەریعەت و طبیعەت نییە، بەڵکو و لدی التقدیر غایەت موافقن. ئەو ئایاتی کائنات، کە خوای پێئەناسین، لە عەینی ئایات ئەتوانین استفادەی دنیەوی لێبکەین.

خولاصە واضعی دینی ئیسلام و خالقی انام یەکە، قواعدیشیان یەکە، مدرکی احکامی (کونین) و، فارقی (بین المتشابهات) و، ناظمی متباینات، عقڵە.

علمای ئیسلام، نەدەبا عداوەت بخەنە بەینی دین و عقڵ و طبیعەت. بەڵام

---

(١) وەکو حکما ئەڵێن«لا تعطل في الوجود كذلك لا تعطل في الاسلام»

ئەوانیش مع الأسف، وەک علمای ئیسرائیلی ئەمانەیان کەم و زۆر لەیەک کردە دوژمن.

﴿وَمَا ٱخۡتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ گشتیان، هەتا ئێمەش لە پاش ئەو هەموو مواعظ وعبری قورئانی، تووشی اختلافی بووین لە ئی ئەوان خرابتر.

﴿إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُ﴾ الاّ دوای ئەوە، کە عیلمیان بۆهات. ئایاتی کتاب ئەوەندە (بیّن) بوو، ئەو عیلمەی لێ وەرئەگیرا، وەک بدیهیات خۆی ئەهات، حاجەت نەبوو بە مشقەتی فیکر و ترتیبی مقدمات، کەوابێ اختلافیان لەبەر وجهی نظری نەبوو، تا وەکو علمای ڕاسخ لە مصادماتی افکاریان بارقەی حقیقەت دەرکەوێ. بەڵکو ﴿بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۗ﴾ صرف لەبەر بغض و حسد و تجاوز لە حەد لەبەینی خۆیان. ﴿وَمَن يَكۡفُرۡ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ ئەوەی ئیمانی پێنەهێنێ، یا بە واسطەی ئایاتی خوا، ئەگەر وەجهێکی تەشابهی تیا دوای بکەوێ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ١٩﴾ هەرچەند حساب زۆر بێ و، ورد بێ لێی بزر نابێ ﴿فَإِنۡ حَآجُّوكَ﴾ خاصة بە متشابهات لە پاش اظهاری سرری متشابە، جێی مجادلە و محاجە نامینێ، الاّ لە صورەتی عناد ﴿فَقُلۡ أَسۡلَمۡتُ وَجۡهِيَ لِلَّهِ﴾ قلباً وقالباً خۆم منقاد و مخلص کردوە بۆ خودای تعالی، (زیغ)م لە دڵدا نىیە، مەیلی (الی غیرە) ناکەم. ﴿وَمَنِ ٱتَّبَعَنِۗ﴾ ئەوانیش ڕوویان کردۆتە خودا بە گویرەی دینی حنیفی ابراهیم، دەعوەتی خلیلە خوا بۆ ئێمەی قبوول کردیە ﴿وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ لە یهود و نصاری ﴿وَٱلۡأُمِّيِّـۧنَ﴾ لە عەرەب و کورد ﴿ءَأَسۡلَمۡتُمۡۚ﴾ وەکو ئێمە ﴿فَإِنۡ أَسۡلَمُواْ﴾ بە تەواوی بێ زیغ و مەیلی ئەم و ئەو ﴿فَقَدِ ٱهۡتَدَواْۖ﴾ بەڕاستی پاش ئەو اهتدایە، کفر و ضلال بۆ ئەوان لە مقولەی (مستحیلات) ئەبێ،

دڵیان بە مەیلی فاسد ژەنگدار نابێ. ﴿وَإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلَاغُ﴾ تبلیغ لەسەر تۆ، وە هیدایەتی قلبی عائدی خوایە، ئەگەر قابلیەتێکیان هەبێ لە فەیضی خۆی، محرومیان ناکا. ذاتاً اول و آخر وظیفەی (رسالەت پەناە) دەعوەتە، چونکی حوکمی ئیلاهی پێگەیشت وا ڕەفتار ئەکا، سیطرەی قەلبی عائدی ئەو نییە. ﴿وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ ﴿٢٠﴾﴾ حقیقەتی قابلیەتیان هەر ئەو ئەیزانێ «ان الذین کفروا سواء علیهم اانذرتهم ام لم تنذرهم لا یؤمنون» وەک تێپەڕی لە سوڕەتی (بقرة)، کەوابێ ئەو حوکمە مقررە بە تۆپی هاون، بە بۆمبا ازالە ناکرێ، فضل لە شیروتیر.

﴿ إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ ﴾ بە دەوام و استمرار انفکاکیان لەیەک نابێ ﴿وَيَقْتُلُونَ النَّبِيِّينَ ﴾ کانە بغضی نبووەت لە دڵیان قەرار گیر بووە، هەر پێغەمبەرێ دەسەڵاتیان بەسەردا بشکێ، دەیکوژن، کبریان مانعە لە قبووڵی حەق، بێ ادنی حەق قصدی کوشتنی پێغەمبەران ئەکەن.. وانییە لەبەر شخصی تۆ بێ! ﴿بِغَيْرِ حَقٍّ وَيَقْتُلُونَ الَّذِينَ يَأْمُرُونَ بِالْقِسْطِ مِنَ النَّاسِ ﴾ دیارە هەر کەیفیان بە عدل و حەق نایێ، وە الاّ بۆ قصدی کوشتنی ئەوان کەسانە ئەکەن، کە ئەمر ئەکەن بە عدالەت، لە انسانان هەر کەس بێ ئەگەر چی لە خۆشیان بێ. «قتل» لێرە بە معنا «قتال» غایەت جوانە، موافقە معنی لەگەڵ قرائەتی «حمزە» و «یقاتلون»، یەعنی شەرر لەگەڵ پێغەمبەران ئەکەن بە قصدی قتل، وە لەگەڵ ئەوانەی ئەمر بە چاکە ئەکەن.

﴿فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢١﴾﴾ بەشارەت و موژدەیان بدەیە بە عذابی زۆر بە ئێش. دیارە کەیفیان بە عذاب دێ، بۆیێ سعی لە اسبابی موجبەی.

یا بەشارەتیان بدەیە بە مغلوبی و منکوبی شەرر بکەن، ژێر ئەکەون لە دەرەجەی کبرو انانیەت، ئەکەونە دەرەکی ئەسارەت. ﴿ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ

حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ ﴾ هەرچی کردیان بۆعداوەت و عنادی لەگەڵ تۆ، بۆ کوشتنی حسی و معنویەت بە خۆڕایی چوو ﴿فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْأٓخِرَةِ﴾ نە لە دونیا کەڵکی گرتن«لله المنة»، ڕۆژ بە ڕۆژ دینی ئیسلام لە تعالیی دایە، شەوکەتی زیاد ئەبێ، دوژمنان مغلوب ئەکا، لە قیامەتیش دیارە مایە پووچن ﴿وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٢﴾﴾ نەلە دنیا و نەلە ئاخرت، ئەوانەی بە تەمایان بوون لە هەر دووجیهان بون دەرچوون. فدیە و اخووەت و شفاعەت نییە، بە امێدی ئەوانیش خۆیان محروم کرد، لە ئیمان و لە عملی چاکە.

﴿أَلَمْ تَرَ﴾ ئەی حەضرەتی ڕەسول ﴿إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ﴾ نابینی ئەمانەی، کە (حظ) و بەشێکیان دراوەتێ لە کتاب، کە تەوراتە ئەمما انجیل هیچ، ئەو لە زەمانی (عیسی) تدوین نەکرا و پاشان هەرکەسە بە زوبانی ئەو، ئەوی بە خاطری داهات نووسی، ناوی لێنا انجیل و احتمال هەیە بعضە آیاتیان لەفیکر بووبێ، کەوابێ ئەویش ارادە بکرێ زەرەر نییە ﴿يُدْعَوْنَ﴾ لە تەرەف خوای پێغەمبەری خوای ﴿إِلَىٰ كِتَٰبِ ٱللَّهِ﴾ بانگ ئەکرێن بۆ کتابی خوا، کە قورئانی کریمە و کتابی حکیمە ﴿لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ﴾ ئیمانی پێ بێنن، حوکمی لە بەینی خۆتان پێبکەن، حەق و باطڵی پێ جوایز بکەنەوە ﴿ثُمَّ﴾ لەپاش ئەو دەعوەتە ﴿يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ﴾ اعراض ئەنێن، ڕوو وەر ئەگێڕن، طبعاً هەموو نا.. کەمێ موسڵمان بوون اطاعەیان کرد﴿وَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾﴾ ئەو فرقە خۆیانە، شێوەیانە اعراض لە حەق نان.

﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەمە بۆچ؟ ﴿بِأَنَّهُمْ﴾ بە سەبەب ئەوە، کە ئەوان﴿قَالُوا۟﴾ گوتیان وەک باوو باپیرانیان ﴿لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَٰتٍ﴾ ئاگر سەهلە، تحملی ئاسانە.. (شعب الله)ن، هەرچی بیکەن لای خودا معفون. ﴿وَغَرَّهُمْ فِي دِينِهِم﴾

مغروری کردبوون، هەڵی خەڵە تاندبوون لە دینی خۆیان ﴿مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ ﴿٢٤﴾﴾ ئەوی لە سالفی ایام بە افترا ئەیان گوت: ئێمە ابناءاللەین أحبّای ئەوین، لە ذریاتی پێغەمبەرانین، خودا وەعدی لەگەڵ یعقوب دایە، ابنای ئەو عذاب نەدا (الا تحله القسم)، ئەو افترایە بە شیددەتتر هاتە ناو دینی ئیسلامی. گەلێکی ماڵوێران کرد، لە سەعی محروم بوون، تێنەکۆشین، پەکیان بە سیّئات نەکەوت، بوونە حجارەی وقوودی نار﴿ فَكَيْفَ ﴾ حاڵیان چۆن ئەبێ ﴿إِذَا جَمَعْنَٰهُمْ لِيَوْمٍ ﴾ لە ڕۆژێ گرد بوونەوە ﴿لَّا رَيْبَ فِيهِ ﴾، کە گومان نیە لە بوونی، نەلەوەی تێیدا دەبێ ﴿وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ ﴾ لە انبیاو ذراری انبیای اسرائیلی و اسماعیلی..

﴿وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٥﴾﴾ بە تەواوی جزا وەرئەگرن، بەشارەتیان بدەیێ، لەو مغرورانە ذەرەییک ظلم ناکرێ، ئەوەی سەعیان بۆ ئەکرد لە عذاب و عقاب، بە تەواوی ئەیان درێتێ، وقتاً کە لە ئایاتی پێشوو معلووم بوو، حرمان لە نیعمەتی ئیمان دوو سببی هەیە:

١- حبی مزخرف شهواتی نفسیەی بهیمییە.

٢- غرور بە افترائیات بە مفتریاتی دینی اتباعی متشابهات، بە وەجهی تشابە تخصیصی سلطنت و نبووەت، بە شەعبێک بۆ ابطالی و افکاری فاسدە و اظهاری حقی صریح ئەفەرموێ: ﴿ قُلِ ﴾ یا ڕەسوڵی هادی بڵێ: ﴿ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلْمُلْكِ ﴾ ئەی خواوەندی ملک و ملکوت و، ئەی خاوەنی لاهوتو ناسوت و ئەی مدبرّی امور، ئەی واهبی مواهبی مکتسب و مفطور ﴿تُؤْتِى ٱلْمُلْكَ مَن تَشَآءُ ﴾ تۆ عطا ئەکەی مڵکی مادی و معنوی، سلطەنەتی حسی و ڕوحی بە کەسێ خۆت حەزبکەی، خاوەندێکی پەروەردگاری لە ئیش و کاری خۆت مختاری، مطلق التصرفی، بە اختیار مقدسی، لە قیدو بەند و حجر و

انحصار و اجبار. ﴿وَتَنزِعُ ٱلۡمُلۡكَ مِمَّن تَشَآءُ﴾ دادەرِرنی موڵک و سلطەنەت، عیزەت و عظمەتی مادی و معنوی، حسی و ڕوحی لە کەسێک خۆت ئارەزوو بفەرمووی، خانەدانێ ئەکەیتە محتاجی نانێ، گاوانێ ئەکەیتە محتاجی سفرەو خوانێ، شاهێ ئەخەیتە چاهێ، نەفەرێ ئەبەیە سەر ئەورنگی خسروی، ئەی کەی بە پادشاهی صاحب دەست و جاهێ.

﴿وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُۖ﴾ لە دین و دنیا، ئەوی ئارەزوو بکەی زەلیل بێ، عەزیزی ئەکەی، عەزیز بێ، زەلیلی ئەکەی، عیزەت و زیللەت لازمەی شەخصێ (دونَ) شەخصێ، قەومێ دونە قەومێ نییە ﴿بِيَدِكَ ٱلۡخَيۡرُۖ﴾ چاکە بە دەست تووە، ئەوی بیکەی ئەیکەی لە جیهەتی چاکە. کەسێ بێ لە سلالەی خلفا بێ، کە بالذات لیاقەتی نەبێ بۆ گاوانیی باشە. نەفەرێکی لایق و زەکی و ماهر، آزاو بە علم و ادراک، مدبر سیاسی لایقی دەیهەمی خسرویيە، ئەگەرچی لە شوانان بێ، بۆیێ نافەرموێ«والشر» تاریخ ئەو نەوعە تقلباتەی زۆر دیوە، خاصة ئێمە لە ظرفی هەشت نۆ سال انقلاباتێکمان دیت، محیر العقول. چەند پادشاه و شاهو امپراطۆر موڵکیان لێ داررندرا و دەربەدەرکران. چەند حکوومەت شکڵی ئیدارەیان گۆررا، چەند خانەدانی قدیمی موڵک و سلطەنەت، ئاوارەی دار و دیار بوون، کە نەدەهاتە خەیاڵ و تەخمین.

﴿إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٢٦﴾ بەڵام ئەوەی بیکا، الاّ جهەتی خێری تێدا ڕعایەت ئەفەرموێ، چونکە هەم قدیرە و هەم حکیمە. ئەو تقلباتە غریبە وانییە هەر لەجیهەت موڵک بێ، لە زەمانیشدا هەیە. ﴿تُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَتُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِۖ﴾ شەو ئەهاوێیە ناو ڕۆژ، هەمووی. یا بعضێک.. کەم یا زۆر. وە ڕۆژ ئەخەیتە ناو شەو، بەو نەوعە تساوی شەوو ڕۆژ (علی التحقیق) نادرە و، ظاهراً ئەبێ، کە شمس بکەوێتە سەری بەهار و سەری

پاین، کەلەو دوو نقطەی لادا، درێژی شەو و ڕۆژ ئەگۆڕرێن، تا مملکەت لە (استوا) نزیکتر بێ، اختلافیان بە مدە کەمترە، تا بە لای قطبەوە بێ، چ شمالی چ جنووبی، اختلاف زۆرترە، لە اواخری اقالیم نظام تەواو ئەگۆڕرێ، تاکو شەو و ڕۆژێکیان ئەبێتە ساڵێکی ئێمە. لە نصفێ ڕۆژ ئەکەوێتە ناوشەو، لە نصفێک شەو ئەکەوێتە ناو ڕۆژ. ئەو احواڵی لە وەضعی ئەرز و ڕۆژ پەیا ئەبێ، عیلمی هیئەت بە تفصیلات بۆ ئەو احوالاتە کافلە، ئەگەر کەسێ هیلمی هەیئەت کەمێ، بزانێ لەو ڕێگەیە تووشی کفریات نابێ، ئەزانێ ئەو وەضعو ئەساسە لە تەرەف خوایە، کاری (عیسی و علی) نییە.. ناتوانم بڵێم (عیسی) بە تەواوی عیلمی هەیئەتی زانیبێ، احاطەی بە احواڵی ئەرز دابێ. من دوای قەومی خۆم، کە کوردە تاسف بۆ یۆنان لە هەموو میللەت زیاتر ئەکەم، ئەو علومانە لە ئەوانە، حکمای یۆنان منبعیانە.. چۆن دەستیان لەو حکمیاتە هەڵگرت بوون بە (عیسەوی)، (حقیقةً) جێی تعجبە قەومی کوردیش پاش ئەو هەموو عیلمە، کە لە کوردستاندا بوو، چۆن وا زوو بە تەریق و مەریق گۆڕران، خولیای کراماتیان کەوتە سەر، عیلمیان لا مبغوض بوو، تووشی ئەو جهالەتە هاتن، نەک هەر عوامیان، بەڵکوو ئەوانەی لای ئەوان لە أخصی خواصن. نهایەت سەری کێشا بۆ ئەمڕۆ، کە لە سایەی طریقی نقشبندی فضل لە عیلم، شجاعەت، سخاوەت، غیرەت، کە لە مزایای کوردان بوو لایان نەما «انا لله وانا الیه راجعون»ئەو تقلباتە نەک لە زەمان و مکان، بەڵکوو لە عالەمی حیاتیش دا هەیە..

﴿وَتُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ﴾ زیندی لە مردی ئەهێنییە دەر﴿وَتُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ﴾ بالعکس.. یەکەمیان وەک ایلاجی لیلە لە نهار، کە ڕۆژ وەقتی حرکاتە، دووەمیان مقابلی ایلاجی نهارە لە لیل، چونکە شەو وەختی ئارامو سکونە.. ئەو زیندی و مردییە عیبارەتە لەچی؟ احتمالاتی زۆرە، هەمووشی

جوانە.. حیوان لە نطفەیە و نطفە لە حیوان، نبات لە حبە و حبە لە نبات، دار لە ناوک و، ناوک لە دار، جاهل لە عالم و، عالم لە جاهل، پاک لە پیس و، پیس لە پاک، صالّح لە فاسق و، فاسق لە صالّح، کافر لە مؤمن و، مؤمن لە کافر، زیرەک لە نازیرەک و، نازیرەک لە زیرەک. کەس نەڵێ ئەو زاتە مادام پێغەمبەرە، ئەبێ لە پێغەمبەران، یا لە چاکان بێ، ئەوی اولادی ئەوە، ئەبێ پێغەمبەربێ علی الاقل، ئەبێ چا بێ. ئەوە خانەدانی سلطنەتە، هەرئەبێ ئەو پادشاە بێ. ئەوە کوررە جوتیار، ئەبێ هەر جوتیار بێ؟! خوا ئەزانێ بعضە اولادی خانەدانان هەیە، لەهەموو خصوصێ لە بنەڵۆکی دۆمان هیچ ترە.. ئەوانی منسوبی خانەدانی نبووەتن، جەنابی فاطر چ مزیەتی فیطری نەدانێ، تابڵێین لای خودا ممتازن! ئیتر خیاڵاتی ئەو حەشیشە کێشانە، لای خوا قیمەتی نییە، قیمەتی ئینسان عەقڵە، عیلمە، تقوایە، اعمالی چاکەیە، اخلاقی فاضلەیە، ئەوەندە بۆ فهمی مقصد کافییە حەیات چییە؟ حقیقەتی نازاندرێ، بەڵام آثاری (ذی الحیاة) معلومە، حرکەی زیندی لەگەڵ حرکەی جماد جیاوازە... حەیات مەنشەئی لە چییە؟ لە ئەرز پەیا بووە، یا لە ئاسمان بۆی هاتووە؟ مادەی حیوی لە مادەی غیرە حیوی نشات ئەکا، یان نا؟ علمای طبیعەت قسەیان زۆرە، حقیقەتی حاڵ بە علم بۆیان کەشف نەبووە و، کەشف نابێ.

بەوە ڕازی نین، کە حەیات لە ما فوق الطبیعة بۆ عالەمی طبیعەت هاتووە، بەڵام ئەو ئایەتە باسیان ئەداتێ، ناعیلاج چارە نییە، ئەبێ بەدڵ بڵێین اخراجی مادەی (حی) لە مادەی (میت)، مادەی میت لە مادەی حی عائدی حەزرەتی کبریایە و، ممکنە بڵێین مەعنای اخراجی حی لە میت، میت لە حی فەرق و تمییزیانە لەیەک، جسمی هەموو احیا (لە نباتات و حیوانات و انسان_ ڕاقی و غیر ڕاقی_) مرکبە لە دوو مادە، مادەی حیوی، مادەی غیرە حیوی ئەو تۆیە وردە وردە، ئەو نطفە، کە لە حیواناتی غایەت گچکە تکوّن ئەکا، هەردوو مادەی تیایە، فەرقیان لە یەکتر، یاخود ترکیبی هیکل

لە مادەی غیر حیوی، ترتیبی وضعی مادەی حیوی لە نێوی بە غیری (علاّم الغیوب و حیّ وقیوم) ناکرێ، کەسێ نەختێ لە علومی طبیعەت بزانی، ئەزانێ طبیعەت بەغەیری قادری مطلق بۆ احدێک ڕام نابێ، ئەوجا لە هەموو کفریاتێ، کە هاتیتە ناو ادیانی ئیلاهی محفوظ ئەبێ.

هەربژی علم، هەر بمرێ جەهل، هەربژی ئیمان، هەر بمرێ کفر.

﴿وَتَرْزُقُ مَن تَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٢٧﴾﴾ نیعەم و مواهبی ئیلاهی، نەفسی و ڕوحی، بدنی و عقلّی، داخلی حسابی ئێوە نییە، فاطری حی و قیوم خۆی ئەیزانێ. علماً و عملاً، عائدی رب العالمینە، نە نبووەت، نە ملک و سلطەنەت، نە علم و فضیلەت بە شعبێک، بە طائفەیێک، بە خانەدانێک اختصاصی نییە، خالقی گشتە «خلق لکم ما فی الارض جمیعا» یەکێ ئەڵێ: «اختار الاسرائیلی»، یەکێ ئەڵێ: «اختار العرب»، یەکێ ئەڵێ: «اختار بریطانیا العظمی»! یەکێ ئەڵێ: اختار بنی الزهراء وهکذا.. گشتی بێ ئەصل و ئەساسە... سیاسەتە.. هەتا مع الأسف ئەمڕۆ دینیش بویتە مدارێکی سیاسی، وە وەسیلەی استیلایە..

﴿لَّا يَتَّخِذِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ﴾ ئەوانی ئەهلی ئیمانن، ئەو کافرانەی بێ عەقڵ و عرفان، نەگرن بە دەست، ڕفاقەتیان نەکەن.. ڕەفاقەت زۆر بە تاثیرە، خاصة ئەوانەی، کە بە دین مغرور بووین.. بە افتراءات خەڵەتاون، ئێوەش دەچنە سەر فیکری ئەوان، خووی ئەوان ئەگرن مە لێن ئەهلی کتابن، ئەمانە محرفن مغیرن، منفری ئیمانن ﴿مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ بە ڕەفاقەتی وان تجاوز لە ئیمانداران مەکەن، هەرچی هەبێ هەر ئەهلی ئیمان چاترن، خۆ بە خۆیی دۆست بن، متحدی فکر و عمل بن، لە مصالحی یەکتری سەعی بکەن. ﴿وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ﴾ ئەوەی ئەوە بکا، یەعنی دۆست لە کافران بگرێ، پشت لە ئیمانداران بکا.. بەدڵ بیانگرێ بە دۆست ﴿فَلَيْسَ

﴿مِنَ ٱللَّهِ فِي شَيْءٍ﴾ لە تەرەف جەنابی حەق لە هیچ دا نییە خارجی دینە، خارجی ولایەت و محبەتی خوایە، بالکلیە علاقەی لەگەڵ خوا نییە، حقیقة ئێمە ئەوەمان دیت.. قسمێک محبی فرنسە بوون، قسمێ بریطانی، قسمێ المانی، جزاشمان دیت. انقطاعمان لە یەک، بوو پارچە پارچە بووین، کەوتینە استعمار و استعباد و، لە تواریخی مختلفە، موسڵمانانی خلافی ئەو ئایەتە ڕەفتاریان کرد، سەبەب بە عداوەتی یەک، لەگەڵ بێگانان دۆستایەتیان کرد، هەردوو لا ماڵ وێران بوون، موڵک و سلطەنەتیان ڕۆیی، لە عزیزییەوە زەلیل بوون.. تعجب ئەمەیە، (خەلەف) بە احوالتی (سەلەف) عبرەتی نەگرت.. بقیەی باقیە بەو ڕێگەوە ڕۆیشتن، ئەوانیش تووش بوون ﴿إِلَّآ أَن تَتَّقُواْ مِنْهُمْ تُقَىٰةً﴾ خۆتانیان لێبپارێزن بە پارازتنی ئاگادارانە. ظاهراً دۆست بن، محبەتیان نەیێتە دڵتان، بڕواییان پێ نەکەن، اعتمادیان نەدەنە سەر. تقیەی مەردانە و محترسانە، نەک تقیەی ترسنۆکانە. ئەو نەوعە تقیە و خۆپاراستنە، لە زەمانی عیززەت و عظمەت چاترە، لە زەمانی زیللەت و مسکنەت. ئەمڕۆ تەماشا بکەن! دەوڵەتێ لە هەموو دەوڵەتان گەورەترە، لە گشتیان بە تقیە و پارێزترە، بەڵام مع‌الأسف بعضە دەماری حیز، ئەو تقیەشیان بە فساد دا. ﴿وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ﴾ جەنابی کبریائی ئێوە ئەترسێنی لە خۆی. خۆتان بە ئیمانی فرۆشت بە انتساب بۆ ئەم و ئەو، هەڵمەخەڵەتێنن، بە ظاهری نیسبەت، دەرگەی تحقیق و تدقیق وفکرو نظر مەبەستن. بەناوی دین لەگەڵ یەک عداوەت مەکەن، خولاصە، خۆتان بە هەواو هەوەسو، میولی فاسدە لە خوا مەکەن. ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٢٨﴾﴾ مرجعتان بۆ لای خودایە، پشت و پەناهتان نییە، دۆستێ کە تەرکی جیهەتی خواو خۆتانی تیابێ، بە کەڵکتان نایێ ﴿قُلْ إِن تُخْفُواْ مَا فِي صُدُورِكُمْ﴾ ئەوەی لە دڵتان چەسپیوە، لەسینەتان ئەگەر بزری بکەن و،

ئەثەری بەدەر نەخەن لە ترسی آبڕووو چوون ﴿أَوۡ تُبۡدُوهُ يَعۡلَمۡهُ ٱللَّهُۗ﴾ خوا ئەیزانێ، لەو بزر نابێ، با لە خەڵکیشی بزرکەن، لە خوا بزر نابێ لە ڕۆژی ڕجوع، ڕجوعو پەشیمانی بێهوودەیە.

انكار قابل نییە، جەزا محققە، قابلی نەسخ نییە ﴿وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ﴾ ئیلاهێ ئەو عیلمە محیطەی هەبێ، چۆن (ما فی الضمیر)ی ئێوەی لێ بزر ئەبێ؟. ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٢٩﴾ لە ڕاستیدا عیلمی بێ قودرەت هیچ نییە.. عیلمی نظری بە قووەت، تا نەیێتە ژێر(عەمەل) ، بە هیچ حسابە و، قودرەت خۆی قووەتێکە بە عیلمی عملی داخلی انتظام بووبێ، ئەگەر قووەت تنظیم نەکرێ، خۆڕرایی ئەڕوا، بەڵکوو عالەم بەرباد ئەکا.. عیلم و قودرەتی خوای، لە صفاتی ثابتە و مقررەن ناگۆڕرێن، بەلاّم لە دنیا احتمالی دەغدەغە و (تردد) هەیە لە شمولی عیلم و قودرەتی، بەڵکوو گەلێ لە ئەهلی عیلم ئەڵێن: جەنابی حەق عیلمی بە جزئیات نییە، کە عیلم نەبوو، قودرەت هیچ، بەلاّم ڕۆژی قیامەت شک و شوبهە نامێنێ ﴿يَوۡمَ تَجِدُ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا عَمِلَتۡ مِنۡ خَيۡرٖ مُّحۡضَرٗا﴾ هەر کەس هەر خێرێکی کردبێ، ئەی بینێ حازر کراوە، ئەو ڕۆژە عمومی علم و قودرەتی ئیلاهی، عەیان ئەبێ لایان، زۆریان کەیف پێ دێ﴿وَمَا عَمِلَتۡ مِن سُوٓءٖ﴾ خراپەش محضرە، بەلاّم هیچ خەڵکی لەگەڵ نییە، حەزئەکا گوم بێ، دەفن کرێ..

﴿تَوَدُّ لَوۡ أَنَّ بَيۡنَهَا وَبَيۡنَهُۥٓ﴾ حەزئەکا، کە لە بەینی وی و ئەوی ﴿أَمَدَۢا بَعِيدٗاۗ﴾ زەمانی دوور دووری غیرە محدود هەبا، قەت نەی کردبا، نەگەیشتبانە یەک. تکرار ئەفەرموێ: ﴿وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفۡسَهُۥۗ﴾ بە امانی و بە شفعاء، ئیمانی خۆتان ضعیف مەکەن، لە موالاتی اجانب، لە اعمالی سیئە خۆ بپارێزن. ئەتان ترسێنێ لەخۆی، ئەوەشی لە ڕووی لطف و مەرحەمەتە،

کەیفی بە عەذاب دانی عباد نایێ..

﴿وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ ٣٠﴾ جەنابی کبریائی دەرحەق بە هەموو عباد لە غایەتی ڕەحمەتە، کەسێ خۆی محروم نەکا لە علاقەی خۆی لەگەڵ خوا نەبرری، لەو ڕەحمەتە واسعە بێ پایانە بێ بەش نابی ﴿قُلۡ﴾ یا ڕەسولی هادی! بڵێ بە کافەی عباد: ﴿إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ﴾ ئەگەر ئێوە محبەتی خواتان هەیە، ئیمانتان لەگەڵ خۆشەویستی‌یە؟ ﴿فَٱتَّبِعُونِي﴾دوای من بکەون، ئەوی من پێتان ئەڵێم لە اعتقادیات و عملیات قبووڵی بکەن و بیکەن، دوای خائنان مەکەون، وە بۆ اجانب لەگەڵ یەک ببن بە دوژمن. ﴿يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ﴾ خوای تعالی ئێوەی خۆش ئەوێ، چونکە حبیبی خودا بە حەق و حقیقەت، دەعوەتی ئێوە ئەکا، بۆ خودا ظاهر و باطن ڕووتان لەو بێ، بێ غلّ و غەش و شائبەی شرک، خوائیکی ڕەحمان و ڕەحیم، خوداوەندی ڕۆژی جزا عزیز حکیم، غفور ڕوؤف و عظیم و واحد و احد و بێ (ند) و ضد و بێ کورر و غفّار الذنوب و ستّار العیوب و علاّم الغیوب، ئاگاداری سرر و نیهان، حی و قیوم، بێ خەو و بۆرژان، منزل الکتب، مرسل الرسل هادی الکل، پەیدا کنندەی انام، مصور ما فی الارحام، خبیر و بصیر، ئاگاداری ما فی الضمیر.. ڕەسولێکی بێ فەرق و جوایزی، بێ مەیل و محابا، اهم مقاصدی نجاتی بەشەرە، لە تاریکی جەهل و شکوک واوهام، حفظی شەرەفی بەشەرە لە خسەتی عبوودیەت، حیوانات و اجرام، حفظی مقامی الوهیەتە لە ادنی دنائەتێ، کە بۆ اعلی مراتبی عالەم امکان هەیە، حفظی نبووەتە لە شائبەی درۆ و افترا و تفریق. حاصڵی ڕەسولێکە، کە کلی‌شت حەقی خۆی ئەداتێ، هەموو جنس لە جن و مەلەک و انس، حدّی خۆی بۆ دادەنێ. احدی لە کائنات لە عالەمی ممکنات و طبیعیات، ناکاتە فوق الطبیعة، الحاقی ناکا بە مقامی الوهیەت. پەروەردگاری عالەم (بوجه من الوجوه) نامێنێتە ڕیزەی

ممکنات. امتیازی بۆ خۆی دانانێ، خۆی بە عبدی خوا، بە یەکێ لە آحادی نوممەت ئەزانێ.. عطالەت و بطالەت و جهالەت و ضلالەت لە دینی ئەو دانی‌یە، ڕوحی ئایینی ئەو اخلاصە و محبەتی خودایە، بێشک ئەوی اتباعی ئەو پێغەمبەرە بکا، بە دڵ و جان خوای خۆش ئەوێ، خواش ئەوی خۆش ئەوێ ﴿وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۚ﴾ ئەو متابعەی کردبێ توش نایێ، ئەوی بیکا گوناهی سابقی عفو ئەکرێ ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٣١﴾ دەربارەی ئەوانی خۆیان خۆشەویست ئەکەن لای خوا، بە متابعەی ڕەسول محبەتی ﴿قُلۡ﴾ بلّێ: بۆ دەفعی ادنی توهمی لە ئەمر بە اتباع ﴿أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَۖ﴾ بەجهەتی ڕسالەت، نەک ترسی شەخصی، ذاتاً شخصیەت لای حبیبی خودا نی‌یە ﴿فَإِن تَوَلَّوۡاْ﴾ ئەگەر اطاعەی خوا و پێغەمبەریان نەکرد، دیارە غەیری عناد و مەیلی فەساد، چ معذرەتیان نی‌یە، بالکلیة حەق بزر ئەکەن. ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٢﴾ پاش زەمانی نبووەت، ئەگەر موسڵمان پەیڕەوی ڕەسولی خوایان کردبایە، نەدەبوونە مبغوضی خودا، ڕەزالەتی ئەمڕۆیان، تا ئەبەد نەئەدیت. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ﴾ خوداوەندی (حیّ وقیوم ومصوّر، مالک الملک معز ومذل ومخرج الحيّ من الميت والميت من الحيّ) ﴿ٱصۡطَفَىٰٓ ءَادَمَ﴾ لە خاکی مردووی خەلق کرد، بووە ابو البشر، پیاو چاک و فاجر، مؤمن و کافر لە اولادی ئەو پەیا بوون، ﴿وَنُوحٗا﴾ ئەویش باوکی بەشەری دووەمە، لە مردوو اخراج کردیە و، مردوویشی لێ اخراج کرایە. ﴿وَءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ﴾ ئەویش باوکی سێیەم حسابە، معظمی بەشەر، یا لە خانەدانی ابراهیمە، یا منسوبی ئەو خانەدانەیە، وەآل ابراهیم شامله بۆ (اسماعیل و اسحاق و یعقوب و یوسف و موسی و داود) و سائری ذواتی محترمە ﴿وَءَالَ عِمۡرَٰنَ﴾ باوکی (مریم)، باپیری

(عیسی) ﴿عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٣﴾﴾ ئەو اختیار و انتخابە بە نبووەت و سلطنەت، انتخابی طبیعیشی تێدا هەیە، ئەوانی اصفیای خودا بن، خوا عەزابیان نادا و ناکەونە ژێر تسلطی ابلیس ﴿ذُرِّيَّةً﴾ آل ابراهیم و آلعمران سولالەیێکە..

﴿بَعْضُهَا مِنۢ بَعْضٍ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾﴾ بەعضێ لە بعضێ، هیچیان بە گشتی لە قاعدەی تناسل نەچوونە دەر، باز بە طریقەی خروجی مردوو لە زیندوو، زیندوو لە مردوو پەیا بووین. امتیازی آلی عمران کەی بوو ﴿إِذْ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ عِمْرَٰنَ﴾ وەقتێ حەرەمی عمران گوتی: ﴿رَبِّ إِنِّى نَذَرْتُ لَكَ مَا فِى بَطْنِى مُحَرَّرًا﴾ ئەو خاتوونە ئەمەلی بوو کوڕێکی ببێ، ئازادی بکا بۆ خوا، لەسەر خۆی لازم کرد ئەو فەرخۆڵەی لە زگی دایە، تەرکی بکا بۆ خزمەتی خوا ﴿فَتَقَبَّلْ مِنِّىٓ ۖ﴾ ئەم نذرەم لێ قبووڵ بکەی ئەی خودایە ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٥﴾﴾ هەرتۆ دوعای من ئەبیێی، مافي الرحم ئەزانی، تۆ (مصور ما في الارحام)ی ﴿فَلَمَّا وَضَعَتْهَا﴾ کە حملەکەی دانا کچ بوو ﴿قَالَتْ رَبِّ إِنِّى وَضَعْتُهَآ أُنثَىٰ﴾ گوتی خوایە حملەکەم بە مێیی دانا، نێر نەبوو ﴿وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ﴾ هەرخوا ئەزانی، چ شانەکی هەیە، چی لێ پەیابێ. حقیقةً ﴿وَلَيْسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلْأُنثَىٰ ۖ﴾ کورر وەک کچ نییە، بەڵام ئەوی لە تەرەف خوای بێ، باشە پێیە ڕازیم ﴿وَإِنِّى سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ﴾ ناوم لێنا مریەم، ئەڵێن: مریەم بە مەعنا عابدەیە..

﴿وَإِنِّىٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٣٦﴾﴾ من ئەی پارێزم بە عنایەتی ئیلاهی تۆ و، اولادی و نەسلی لە شیطانی دوور کراو لە ڕەحمەت ﴿فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا﴾ خودای مریەم، مریەمی قبووڵ کرد، یا (رب)ی ژنەکەی

عمران قبووڵی کرد لەجێی کورر. ﴿بِقَبُولٍ حَسَنٍ﴾ ئەگەر حسنی قبووڵی ئیلاهی نەبوایە، لە شریعەتاندا قبووڵ نەدەکرا.

﴿ وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا ﴾ شینی کرد و ڕواندی، بە ڕواندنی جوان، یەعنی تربیەی باش، چ هی لەش، چ هی ڕوح ﴿وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا ﴾ شینکردن لەوە جوانتر؟ کە بە خێو کردن و تربیەدانی دەر عهدی حەضرەتی زکریا کرد، لەپاش ئەوە کە لە شیر کرایەوە و نەختێ گەورە بوو لە غرفەیێکیان دانا ﴿كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيۡهَا زَكَرِيَّا ٱلۡمِحۡرَابَ﴾ بۆ احوالْ پرسی و ملاحظە فەرمووني ﴿وَجَدَ عِندَهَا رِزۡقًا﴾ ئەڵێن: ڕزقی هاوینی لە زستاندا لای ئەدیت، ڕزقی زستانێ لە هاوین، لەبەر ئەوە ئەوانی کەرامەت بۆ اولیایان اثبات ئەکەن، بەو ئایەتە استدلال ئەهێنن. ذاتەن هەروا دیترا، ئەوەی مەلایان شەرڕی لە سەر ئەکەن، کەس نایێتە مەیدان،بە لێ بە لێ ئەوەتە کەرامەت، تەماشای بکە بەڵکو بە ئایەت و حدیث و حکایەتی سەلەف، دەلیلان ئەهێنن، اولیایەکانیش استفادە ئەکەن، مەلایەکانیش محروم! (معتزلە) جواب ئەدەن ئەڵێن: ئەمە ارهاصی پێئەڵێن لە دەور و پشتی ظهوری پێغەمبەری بعضە خوارق ظهور ئەکا، چونکە ئەمە عائدی نبووەتە انکاری ناکەن، بەڵام مجددی میصری بە ئەصڵی ئە م حکایەتە ڕازی نییە، حاصڵی، فەرمایشی ئەوانی ئەربابی حسنات، شتیان بۆ مریەم ئەبرد، لە خزمەتیان دادەنا ﴿قَالَ﴾ کە حەضرەتی زکریا سؤالی کرد ﴿يَٰمَرۡيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا﴾ ئەو ڕزقە لەکوێ بۆت بوو؟ بە قاعدەی ئەهلی ئیمان ﴿قَالَتۡ﴾ ئەیفەرموو ﴿هُوَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ﴾ ذاتەن ئەمڕۆش موسڵمانێک شتەکی لە نەوعێ هدیە بۆ بێ، ئەڵێ خوا هەناردی ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٍ ﴿٣٧﴾﴾ بە بێ ئەوەی، کە بە خاطری دابێ و ئەمەلی بکا، ئەوە یعنی فەرمایشی مجددی میصری باشە، بەڵام زۆر

مناسبەی لەگەڵ ﴿هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥ﴾ نییە، ظاهر وایە ئەو ڕزقە غرابەتێکی تیا بووبێ، بۆیێ لەو وەقتەدا سەوقی حەضرەتی زەکریای کرد بۆ طلبی (ولد)، با وجودی وەقتی (حساب العادة) نەمابوو، و زێدە مناسبەتی لەگەڵ حاڵی مریەم هەیە، کە خۆش ثمرەییێکی خلافی معتادیدا ﴿ ﴾ زکریا گوتی ﴿رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً﴾ خوایە بە من کەڕەم بکە لە تەرەف خۆت، ولدی پاک و خاوێن، ئەگەرچی (ذرية) بە نسل ئەڵێن، ئەمما اطلاقی بەسەر ولد ئەکرێ و، بۆ تاک و جمع بەکارهاتووە ﴿إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ ﴿٣٨﴾﴾ بەحەققەت تۆ دوعا ئەبیەی، قبووڵی ئەکەی، خوای تعالی، دوعای قبووڵ کرد ﴿فَنَادَتْهُ الْمَلَائِكَةُ﴾ لە حاڵی بەخەبەری بوو، کە ﴿وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي فِي الْمِحْرَابِ﴾ ملائکەتی معروف لایان، کە جبریلە بانگی کرد، زکریا لە ناو محرابی، یا محرابی مریەم ڕاوەستابوو، دوعای ئەکرد، فەرمووی ﴿أَنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَىٰ﴾ خەبەری خۆش، بێ شوبهە بە کوڕێ ناو (یحیی). کە ئەڵێن: (یۆحنا)، ئەویش لە کلمەی حیاتەوەیە ﴿مُصَدِّقًا بِكَلِمَةٍ مِّنَ اللَّهِ﴾ بە یەک ئەمر ئیمان و باوەڕی ئەکا، بێ تکلیف و تکلّف، وەک حەضرەتی ابراهیم، کە فەرمووی (أَسْلِمْ) عەرضی کرد (أَسْلَمْتُ) لێرە تەفسیری کلمە بە (عیسی)، یا بە انجیل، زۆر لام مناسب نییە ﴿وَسَيِّدًا﴾ ذاتی گەورەی عالی نژاد و عالی هیمەت ﴿وَحَصُورًا﴾ مالکی نەفسی خۆیەتی، ئەتوانێ حبسی بکا لە شهوات و لذائذ. لەجملەی مشتهیاتە (ژن)، جەنابی مەیلی نەبووە، نەک لەبەر عنەت و نەمێردی؛ چونکی ئەوە هیچ مدحی تیا نییە و، هیچ معنای لایق بە مقامی تیا نییە ﴿وَنَبِيًّا مِّنَ الصَّالِحِينَ ﴿٣٩﴾﴾ پێغەمبەرە لە صاڵحایانە، نسباً و حسباً ﴿قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَامٌ﴾ لە پێشەوە فەرمووی

(من لدنک) دیارە لە قودرەتی ئیلاهی دوور نەزانـاندووە، ئـەمما لـە حـاڵی خـۆی و ژنـەکـەی دوور دیـوە ﴿وَقَدْ بَلَغَنِيَ ٱلْكِبَرُ﴾ پیـری گـەیـشتیتە مـن، یەعنی تەمام تاثیری تێ کردووم، حسب الحال مادەی قابلیەتی ولد نەماوە، لەبەر طغیانی پیری ﴿وَٱمْرَأَتِي عَاقِرٌ﴾ ژنەکەم نـەزۆکـە، کـەوابێ لـە بـەینیـان چۆن ولد ئەبێ ﴿قَالَ كَذَٰلِكَ﴾ وایە، تکوّنی ولـد لـە بـەینـی ئێـوە مـستبعدە نظر بە مجاری عادات، بەڵام ﴿ٱللَّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ﴿٤٠﴾﴾ با بە ڕێگەی شذوذیش بێ! شاذ و معتاد، عائـدی مـەشیئـەتـی خودایە، گـەلـێ امـوری معتـادە لای هەندێ ناقصان، خلافی بە محاڵ ئەزانن. مـن خـۆم دیومـە ژن و مێـردی لـە عمری معتـاد بـەدەر، ولـدیان بـووە و بـە زەریفـی ژیـاوە. زکریـا ئـەمـەی لـە جهەتی خۆیان بە دوور زانی لەسەر وەقتـی (علـوق)، علامـەتـەکـی لـە خـوا خواسـت ﴿قَالَ رَبِّ ٱجْعَل لِّيٓ ءَايَةً﴾ علامـەتـێ مناسـبی حـاڵ ﴿قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ﴾ قسەکردن بۆ ئینسان لە زەمانی منداڵی تا آخری معتادە و زۆر سهلە، وەک علمای اصولی ئەڵێن: کیفیەتە کە بۆ هەناسـە بـە طبیعی بێ اختیار دێ و دەچێ، بە نەختە قووەتێ قسەی لێ پـەیدا ئـەبـێ. لەوانەی، کە نەتتوانی قسە بکەی ﴿إِلَّا رَمْزًا﴾ الاّ بە اشارەت و دەوامی بوو بە سێ ڕۆژ، بزانە (علوقی) بووە. نـاتوانی لـەو مـدە قـسە بکـەی، بـا وجـودی امـرێ معتـادە وآسـانە. بـەڕاستـی ئایـەتـی جوانـە، ئـەوە خۆیـەتـی ئـەوی مفسرەکان فەرموویانە، لیاقەتی ئایـەتـی نـیـیە! ﴿وَٱذْكُر رَّبَّكَ﴾ بـە دڵ ذکـری خوای خۆت بکە، چونکە چ ئافەتێکی قلبی و دەماغیت پێ نەگەیشتووە، کە لێت بـوو بـە (عـيّ)ـ نـەتـوانیـ ﴿كَثِيرًا وَسَبِّحْ﴾ زۆر تـەسبیح و تقدیـسی کبریائی بکە ﴿بِٱلْعَشِيِّ وَٱلْإِبْكَٰرِ ﴿٤١﴾﴾ لە ئێوارە و سبەینە، دوعای ذکریا و بەشارەتی بە (یۆحنا)، بە هـەردوو نظـم واقـع بـوو لـە بـەینـدا و. مقـصدی

اصلی بیانی جهەتی (اصطفا) ، هه ڵبژاردەیی ئالی عمرانه و، مصدری ئەو هەڵبژاردەیی‌یە، مریەمه ﴿ وَإِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ﴾ هەرکەسێ بێ تعیینی لازم نی‌یە، بەڵام ئەفەرموون جبریل بووه ﴿يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰكِ﴾ خودا قبوولی کردی بۆ خزمەتی مسجد، ڕزقی بۆ هەناردی ﴿وَطَهَّرَكِ﴾ پاکی کردی‌یەوە لەمیولی نسائی‌یە ﴿وَٱصْطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٢﴾﴾ بە انتخابی طبیعی قووەتی پێدای، به تصویری (جنین)ی ولد بوون، بێ نقیصه و بێ لقاح، ئەمەش له تاریخی عالەم بۆ کەس به محقق نەگەیشتووه، بەڵکوو نباتات و حیواناتیش ئەمە نی‌یە. ﴿ يَٰمَرْيَمُ ٱقْنُتِى لِرَبِّكِ﴾ مطیعی خوای خۆت بە، هەراسمەکە ﴿وَٱسْجُدِى وَٱرْكَعِى﴾ باری اطاعەت بکێشه بۆ خزمەتی خوا. خۆت دووتاکە ڕووی مذلەت و انقیاد لەسەر خاکو بەردی باری دابنێ ﴿مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾﴾ لەگەڵ ئەوانەی، که مطیعن له زومرەی ئەوان قبوڵ کرای ﴿ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ ﴾ ئەوی بۆت بەیان کرا، له اخباری غەیبە، بزرە، سرری مکتومە. الآنیش هەر لە پەردەی غەیب دایە. ﴿نُوحِيهِ إِلَيْكَ ﴾ ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە، که به وەحی بۆ تۆ اظهار ئەکەین، کتبی اسرائیلی پرره له خرافات. سابقاً فەرمووی (کفلها زکریا) به شەددەی (عین الفعل) بزانین جەنابی حەق به کردنی، چۆن مریەمی در عهدەی زکریا کرد..

﴿وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَٰمَهُمْ ﴾ ئەوەش له اخباری غەیبه بۆ تۆو قەومی تۆ، وەختێ بۆ به خێو کردنی ئەو خاتوونه، قورعەیان ئەهاویشت بزانن ﴿أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ ﴾ (به تخفیفی کافی یکفل)، بەناوی کێ دەرئەچێ ئەو بەخێوی بکا. قورعه بەناوی حەضرەتی زکریا دەرچوو ﴿وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴿٤٤﴾﴾ لە شان و حاڵی مریەم (العلم عند الله)، ئەو

منازەعەیان لەکاتی حەملی بووە ﴿إِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ﴾ ندای پێشوو مقدمە بوو بۆ ئەو خەبەرە ﴿يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ﴾ ئەو عەهدە قطعی موجز و، مختصر لەسەر زمانی انبیای نزیک ئێوە، کە کورری بێ باب لە نەسلی داود پەیا ئەبێ، بەو کلمەیە تۆ بەشارەت ئەدەین، کە مظهری ئەو منقبەیە تۆ ئەبیت. ئەو موژدە لێدراوە ﴿ٱسْمُهُ ٱلْمَسِيحُ عِيسَى﴾ مسیح لە مشیحایە، عیسی لە یشوعە ﴿ٱبْنُ مَرْيَمَ﴾ نەک کورری خودا، چونکە احتمالی هەیە ئەوەش داخلی ناوی بێ و، احتمالی هەیە وەصفی ممیزی بێ، کە نبووەتی ئەو بۆ مریەم ضرورییە ﴿وَجِيهًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ﴾ ذاتی گەورەیە، صاحب قەدر و شەرەفە، لە دنیاو لە قیامەت ﴿وَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٥﴾﴾ لەو رەسولانەیە، کە مقرّبی دەرگاهی کبریائین.. هەوای موڵک و سلّطەنەتی لە کەللە دانییە، بە دەعوای رسالەت موڵکی باپیری خۆی، کە حەضرەتی سلێمان و داودە طلب ناکا. پادشاهی موڵکی هیدایەتە، سلطانی اقلیمی عیلم و حکیمەتە، لە انجیلی (لۆقا) ئەڵێ: فریشتە بە مریەمی گوت: مەترسێ، چونکە لە تەرەف خوای نیعمەتت چەنگ کەوتیە (اینک)، کە تۆ حاملەی کورریێک ئەبی ناوی لێ ئەنێی عیسی، ئەو گەورە ئەبێ بە کورری حەضرەتی اعلی ناوی لێ دەندرێ و، خودا تەختی باوکی، کە دوو سەرە بەوی عطا ئەکا و، ئەو لەسەر خانەدانی یعقوب، تا ابد پادشاهیی ئەکا، سلطەنەتی ئەو نهایەتی نابێ!. آه. لە انجیلی (متی) ئەڵێ: فرشتەیێ لە خۆوە بە یوسفی گوت، کە (دەزگیرانی مریم) بوو، مەترسە ئەوی لە وێدا قەراری گرتییە لە (روح القدس)ە، ئەو کورریێکی ئەبێ ناوی لێ ئەنێی عیسی، چونکە ئەو ئوممەتی خۆی لە گوناهان نجات ئەدات، ئەوە هەموو بۆیە بووە، تا قسەیەکی لەسەر زوبانی (نبی) فەرمووە، تەواو ببێ، کە ئەوەتە کچی (بکر) ئاوس بووە کورریێ ئەهینێ و، ناوی وی (عمانوئیل)ی

لێ ئەنێی، کە مەعنای ئەوەیە خوا لەگەڵ ئێمەیە. والحاصل ئەمانە وا بە تەمابوون، کە حضرەتی (عیسی) ببی بە پادشاه. اعادەی سلطەنەتی (داود) بکا، لەو زەمانە، تا ئەمرۆ نە عیسی، نە غەیری عیسی، اعادەی ئەو مجدەیان نەکردووە. جوو ئەڵێن: ئەو عیسایە، (مسیحی دجال) بوو، مسیحی ناجی و معیدی مجدی ئالی داود دێ! ئەو ئەمەلە لەدوو هەزارساڵ زیاترە لە دەماغیان دایە، ئێمەیش و دیانیش، بە تەماین حەضرەتی (عیسی) لە ئاسمان بێتە خوارێ، بەخێر و بە سلامەت لەو فلاکەتە نجاتمان بدا! گەلێ لە انتظار ئەمرن، گەلێکی تریش ئەمرن نایبینن. نازانم موسڵمانان بۆ خۆیان تێ هەڵ قوتاندووە، تا ئەو ئاخرە هەندە ڕەزیل نەبوون، انتظاری کەسێ بکەن لە ئاسمان بێ نجاتیان بدا، بەڵام خۆیان تووش کرد. ﴿وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ﴾ قسە لەگەڵ خەڵک ئەکا، لەناو لانک بە منداڵی. ئەو قسە بۆ برائەتی مریەم دەلیلی قاطعە، ئەوی انکاری بکا لە عیسەویان برائەتی بۆ ثابت نابێ، لەو وەختە عیسەوی نەبوون جوولەکەش ئەڵبەتە لە پۆشینی سەعیان کردووە.

﴿وَكَهْلًا﴾ صاحبی (صحاح) ئەڵێ: (کهل) لە پیاوان ئەوەیە عومری لە (٣٠)سی ساڵ تێپەڕێ، مووی لێ سپی بووبێ، کە وابێ حاجەت نییە بڵێین قسەی زەمانی (کهل)ی پاش هاتنە خواریەتی و، مقابلەی لەگەڵ (فی المهد) ئەگەیێنێ، کە وەختی گەورەبوون و پیاوی مقصودە لە هەر ساڵێدابێ. مظنە بۆیێ (مجددی میصری) ئەوەی اختیار کردیە. ئەمما ئەوەی ئەڵێ پیاو لە بەینی ٣٠ و ٤٠ پێی ئەڵێن: (شاب) لەوەی زیاد، تا ٦٠ ساڵە ئەیڵێن (کهل)، بنا لەوە ئەمە پاش نزولە، بەڵام ئیجاب ئەکا، کە هاتە خوارێ عمری لە چل کەمتر بێ، کە ڕووی کردە شەصت ئەوجا قسە بکا.. بنا بە (قولی) بعضێک دەجال ئەکوژێ ئەوجا قسە ئەکا. ئەگەر ئەو وەختەی ڕەفع کراوە عومری (٣٣) بووبێ، ئەبێ پاش حەوت ساڵ، ئەوجا

قسە بکات. ﴿وَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٤٦﴾﴾ نسباً وحسباً لە پیاوچاکانە، ئەمەی (جوو) و (قادیانی) لەحەقی ئەڵێن، هەمووی افترایە ﴿قَالَتۡ رَبِّ﴾ مریەم لە جوابدا گوتی: ئەی سیدی ومولای ﴿أَنَّىٰ يَكُونُ لِي وَلَدٞ﴾ ئەوی استبعادی پتر تیایە لە عادەت زۆر دوورە، بەڵکوو خارقەیێکی بێ مثلە. ﴿وَلَمۡ يَمۡسَسۡنِي بَشَرٞۖ﴾ بە هیچ وەجە، کەس مسی منی نەکردووە ﴿قَالَ﴾ مەلەک فەرمووی: ﴿كَذَٰلِكِ﴾ وایە ﴿ٱللَّهُ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ إِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا﴾ کە بە قطعی ارادەی شتێک بکا ﴿فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن﴾ ئەمری ئەکاتێ بە ئەمری تکوینی، بلا مخالفة ﴿فَيَكُونُ ﴿٤٧﴾﴾ ئەبێ، خلافی ئەمری تکوینی قابل نی‌یە، ئەمە وەک ئەمری تکلیفی نی‌یە، ئەگەر واجبیشی داخلی اختیاری انسانە.

افکاری بەشەر دەرحەق حەضرەتی (عیسی) مختلفە، هەتا لەبەر ئەو اختلافە بعضێ ئەڵێن: موهومە، ذاتی محقق الوجود نی‌یە، مجهول التاریخە!! ئێمە بەو نەوعەی، کە قورئان ئەفەرموێ ئیمانمان هەیە بە تولدی عیسی لە مریەم، بە خارقەی عادەت، بە قودرەتی ئیلاهی و لەبەر ئەو ئیمانە، شهادەت لەسەر برائەتی مریەم ئەدەین، بعضێ ئەڵێن: ئەمە نابێ بە قاعدە بە وەلەد بووبێ، قسمێ ئەڵێن: بە طریقی شرعی لە یوسفی کوڕی خاڵی مریەم بە ولد بووە و، بعضێ ئەڵێن: بە طریقی غیرە شرعی لە قائدەیێکی ڕۆمانی پەیا بووە، ئەو فرقە، اتهامی مریەم ئەکەن (معاذ الله)، ئەڵێن: عیسی بیژی‌یە! ئەو قسە لای هەموو موسڵمانان کفرە، مخالفی نصی قورئانە و، مریەم محضاً بە قودرەتی ئیلاهی مدافعەی ئەکرد لەگەڵ یوسفی دەسگیرانی، ئەڵێن: ئەو کەسە دەرکی کرد، کە مریەم حاملە اشتباهی لێ پەیابوو، محزون بوو، بە تعریض عەرضی مریەمی کرد، گوتی: آیا گیا بێ تۆو ئەبێ؟ گوتی: بەڵێ، خوای تعالی اوەل بذری خەلق کرد بێگیابوو، اوەل گیای ایجادی کرد، بێ تۆو بوو، ئایا تۆ ئەڵێی، ئەگەر تۆو

نەبایە، خوا نەیدەتوانی گیا شین بکا؟! ئەگەر گیا نەبووایە، نەی دەتوانی تۆ پەیا بکا؟ گوتی: اعوذبالله لەو قسە، بڵێم خوا اقتداری نی یە، ئەوە وایە... ئەمما خەبەرم بدەیێ، دار بێ ئاو شین دەبێ؟ گوتی: نەت زانیوە تۆو ئاوو دار و باران، هەموو یەک خوای هەیە؟ ئایا ئەڵێی ئەگەر ئاو و باران نەبێ، خوا ناتوانێ دار شین بکا؟ گوتی: اعوذ باللە، کە ئەوە بڵێم، انکاری قودرەتی خوا بکەم. ڕاست ئەڵێی. خەبەرم بدەیێ. گوتی: جەنابی حەق مژدەی دایمێ بە کلمەیێ، لە تەرەف خۆی ناوی (المسیح عیسی بن مریم)ە ..

بەڵێ، ئەمەی وترا، بۆ (ملیّـون) ان باشە، قەول بە عمومی قودرەتو شمولی ئەکەن. اکتفا ئەکەن بڵێن، خوا کردی و ناتۆژنەوە چۆنی کرد؟. ممکنە.. محاڵە؟ تەنها امکان کافی یە، خەلقی متشابهاتو غەیری متشابهات تفویضی عیلم و قودرەتی خوا ئەکەن، بێ تەفسیری اقرار ئەفەرموون، بەڵام مقابلی (طبیعی)یەکان، بەڵکوو حکمای (الهیون)یش، کە ئەڵێن امکان استعدادی شرطە بۆ حوادثات، خاصة ئەوی بە تطور پەیا ئەبێ، بێ مادە نابی، بەو قەولە نجاتمان نابێ و، قیاسی شتی پاش دامەزرانی قاعدەی خەلقو ایجاد، لە پێش دامەزرانی ناکرێ، لەوی ضرورەتی تیا هەیە، لێرە هیچ ضرورەتی تیا نی‌یە، لە علومی عقلیە، طبیعیە گەلێ حوکم هەیە، مجبوریەت و ناچاری، سەوقمان ئەکا بۆ اعتراف پێ کردنی ئەو مجبوریەت و ناعلاجی‌یە، کە نەبێ اعتراف بە حکم ناکەین و دەلیلی ترمان ئەوێ. مثلا بالمجبوریە اعتراف ئەکەین، حەضرەتی بێ داک و باب پەیابووە لە ئەرزی، بە ناعلاجی و مجبوری، ئەمما لە پاش قاعدەی تناسل اعترافمان پێ ناکرێ، الاّ سەرسەریانە نەبێ.. ئەرز بباتە ئاسمان و، ئاسمان بێنێتە سەر عەرد، برروا ناکەین ئەو کەسە ڕاساً پەیا بووە.

بعضە ئەهلی تدقیق لەخوا پەرستان، هەتا یەکی وەک (شێخی عەرەبی) نەوعە تصورێک ئەکا لە قاعدەی بە دەری ناخا و، ئەفەرموێ: لە تەفسیری

سورەتی مریەم چۆن ممکن بووە (تولد) لەیەک نطفە ؟ ئەڵێ: چونکی لە علومی طبیعیە ثابت بووە، کە (مەنی) نێر وەک هەوێنەو، (مەنی) ژن وەک شیرە ئەو ئەمەیێنێ. ئەم ئەمەیی، کە تێکە ڵاو بوون پەنیریان لێ پەیدا ئەبێ، کەوابێ ئەگەر مزاجی ژن بە قووەت تر بوو، نێرانە بوو وەک ژنانی (شریفة النفس) ، قەوی و بە قووەت و مزاجی جگەری گەرم، بۆ ئەو مادەی کە لە گورچیلەی چەپی جودا دەبێتەوە، کە گردبوونەوە لە ڕەحمدا و مزاجی ڕەحم ماسکە و جاذبەی بە قووەت بێ، ئەوی لە گورچیلەی ڕاستی لەجێی نطفەی پیاو ئەبێ و، ئەوی لە گورچیلەی چەپی لە جیاتی (مەنی) ژن ئەبێ، کە تێکە ڵاو بوون، انعقاد ئەکا و ولدی لێ پەیدا ئەبێ.

فەرمایشتی ئەو لە تکوّنی (مەنی) لە گورچیلە، بەگوێرەی کەشفیاتی ئەو زەمانی بووە، و بەکشفیاتی ئێستا قابلە تطبیقی لە مادەی (گون)، کە لە داخلی ڕەحمی ژناندا هەیە بکرێ. بۆیە قەت نەبووە پاش (آدەم)، تولد لە تەنها پیاوێ و، ولدیش بۆ کچ بێ، چونکە بۆ پەیا کردنی مادەی مذکری احتیاجیمان هەیە بەو تکلفات و تقدیراتە. ئەگەر مادەی (انوثت) غەلەبە بکا بەو صورەتە قەت نابێ، زێدە تفصیل ان شاءالله لە سورەتی مریەم عرض ئەکرێ، والله الموفق.

﴿وَيُعَلِّمُهُ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ ئەوەش داخلی بشارەتە و، ممکنە جملەیێکی سەربەخۆ بێ، جەنابی حەق (کتبی منزلە)، یا کتابەتی فێر ئەکا ﴿وَٱلۡحِكۡمَةَ﴾ علومی عقلیەی تعلیم ئەفەرموێ ﴿وَٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ ۝٤٨﴾ تەورات و انجیلی فێر ئەکا، تەورات بە تعلم و، انجیل بە وەحی. ﴿وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ ئەیگێرێ، یا ئەینێرێ بە پێغەمبەر بۆ سەر اسرائیلیان.. ئەو جا خوا (عیسی)ی خەلق کرد، بەوەلەدبوو، گەورەبوو، فێری کتابەت و حیکمەت و تەوراتی کرد، وەحی بۆ نارد و ناردی بۆ بنیاسرائیل. لە وەختی بعثەت پێیان ئەڵێ..

﴿أَنِّي قَدۡ جِئۡتُكُم بِـَٔايَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ له بعضه (قراءات)«آيات»ه ﴿أَنِّيٓ أَخۡلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيۡـَٔةِ ٱلطَّيۡرِ﴾ من بۆتان دروست ئەکەم له قوڕر شتێک له شکلی تەیر «نه له زێرر وەک عجلی سامری.. نەتەنها بجوڵێتەوه وەک خواری عجل.» ﴿فَأَنفُخُ فِيهِ﴾ فووی تێ ئەکەم ﴿فَيَكُونُ طَيۡرَۢا بِإِذۡنِ ٱللَّهِ﴾ بە تەواوی ئەفرری به ئیذنی خوای، یەعنی دروست کردن و فوو تێکردن ئی منه، بوونی به تەیری صاحب حەیات وفررین، به خەلقی خوایە، اصلا مداخلەم تێدا نییە، بەستیمان لەگەڵ ئەو حەیاتە نییە ﴿وَأُبۡرِئُ ٱلۡأَكۡمَهَ﴾ (اکمه) ئەگەر به کوێری زگماک بلێن، مەعنای ئەبرێ، بەلام زۆر جوان نییە، بۆیێ بعضێکی وەک مجاهد تەفسیری به (شەوکۆر) ئەکاو، (عکرمه) تەفسیری به چاو پروپووشاوی ئەفەرموێ.

﴿وَٱلۡأَبۡرَصَ﴾ بەڵەک ﴿وَأُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ بِإِذۡنِ ٱللَّهِ﴾ وەک زیندو بوونەوەی کوژراو له زەمانی حەضرەتی (موسی)، به لێدانی بعضێ له گاجووت، صرف به خەلقی خودایە.

کەسێ ئەتوانێ به ڕاستی مردی زیندی کاتەوه، که خۆی نەمرێ و حقیقەتی حەیات بزانێ و، تەسخیری بتوانێ.

﴿وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأۡكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمۡۚ﴾ و خەبەرتان ئەدەمێ به ئەوەی ئەیخۆن، به ئەوەی دای ئەنێن به زەخیره له ماڵی خۆتان، دیاره ئەو قسانەی لەگەڵ ڕجالی بنیاسرائیلی فەرمووه، نەک لەگەڵ منداڵان، وەک له ڕوایەتان ئەڵێن. ئەمه ئەگەرچی ظاهراً به نظر ئایاتی پێشوو، زۆر به قیمەت نییە، ئەمما ڕێی شوبهە زیاتر ئەبرێ، شخصی خارج اسراری ناوماڵی ئینسانێ بزانێ، دیاره شائبەی نەیرەنگو تلبیسی تیا نییە، دڵ چاتری پێدا دەمەزرێ، ئەمما بعضه کەس له دەروێشانی سەرسەری، دەچنه دێ و شاران له پێشەوه به واسطەی منداڵیان، یا له ئەم و ئەو تحقیقی احواڵی

بعضە عائلات ئەکا، پاشان ئەچی خەبەریان ئەداتێ بە خفایای ماڵەکە.. بە کەراماتی ئەزانن، گەلێ ساوارو داندۆک و پارەی ئەدەنێ، نعوذ بالله مسلکی سواڵ کردن ئایاتیش تێک ئەدا. ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لَّكُمْ﴾ لەوەی بەیانکرا ئایەتی حەقی تیایە بۆ ئێوە، کە مشاهدەی ئەکەن جێی شک و اشتباه نیە ﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٤٩﴾﴾ ئەو ئایاتە، بوو یان نەبوو، لێرە دەرناکەوێ، بەڵام ئایەتی (مائدە)، بە ئاشکرا دەلالەت ئەکا لەسەر بوونیان.

من انکاری (معجزة) ناکەم، ئەوی لە قورئان نسبەتی دابێ بە پێغەمبەرانی پێشووتر، لە زەمانی خاتم الرسل، بێ تاویل قبووڵی ئەکەم، بەڵام «علی ملأ الناس وبین یدی ربی» ئەڵێم: معجزە، کەرامەت، بێ فائدەیە.. ئایاتی مستمرەی ئیلاهی، بە هەموو نەوع چاترە لە شواذ. حەضرەتی (عیسی) فووی کرد لە قورڕ، بوو بە تەیر، بە ملیار بەشەر لە فرینی فکری.. چاوی کۆری چاک کردەوە، ئەمما بە ترلیۆن بەشەری کۆر کرد. بەڵەکی شفادا، بەڵام بەشەری پێ بەڵەک بوو.. مردی زیندی کردەوە، عالەمی پێ مرد.. حەیاتی عقڵیان نەما، خۆی بێ باب بە وەلەد بوو، خوایان کردە بابی، قسەیەکی وایان هەڵبەست، کە (موحدین) شەرمەسار و خجاڵەت بن لە بەینی بەشەر. خولاصە لە حەضرەتی موسا، تا حەضرەتی عیسی، هەتا معجزە زیاتر بوو عالەم، احمقتر بوون، والسلام.

﴿وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ﴾ هاتووم بە مصدق ومؤید، بۆ ئەوەی لەبەینی دو دە ستی من دایە، لە تەوراتْ ئیمانم پێی هەیە، هەتا نەفسی هاتنی من بە ڕەسول، صدقی تەورات اثباتی ئەکا، کە بەشارەتی بە بعثی منی تیایە ﴿وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ الَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ﴾ و هاتووم تاکو بعضە شتێ، کە لە ئێوە حەرام کرایە، بۆتان حەڵاڵ بکەم. ذاتەن تضییقی شریعەت پابەندیە بۆ ئوممەت، مانعی ترقیە،و ئەمڕۆ سەبەب بەشددەتی، کە لایانە لە تعالی محروم بوون، دیارە ئەو مساهلەی، کە لەدینی مەسیحیان

دایە، اساسی لەحەضرەتیی (عیسی) نی‌یە ﴿وَجِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ﴾ نەفسی خۆم ﴿مِّن رَّبِّكُمْ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٥٠﴾﴾ بە عناد و کبر، تکذیبم مەکەن، خۆ لە خوا بپارێزن، اطاعەی من بکەن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ﴾ نالێم من بپەرستن، اطاعەم بکەن (من حیث کونی داعیا الی الله) نالێم کوڕی خوام، منیش وەک ئێوە بەندەیێکم لە بەندەکانی خوا ﴿هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٥١﴾﴾ ڕێی ڕاست ئەوەیە، ئی هەموو پێغەمبەران و هادیانە، بەنی ئیسرائیلی قبوولی دەعوەتیان نەکرد، اظهاری کفر و انکاریان کرد ﴿فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنْهُمُ ٱلْكُفْرَ﴾ کە عیسی حسی کرد بەکفری ئەوان. نفسی کفر، ئەگەرچی وەک سرر کیفیاتی نفسیە، نادیترێ بە بەر حس ناکەوێ، بەلام بە ئاثار ئەزاندرێ ﴿قَالَ مَنْ أَنصَارِىٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ کە خزم و عەشیرەتی خۆی، ذراری ڕەسولەکان، منتظری مسیحی منجی یاردمی نەکەن؟ کێ یاردمی ئەکا بۆ دەعوەتی الی الله؟ ﴿قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ﴾ جەمعێ لە انصاری أنبیا، پاک و خاوێن لە کبرو حسد و عداوەت وعناد. لە قاموس ئەڵێ: (الحواری الناصر أو ناصر الانبیاء). هرقل سؤالی لە آبا سفیان کرد، ئایا ضعیفەکان تابعی محمد ئەبن، یا اقویا؟ گوتی ضعفا، گوتی: بەڵێ، ئەوانن اتباعی پێغەمبەران ﴿نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ﴾ زیفی عناد لە دڵماندا نی‌یە پابەندی دنیا نین، ئێمە نەصرەتی تۆ بۆ خوا ئەدەین، نەک لەبەر شخصیەت. مفسران ئەوەندە قسەی سەیر سەیریان کردیە، سپی‌و ڕەشیان تێک داوە ﴿ءَامَنَّا بِٱللَّهِ﴾ بە ئیمانی بە قووەت و کامل ﴿وَٱشْهَدْ﴾ ئاگادار بە ﴿بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٥٢﴾﴾ مطیع و منقادی ئەمر و ڕەسولی خواین، ئەو جا متوجهی (الی الله) ئەبن و، ئەڵێن: ﴿رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلْتَ﴾ هەرچی هەبێ ﴿وَٱتَّبَعْنَا ٱلرَّسُولَ﴾ کە

حەضرەتی عیسایە، ئیمانەکەمان لە دڵا ڕاسخە ﴿فَٱكْتُبْنَا﴾ تۆش ئێمە ثبت بکە﴿مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ۝٥٣﴾ لەو گرۆهەی بەڕاستی شاهدیان داوە لەسەر وحدانیەتی تۆ و، حقیقەت کتب و صدقی ڕەسولی عصری خۆیان ﴿وَمَكَرُوا۟﴾ حواری‌یەکان خۆیان نوواند بە ڕەنگی شێرانە، شێری خوون ئالود، نفخی دلێریان لێ ئەدا. ﴿وَمَكَرَ ٱللَّهُ﴾ خوای تعالی ڕەنگەکەی نوواند. ئاشکرای کرد﴿وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ ۝٥٤﴾ ڕەنگی فیطری و حیلەکاری بە دەرئەخات (صبغة الله ومن أحسن من الله صبغة) عاقبەت ئەوانی مزخرف بوون، لە وان بە دەرکەوت. دەعوای باطلیان وەختێ بە دەرکەوت ﴿إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ﴾ خودا فەرمووی: ئەی عیسی مایوس ببە لە ئیمانی ئەوانە. مانەوەی تۆ بێ فائدەیە ﴿إِنِّى مُتَوَفِّيكَ﴾ من ئەتمرێنم. حسابت تەواو ئەکەم ﴿وَرَافِعُكَ إِلَىَّ﴾ بلندت ئەکەم بۆ لای خۆم، لەو زیللەتو خستە، کە ئەو گرۆهە نیسبەتی بە تۆ ئەدەن، خەلاست ئەکەم ﴿وَمُطَهِّرُكَ مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ لە شوبهەی ئەوانەی، کە کافرن بە خۆت. ئیمانیان بە تۆ نی‌یە بە قەومێ، کە بە ڕاستی شەهادەت ئەدەن لە افراط و تفریط، خاوێنت ئەکەن. ﴿وَجَاعِلُ ٱلَّذِينَ﴾ ئەگێڕرم ئەوانەی، کە ﴿ٱتَّبَعُوكَ﴾ تتبعی حاڵی تۆیان کرد، حقیقەتی ذاتی وەصفی تۆیان بەدەرخستووە ﴿فَوْقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟﴾ حەقیان بزرکردیە مغلوب ئەبن، یا بە حجەت و بورهان، یا بە حەرب ﴿إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ ئەو تفوقەی مادی و معنوی دائمە، تا ڕۆژی قیامەت، وامەزانن لەتاریخی عالەم مسیحیەکانی مزخرف غالب بوون. ئەمڕۆش ئەورووپایی کە غەلەبەیان بەسەر موسڵمانان‌دا کردیە، بە مسیحیەتی نی‌یە، بەڵکو..

(١) لایەک بە علم و عقڵە، بە اکتشافات و اختراعاتی قووەتی طبیعەتە،

کە ئەساسی مسیحی لەگەڵ طبیعەت متنفرە. متباینە. لە هەموو وەقت مؤمن بە سەر کافر غالب ئەبێ. ئیمان بەخوا، کە موافق نەبێ کفرە. موسڵمانان وەک جوو و دیانان، دوای خوارق و شواذ کەوتن. بە خلافی قورئان ئیمانێکیان اختراع کرد، نە عقڵی هێشت، نە علم، نەقووەت، نە قودرەت. نە سعی و عملی صالح و، خونجایی بۆ دنیا و دین، بە واسطەی کفر بە قواعدی ئیلاهی، بە قورئانی حکیم،ماڵی وێران بوون، حالاً افاقەیان نەبووە، ئەگەر هەروابن عاقبەت، مەسخ ئەبن بە کیسەڵ، بە قالۆچە ئەکەونە ادنی مراتبی حیوان.

(٢) لایەکی تر بە مەیلی نفسانییە، اباحەی شهوات ترویجی فسق وفجور و قومار و خمور و سائری کردەوە بەدەکان، کە نفسی حیوانی حەزی لێ ئەکا و، فیطرەتی بەشەری بە فەساد ئەبا.

﴿ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ﴾ مرجعی هەمووتان لە دنیا و قیامەت لای منە ﴿فَأَحْكُمُ بَيْنَكُمْ﴾ حوکم ئەکەم لە بەینی ئێوە، حەسمی نزاع ئەکەم ﴿فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٥٥﴾﴾ لە هەموو شتی دنیەوی و اخروی فطری و شرعی ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَأُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ﴾ ئەوانەی کافر بوون بەخوا، یا بە نبووەت، یا بە طبیعەت، بە ئیمانی (مزخرف بالله و بالنبوة) هەبێ لەدنیا معذبە، ئەگەر خدعەکار نەبی، لەقیامەت نەجاتی ئەبی، وە الاّ فلا ﴿وَمَا لَهُم مِّن نَّـٰصِرِينَ ﴿٥٦﴾﴾ کەسێ ئیمانی ڕاستی بە خواو بە قواعدی خوا نەبێ، کێ نصرەتی ئەدا بە تبعیەتی شواذ چۆن خێر لە قواعدی طبیعی ئەبینێ کەسێ برسیی ئیمانی هەبێ، کە عیسی دەهەزار کەس، بە پێنج کولێرە تێر کردووە، ئایا تێر ئەبی؟

ئەگەر کەسێ بڵێ (عیسی) ، یا غەیری (عیسی) بەسەر ئاودا ڕۆیشتوە، عجبا خۆی بە سەرئاوا دەڕوا؟ حاشا.. پردێ لەسەر ئاو دروستبکەن بۆ

نفعی عمومی، سەد هەزار هەندە چاترە. حاصڵی، ئەوی ئیمانی بە خواو عقڵ و نبووەت و طبیعەت هەبێ، لە هەردوو دنیا نەجاتی ئەبێ، نوشوست ناهێنێ ﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ بەو نەوعەی، کە عەرزکرا ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ ئی دنیا بۆ دنیا.. ئی قیامەت بۆ قیامەت، ئەجریان ئەکەوێتە سەرخۆ، یا لای خوا ﴿فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ ﴾ بە تەواوی ئەجریان پێ ئەدا، مثقالە ذەررەیێ ظلمیان لێ ناکا ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٧﴾ ﴾ کەوابێ خۆی چۆن ظلم ئەکا. جەنابی حەق لە دانانی شرع، قواعدی طبیعی تێک نادا، چونکی خەلقی خۆیەتی.. قواعدی طبیعی، احکامی شرعیە تێک نادا، چونکی خۆی دایناوە، صاحبی هەردوو یەکە، ظالمی جاهل ئەو کەسەیە، کە نەفرەت ئەهاوێتە بەینی طبیعەت و شریعەت. ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەوە، کە ئەوی کافر بێ معذبە، بێ یارو یاوەرە، ئەوی مؤمن وچاک بێ، نائلی ئەجری خۆی ئەبێ ﴿نَتْلُوهُ عَلَيْكَ ﴾ لە اوەل و ئاخر مستمراً بە سەرتدا دەخوێنینەوە ﴿مِنَ ٱلْأَيَٰتِ ﴾ لەضمنی علامات و دلائل ﴿وَٱلذِّكْرِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٥٨﴾ ﴾ لە قورئانی ثابت و محکم، کە وەهنی نیيە.

مقصد لە دین ئەوەندەیە، هەر کەسێ خۆی و کیفیاتی نفسیە و عملی خۆی، ڕێی ڕاستی نوممەتە، باقی فەند و فێڵە، ئەوی صاحبی هۆش بێ، گوێی ڕاگرێ، استماعی ئایاتی خوا بکا. اعتماد ناداتە فدیە و شفاعەت بە ادنی تاملی، دەفعی شبهات وشکوک ئەکا، بە خیاڵات و اوهامی فاسدە خۆی وەرناگێرێ، بوونی حەضرەتی عیسی بێ باب، ناکاتە باعثی کفر و ضلال ﴿ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ ﴾ لای خوا بۆ ئەو کەسەی لە ئایاتی خوا بگا ﴿كَمَثَلِ ءَادَمَ ﴾ شەبەهە، مثلە، مثلی تەواو نیيە ﴿خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ﴾ ئەو مادەی، کە ئینسانی لێ پەیا ئەبێ لە خۆڵ خرری کردەوە، بە عیلم و

قودرەتی خۆی ﴿ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ٥٩﴾ بەو خۆڵە مهیایە و مستعدەی فەرموو. یەعنی بە ئەمری تکوینی و ایجاد، نە بە لفظ. لفظ، تاثیری نی‌یە، بۆیێ لە هەموو جێ لە قورئان لەگەڵ (كُنْ) (فَيَكُونُ) هەیە. حاشا ثم حاشا لەگەڵ حەضرەتی کبریائی، ادنی شەبەهی نی‌یە، فضل لە تشابە. اعتراف بە تکوّنی آدەم لە موادی حیویەی ئەرضی ضروری‌یە.. (ملیــون)و (طبیعیون) اعترافی پێئەکەن. بە قەولی حکمای جدید، ئەرض لە شمس جودا بووە، مایعی ناری حەیاتی تیا نەبوو، لە پاش چەند أطوار، حیاتی نباتی، پاشان حیاتی حیوانی تیا پەیابوو، دیارە ئەوە بێ لقاح بووە، اعتراف بە تکوّنی (عیسی) بێ لقاح، اضطرار و مجبوری تیا نیە و، ادنی ادنی توهمی تیا نیە، کە بیکەینە کوڕری خوا.. لە بەینا گەلێ احتمالی نزیک نزیک هەیە، بەس حفظی شەرەفی نبووەت، سەوقمان ئەکا بۆ توجیهی مناسب ﴿ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾ حەقی مقرر و ثابت و لا یتغیر، لە تەرەف خوای تۆوە بۆت بەیان ئەکا ﴿فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ٦٠﴾ لەوەی لە تەرەف خواوە بۆت دێ، مەسئەلەی (عیسی) نەبوو، پێغەمبەر نەبوو.. ئەهلی علم جێی مریەو اشتباە نی‌یە، نظر بەجهەتی ئیلاهی، ئەگەر (مریە)یەک بێتە دڵ، لە جهەت قاعدەی توالدە، ئەوەش بە ئیمان بەعمومی قودرەتی ئیلاهی زائل ئەبێ. لەو ئایاتی مذکورە حەق ظهوری کرد.. (عیسی) کوڕری مریەمە، بێ (سفاح) نە خوایە و نەکوڕری خوایە.

﴿فَمَنْ حَآجَّكَ﴾ ئەوی مجادلە و مخاصمە بکا لەگەڵ تۆ ﴿فِيهِ﴾ لە شەئنی (عیسی) ﴿مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ﴾ لە ضمنی ئایاتی پێشوو.. پاش ئەو عیلمە، کە بۆت هات.. پەیا بوو، ادلّەکان لە ظهور بە دەرەجەیێکن، کە مقصود لەوان چی‌یە، خۆی بۆت دێ وەک علومی بدیهیە، حاجەت بە توجە، لێکۆڵینەوە نی‌یە. ئەوانی مجادلن زۆر فرقەن:

گرۆهێ ئەڵێن (عیسی) معاذالله محصوڵی زنایە، ئەوی لای وابێ مادام لەسەر ئەو فکرە بی، قابل نییە ئیمان بە خاتم الرسل بێنێ. اولاً ئەبێ سەعی بکرێ لە ازالەی ئەو فکرە فاسدە.

جەمعێ ئەڵێن کوڕی خوایە، یا خوا چوویتە ناو مریەم، تکوّنی بوو بە (عیسی)، لەو سوڕەتە تصریح بەو قسە نییە، ئەمما ئیشاراتی بۆ هەیە، ذاتەن ئەو فیکرە لە زەمانی (عیسی)دا نا، بەڵکو پاش وەفات و ڕەفعی هاتە خیالات و اوهام. مضلەکان پاش ئەو علمە قطعییە، ئەبایە ئەوانیش دەست لە خصام هەڵگرن، ئیمان بە (عیسی) و بە تۆ بینن، لەسەر ئەو حاڵە ئەگەر کەسێ مخاصمە بکا بەچی ئەتوانێ مدافعەی بکەی؟

﴿فَقُلۡ تَعَالَوۡاْ﴾ بفەرموو بەوان وەرن مباهلە و ملاعنە بکەین، چونکە ئایات و بورهان بۆ ئەوانە دەست نادا ﴿نَدۡعُ أَبۡنَآءَنَا وَأَبۡنَآءَكُمۡ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمۡ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمۡ﴾ تێکرا بانگی کوڕانی خۆمان، ژنانی خۆمان و، خۆمان بکەین، هەر کەس فرقەی خۆی کۆبینەوە. ﴿ثُمَّ نَبۡتَهِلۡ﴾ دوعا بکەین. بپاڕێینەوە لەبەر خوا ﴿فَنَجۡعَل لَّعۡنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلۡكَٰذِبِينَ ٦١﴾ لەعنەتی خوای لە درۆزنان بکەین:

قسمێ قذفی خوا ئەکەن، کە (مریەم)ی (وەطئاندووە)، قسمێ قذفی (مریەم) ئەکەن، کە بە زنا کوڕی بووە. ئەو ملاعنەیە، عیناً وەک (لعان)ە، مادام ئێوە ئەڵێن ئەو ئافرەتە مؤمنەیە، بێئاگا و جزبە تاعەت و عبادەتی خوای دوور لە توهمەت زانییە.. فەرموونە ملاعنە. ئێمە دەعوای بەرائەتی خوا ومریەم و عیسی ئەکەین، ئێمە (لعن) ئەکەین لە درۆزنان، فەرموون ئێوەش (لعن) بکەن لە درۆزنان، لە خاتمەوە، تا ئەمڕۆ لە ئەمڕۆوە، تا ابد موسڵمانان لەعنەتی خوا لەدرۆزنان ئەکەن. الانیش ئێمە بە منداڵ و بە ژنو بە پیاوی حاضرین (وەک دولوّی، کە معروفە لە ئەورِوپا) لەهەر موقعێ، کە

ئەڵێن مقدسە جێی قبوڵی دوعایە، خررئەبینەوە ملاعنە ئەکەین، چونکە بە یقینی ئەزانین ﴿إِنَّ هَٰذَا﴾ ئەوەی کە ذکر کرا لەشەئنی (عیسی) ﴿لَهُوَ ٱلْقَصَصُ ٱلْحَقُّ﴾ ئەمری حەقە ثابتە، مطابقی واقعە، شائبەی درۆی تیانییە، بە عقڵو نقڵ مؤیدە و مؤکدە ﴿وَ﴾ بڕواییمان هەیە بە بورهانی قاطع، بێ شک و شوبهە ﴿وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ﴾ نیە هیچ (اله) معبود خالق. کەس ادنی شبهەییکی ببێ بە اله ﴿إِلَّا ٱللَّهُ﴾ الاّ ذاتی واجب الوجودی، واحدی احدی، بێ والدو صاحبە و ولد، خالقی اکوان، آمری (کن فکان) حیّ وقیوم بێ خەوو بۆرژان. ربّ العالمین مالک یوم الدّین ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٦٢﴾﴾ عزیز الوجودە، شەبەهی وی نایابە، فەردی ممتازە، بە قووەتی غالبە، بە قودرەتی کاملە، شاملە.. صنعی ئەو مەحکەمە منتظمە، شواذی طبیعەتیش بە علمی صنانعی ئەو پەیدا ئەبێ، با لە ئێمەش بزربێ ﴿فَإِن تَوَلَّوْا﴾ ئەگەر اعراضیان نا، ڕوویان وەگێڕرا، ملاعنەیان نەکرد، دیارە ئەو فکرە فاسدە محضاً بۆ افسادە، افسادی ئەوان لە خوا بزر نابێ. ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٦٣﴾﴾ ئەمانە وغەیری ئەمانە اظهاری کەن، اضماری اموری خفیەی نفسیە لەو بزر نابێ.

﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ﴾ جوو و دیان و سائری میلەلی صاحب کتابی سماوی ﴿تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ﴾ وەرن ڕوویکەنە بال قسەیێ کورتو مختصر ﴿سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا﴾ ڕێکو پێک لە بەینی ئێمە و ﴿وَبَيْنَكُمْ﴾ ئێوە..

چ تاقمان تەجاوزی لێ نەکەین. ﴿أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ﴾ غەیری خودا عبادەتی کەس نەکەین، نە تماثیل، نە ارواح ﴿وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا﴾ هیچ شەریکی بۆ پەیا نەکەین، کەس نەکەین بە شەریکی ئەو، نە هیچ لە طبیعیات الحاق

بکەین بە مقامی الوهیەت، نە خـواش تنـزل پـێ بکـەیـن و بیهێنینـە ڕیـزەی طبیعیات، تەنها ئەوە (فوق الطبیعە)، ارواحی (مجردە)ش قبووڵ نـەکـەیـن، ﴿وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ کەسمان کەسمان بە مدبرّ و مربـی حساب نەکەین. ڕێاسەتی دین نەکەینە ڕبوبیەت.

الآن لەو عصرە، کە قەرنـی بیـستەمـە، دەڵـێن عـصری علـم و نـورە، بـە هەزارەها بەشەر سجدەو ڕکوع بـۆ (پـاپ) ئـەبـەن. ومـن العجایـب صـاحبـی مواقف ئەفەرموێ: (حابطیە)، کە فیرقـەیـێکن لـە فیرقـەکـانی موسـڵمانان، تەبەعەی (احمدی بن حابطن)، کە لە اصحابی (نظام) بووە، ئـەڵـێن عالـەم دوو خوای هەیە، یەکێ قدیم کە (الله)یە، یەکێ محدث، کـە مـسیحە، بۆیـە ئەڵێن مسیح، چونکە (مبدعی) اجسامە.

فیرقەیێکیش هەن (مفوّضە) ، ئەڵێن: خـوا خـەلقـی دنیـای تفـویـض بـە حضرتی (محمد) کردوە. لام وایە لە ڕەغمـی حـابطیـە ئـەم قـسە ئـەکـەن.. ئەوانە لاشک لە (فرقی) اسلامیە نین!. پاش ئەو دەعوەتە منصفانە، ئەگـەر قبووڵیان کرد (فبها) و (نعم)، وە الاّ ﴿فَإِن تَوَلَّوْا﴾ موافقەیان نەکـرد ﴿فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ٦٤﴾ ئێوە شاهد بن، ئەدای شەهادەت بکەن، کـە ئێمە موسڵمانین، منقاد و مطیعی خواین، غەیری ئـەو، کـەس بـە (الـە) بـە (ربّ) نازانین، وەک ابو الرسل، کە حەضرەتی (ابراهیم)ە دینمان فیطریـیە.

﴿يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تُحَاجُّونَ﴾ بـۆ مخـاصـمە ئـەکـەن لـەگـەڵ ئێمـە ﴿فِي إِبْرَاهِيمَ﴾ دەربارەی حەضرەتی ابراهیم کە ئـەڵـێن یهـودی بـووە، دیـان بـووە ﴿وَمَا أُنزِلَتِ التَّوْرَاةُ﴾ بـۆ مووسـی ﴿وَالْإِنجِيلُ﴾ بـۆ عیـسی ﴿إِلَّا مِن بَعْدِهِ﴾ دوای ئـەو هاتۆتـە خـوارەوە بـەزەمـانی زۆر دوور﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ ٦٥﴾ ئایـا ئێوە تـێنـافکرن؟ نـاوی موسـی و عیـسی و تـەورات و انجیـل، لـە صـفحەی عالەم نەبوو، حەضرەتی ابراهیم ڕووی کردبووە خوای تاک و آلهی سماوات و

ئەرز، مائل لە ربّ و ادیانی باطلە و منقاد و مطیعی خوای بوو، صورەت و تماثیلی مشرکانی ئەشکاند. ﴿هَٰٓأَنتُمۡ﴾ هائەوانەن ﴿هَٰٓؤُلَآءِ حَٰجَجۡتُمۡ فِيمَا لَكُم بِهِۦ عِلۡمٌ﴾ مجادلەو مخاصمەتان لەوەی عیلمتان پێ بوو کرد، جوابتان وەرگرت.

﴿فَلِمَ تُحَآجُّونَ فِيمَا لَيۡسَ لَكُم بِهِۦ عِلۡمٌۚ﴾ ئەوا ئەو قەیدی نەبوو، بعضە کلماتی متشابە لە تەورات و انجیل هەیە خۆتان پێ هەڵخەڵەتاند لەو کتێبانە تلویحێ، رەمزێ، اشارەتێ هەیە، کە بە علمی متبحرانەی خۆتان لێی استنباط بکەن، کە ابراهیم موسەوی بووە، یا عیسەوی، لاشک ئەوانە عالم بوون بە تاریخ، و هەر کەس علی الاجمال ئەزانێ، کە ابراهیم لە موسی و عیسی کۆن ترە بە زەمان.

وەک لە پێشەوە زاناندرا وەظیفەی اسرائیلیان قلبی حقائقە، کەتمی حقە، تلبیسی حقە. چەند ساڵێ لەمەوپێش شەوێک لە مجلسی پیاوێکی گەورە، جمعێک لە سەرسپیان حاضر ئەبن، یەکێک سؤالیان لێ ئەکا، ئەڵێ: حەضرەتی (موسی) مقدمە، یا حەضرەتی داود؟ بعضێ ئەڵێن: هەیهوو داود گەلێ مقدم بووە لە (موسی). بعضێکیش ئەڵێن: نازانین، ئەو سائلە سبەی هاتەلای من گوتی: کاکە مەلا! ئەمشەو شتی وا بوو، تۆچی ئەفەرمووی؟ گوتم ئەوانە هەروەکو ئاگایان لە تاریخ نییە، ئاگایان لە قورئانیش نییە.. لە مەسئەلەی طالوت، کە مەلەئی اسرائیلی طلبی علامەتیان کرد، نبییەکە گوتی: ئایەت و سلطەنەتی ئەو ئەوەیە، کە تابوتتان بۆ دێت و، کە سُکْنیە و بقیەی تەرەکەی آلی موسی و آل هارونی تیایە و، لە حەربی طالوتی لەگەڵ جالوت، داود جالوتی کوشت و بووە مەلیک. مع الاسف مەلەئی کوردان زۆر لە تاریخ ناشارەزان.

﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ﴾ هەر خوا ئێمەی خەبەردار کردوە، ئێمە امیین، احتیاجیمان

بە تعلیمی آلهی‌هـەیـە ﴿وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ۝٦٦﴾ ئێـوە وا خۆتـان گـەوج کردیـە، هیچ نازانن ﴿مَا كَانَ إِبۡرَٰهِيمُ يَهُودِيًّا﴾ ئەی عبادی خوای، ئێوە بزانن ابراهیم جـوو نەبـووە ﴿وَلَا نَصۡرَانِيًّا﴾ دیـانیش نـەبـووە. ﴿وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسۡلِمًا﴾ مائـل لـە عقائد و ادیانی بطال، تسلیمی خوای بووە و، لە شیعانیش نەبـووە ﴿وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ۝٦٧﴾ پێش نبووەتیش لە مشرکان نەبووە، موحدّ بـووە ﴿إِنَّ أَوۡلَى ٱلنَّاسِ﴾ لە هەموو کـەس اولـی واقـرب وانـسب ﴿بِإِبۡرَٰهِيمَ لَلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ﴾ لـە زەمانی حەیـاتی، تـا زەمـانی خـاتم ﴿وَهَٰذَا ٱلنَّبِيُّ﴾ محمـدی اسـماعیل، زینـدو کـەرەوەی شـریعەتـی ابـراهیم ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ لـە اتبـاعی ئـەو پێغـەمبـەرە صادق‌و ئەمینە.

بۆ پێغەمبەران نەسەب دینە، قرابەتی خوێن هیچ نی‌یە، ئـەگـەر قرابـەتـی دینی نەبی. هەموو پێغەمبەران، خاصة خاتم الانبیاء، ئەوەندەی ضرریان لـە خزمـان دیـت، ئـەوەنـدە لـە بێگانـان نـەدیـت. خزمـانی قریـشی تعـویقی پێغەمبەریان نەکردابا، گەلێ زوو دینی انتـشاری ئـەکرد، لـەو عالـەمـەی زۆر استفادەی تریان لە حەضـرەتـی ڕەسـول ئـەکرد ﴿وَٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ۝٦٨﴾ لـە دەوری هەموو پێغەمبەران، ئەگەر خودا نەصرەتی مؤمنانی نەدابایە، حفظـی نەکردبان، لەمیانی دریا، دریای گرۆهی کفـار مـەحـوو ئـەبـوون و، لـە وە لـە ڕووی (ولایتیە)، موسـڵمانان لـەتـاریکی شـرکو جوولـەکـەیـی‌و دیـانی حفـظ ئەکات و، ئەیان با بۆ ڕووی وحدانیەت و میللەتی ابراهیم و محمـدی ﴿وَدَّت طَّآئِفَةٌ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ لە جوو و لە دیان ﴿لَوۡ يُضِلُّونَكُمۡ﴾ ئارەزوویان هـەبـوو، وە ئارەزوویانە ئێوە گومڕا بکەن ﴿وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ﴾ گومڕاه ناکـەن، الاّ نەفسی خۆیان نەبێ ﴿وَمَا يَشۡعُرُونَ ۝٦٩﴾ شـعوریان نـی‌یـە، کـە خۆیـان

گومڕاه ئەکەن. سرری عظیم هەیە بۆ ئەوانەی، کە القای شکوک و شبهات ئەکەن بۆ اغوای خەڵکی، ئاگایان لە خۆیان نی‌یە، مەیلی افساد ڕوو لە خۆیان ئەکا، نەفسی ئەوان ضال ئەبێ، گوم ئەبێ لە میانەی اوهام وخیالاتی ابلیسانە ئەبن بە (سوفسطائی) صاحبی حیکمەت و علمی مزخرف، گەلێ لە علمای عظیم عظیم تووشی ئەو مەیلە بووین، ئاگایان لە خۆنی‌یە وا تێ ئەگەن، کە ئەو نەوعە سؤالانە لە ڕووی تحقیقاتەوە ایراد ئەکەن، ئاخر وایان لێدێ خۆیان ئەکەونە حیرەتو اشتباه..

﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ﴾ ئەگەرچی ادعای ئیمان ئەکەن، ئەمما لە حقیقەتدا ئیمان نی‌یە. اصلاً ئەوەی ئەڵێن اله العالمینە بە حەقی الوهیەت تصدیقی ناکەن، لەبەر کفر بە ئایاتی کونیە، هەتا خواتان هێنایتە دەرەجەی احقری حیوانات. حقاً ئەو کفرو جهالەتەی، کە لەوانە صادر بووە هیچ کافر، هیچ (مشرک) دوچاری ئەو کفرە نەبوین. مشرک دەرەجەی عالیان بۆ خوا داناوە، کەس ناگاتە ئەو دەرەجە، ئەسبابی چی‌یە ئێوە نە ئیمان بە ئایاتی عقلّیە ئەهێنن، نە بە نقلّیە. معجزات ئەکەنە ئایەتی کفر، (مع انه) ئەوە زۆر دوورە لە ئێوە ﴿وَأَنتُمۡ تَشۡهَدُونَ ٧٠﴾ ئێوە زانان ئەهلی کتاب بۆ زانین صاحب نظرو فیکرن، ئەتوانن تەماشای ئایاتی سماوات و ئەرز بکەن. ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَلۡبِسُونَ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ ﴾ بۆچی حەق ئەگۆڕرن، لباسی بطلانی لەبەرئەکەن ﴿وَتَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ﴾ حەق بزر ئەکەن ﴿وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٧١﴾ وا نی‌یە ئەو تلبیس و کتمە، لە سهو، یا لە نسیان، یا غەڵەتەوە بێ قصداً ئەیکەن، قانزاجتان چی‌یە لەو اغوا و فەسادە؟ ﴿ وَقَالَت طَّآئِفَةٞ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ ئەوانە شەیتانەکانیانن بە تلامیذی خۆیان ئەڵێن: ﴿ءَامِنُواْ﴾ بە ظاهری ئیمان بهێنن ﴿بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ بەو کتێبەی،

کە نازل کراوەتە سەر ئەوانی، کە ئیمانیان هێناوە ﴿وَجۡهَ ٱلنَّهَارِ﴾ لە اوەلی ڕۆژ زوو مسارەعە بکەن، (کانە) شەو خەوتان دیوە ئەمرتان پێکراوە، ئیمان بهێنن ﴿وَٱكۡفُرُوٓاْ ءَاخِرَهُۥ﴾ لە ئاخری ڕۆژ انکاری بکەن، بلێن ئێمە ئەهلی کتابین، تێی فکرین ئەوە لە تەرەف خوا نییە اختلاقە، دیارە ئێمە تعصبمان نییە مقصودمان کەشفی حەقە ﴿لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ٧٢﴾ بەڵکوو موسڵمانەکان ئەگەڕێنەوە، مرتد ئەبن، ئەو مەکرەی ئێوە تەئسیریان تێ ئەکا. شریعەتی ئیسلامە بۆ سدّی ئەو نەوعە افسادو تزویرە ئەمر ئەکا بە قتلی مرتد. خوێنی هدر ئەکا..

﴿وَلَا تُؤۡمِنُوٓاْ إِلَّا لِمَن تَبِعَ دِينَكُمۡ﴾ بڕوا و وثوقتان نەبێ بەکەس، ئەمین مەبن لەکەس، الاّ لەو کەسە نەبێ، کە تابعی دینی ئێوە بووە، اظهاری ما فی الضمیری خۆتان مەکەن. تعلیلی ئەو (نهیە) لەسوڕەی (بقرة) زانانـدرا، لێرە لە جوابدا ئیشارەی بۆ ئەکا.

﴿قُلۡ﴾ یا محمد! لە ڕەددی ئەوان بلێ: ﴿إِنَّ ٱلۡهُدَىٰ هُدَى ٱللَّهِ﴾ خوا خوای هەموومانە، هیدایەتی بۆ هەموانە، خاص نییە بە شعبی اسرائیلی، هیچ مانع نییە..

﴿أَن يُؤۡتَىٰٓ أَحَدٞ مِّثۡلَ مَآ أُوتِيتُمۡ﴾ هادی عباد عالمە بە (ما فی الضمیر)ی ئێوە، بۆ ئەهلی ئیمان اظهاری ئەکا، اخفای ئێوە نابێتە حجاب لە خواو، نابێتە مانع «ئەو ئایەتە لایان زۆر مشکلە و تەفسیری گرانە» ﴿أَوۡ يُحَآجُّوكُمۡ عِندَ رَبِّكُمۡۗ﴾ خوا اعلامیان ئەکا بە حجەت غالب ئەبن، بە سەرئێوە. ئەوە جوابێکە مجمل ئیشارە ئەکا بۆ عیللەتی جوابی مفصل.

﴿قُلۡ إِنَّ ٱلۡفَضۡلَ بِيَدِ ٱللَّهِ﴾ فضلی مطلق بەدەست خوایە، بەدەست ئێوە نییە ﴿يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۗ﴾ هەرکەسێ ببێ ﴿وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ ٧٣﴾ خوا واسع العطایە،

احاطەی بە هەموو شت دایە، بە قودرەت و ڕەحمەت، علیمە بە مصالح، بە لایق، بە ڕسالەت، بە (ما فی الصدور)ی ئێوە، لە خزمەت (مفتضح) ئەبن ﴿يَخۡتَصُّ بِرَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۗ﴾ ئەوەش هەر عائدی ئەوە، بە مەشیئەتی خۆیەتی، بە خواهش و ئارەزووی ئێوە نییە ﴿وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ٧٤﴾ وافرە، زۆرە بە ئێوە کەم ناکرێ، بەربەست نابێ، خۆی هەڵ ئەڕێژێ.

ئەهلی کتاب هەمووی وانین، بعضێ انسانی باشیان هەیە ﴿وَمِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ مَنۡ إِن تَأۡمَنۡهُ بِقِنطَارٖ يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيۡكَ﴾ بعضێ هەن لە ئەهلی کتاب، جوو، دیان، ئەگەر بە ئەمینی بزانی، قنطارێکی زێڕ لا دانێی بە ئەمانەت، ئەدای ئەکا پێت ئەگەیێنێ، حریص نین بۆ ماڵ خواردن بەهانەی نادۆزنەوە لەبەر پاکی دڵیان ئیمان ئەهێنن، حەق بەرن. حەق دەرن. (سیدی آلوسی) ئەفەرموێ بە قنطار، قسە لەقنطار کرا لە پێشەوە.

﴿وَمِنۡهُم مَّنۡ إِن تَأۡمَنۡهُ بِدِينَارٖ﴾ جوو، دیان، فەرقی نییە، مەگەر بە قیللەت و کثرەت. دینار کلمەیەکی عەرەبی نییە، معرّبە اصلی (دنار)ە بە شدەی نوونە، کە.. نوونی کراوە بە یێ، نابینی جمعی ئەکەن بە دنانیر. لە مالک بنی دینار نەقل ئەکەن، دینار لە دینو نار، یەعنی ئەوی بە حەقی خۆی وەرگرێ، دینیەتی. ئەوی بە غەیری حەق بیستێنێ، ئاگرە. بۆیە (سیدی ئالوسی) ئەفەرموێ: (لعلە) ابدای ئیشارەی صوفیانەیە لە لفظ، نەک مدلولی ئەوە بێ وەک بزر نابێ لەسەر کەس، کە مالکی دەرهەمێ بێ لە عەقڵ. فضل لە کەسێ مالکی دیناری بێ. حقیقةً (سیدی ئالوسی) زۆر مەلایە. زۆر قسە خۆشە ﴿لَّا يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيۡكَ﴾ نات داتەوە ﴿إِلَّا مَا دُمۡتَ عَلَيۡهِ قَآئِمٗاۗ﴾ الاّ وەقتێ دائماً لەسەر سەری ڕاوەستی، مهلەتی نەدەی، یعنی بە جبر ئەبێ بیستێنیەوە، وە الاّ بە خواهشی خۆی نایدا، کەسێ ئەوەندە حریص و لیم بێ، قەت ئیمانی نابێ.

﴿ذَٰلِكَ﴾ بۆ چی‌یە ﴿بِأَنَّهُمْ قَالُواْ لَيْسَ عَلَيْنَا فِي ٱلْأُمِّيِّـۧنَ سَبِيلٌ﴾ چونکی ئەوان ئەڵێن: لە خواردن، لە وەضعی دەست بە سەر ماڵی (أمّیان)، کە عەرەبن، ڕێمان لە سەر نی‌یە، بێعتابە. بێ ذم ولۆمەیە ﴿وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ﴾ افترا بە خوا ئەکەن، ئەڵێن ئێمە (شعب الله)ین دنیا بۆ ئێمەیە، خەڵکی دی وەک حیواناتە، مەگەر حەقی لەوەرری هەبێ. ﴿وَهُمْ يَعْلَمُونَ ٧٥﴾ ئەشزانن درۆ ئەکەن.. خوا مالک الملکە، ربّ العالمینە (ما في الارض)ی بۆ بەشەر خەلق کردیە. اسرائیلی و سماعیلی و هی‌تر، فەرقیان نی‌یە. ئەو قسە لە بەینی ساداتی ئێمە، وەک ساداتی ئیسرائیل خوڵقاوە. حاصڵی، هەر قەومە غەیری کوردان، ئەڵێن: ئێمە حسابین و، ئێمە لای خوا خۆشەویستین و، دنیا بۆ ئێمەیە. ﴿بَلَىٰ﴾ ئەو قسانە واز بینن ﴿مَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِۦ﴾ هەر عهدێ بێ. فرۆشتن. ئەمانەت. ڕەهن. اعارە. استعارە ﴿وَٱتَّقَىٰ﴾ لە اعتقادیات. لە عملیات خۆی لە شتی خراپ بپارێزێ ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ٧٦﴾ ئەگەرچی لە دۆم دابی. ئەوەی وەفای نەبێ، خۆی نەپارێزێ، خوا خۆشی ناوێ، ئەگەرچی لە صلبی ابراهیم و موسی و محمد بێ ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَـٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا أُوْلَـٰٓئِكَ لَا خَلَـٰقَ لَهُمْ فِي ٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ ئەوانە بەشێو نصیبیان لە ئاخرەت دا نی‌یە ﴿وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ﴾ خوا ئەوەندی ڕق لێیان ئەبێتەوە، أصلا قسەیان لەگەڵ ناکا، هەتا بەو نەوعە، کە قسەی لەگەڵ ابلیس کردووە ﴿وَلَا يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ﴾ تەماشایان ناکا لە ڕۆژی قیامەت. لە لطف و مەرحەمەتی محرومن ﴿وَلَا يُزَكِّيهِمْ﴾ لە گوناهیان پاک ناکاتەوە بە عفو ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ٧٧﴾ هەر کەسێ بێ، لەهەر کەس بێ ﴿وَإِنَّ مِنْهُمْ﴾ لەوانە بەدتر ﴿لَفَرِيقًا﴾ چ فەریقێ خاین؟! ﴿يَلْوُۥنَ أَلْسِنَتَهُم﴾ زوبانی خۆیان ئەپێچنەوە

وەک کلکی حوشتر، حەرەکەی پێ ئەدەن ﴿بِٱلۡكِتَٰبِ﴾ (گلدو فلّدو) یەکێ بە لەهجەی خوێندنەوەی کتابی آلهی ئەکەن، ئەڵێن: ئەوە کتابی منزّلە .

﴿لِتَحۡسَبُوهُ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ ئەو تزویرە ئەکەن، تا ئێوە ئەو (لولو)ی ئەوان لە کتبی مقدسە حساب بکەن، چونکی ئێوە (امیین)، هە لێتان ئەخەڵەتێنن ﴿وَمَا هُوَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ حاشا ثم حاشا ﴿وَيَقُولُونَ هُوَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ﴾ ئەڵێن ئەمە وەحی سەریەخۆیە ﴿وَمَا هُوَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ﴾ تەماشای کتێبە مقدسەکان، تواریخ و حکایاتە.. ئەمما علی الاکثر، بێ ئەصڵ و ئەساسە.. ئەشڵێن ئەوانە کتبی ئیلاهین، عهدی قدیم و جدیدن.

لە سەرەتای ظهوری (شەدەلە)یی‌یەکان، کابرایێ مل قەوی، ڕیش پانو ورگ ئەستوور، فلّتە فلّتی ئەکرد، ئەیان گوت ئەمە قورئان ئەخوێنێ، بە کەرامەتی شێخ، هەر (٣٠) جزوی قورئانی هاتیتەبەر. سەرسپی‌یەکان ئەیان گوت: ئەمە سوربانییە، ئەمەش نتیجەی کەرامەتە ﴿وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ﴾ أنواعی درۆ ﴿وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ٧٨﴾ ئەزانن درۆیە.. جەنابی حەق ئەو نەوعە کەسانەی چۆن خۆش ئەوێ؟ ﴿مَا كَانَ لِبَشَرٍ﴾ ئەمە نەبووە و نابێ، مادام (شمّە)یێکی لە بەشریەت تیا بێ﴿أَن يُؤۡتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحُكۡمَ﴾ تشریعی، یان قضائی ﴿وَٱلنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ﴾ لە پاش ئەو انعامە عظیمە بڵێ لە جیاتی (دعوة الی الله).. ﴿كُونُواْ عِبَادٗا لِّي مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ من بپەرستن لە خوا بگەڕێن، ئەمە چۆن ئەبێ؟ نەلە خوا ئەوەشێتەوە، ئەو نەوعە کەسە بکا بە ڕەسولی صاحب کتێب و حکم.. نە لەو نەوعە بەشەرە دێ ﴿وَلَٰكِن﴾ ئەمریان ئەکاتێ ئەفەرموێ: ﴿كُونُواْ رَبَّٰنِيِّـۧنَ﴾ ببنە مربي. مدبرّ. فقیە. (داعی الی الرب تعالی و تقدس) ﴿بِمَا كُنتُمۡ تُعَلِّمُونَ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ چونکی ئێوە تعلیمی

کتابتان کرد ﴿وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ ٧٩﴾ ئێوه تدریستان ئەکرد، هەم عبارەت، هەم مەعنا هەم حقائق و دقایقتان ئەزانی و فێری خەڵکی ئەکرد، چۆن ئێوه افترا بە پێغەمبەری ئەکەن، کە دەعوەتی ئێمە بۆ خۆی کردووه، ئەگەر ڕاستبکەن ئەوانی تکفیر و لەعنی ئەو شخصەیان کردیە (محقن)..

﴿وَلَا يَأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِذُوا الْمَلَائِكَةَ وَالنَّبِيِّينَ أَرْبَابًا﴾ (مع انه) ئێوه نسبەتی خەلق وایجاد بۆ ئەوانە ئەدەن، کەسێ وابێ کافره، مشرکه چۆن ئەبێتە پێغەمبەری خوا. انبیا هەرچی هەبن بەشەرن، هیچ امتیازیان لەسەرئێوه نیە. ملائکەت لە صفحاتی کائنات، دەلیلی لەسەر وجودیان نیە، چۆن اتخاذ ئەکرێن بە خواو عبادەت ئەکرێن؟

﴿أَيَأْمُرُكُم﴾ ئەو پێغەمبەره، ئایا ئەمرتان ئەکاتێ ﴿بِالْكُفْرِ﴾ بە کفر کردن ﴿بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ٨٠﴾ پاش ئەوه، کە ئێوه موسڵمان بوون و مطیع و منقادی خوا بوون. خواتان ناسی، مەلەک چیە؟ ڕەسول کێیە؟ چۆن ئەو شخصە ئەو ئەمره ئەکاتو، بالغرض ئەو ئەمره بکات، ئێوه چۆن بڕوای پێ ئەکەن، و مطیعی ئەمری ئەبن، بە بورهان معلومە ئەوه ممکن نیە.

بزانین ئەوانەی خوا ئەیانکا بە ڕەسول، دەربارەی یەک، چیان پێ ئەمر ئەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ﴾ هەموو یەکێک لە ئەوان ﴿لَمَا آتَيْتُكُم مِّن كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ﴾ بە سوێند و پەیمان بەو شەرتە ئەوەی ئەدەمە ئێوه. لە کتاب و حیکمەت ﴿ثُمَّ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ﴾ پاشان هاتە لای ئێوه پێغەمبەرێ مصدّق و مؤید لە بۆ ئەوەی کە لەگەڵ ئێوه دایە ﴿لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنصُرُنَّهُ﴾ چۆن ئەو ئیمانی بە ئێوه هێنا و تاییدی ئێوەی کرد. حاصڵی هیچ کەس لە پێغەمبەران دەعوای حصری ڕسالەتی لە خۆی نەکردووه و لە زەمانی هەر ڕەسولێ ڕەسولێکی دی هاتبایە ئیمانیان بەیەک ئەهێنا، نصرەتی یەکیان ئەدا أصلا تفرقە لای وان

نـیـیە ﴿قَالَ ءَأَقۡرَرۡتُمۡ﴾ گوتی اقرار و اعترافتان كرد بـەو میثاقـە ﴿وَأَخَذۡتُمۡ عَلَىٰ ذَٰلِكُمۡ إِصۡرِيۖ﴾ میثاقی منتان لـە ئوممـەتـەكـانی خۆتـان لـەسـەر ئـەو تـەرزە وەرگرت؟﴿قَالُوٓاْ﴾ پێغەمبەرەكانو ئوممەتـەكـان گوتیـان ﴿أَقۡرَرۡنَاۚ﴾ اعترافمـان كرد بەو عهدو میثاقە﴿قَالَ﴾ جەنابی حەق فەرمووی ﴿فَٱشۡهَدُواْ﴾ حفظـی ئـەو عهدە بكەن لەفكرتان نەچێ. ﴿وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ٨١﴾ ذاتەن هـیـچ شت لە خوا بزر نابێ. ﴿فَمَن تَوَلَّىٰ﴾ ئەوی اعراض بنـێ لـەو عهـدە﴿بَعۡدَ ذَٰلِكَ﴾ لـە پـاش ئـەو اعترافـە ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ٨٢﴾ خـارجن لـە طـاعـەت، بەدرۆ ئەڵێن هەر ئەوە پێغەمبەرە، ئیمان بە كەسی تر مەهێنن ﴿أَفَغَيۡرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبۡغُونَ﴾ ئەو فاسقانە ئایا غـەیـری دینـی خـوا طلـب ئـەكـەن، ئـەوە محاڵە، مع انە ئەڵێن: ئێمە مؤمنین. معتـرفین بـە نبـووەت، دیـارە مقـصدی ئەوان عصیان و تجبرە لە سەرخوا، ئەمە چۆن ئەبێ؟

﴿وَلَهُۥٓ أَسۡلَمَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ طَوۡعٗا وَكَرۡهٗا﴾ئەگەر مەسئەلەی (من) و (ما) لێبگەڕێ، معنای ئەو ئایەتە زۆر جوان دیارە. جەنـابی حـەق دوو ئەمری هەیە: یەكێ تكلیفی، یەكـێ تكـوینی، مخالفـەی ئـەمری تكلیفـی ممكنە و واقعە.. ئەمر بە نوێژ، بە ڕۆژوو، ئەمری ئەوە گەلێ كەس لە ئەهلی ئیمان نایكەن، ئەمەش چ عجزی خوای تێدانییە، چونكە احكامی فرعیـە بـۆ افعالی عبادەت، لە جهەت اختیار غایـەتـی مقـابلی ئـەو مكافـات و مجازاتـە. ئەمما ئـەمری تكوینی مخالفـە نـاكرێ، چـونكی ئـەو عبـارەتـە لـە تـوجیهی قودرەت و ارادە بۆ كردنی شت.. ئەگەر مخالفە تصور بكرێ، ئەبێ تـصوّری عجز بۆ خوا بكرێ، ئەوی لە ئەرز و ئاسمانە.. هەتا نەفسی ئینسان یەكێكـە لە مكوناتی تركیبی ئەو موالیدە، كە لە بعضـێ عناصرە، ئـەو عنـاصرەی، كە ئەصڵی مركباتن بعضـێك لـەگـەڵ بعـضـێك زۆر بـەمـەیلی طبیعین..

ئەڵێی عاشق و معشوقی یەکن، غایەت بە سهولەت امتزاج ئەکەن و بعضێ لەگەڵ بعض متباین و متنافرن، بە قودرەت و قووەتێکی قاهرە نەبێ، تالیفیان لە بەینا نابێ، ڕوح و جسمی لطیف، یا جوهری مجرد لەگەڵ بەدەن، چەند لەیەک دوورن.

ئاگر وگڵ بە قورسی و سووکی، چەند متنافرن لەگڵ و ئاو بە نظر ساردی چەنن متباین.. صانعی معملی کیمیای موجودات، بەعلم و قودرەت و، تدبیری صانعانە، چۆن ڕێکی خستوون.. موالیدی لێ پەیا کردوون، کەسێک ئیمانی تەواوی بە خوا هەبێ و، کەمێک لە احواڵی موجوداتی طبیعیە بگات و، بزانێ بعضە طبیعیات چەند سەرکەش و طاغیە؟! چەندە عاصیە، بە چ قووەتێ، بە چ عیلمێ تەسخیر کراوە، بە کەمالی سهولەت اطاعەی ئەمری تکلیفی ئەکات. ذاتەن قووەتی ئیمان، نەفس و قووای حیوانی ڕام ئەکا، بۆ امتثالی ئەمری تشریعی.

کەوایە ئێوە ئەی ئەهلی کتاب! چۆن دینی غەیری دینی خوا، بکا طلبی ئیلاهی غەیری خوا ئەکا﴿وَإِلَيۡهِ يُرۡجَعُونَ ٨٣﴾ ئەی ئەهلی کتاب! تقدیری اشارەمان بۆ کرد پێی ناوێ. ئەوە عهد و پەیمانی پێغەمبەرانی، ئیتر کێی دی بە (اله) بە (ربّ) ئەزانن. لە قرائەتی غیری عاصم (یُرجعون) بە ضمیری غائب. بناء علیه حاجەت بە التفات نیيە، ئەو تقدیری اشارەمان بۆ کرد پێی ناوێ. ئەوە عهد و پەیمانی پێغەمبەرانی پێشوو، عهدو میثاقی ئێمە چیيە؟

﴿قُلۡ﴾ ئەی خاتم الرسل لە تەرەف خۆتو ئوممەتت ﴿ءَامَنَّا بِٱللَّهِ﴾ بێ شک و بێ گومان و شەبەهو تشبیه و تشابه ﴿وَمَآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا﴾ ئەوی لە تەرەف خودا بۆ ئێمە ناردرابێ، باوەڕی پێ ئەکەین، ئیمانمان بەکیفیەتی تکوّنی (عیسی) ، یەکەم دەلیلە لەسەر بە (ما انزل علینا)..

﴿وَمَآ أُنزِلَ عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ﴾ یوسف

وغەیری وی، تا زەمانی موسی ﴿وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ﴾ لە کتاب و لە معجزات ﴿وَٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ﴾ ئەوی دراوەتە ئەنبیایان هەرچی هەبێ، هەرکەس بێ، بێ تفریقی جنس.

﴿لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ﴾ بە تصدیقی بعضێک و، بە تکذیبی بعضێک ﴿وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ٨٤﴾ ئێمە تەسلیمین بۆ خوا، ڕوحی اسلامیەت استسلامە بۆ خوا، ئەوی موسڵمان بێ بۆ غەیری خوا، گەردەن دادەی اطاعەت و عبودیەت نابێ، بۆ کەس (مذلت)ی استعباد قبووڵ ناکا..

﴿وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ﴾ دین دینی ئیسلامە، غەیری ئەو (کە حقیقة دینی بنای لەسەر علمو عقڵ و حریەتی بەشەرە) هیچ دینی تر نی‌یە، لە وەقتێ هەش‌بووبێ گۆڕراوە. هەتا دینیان کردۆتە مەیلێکی نەفسی هەرچۆنێ بێ. بەڵێ، مەیلی نەفسی ، ئەمما نە مەیلی (بهائمی) ، نە مەیلێک، کە بالکلیة شەڕەفی بەشەر مەحوو بکا. کەسێ دینێ غەیری دینی ئیسلامی بووێ، لێی قبووڵ ناکرێ..

چونکی نی‌یە! ئیتر چی لێ‌قبووڵ بکرێ؟

﴿وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٨٥﴾ خەسارەت مەند، خانە خشتور، خوایان لە قیس خۆیاندا، ئەوانی تریش نەهاتنە فریادیان ﴿كَيۡفَ يَهۡدِي ٱللَّهُ قَوۡمٗا كَفَرُواْ بَعۡدَ إِيمَٰنِهِمۡ﴾ کەسێ اصلاً کافربێ، هیدایەت پەزێر ئەبێ، ئەمما ئەوانی پاش ئیمان هێنان و کتاب خوێندن و تدریس کردنی، کافربن قابلی هیدایەت نین، خوا چۆنیان هیدایەت بدا، لە دائرەی امکانی استعدادی دەرچووین. ﴿وَشَهِدُوٓاْ أَنَّ ٱلرَّسُولَ حَقّٞ﴾ وەک دیان لە ئەوەڵەوە شاهدیان ئەدا لەسەر ڕسالەتی (عیسی)، دوایی کردیانە کوڕی خوا، پاشان کردیانە خوا..

﴿وَجَآءَهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُۚ﴾ لەسەر حقیقەتو وحدانیەتی خوا، ڕسالەتی ئەو

پێغەمبەرە، چۆن ئیمان بە حەضرەتی خاتم ئەهێنن﴿وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِى ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ٨٦﴾ قەومێک طغیانیان کرد، لە حەد چوونە دەر، خوا هیدایەتیان نادا، بەڵکو بەنظر قووەتی ظلمیان، خوا زیاتر لەکفریان ڕووئەباتە خوارەوە. ئینسان سەعی بۆ هەر شتێ بکا، استعدادی خۆی بە قووەت بکا، خوا بەو گوێرە پێی ئەدا. کەسێ تعلیمی زۆرنا لێدان بکا، خوا عیلمی کیمیای بۆ نانێرێ﴿ أُوْلَـٰٓئِكَ جَزَآؤُهُمۡ أَنَّ عَلَيۡهِمۡ لَعۡنَةَ ٱللَّهِ وَٱلۡمَلَـٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ ٨٧﴾ چونکە ئەو ئیمانەی هەیانە، نە ئیمانە بە خودا.. نە ئیمانە بە ملائکەت، نە ئیمانە بە پێغەمبەر، کە ئەوانو سائری ناس، هەتا ئەوانی پێیان هەڵخەڵەتاون، (لعنیان) ئەکەن.. هەمووکەس ئەڵێ: لەعنەت لە ظالمان، لەعنەت لەکافران، لەعنەت لە ڕێگۆڕران.

﴿ خَـٰلِدِينَ فِيهَا ﴾ لەو لەعنەتە دەرناچن ﴿لَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابُ ﴾ هەرگیز عەذابیان لەسەر سووک نابی، بەادنی سووکبوون ﴿وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ٨٨ ﴾ مهلەت نادرێن، تەماشا ناکرێن، مەرحەمەتیان پێناکرێ ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ ﴾ وەک لەسورەتی (بقرة) عەرضکرا. ئەوە قەت نابی، غایەتی مقصد ئەوەندەیە، خوا دەرگەی مەرحەمەتی خۆی لەکەس ناگرێ، باگوناهی لە ئەندازە بەدەربێ، کفری لە غایەتی (غلظەت دابێ) ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ٨٩ ﴾ ئەمما بە نظر ئەوانی دوایی بالکلیة لە دائرەی امکان نەچووینە دەر..

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعۡدَ إِيمَـٰنِهِمۡ ثُمَّ ٱزۡدَادُواْ كُفۡرٗا ﴾ کە لایان وایە ئەتوانن عەفووی گوناە بکەن و، خەڵکیش باوەڕیان پێ ئەکا وەک (پاپ) و ئەوانەی (صك الغفران)یان بۆ ئەبرن ﴿لَّن تُقۡبَلَ تَوۡبَتُهُمۡ ﴾ ئەو تۆبەی ئەیکەن

لای خوا قبووڵ نی‌یە، بەڵکوو نەفسی تۆبەکە زیادەی فی‌الکفرە ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلضَّآلُّونَ ﴿٩٠﴾﴾ ئەوانە وا ڕووچووین لە (ضلال)، کەس بە (ضال) حساب نی‌یە، ئەمما مضلەکان ئەوانە تۆبەیان بە دڵدا نایێ. خۆیان (توّاب)ن ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كُفَّارٞ﴾ کافربوون و بە کافری مردن﴿فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡ أَحَدِهِم مِّلۡءُ ٱلۡأَرۡضِ ذَهَبٗا﴾ ظاهر وایە ئەرزی قیامەت مقصود بێ، کە ئەوەندە گەورە ئەبێ، جێی کائناتی لەسەر ئەبێتەوە ﴿وَلَوِ ٱفۡتَدَىٰ بِهِۦٓ﴾ بالغرض، بالفعل بیکاتە (فدیە) لێی قبووڵ ناکرێ.

وەلێ ئەفامرێتەوە دڵیان زۆر پێوەیە، عەذاب قبووڵ ئەکەن، ئەمماماڵیان لە قیس نەچێ! ئەمە بۆ مثالی پایەکانە، بەهەشت ئەفرۆشن، جەهەنەم ئەکڕن.. ماڵیان زۆرە، با فدیە بدەن، چۆن خە ڵکیان کڕی‌یەوە، با خۆیان بکڕنەوە ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ بەڵام بڕوایان بە عەذاب نی‌یە ﴿وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٩١﴾﴾ کێ نەصرەتیان ئەدا؟ خۆیان ناصرومنجی بوون!! (حقیقةً) ڕۆسای دین، ئەمڕۆ زۆر ماڵ وێرانن، لەبەر حبی دونیا ئاگایان لە ئیمان بە قیامەتو عەذاب نەماوە، بە جەهل خۆیان مغرور کردووە..

ئوممەتیش وەک حەیوان (لا یعقل) تەسلیمیان بووە (نعوذ باللە من غضبە وعقابە).

* * *

جزۆی سێیەم لە تەفسیری کوردی تەواوبوو، شەوی جمعە، چوارەمی ماهی صفر الخیر، پێنجەمی مایسی رۆمی ۱۳۵۲ هیجری، ۱۹۳٤ میلادی

نووسینەوەی بە تمییز تەواویوو لە رۆژی شەمو وەقتی نیوەرۆ بیستو پێنجەمی مانگی محرم الحرام، نوزدەی آبی رۆمی، یەکی ایلولی افرەنجی ۱۳۷٦ ە، ۱۹۵٦ لە دەستی خادمی علم، لحقری عباد،

معصوم ملا خضری هەورامی

# ناوەڕۆکی بەرگی یەکەم